# صفوة الأحكام

ڕاڤەکردنی هەڵبژاردەیەك لە فەرموودەکانی
هەردوو کتێبی (نَيْلُ الْأَوْطَار وسُبُلُ السَّلَام)
بەشێوازی هاوچەرخ


دانراوی
د.قَحْطَان عَبْدالرَّحْمَان الدُّوري



وەرگێڕانی
م.ئاسۆ ڕەزا ئەحمەد

# صفوة الأحكام

ڕاڤەکردنی هەڵبژاردەیەك لە فەرمودەکانی هەردوو کتێبی

نَيْلُ الْأَوْطَار وسُبُلُ السَّلَام بە شێوازی هاوچەرخ


دانراوی

د.قَحْطَان عَبْدُالرَّحْمَان الدُّوري

وەرگێڕانی

م.ئاسۆ ڕەزا ئەحمەد



٢٠١٣ زاینی ١٤٣٤ کۆچی



**ناوی کتێب**

صفوة الأحكام (نيل الأوطار) و (سبل السلام) به شێوازی هاوچەرخ

**ناوی نوسەر**

د. قحطان عبدالرحمان الدوری

**ناوی وەرگێڕ**

ئاسۆ ڕەزا ئەحمەد

**تیراژ**

١٠٠٠ دانه

**ژمارەی سپاردن له لایەن بەڕێوبەرایەتی کتێبخانه گشتی یەکان**

(١٣١٨) ی ساڵی ٢٠١٣

**ساڵی چاپ**

٢٠١٣



**چاپ و تەجلیدی ڕێ نوێ دیزاینی کردووە**

# پێشەكی

له دوای قورئانی پیرۆز،فەرموده به دومم سەرچاوەی ئاینی ئیسلام دائەنرێت، هەربۆیه له ناو موسلمانآندا بایەخی زۆری پێدراوه له كۆكردنەومو لەبەركردن وراڤەكردن و نوسینەومو....تاد.

فەرمودەكانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كورت وپوخت وپڕ مانان، هەرچەنده وتەی پێغەمبەرن، بەڵام ئەویش لەخۆوه هیچ ناڵێت،وەك خوای گەوره ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ {النجم:٣و٤}.

فەرمودەكان لەهەر كات وسەردەمێكدا بن،گرنگی خۆیان هەیه وناكرێت فەرامۆش بكرێن،چونكه:

١.هۆكارێكن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەوره.وەك ئەفەرموێت: ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ {النساء:٨٠}.

٢.شاكارێكی گەورەی زمانی عەرەبین.

٣.باشترین چارەسەره بۆ دەردەكانی كۆمەڵگا.چەندەها لێكۆڵینەوه ئەنجام دراون، كەباسی بەرنامەی سوننەت ئەكات لەچارەسەری كێشەكاندا،وەك:مَنْهَجُ السُّنَّةِ فِي حِمَايَةِ البِيئَةِ،ومَنْهَجُ السُّنَّةِ فِي الزَّوَاجِ....

٤.سەرچاوەی دوەمی شەریعەتی ئیسلامیه وەك لە پێشتردا باسكرا.كەواتەبۆ تێگەشتن له گەورەیی شەریعەت، پێویستمان به ناسینی فەرمودەیه.

٥.له ڕێی فەرمودەوه شارەزا ئەبین له شێوه ژیانی پێغەمبەرو هاوەڵانی.تا بیانكەینه سەرمەشقی ژیانمان.

٦.لەڕێگەی فەرمودەوه،ئاشنا ئەبین به شێوازی پەروەردەكردن وپێگەیاندنی هاوەڵان له لایەن پێغەمبەری خواوه.

فەرمودەكانیش هەمه جۆرن،لەچەندەها بابەت ئەدوێن،بواری بیروباوەڕو ئەخلاق و چیرۆك وباسی ڕۆژی دوایی و...

كتێبی (صَفْوَةُ الأَحْكَامِ مِنْ نَيْلِ الأَوْطَارِ وَسُبُلِ السَّلامِ) هەروەك لەناوەكەیدا دەرئەكەوێت، ڕاڤەكردنی كۆمەڵێك فەرمودەی پێغەمبەره كەله ئەحكامە شەرعیەكان ئەدوێن.

دانەرەکەی هەوڵیداوە بە شێوازێکی هاوچەرخ وسەردەمیانە، ڕاڤەکردنی ئەوفەرموودانە بخاتە ڕوو، بەمەبەستی ئاسانکاری بۆ خوێندنی ئەو جۆرە بابەتانە.شێوازی خاڵبەندیکردن وڕێکخستن و جیاکردنەوەی بابەتەکان لەیەکتر،سیمای دیاری ئەم کتێبەیە.کتێبەکەش چەندەها جار چاپکراوەتەوە.

لەبەر ئەم سیفەتە باشانەیە کراوەتە پرۆگرامی خوێندنی بابەتی (أحاديث الأحكام) لەزۆر کۆلیژو خوێندنگەی ئاینیدا.منیش بە باشم زانی وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی،بەهیوای ئەوەی سود بەخش بێت بۆ خوێندەوارانی کوردو خوێندکارانی خۆشەویست.

لە وەرگێڕانەکەدا هەوڵمداوە:

١.ژمارەم بۆ فەرمودەکان داناوە،کە لەدەقە عەرەبییەکەدا نەبون. بەڵام ئەگەر چەند فەرمودەیەك مەسائیلەکانیان هاوبەش بون،یەك ژمارەم بۆ داناون.

٢.هەندێك لەو زاراوانەم پێناسە کردوە،کەلە کتێبەدا چەند بارە بونەتەوە.

٣.لەکتێبەکەدا،تەخریج ی هەندێك فەرمودە بە درێژی باسکراوە،تەنها ئەوەی مەبەست بێت، وەرمگێڕاوە.

وە هەندێك فەرمودە کە تەخریج نەکراوە،تەخریجم کردون.

بۆ تەخریجی فەرمودەکانیش پشتم بەستوە بە بەرنامەی (جامع الحديث النبوي)،کە لە ئینتەرنێتدا سایتی خۆی هەیە. بۆ زانینی پلەی فەرمودەکانیش، گەڕاومەتەوە بۆ کتێبەکانی شێخ ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت).

٤.ئەو فەرمودانەی لە باسەکاندا هاتوە وەك بەڵگە هێنانەوە،وەرمگێراون،بەڵام دەقە عەرەبیەکەشم لە پەراوێزدا نوسیوەتەوە،تا کەسێك بیەوێت،لەبەر دەستیدا بێت.

٥.بە پێویستم نەزانیوە کە کەسایەتیەکانی ناو کتێبەکە بناسێنم.هەرچەندە بواری زۆری لە دەقە عەرەبیەکەدا بۆ تەرخان کراوە.

٦.ئەگەر وتەی پێغەمبەری خوا بێت،وشەی: (فەرموی،یا نەفەرموێت) م بۆ بەکار هێناوە، بەڵام بۆ هاوەڵان و پێشەوایان و زانا بەڕێزەکان،(وتی،یا نەڵێت) م بەکارهێناوە. ئەمەش بۆ جیاکردنەوەی قسەی پێغەمبەری خوایە لە قسەی کەسانی تر.

## ناساندنی چەند زاراوەیەك كەلەم كتێبەدا هاتون

**أَثَرْ**: وتەی هاوەڵان یا شوێنكەوتوان.

**الْإِجْمَاعْ**: كۆ دەنگی زانایانی زانستە شەرعیەكان لەسەر بابەتێك،لەهەر سەردەمێكدا بێت.

**أَحَادِيثُ الأَحْكامِ**: ئەو فەرمودانەیە كە حوكمی شەرعی لێوەرئەگیرێن.

**الْإِخْتِلافْ**:جیاوازی بۆچونی زانایانە بەرامبەر بابەتێكی فیقهی.

**أَخْرَجَهُ الأَرْبَعَةُ**: شەش كەسەكە جگە لە بخاری وموسلیم فەرمودەیەك بگێڕنەوە.

**أَخْرَجَهُ الثَّلاثَةُ**: نسائي وترمذي و أبوداود فەرمودەیەك بگێڕنەوە.

**أَخْرَجَهُ الخَمْسَةُ**: احمد بن حنبل لە گەڵ چواركەسەكە فەرمودەیەك بگێڕنەوە.یان: شەش كەسەكە جگە لە إبن ماجه.

**أَخْرَجَهُ السَّبْعَةُ**: ئەو شەشەی سەرەوە لەگەڵ احمد بن حنبل فەرمودەیەك بگێڕنەوە.

**أَخْرَجَهُ السِّتَّةُ (أَخْرَجَهُ الجَمَاعَةُ)**: بوخاری وموسلیم وابوداود ترمذي ونسائی وإبن ماجه فەرمودەیەك بگێڕنەوە.

**أَخْرَجَهُ الشَّيْخَانِ(رواه الشيخان)**: ئەو فەرمودەیەیە كە هەردوو زانا، بوخاری وموسلیم ئەیگێڕنەوە،بەڵام لەڕێگەی دوو هاوەڵی جیاوازەوە.

**تَخْرِيجْ**: گەڕان بەدوای فەرمودەیەكدا لەكتێبە متمانەپێكراوەكاندا.

**التَّعْرِيفُ إِصْطِلاحاً**:پێناسەكردنی زاراوەیەكە لای ئەو زانایانەی لەو زانستە دواون.

**التَّعْرِيفُ لُغَةً**:پێناسەكردنی زاراوەیەكە لەفەرهەنگەكانی زمانی عەرەبیدا.

**الْجُمْهُورْ**: ڕای زۆرینەی زانایان لەسەر بابەتێكی شەرعی.

**حَــديثُ البَــابْ:** ئـەو فەرمودەیەیـە کـە بـاس ئـەکرێت لـە ڕوی تَخْـرِیجْ ومانـــاو هـــۆی وتـــن وڕای زانایـــان دەربـــارەی وپەیوەنـــدی بـــە فەرمودەکانی ترەوە و.......

**الحَــدِیثُ الحَــسَنْ:** ئـەو فەرمودەیەیـە کـە ناگاتـە پلـەی صـحیح،بە هـۆی کەمی بە ئاگابونی ڕاویەکەوە.

**الحَــدِیثُ الــصَّحِیحْ:** فەرمودەیەکـە کەسێکی دادپـەروەری بـە ئاگـا لـە کەســــێکی وەك خــــۆی ئەیگێڕێتــــەوە،تاکۆتایی ســــەنەدەکە، فەرمودەکەش بەدورە لە شُذوذ وعِلَّة..

**الحَــدِیثُ الــضَّعِیفْ:** ئـەو فـەرمودە یـە یـە کـە مەرجـەکانی فـەرمودەی صحیح یان حسن ی تیا نیە.

**الــــدَّلِیل:** بــۆ پــشتگیری کــردن لــە ڕایــەك ئەهێنرێتــەوە،وەك: قورئان،فەرمودە،کۆدەنگی زانایان،قیاس (چواندن)....

**الــرَّاجِحْ:** ڕای دروســت لــە نــاو چــەند ڕایــەکی تــردا،بــەپێی بەڵگــەی بەهێز.

**سَــــبَبُ ورود الحَــــدِیثْ:** ئــەو هۆکارەیــە کــە بەهۆیــەوە فەرمودەکــە وتراوە.پرسیار بێت یا ڕوداو.

**سَنَدُ الحَدِیثْ** : زنجیرەی ئەو کەسانەیە کە فەرمودەیەك ئەگێڕنەوە.

**القَوْل:** ڕای دیاری زانایەك یا کۆمەڵێك زانا دەربارەی بابەتێك.

**كِتَــابْ:** زاراوەیــەکی زانـا موسـڵمانەکانە بـۆ پـۆلێن کردنـی بابەتـەکان. وەك: کِتـابُ الطَّهارَة،الـصَّلاة، الزَّكَـاة..هـەر کِتَـاب یـَك چـەند بابێـك لـەخۆ ئەگرێت.وەك لە کِتَابُ الطَّهَارة دا: بابُ المِیاه،بابُ الوُضُوءْ..

**مُتَّفَـقٌ عَلَیْـهِ:** بوخـاری و موسـلیم فەرمودەیـەك بگێڕنـەوە لـە ڕێگـەی یـەك هاوەڵەوە.

**مَتْنُ الحَدِيث**: دەقی فەرمودەکەیە.

**المَرفُـــوع**: فەرمودەیەکــە بدرێتــە پــالّ پێغەمبــەری خوا،پلــەی هــەر چۆنێك بێت.

**المَسَائِل،المَــــسْأَلَة**: باســـکردنی بابەتێك،کــە پەیوەنـــدی هەیـــە بـــە فەرمودەکەوە.

**مَفْهُـــومُ الحَـــدِيث**: ئــەو مانایەیــە کــە ناڕاســتەوخۆ لەفەرمودەکــەوە تێیئەگەین،دوای وردبونەوە.

**مَنْطُـــوقُ الحَـــدِيث**: ئــەو مانایەیــە کــە بــە ئاشــکرا لــە فەرمودەکــەوە دەرئەکەوێت،بەبێ وردبونەوە.

**المَوْقُـــوف**: فەرمودەیەکـــە بدرێتـــە پـــالّ یـــەکێك لـــە هاوەڵـــانی پێغەمبەرەوە.

الحَـديثُ ١ // عَـنْ أَبـي سَـعيد الخُـدْرِيِّ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللّه صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ: إِنَّ المَـاءَ طَهُـورٌ لا يُنَجِّـسُهُ شَـيْءٌ... ئـاو پاككەرەوەيـەو بـەهيچ پيس نابێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە/**

١. ترمـذي/ ابـواب الطهـارة عـن رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم،باب مـا جاء ان الماء لا ينجسه شيء (٦٤).

٢. نسائي/ السنن الصغرى،كتاب المياه، باب ذكر بئر بضاعة ،(٣٢٥).

٣. ابوداود/ كتاب الطهارة،باب ما جاء في بئر بضاعة (٦٠).

٤. ئيمـامی ئەحمـەد بەصـحيحی دانـاوە.ئـەلبانيش بـە صـحيحی دانـاوە (صحيح ابی داود ٦٧).

**باسەكان//**

**باسـی يەكـەم/** هـۆی وتـنی فەرمودەكـە: (بەپێغەمبـەر صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ وترا:ئايا لەبيری بوزاعە دەستنوێژ بگرين؟ ئەويش فەرموی:....[1]

**باسی دووەم/** لەم فەرمودانەی خوارەوە حوكمی ئاوەكان وەرئەگيرێن:

١.فەرمودەی باسلێكراو...[2]

٢.لـە عبداللـە كـوڕی عومـەرەوە كەئـەڵێت:پێغەمبـەر صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ فەرمويەتی:(گەر ئاوگەشتە ئەندازەی (قوللەتێن ) پيسی هەڵناگرێت.)[3]

٣.انـس كـوڕی مالـك دەفـەرموێ:(دەشـتەكيەك لەلايـەكی مزگەوتەكـەوە ميـزی كـرد، خەڵكەكـەش سـەرزە نـشتيان كرد،بـەڵام پێغەمبـەر صَـلّى اللّـهُ

---

[1] قيلَ لرسولِ الله (صَلّى اللهُ عَليه وَسَلّمَ):أَنَتَوَضَّأُ منْ بِئْرِ بُضاعَةَ؟-وَهيَ بِئْرٌ يُطرَحُ فيهِ الحيضُ وَلحَمُ كلابٍ وَنَتْن-.فَقالَ: الماءُ طَهُورٌ لا يُنَجِّسُهُ شيْءٌ. أَخرَجَهُ أبوداوُد.حديث (٢٢٠)

[2] له دەقە عەرەبيەكەدا دەستەواژەی (حديث الباب) هاتوە، بۆ وەرگێرانەكەی دەستەواژەی (فەرمودەی باسلێكراو) م بەكار هێناوە. لەم كتێبەدا زۆر دوبارە ئەبێتەوە.

[3] إِذا كانَ الماءُ قُلّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الخَبَثَ.أَخرَجَهُ الأَرْبَعَةُ،وَصَحَّحَهُ إبنُ خُزَيْمَةَ.والالباني في صحيح أبي داود.

عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ رێگـری لێکردن،کەتـەواوبوو پێغەمبـەر صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمانیدا دۆلکەیەك ئاو بکرێت بە میزەکەیدا)[1]..

٤.لـە ئـەبو هریـرەوە کـە وتویـەتی: پێغەمبـەر صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمویـەتی: (هـیچ کـام لـە ئێـوە لـەئاوی لەبەرنەڕۆشـتودا-ڕاوەسـتاودا- میزنەکات و لەپاشان لەوئاوە خۆی بشوات.)[2]

٥.لـە ئـەبوهوریرەوە کـە وتویـەتی: پێغەمبـەر صـلَّى اللّـهُ علیْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمویـەتی: (پاکـرەوەی قـاپ وقاچـاخی هەریـەك لـەئێوە کەسـەگ دەمـی تێخست ،حەوت جارشۆردنیەتی یەکەم جاریان بەگڵ.)[3]

ئەم فەرمودانەی سەرەوە دژ بەیەکن:

فـەرمودەی (إذا إسْـتَيْقَظَ أحَـدُكُمْ...) لەگـەڵ فـەرمودەی ژمـارە (٤)و(٥) وائەگەیەنێت کە: پیسی کەم ئاوی کەم پیس ئەکات.

وە فـەرمودەی ژمـارە (١) و(٣ ) وا ئەگەیـەنێت کـە: پیـسی کـەم ئـاوی کـەم پیس ناکات.

<u>**باسـی سـێیەم**</u>/ ئـاوی کـەم و زۆر پیـسی تێبکـەوێت و ڕەنـگ یـا تـام یـا بـۆنی بگۆڕێت،ئاوەکە پیس ئەبێت، بە بەڵگەی:

١.ئـەبو ئومامـەی بـاهیلی ئـەڵێت:پێغەمبـەر صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ

---

[1] جاءَ أعْرابِيٌّ فَبَالَ في طائفَة المسْجد،فزَجَرَهُ النَّاسُ،فَنَهاهُمْ رَسُولُ الله (صَلَّى الله عَلَيه وَسَلَمَ)،فَلَمَا قَضى بَوْلَهُ،أمَرَ النَّبيُّ صَلَى اللهُ عَلَيْه وسَلَمَ بِذَنوبٍ مِنْ ماءٍ،فَأُهْريقَ عَلَيْه.مُتَفَقٌ عَلَيْه.صحيح البخاري ،كتاب الوضوء،باب يهريق الماء على البول (٢١٧)، صحيح مسلم ، كتاب الطهارة،باب وجوب غسل البول وغيره من النجاسات إذا حصلت في المسجد (٤٥٤).

[2] لايَبُولَنَّ أحَدكُمْ في الماءِ الدَّائِمِ الَّذي لا يَجْري،ثُمَّ يَغْتَسِل فيه.صحيح البخاري ،كتاب الوضوء،باب البول في الماء الدائم (٢٣٦).

[3] طَهُورُ إناءِ أحَدكُمْ إذا ولَغ فيه الكَلْبُ،أنْ يَغْسِلَهُ سَبْع مَرَّاتٍ،أولاهُنَّ بِالتُّراب. صحيح مسلم ، كتاب الطهارة،باب حكم ولوغ الكلب (٤٤٦).

فەرمویەتی: (ئاوپیس نابێت مەگەر بۆن و تام ورەنگی بگۆڕێت.)[1]

٢. کـۆدەنگی زانایـان لەسـەر ئەوەیە،هـەروەك إبـن المنـذرو شـافیعی وبەیهەقی و مهدی، ئەو کۆدەنگیەیان پێ ڕاگەیاندوین.

**باسی چوارەم/** ڕای زانایان جیاوازە لەبارەی ئاوێك کەپیسی تێکەڵ بوبێت بەڵام نەیگۆڕیبێت،بەم شێوەیە:

***ڕای یەکەم/*** ئەوئاوە کەم بێت یان زۆر پاکە.ئەمەش ڕای عائشەو عومەر وابن عباس..مالیك وڕایەکی احمدو صەنعانیش بەڕایەکی پەسەندی داناوە.بە بەڵگەی:

١..فەرمودەی باسلێکراو.

٢..فەرمودەی میزکردنی دەشتەکیەکە.

لە بارەی فەرمودەکانی: )دەستشۆردن دوای لەخەوهەستان( و)میزکردن لەناوئاوی لەبەرنەڕۆشتوو ) و(دەمتێخستنی سەگیش) فەرمویانە:

١.بۆ ڕونکردنەوەی حوکمی ئاوی پیس تێکەوتو نین،بەڵکو خۆ دورخستنەوە لێیان تەنها بۆ خواپەرستیە نەك لەبەرپیسیان،لەوانەشە حیکمەت لە خۆ بەدورگرتن لە بەکارنەهێنانی ئەوجۆرە ئاوەش نەزانین وەك حیکمەت لە ژمارەی نوێژەکان و زۆری تریش.

٢.ڕێگریکردن لێیان تەنها بۆ کەراهەتەو بۆ حەرامبون نیە،کەواتەپاکن و پاککەرەوەشن.

***ڕای دووەم/*** هەندێك لەزانایان ئاو ئەکەن بە دووبەشەوە:

١.ئاوێکی کەم کە پیسی زۆر یان کەم پیسی ئەکات.

٢.ئاوێکی زۆر،پیس نابێت بە گۆڕینی ڕەنگ یا تام یا بۆنی ئاوەکە نەبێت.

---

[1] إنَّ الماءَ لا يُنَجِّسُهُ شيءٌ،إلاّ ما غَلَبَ على رِيحِه وَطَعْمِه وَلَونِه.أَخرَجَهُ إبْنُ ماجَه،كتاب الطهارة وسننها،باب الحياض (٥١٨). وَضَعَّفَهُ إبْنُ حاتِم.

له دیاریکردنی ڕێژەی کەم وزۆری ئاو ، چەند ڕایەکیان هەیە:

١.ئـاوی کـەم ئـەو ئاوەیـە: بەکارهێنەرەکـەی وابزانێـت ئەگـەر بـەکاری بهێنیـت پیـسیەکەی بـەکارهێناوە.جگـە لـەو ڕێژەیـە بەزۆردائـەنرێت. ئەمیش ڕای هادەویە والمؤیدبالله..

پێیـان وایـە کـە: فـەرمودەی (دەسـت شـۆردن دوای لەخەوهەسـتان)، بـۆ سـوننەتە و فـەرز نیـە بـشۆردرێن.هـەروەها فـەرمودەی (قوللـەتێن) یـان بـە فەرمودەی دژ بەیەك –لاواز–داناوە.

٢.ئـاوی زۆر ئەوەیـە: ئەگەرکەسـێك لایـەکی بجوڵێنێـت –بەدەسـت یـا شـتێکی تـر–لایەکـەی تـری ناجوڵێـت. ئەمـەش ڕای ئەبوحەنیفەیـە. یـا بەئەنـدازەی (١٠بـاڵ بـە١٠ بـاڵ بێـت). ئـەویش ڕای ئـەبو یوسـف ومحمـدە .جگە لەم ئەندازەیە ئاوەکە بە کەم دائەنرێت (لەلایان).

پێیـان وایەکـە: مەبەسـت لـە (لايُنَجِّسُهُ شَـيْءٌ): واتـە: هـیچ شـتێك پیـسی ناکات،ئـەو ئـاوە زۆرەیـە کـە: ڕێژەکـەی لـە سـەرەوە دیـاریکرا.وە فـەرمودەی قوللەتـەین لاوازە (مُـضْطَرَبْ)ە.فـەرمودەکانی تـریش جگەلـەو فەرمودەیـە باسی ئاوی کەم ئەکات.

٣.ئـاوی زۆر ئەوەیـە کـە بگاتـە قوللەتەین،نزیکـەی ٥٠٠رطـل( ٢٠٠لـیتر) وەك لـە فـەرمودەی قوللەتـەین باسـکراوە.جگـە لـەو ئەندازەیـە بەکـەم دائەنرێت. ئەمیش ڕای شافعیەکان و الناصرو المنصوربالله یە.

<u>باسـی پێنجـەم/</u> بـە فـەرمودەی میـزی دەشـتەکیەکە وەڵـامی ئەوزانایانـە دراوەتـەوە کـە ئـاو دابـەش ئەکـەن بـۆ کـەم وزۆر.چـونکە ئـەو فەرمودەیـە ئـەوە ئەگەیـەنێت کـە:پیـسی کـەم ئـاوی کـەم پـیس ناکـات. بـەڵام شـافعیەکان بـەم شێوەیە وەڵامی ئەم قسەیە ئەدەنەوە:

ئەگـەر پیـسی کـرا بـە سـەر ئـاوی کەمـدا وەك فـەرمودەی دەستـشۆردنی دوای لەخەوهەسـتان باسـی ئەکات،ئاوەکـە پـیس ئـەبێت. بـەڵام ئەگـەر ئـاوی کـەم کـرا بەسەر پیسیدا وەك لەفەرمودەی دەشتەکیەکەدا هاتوە ، ئاوەکە پیس نابێت.

**الحَديثُ ٢// عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللّهُ عَنْـهُ قـالَ: قـالَ رَسُولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ: طَهُـورُ إِنـاءِ أَحَـدِكُمْ إِذا وَلَـغَ فِيـهِ الكَلْـبُ أَنْ يَغْـسِلَهُ سَـبْعَ مَـرّاتٍ، أُولاهُنَّ بِالتُّرابِ...**

پاككـــەرەوەى قـــاپ وقاچـــاخى هەريـــەك لـــەئێوە كەســـەگ دەمـــى تێخست، حەوت جارشۆردنيەتى، يەكەم جاريان بە گڵ.

**گێـــڕەرەوەى فەرمودەكـــە//** صـحيح مـسلم ،كتـاب الطهارة، بـاب حكـم ولـوغ الكلـب (٤٤٦).

**مانـــاى ووشـــەكان//** وَلَـغَ: بەئـەملاولاى زمـانى خواردیـەوە. فَلْيُرِقْـهُ: ئاوەكـە برژێت.

**سەرباسەكان//**

**باسى يەكەم/** دەمى سەگ پيسە، بە بەڵگەى:

١..فـــەرمانكراوە بـــە شـــۆردنى ئـــەو قاپـــەى دەمـــى تێخـــستوە، وەك لـــە فـــەرمودەى باســـكراودا هـــاتوە. چـــونكە شـــۆردن يـــا بـــۆ بـــێ دەســـتنوێژى ولەشپيـــسيە، يا بـــۆ پيـــسبونە. يەكـــەميان لێـــرەدا باســـنەكراوە ،كەواتـــە شۆردنى قاپ وقاچاخەكان بە هۆى پيسبونيەوەيەتى.

٢.فـــەرمان كـــراوە بەڕشـــتنى ئاو، ئـــەويش بەفيرۆدانـــە(إسْـراف). گـــەر ئاوەكـــە پاكبوايـــە فـــەرمان بـــە بـــەفيرۆدانى نەئـــەدرا. چـــونكە بـــە فيرۆدانـــى مـــاڵ دروســـت نيە.

**باسى دووەم/** لە بارەى پيسى جەستەى سەگ، دوو ڕا هەيە:

***ڕاى يەكـــــــەم/*** هـــەموو جەســـتەى ســـەگ پيـــسە، كە ڕاى جمهورە، بـــە شـــوبهاندنى بەپيـــسى دەمى، ليكـــى نـــاو دەميـــشى بەشـــێكەلەدەمى، چـــونكە ئـــارەقى نـــاو دەمێتى، ئـــەو ئارەقـــەش لەجەســـتەوە دروســـت ئەبێت، كەواتـــە جەستەى پيسە.

***ڕاى دووەم/*** جەســـتەى ســـەگ پاكە، ئـــەميش ڕاى داود و ڕوايـــەتێكى مالـــك وزوهرى وعيكريمەيە. چونكە:

پیسی لەناودەم و لیکیدایە،لە بەر ئەوەی زۆر کات شوێنی بەکارهێنانی پیسیە. لەحوکمیشدا ڕەچاوی حاڵەتی زۆرینە ئەکرێت،کە بریتیە لە خواردنی شتی پیس بە هۆی دەمی و بەرکەوتنی،کەواتە نابێتە بەڵگەی پیسی سەگ خۆی.

وە ئەڵێن: فەرمانکردن بە شۆردنی ئەو قاپ وقاچاخانە بۆ خواپەرستی وگرێڕایەڵیە نەك لەبەر پیسی سەگ،چونکە گەر لە بەر پیسی بوایە،بە حەوت جار کەمتریش ئەتوانرا بشۆردرێت.

وەڵامی ئەم ڕایە بەم شێوەیە ئەدرێتەوە کە: حوکمەکە خۆی (فەرمان کردن بەشۆردن)،ژێری پەسەندی ئەکات، وهۆکاریشی هەیە ئەویش پیسیە. بناغەی حوکمەکانیش هۆکارەکانیەتی. بۆیە زۆرینەی حاڵەتەکان ڕەچاوئەکرێت، وخواپەرستیەکە لەڕەچاوکردنی ژمارەی شۆردنەکەیدایە.

***باسی سێیەم/*** لەبارەی حەوت جار شۆردنەوە، دوو ڕا هەیە:

***ڕای یەکەم/*** فەرزە حەوت جار دەفرەکە بشۆردرێت. ئەمەش ڕای ئیبن عباس و ئیبن سیرین وئەوزاعی ومالیك وشافیعی و احمد ... بە بەڵگەی: فەرمودەی مەبەست (باسلێکراو).

***ڕای دووەم/*** حەوت جار شۆردن فەرز نیە،بەڵکو ئەمیش وەك پیسیەکانی تر ئەشۆردرێت، و ئەو ژمارەیەش بۆ سوننەتە. ئەمەشیان ڕای عترە وحەنەفیەکانە،بە بەڵگەی:

١.ئەبوهوریرە کە فەرمودەکە ئەگێڕێتەوە (حەوت جار ئەشۆردرێت)،وتویەتی : (دەمتێخستنی سەگ سێ جار ئەشۆردرێت)[1] .کەواتە حەوت جار شۆردن لابراوە.

---

[1] يُغْسَلُ مِنْ وُلُوغِهِ ثَلاثَ مَرَاتٍ، أَخْرَجَهُ الطَّحاوِيُ. وَالدَّارَقُطْنِي: كتاب الطهارة،باب ولوغ الكلب في الإناء (١٦٤).

ئەم قسەیە چەند وەڵامێکی دراوەتەوە:

(١) ئیش کردن بەو فەرموودەیەکە لەپێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەیگێڕێتەوە،نەك بە بینین وفتوای خۆی (أبوهريره).

(٢) دژ بە فەرموودەیەکی ترە کە خۆی ئەیگێڕێتەوە.

(٣) فتوای حەوت جار شۆردنیداوە. کە سەنەدەکەی بەهێزترەو لەگەڵ ڕیوایەتی بەرزکراو بۆ پێغەمبەریش ئەگونجێت.

(٤) جگە لە ئەبوهورەیرە چەند هاوەڵێکی تریش فەرموودەی حەوت جارەکە ئەگێڕێتەوە. کەواتەپێچەوانەی فەتواکەی دژ ناوەستێت لە گەڵ گێڕانەوەی کەسانی جگە لە خۆی.

٢.لەپێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوە لە بارەی دەم تێخستنی سەگ بۆ قاپ وقاچاخ ، فەرمویەتی: سێ یا پێنج یاحەوت جار ئەشۆردرێ[1].

فەرموودەکە بەڵگەی واجب نەبونی حەوت جارە،وە خاوەن قاپەکە سەرپشکەلە ژمارەکەدا.

بەڵام وەڵامی ئەم ڕایە دراوەتەوە کە: فەرموودەکە لاوازەو ناکرێت بە بەڵگە.

٣.پیسایی مرۆڤ زۆرترە لە پاشماوەی سەگ و بەحەوت جاریش نەبەستراوەتەوە. کەواتە دەمتێخستنی سەگیش وەك ئەوە.

**وەڵام/**

أ.مەرج نیە گەر پیسایی مرۆڤ لەپاشماوەی سەگ پیستر بوو لەحوکمدا وەك یەکبن.

ب.قیاس بەرامبەر دەقی ڕاشکاو پوچەو ئیشی پێ ناکرێت.

[1] يُغسَلُ ثلاثاً أَوْ خَمساً أَوْ سَبعاً.أَخرَجَه الدَّار قُطني: كتاب الطهارة، باب ولوغ الكلب في الإناء،رقم (١٦٤).

**باسی چوارەم/** لەبارەی بەخۆڵ شۆردنی قاپەکە ، دوو ڕا هەیە:

***ڕای یەکـــــەم/*** فەرزە،بــە بەڵگــەی باســکردنی لەفەرمودەکــەدا.وە ئــەڵێن: فەرمودەکـە دیـاری کـردوە کـە بـە خـۆڵ بێـت ولەیەکـەم جـاریش بێـت. هـیچ جیــاواز نیــە گــەر ئــاو تێکــەڵی خــۆڵ بکرێت،یــا ئــاو ئــەکرێت بەســەر خۆڵەکەدا یا خۆڵ بکرێتە ناو ئاوەکەوە.

***ڕای دووەم/*** فـەرز نیە،ئەمــەیان ڕای ئەوانەیـە کەحـەوت جـار شـۆردن بـە فـەرز دانانێن،چونکە:

١.لــە فــەرمودەی گێــڕاوەی مالیکــدا بــاس نــەکراوە. بــەڵام لــە ڕیوایــەتی صــەحیحی تــر باســیکردوە. زیــاد گێڕانــەوەی کەســی متمانــەپێکراویش وەرئەگیرێ.

٢.گێڕانــەوەی ( التُّــرابْ ) بـە چـەند شـێوەی ئـاڵۆز هـاتوە: جارێـك ( أُولاهُــنَّ) یەکـــــەم جاریان،یــــا ( أُخْــــراهُنَّ) دواهــــەمینیان، یــــا (إِحْــــداهُنَّ ) یــەکێکیان،یا (الــسَّابِعَة)حەوتــەم جار،یــا ( الثَّامِنَــة) هەشــتەم جــار. ئــەم جیاوازی ووشانەش لاوازی فەرمودەکە ئەگەیەنێت.

وەڵـامی ئـەم قسانە ئەوەیـە کـە: کاتێك جیـاوازی وشـە لـە گێڕانەوەکانـدا بـە لاوازی فــەرمودە دائــەنرێت، کــە گێڕانــەوەکان لەپلــەدا وەك یــەکبن.بــەڵام لێرەدا یەك پلە نین:

ا.گێڕانــەوەی (أُولاهُــنَّ) ڕاســـترە،لەبەر زۆری ئەوانــەی گێڕاویانەتــەوە، وە بونیــان لــەلای بوخــاری وموســلیم. کــە بــە هــۆی دروســتربونی فــەرمودە دائەنرێت گەر دژ بەیەکبون.

ب.ئـەو وشـانەی پێـچەوانەی (أُولاهُـنَّ )ن، نـاتوانن لـە بەهێزیـدا بـەرەو ڕوی بوەسـتن، چـونکە : وشـەی (أُخْـراهُنَّ) لـە کتێبـەکانی فـەرمودەدا نیە،وشـەی (أُولاهُــنَّ بِــالتُّرابِ) یــش جیــاوازی ڕا هەیــە لەســەری، وشــەی ( إِحْــداهُنَّ) لەکتێبــە سەرچــاوەکاندانیە،بەزاز گێڕاویەتــەوە.گــەر دروســتیش بێــت، مُطْلَقَــة و فــەرمودە دروســتەکە مقیــدە. وشـەی ( أُولاهُـنَّ أَوْأُخْـراهُنَّ) بـە سـەر

پـشكی تيايدا،گـەر لـە گێـڕەرەوەی فەرموودەكـە بێت،ئـەوە گومانـە لـەلای و پـەنا ئەبرێتـە بـەر تـرجيح. وەك وتـرا (أُولاهُـنَّ) دروسـترە. گـەر لـە فـەرموودەی پێغەمبـەريش بێـت، مانـای سەرپـشككردنی موسـڵمانە لـەنێوانی ئـەو دوانـەدا.لێرەش هـەر وشـەی (أُولاهُـنَّ) بـە دروسـت دائـەنرێت، بـە هـۆی بـونی لە صەحيحەين دا.

**باسـی پێنجـەم/** ئيزافـە لـە وشـەی (إناءأَحَـدِكُمْ) ئيـشی پێناكرێـت. چـونكەپاك وپيـسی لەسـەرخاوەندارێتی قـاپ وقاچـاخەكە نەوەسـتاوە. هەروەها(فَلْيَغْسلْهُ) مەرج نيە خاوەنی قاپەكە خۆی بيشوات.

**باسـی شەشـەم/** وشـەی (فَلْيُرِقْـهُ): فەرمانكردنـە بـە ڕشـتنی ئـە وئاوە،يا ئـەو خواردنـەی سـەگ دەمـی تێخـستوە،كە بـەهێزترين بەڵگـەی پيـسبونيەتی،چونكە ئـەويش كـە ئەڕێـژرێ، لـەئاوو خـواردن گـشتيترە، گـەر پـاك بوايـە فـەرمان بەڕشـتنی نەئـەدرا.بـەڵام ئـەم وشـەيە لاوازە،وەك لـە (فتح الباري) دا باسكراوە.

**باسـی حەوتـەم/** باسـی شـۆردنی هەشـتەم جـار نەكراوە،كـە لـە گێڕانـەوەی موسـليمدا هەيـە: (وَعَفِّـرُوهُ الثَّامِنَـةَ بِـالتُّراب) واتـە: بـۆ هەشـتەم جـار لـەخۆڵی بخـەن. إبـن دقيـق العيـد ئـەڵێ: ئـەم وشـەيە جگەلـە حەسـەنی بەصـری هـيچ كەسـی تـر لەپێـشينان باسـيان نەكردوە،فەرموودەكـەش لـەو بارەيەوە بەهێزە،كەسێك لێی نەدوابێت،پێويستی بە لێكدانەوەيەتی.

صەنعانی ئەڵێ:

لێكدانـەوەی نـەگونجاو بـۆ ئـەم فەرمودەيە،نـەوەوی باسـيدەكات وئـەڵێ: مەبەسـت لێـی حـەوت جـار بيـشۆرن يـەكێكيان بـەخۆڵ لەگـەڵ ئاودا،واتـە خۆڵەكە جێی جارێك شۆردن ئەگرێتەوە.

**الحديث ٣// عَنْ إبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدمانِ: فَأمَّا المَيْتَتَانِ فَالجَرادُ والحُوتُ، وأمَّا الدَّمانِ، فَالكَبِدُ وَالطَحالُ...**

دوو مردارەوە بو لەگەڵ دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ كراوە: مردارەوە بوەكان كوللەو ماسین،وە خوێنەكانیش جگەرو سپڵن.

**گێـرەرەوەی فەرمودەكە//** ئەحمەدو إبن ماجة: سن إبن ماجه،كتاب الأطعمة، باب الكبد والطحال ( ٣٣١١) .بەلاوازی ئەیگێڕنەوە،بەڵام فەرمودەیەكی (موقوف)ە،ئەم جۆرەش حوكمی( مرفوع)ی هەیە،چونكە كە یەك لەهاوەڵان بلێت: بۆمان حەڵال كراوە یا لەسەرمان حەرام كراوە،وەك ئەوەیە بڵێت: فەرمانمان پێ كراوە،یا لێمان قەدەغەكراوە.كەواتە ئیشی پێ ئەكرێت.[1]

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** دوو مردارەوە بوو لە گەڵ دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ كراوە،واتە دوای حەرامبونی بە ئایەت.[2]

**باسی دووەم/** لە بارەی حەڵاڵ بونی كوللەی مردارەوە بوەوە، چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەكەم/*** هەرچۆن بێت حەڵاڵە،خۆی مردبێت یا بە هۆیەكەوە. بە بەڵگەی فەرمودەی باسلێكراو.

***ڕای دووەم/*** مەرجە سەربڕێت بەهۆی مرۆڤێكەوە،هەموو سەری یا هەندێكی بپڕدرێت،یا بكوڵێندرێت،یا بەزیندویی بخرێتە ئاگرەوە. ئەگەر خۆی مرد،یا لە قاپێكدا مرد،حەڵاڵ نیە.ئەمیش ڕای مالیكیە.

---

[1] ئەلبانیش ئەم فەرمودەیەی بە صحیح داناوە.سلسلة الأحاديث الصحيحة( ١١١٨ ).

[2] قال الله تعالى: ﴿ حرمت عليكم الميتة والدم ولحم الخنزير وما أهل به لغير الله والمنخنقة والموقوذة...﴾.........سورة المائدة جزء من الآية ٣

بەڵام بە فەرمودەی باسلێکراو وەڵامیاندراوەتەوە.

**باسی سێیەم/** لەبارەی حەڵاڵ بونی ماسی مردارەوەبویش، چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەکەم/*** بەهەرشێوەیەك بدۆزرێتەوە حەڵاڵە،سەرئاو کەوتبێت یان نا،ئەمیش ڕای سەرجەم زانایانە. بەڵگەشیان:

١.فەرمودەی باسلێکراو.

٢.فەرمودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەبارەی ئاوی ڕوبارەوە: خۆی پاککەرەوەیەو مردارەوە بوی ناویشی حەڵاڵە.[1]

***ڕای دووەم/*** تەنها ئەوەیان حەڵاڵە کە بەهۆی مرۆڤەوە مردبێت،یا بەهۆی ووشکبونی ئاو،بەڵام سەر ئاو کەوتوو حەڵاڵ نیە،هەروەها خۆی مردبێت یا ئاژەڵێك کوشتبێتی. ئەمەش ڕای حەنەفی مەزهەب وهادی و یەحیاو ڕایەکی مؤید باللە،بە بەڵگەی فەرمودەی: ئەوەی ڕوبار فڕێیدا یا هاتبوە دەرەوە،بیخۆن. بەڵام مردارەوە بو یا سەر ئاوکەوتوو مەخۆن.٢ ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە لە جابرەوە. فەرمودەیەکی تایبەتیەو دوو فەرمودەکەی تری پێ تایبەت ئەکرێت.

وەڵامی ئەم ڕایە:

أ.بە کۆ دەنگی پێشەوایانی فەرمودە،فەرمودەکەی جابر لاوازە.

ئەوەوی ئەڵێت: فەرمودەکەی جابر ئەگەر دژیشی نەبێت ئیشی پێ ناکرێت،لێرەدا دژیشی هەیە.کەواتە ئیشی پێ ناکرێت.

---

[1] هُوَ الطَّهُورُ ماؤهُ،الحِلُّ مَيْتَتُهُ.صححه الألباني في صحيح أبي داود(٨٣).

[2] مَا أَلْقَاهُ البَحْرُ أَوْ جَزَرَ عَنْهُ،فَكُلُوا.وَمَا مَاتَ فَطَفَا فَلا تَأْكُلوهُ. المعجم الأوسط للطبراني - باب الألف،باب من اسمه إبراهيم ( ٢٩١٨). قال الألباني: الاكثرون على أنه موقوف.(مشكاة المصابيح)

ب.پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەو نەهەنگەی خوارد کە ڕوبار بۆ سەریەیەکی فڕێدابوو،پرسیاری دەربارەی هۆی مردنەکەی نەکرد.لە کتێبەکانی فەرمودەو سیرەدا باسی لێوە کراوە.

**باسی چوارەم/** خواردنی جگەر حەڵاڵە.بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی باسلێکراو.

ب.کۆدەنگی زانایان لەسەرحەڵاڵ بونی.

**باسی پێنجەم/** لەبارەی حەڵاڵبونی سپڵەوە، دوو ڕا هەیە:

***ڕای یەکەم/*** حەڵاڵە،بە بەڵگەی: فەرمودەی باسلێکراو.

دووەم: بێزراوە (مَكْرُوه)،بە بەڵگەی:

فەرمودەی عەلی : سپڵ پاروی شەیتانە.[1] واتە: بەخواردنی دڵخۆش ئەبێت.

وەڵامی ئەم ڕایە دراوەتەوە: کە نازانرێت ئەم فەرمودەیە کێ گێڕاویەتەوە.

**الحَدِيثُ ٤// عَنْ حُذَيْفَةَ بنَ اليَمَانِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ والفِضَّةِ،وَلا تَأكُلُوا فِي صِحَافِهِمَا،فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنيا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ...**

لەدەفری ئاڵتون وزیودا مەخۆنەوەو، لە مەنجەڵەکەشیاندا مەخۆن،چونکە لە دنیادا بۆ ئەوانە (بێباوەڕان) وە لە قیامەتیش بۆ ئێوەن.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري،(كتاب الأطعمة،باب الأكل في إناء مفضض (٥١١٥) ، صحيح مسلم،كتاب اللباس والزينة،باب تحريم استعمال إناء الذهب والفضة على الرجال والنساء (٣٩٤٣). کۆدەنگن لە گێڕانەوەیدا.

---

[1] إِنَّهُ لُقْمَةُ الشَّيْطانِ. مصنف ابن أبي شيبة،كتاب الأطعمة،في أكل الطحال (٢٣٨٥٦).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** (فَإِنَهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا)، واتە: بۆ بێباوەڕانە،چونکە دیارە مەبەست لەوانە،هەر چەندە لە فەرمودەکەشدا باسنەکراون. ئەمەش مانای حەڵاڵ بون بۆ ئەوان ناگەیەنێت. بەڵکو ئاماژەیە بۆ واقیعی حاڵیان کە بە کاری دێنن.

**باسی دووەم/** خواردن و خواردنەوە لە قاپ و مەنجەڵی ئاڵتون وزیویدا حەرامە،ئەگەر ساغ بن یا تێکەڵ بن لە ئاڵتون وزیو. چونکە تێکەڵبویش هەر قاپی ئاڵتون وزیوی پیٚ ئەوترێت. بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی باسلێکراو.

ب.کۆدەنگی لەسەرحەرامی خواردن وخواردنەوە تیایاندا وەك نەوەوی گێڕاویەتەوە.

**باسی سێهەم/** لە بارەی هۆکاری حەرامبونیەوە ، چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەکەم/*** ئەبێتە هۆی خۆ بەزلزانین.

دووەم: شکاندنی دڵی هەژارانە. بەڵام وەڵامی ئەم خاڵەدراوەتەوە کە: کانزا گرانبەهاکان بەکارهێنانیان بۆخواردن حەڵاڵە هەر چەند لە ئاڵتون و زیویش گرانترن.

سێهەم: خۆشوبهاندنە بە ئاگرپەرستان. بەڵام لەبارەی ئەم ڕایەش قسەهەیە ،چونکە لێرەدا هەڕەشە هەیەو تەنها خۆشوبهاندنیش شایەنی ئەو هەڕەشەیە نیە.

چوارەم: لەبەرئەوەی ئاڵتونن یا زیو (ئەوانیش دیارە کە حەرامن).

**باسی چوارەم/** لەبارەی قاپ وقاچاخی زاخدراو بە ئاڵتون وزیو،چەند ڕایەك هەیە،ئایا حەرامن وەك ئەوان یان نا؟ ووتراوە: ئەگەر بتوانرێت جیابکرێنەوە لە یەکتری حەرامن،چونکە ئەبێتە بەکارهێنەری ئاڵتون یا زیوەکە،ئەگەر نا حەرام نین.

**باسی پێنجەم/** قاپ وقاچاخێك شكابن و بە ئاڵتون یا زیو پینە كرابن،بە كۆدەنگی بەكارهێنانیان دروستە.

**باسی شەشەم/** لەبارەی بەكارهێنانیان بۆ جگە لەخواردن وخواردنەوە تیایاندا (وەك دەستنوێژ گرتن تیایدا)،چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەكەم/*** هەموو شێوەیەكی بەكارهێنانیان حەرامە،بە بەڵگەی كۆدەنگی زانایان لەسەری.

دووەم: حەرام نیە،بە بەڵگەی:

لە دەقەكەدا تەنها خواردن وخواردنەوە باسكراوە، وەك ئەوان سەیركردنی بەكارهێنانەكانی تر مەرجی قیاس وەكیەكی تیانیە.صەنعانیش ئەم ڕایەی پەسەندكردوە لە بەر ئەوەی:

أ.لەدەقەكەدا هاتوە.

ب.كۆدەنگی زانایان بەدینەهاتوە لێرەدا.

**باسی حەوتەم/** ئایا كانزا بەنرخەكانی وەك یاقوت وگەوهەرو (ئەڵماس)،وەك ئەوان حەرامن؟ جیاوازی ڕا هەیە لە بارەیەوە،دیارترینی ئەو ڕایەش ئەوەیەكە: دروستە و وەك ئاڵتون وزیو حەرام نین،لەبەر نەبونی بەڵگەی حەرامبونیان.

**الحَدِيثُ ٥// عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ،أَفَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ؟ قَالَ: لا تَأْكُلُوا فِيهَا إِلَّا أَنْ لَا تَجِدُوا غَيْرَهَا،فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فِيهَا..**

وورتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەناو كۆمەڵێكی -اهلی كتاب-خاوەن نامەكانداین،لەناو قاپ وقاچاخەكانیان بخۆین؟ فەرموی: تیایدا مەخۆن مەگەر هیترتان دەستنەكەوێت،بەڵام قاپەكانیان بشۆن پاشان تیایدا بخۆن.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** بوخاری وموسلیم یەكڕان لەگێڕانەوەیدا. صحیح البخاري ،كتاب الذبائح والصيد

باب صيد القوس (٥١٦٦) .صحيح مسلم ،كتاب الصيد والذبائح وما يؤكل من الحيوان ، باب الصيد بالكلاب المعلمة (٣٦٦١).

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** قاپ و قاچاخی خاوەن نامە ئاسمانیەكان پیسە،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكە.

**باسی دووەم/** لەبارەی هۆی پیسبونی قاپ وقاچاخەكانیان،دوورا هەیە:

***رای یەكەم/*** لە بەرپیسی تەڕاییەكەیان،ئەمە ڕای هادەویەو قاسمیەو ناصر ومالكە،بە بەڵگەی:

ا.تێگەشتنی دیاری ئایەتی:﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾{ التوبة: ٢٨} كتابیش (مُشْرِكْ)ن هاوەڵ بۆ خواپەیدا ئەكەن،چونكە ئەڵێن:﴿الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ﴾ {التَّوْبَة: ٣٠} عیسا كوڕی خوایە،وە ﴿عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ﴾ {التَّوْبَة:٣٠} عوزەیر كوڕی خوایە.

بەڵام وەڵامی ئەم ڕایە دراوەتەوە كە: النَّجَسْ پیسی لە زمانەوانیدا واتە: قێزەون كە لە مانا شەرعیەكە فراوانترە. ووتراویشە : خاوەنی پیسین،چونكە شرك یان هەیە، كەوەك پیسیە،خۆیان پاك ناكەنەوە، لەپیسیش خۆیان ناپارێزن وبەریان ئەكەوێت.

بەڵگەش بۆ دروستی خاوەنی ئەم وەڵامەش ئەوەیە:

خوای گەورە ژنانی خاوەن نامەكانی حەڵاڵ كردوە،دیارە مێردەكانیان لەكاتی خەوتن لەگەڵیاندا عارەقی ژنەكانیان بەرئەكەوێ،لە گەڵ ئەوەشدا بۆ خۆشۆردن لەجوتبون لەگەڵیاندا، هەمان خۆشۆردنە بە هۆی جوتبون لەگەڵ ئافرەتی موسڵماندا.

ب.فەرمودەی باسلێكراوو. لە ڕای دوەمدا وەڵامی ئەم فەرمودەیەو مەبەست لێی، باسكراوە.

دووەم: لەبەرپیسیان نیە،بەڵكو تەنها بۆ خۆپاراستن لێیانە،ئەمەیان ڕای جمهورە. بە بەڵگەی:

ا.گەر پیس بوایە،مەرجی نەبونی قاپی پاك دانەئەنرا بۆ بەكارهێنانی، چونكە پیسبویەك دوای لابردنی پیسیەكەی وەك ئەوەیە پیس نەبوبێت.
ب.بۆ رێگرتن لە چونە ناو حەرامەوە.(سد الذرائع).
ج.ئەو خواردنە پیسە كە تیایدا لێی ئەنێن نەك تەرایییەكەیان،وەك لە گێرانەوەی ابوداود واحمد باسكراوە: ئێمە دراوسێی خاوەن نامەكانین، ئەوانیش لە قابلەمەكانیاندا بەراز لێ ئەنێن ولە پەرداخەكانیان ئارەق ئەخۆنەوە،پێغەمبەریش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموی: گەر جگە لەوانتان دەستكەوت تیایدا بخۆن.[1]
فەرمودە باسلێكراوەكە مُطلَق ە ،وئەم فەرمودەیەش بەستویەتەوە بە قاپێك ئەوانەی سەرەوەی تیا لێنرابێت وبخورێتەوە. بۆیە تەرایییەكەشیان پاكە،بەرای المؤید بالله وشافیعی و جمهور،صەنعانیش ئەڵێت: ئەمەرای دروستە. بە بەڵگەی:
ا.ئایەتی ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ﴾ {المائدَة:٥} .خواردنی خاوەن نامە ئاسمانیەكان حەڵاڵە بۆتان ، خواردنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە.
ب.دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دۆلكەی ئافرەتێكی هاوبەش پەیداكەر[2].بوخاری وموسلیم گێراویانەتەوە.
ج.فەرمودەی جابر لای احمد وابی داود: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوین لەشەرەكاندا وقاپ وقاچاخ ودۆلكەی بێباوەرانمان دەست ئەكەوت، ئەویش رەخنەی لێ نەئەگرتین.[3]

---

[1] إنَّا نُجاوِرُ أهلَ الكتابِ،وَهُمْ يَطبَخونَ في قُدورِهم الخِنْزيرَ،وَيَشْرَبونَ في آنِيَتِهِمَ الخَمْرَ،فَقالَ رَسُولُ الله (صَلَى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ): إنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا ...الحديث .سنن أبي داود ، كتاب الأطعمة،باب الاكل في آنية أهل الكتاب ( ٣٣٦٠ ).
[2] وُضوءُ الرَسولِ صَلَى اللهُ عَلَيه وَسَلَمَ منْ مَزادَةِ إمرَأة مُشركَة. مُتَفَقٌ عَلَيْه.البخاري (التيمم) ومسلم(المساجد).
[3] كُنَا نَغْزو مَعَ رَسولِ الله (صَلَى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ)،فَنُصيبُ منْ آنيةِ المُشْرِكِينَ وَأَسقِيَتِهِمْ،ولا يَعيبُ ذلكَ عَلَيْنا. سنن أبي داود ، كتاب الأطعمة باب الاكل في آنية أهل الكتاب ( ٣٣٥٩ ).

وەڵـامی ئـەم فەرموودەیـەش دراوەتـەوە کـە باسـی دوای دەستبەسـەراگرتنی ئەکات،کە قسەکە لەو بارەیەوە نیە.

صەنعانی ئەڵێت: بەڵگەکانی تر بری ئەم بەڵگەیە ئەکەون.

د.ئەحمـەد فـەرمودەی انـس ئەگێڕێتـەوە: کەجولەکەیـەك پێغەمبـەری داوەت کرد بۆ نانی جۆو شۆربا،ئەویش لێی خوارد[1].

ه.بەسـتنەوەی ثمامـة بـن اثـال بـە یـەکێك لەکۆڵەکـەکانی مزگەوتەوە،کـە هاوبەش پەیداکەر بوو.[2]

و.لـە کتێبـی البحـردا هـاتوە: گـەر تەڕییەکـەیان حـەرام بوایـە خۆپاراسـتنی هاوەڵـان لێـی ،ئەگەشـت بەدەسـتمان،لە بەرکـەمی موسـڵمانان لـەو کاتـەدا وزۆر بـەکارهێنانیان بـۆ لەبـەرکردن وخـواردن.لـەو حاڵەتانەشـدا گـەر شتێکی وا ڕوبدات بڵاو ئەبێتەوە.

---

[1] أنَّهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: دَعاهُ يَهُودِيٌ إلى خُبْزِ شَعيرٍ وإهالَةٍ سَنخة،فَأَكَلَ مِنها. مسند أحمد بن حنبل - ومن مسند بني هاشم- مسند أنس بن مالك رضي الله تعالى عنه - حديث : ١٢٩٤٥

[2] رَبطُ ثُمامَةَ بنَ أثالٍ وَهُوَ مُشرِكٌ،بِسارِيَةٍ مِنْ سَواري المَسْجِد. صحيح البخاري ،كتاب الصلاة ،أبواب استقبال القبلة ،باب الاغتسال إذا أسلم (٤٥٢).

**الحديث ٦// عَنْ حُمْرانَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ: أنّ عُثْمانَ دَعا بِوَضُوءٍ، فَغَسَلَ كَفَيْهِ ثَلاثَ مَراتٍ، ثم تَمَضْمَضَ، وَاسْتَنْشَقَ ،وَاسْتَنْثَرَ ،ثُمّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثَ مَرّاتٍ ،ثُمّ غَسَلَ يَدَهُ اليُمْنى إلى المَرفقِ ثَلاثَ مَرّاتٍ، ثُمّ اليُسْرى مِثْلَ ذلكَ، ثُمّ مَسَحَ بِرَأسِهِ، ثُمّ غَسَلَ رِجْلَهُ اليُمْنى إلى الكَعْبَيْنِ ثَلاثَ مَرّاتٍ، ثُمّ اليُسْرى مِثْلَ ذلكَ، ثُمّ قالَ:رَأيْتُ رَسُولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ تَوَضّأ نَحْوَ وُضُوئي هذا، فَقالَ رَسُولُ الله : مَنْ تَوَضّأ نَحْوَ وُضُوئي هذا ثُمّ صَلّى رَكْعَتَيْنِ لايُحَدّثُ فيهِما نَفْسهُ غُفِرَ له ما تَقَدّمَ مِنْ ذَنْبِهِ.....**

حومران ئەڵێت: حەزرەتی عوسمان داوای ئاوی دەستنوێژی کرد،وسێ جار ناودەستی شت،وئاوی لەدەم وەرداو،ئاوی لەلوت وەرداو دەریهێنایەوەو،سێ جار دەموچاوی شت ،وسێ جار دەستی ڕاستی بەئانیشکەوە شت و،دەستی چەپیش بەهەمان شێوە،پاشان دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەریدا،وەپاشان قاچی ڕاستی شۆرد بە قولەپێشەوە،پاشان قاچی چەپیشی بەهەمان شێوە،ئینجا فەرموی:پێغەمبەری خوام بینی وەك ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژی گرت. وپاشان فەرموی: کەسێك وەك ئەم دەستنوێژەی من بگرێت وپاشان دوو ڕکات نوێژ بکات تیایدا خەیاڵی نەڕوات،خوا لە تاوانی لەوە پێشی خۆش ئەبێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري ،كتاب الوضوء ،باب الوضوء ثلاثا ثلاثا ( ١٥٧). صحيح مسلم ،كتاب الطهارة ،باب صفة الوضوء وكماله ( ٣٥٨).

**مانای وشەکان//** المَضْمَضَةُ: ئاو وەردان لەدەم ودەرهێنانەوەی. الإسْتِنْشاق: گەیاندنی ئاوو بەناولوت .الإستنثار: دەرهێنانەوەی ئاوەکەلەلوت دوای الاستنشاق.المِرْفَقْ: ئانیشك.

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** ســێ جــار شــۆردنی ناودەســت بــەکۆدەنگی زانایــان وەك نــەوەوی گێڕاویەتەوە،ســوننەتە.ئەمــەش جیایــە لەشــۆردنی دوای هەســتان لەخەو،کــەأبوهریرە ئەیگێڕێتــەوە لەپێغەمبــەرەوە صَــلَّى اللَّــهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ ، کــە فەرمویــەتی: هــەر کــەس لــەئێوە لــە خــەو هەســتا،با دەســتی نەخاتــە نــاو قاپەوە تا سێ جار نەیان شۆرێت،چونکە نازانێت لە کوێدا بون.[1]

بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوەو دەربڕینەکانی لەموسلیمدایە.

خۆ ئەگەر لەخەوهەستاو ویستی دەستنوێژ بگرێت، لەهەردووفەرمودەکەدا بەدەرئەکەوێت کە سێ جار بۆ لەخەو هەستان دەستی ئەشوات و بۆدەستنوێژ گرتنیش بەهەمان شێوە. لەوانەشە یەکێکیان بری هەردوکیان بکەوێت.

**باســـی دووەم/** لەفــەرمودەی عوسمانــدا ژمــارەی ئاولــەدەم وەردان ولــەلوت وەردان وهێنانەدەرەوەی باس نەکراوە،جارێك بوە یان سێ جار؟

بەڵام لەفەرمودەی عەلی دا هاتوە: سێ جار ئاوی لەدەم وەرداو لەلوت وەرداو، بەدەستی چەپی ئاوەکەی هێنایە دەرەوە،پاشان فەرموی: ئەمە دەستنوێژی پێغەمبەری خوایە.[2]

**باسی سێهەم/** لەبارەی ئاو لە دەم وەردان ولە لوت وەردانەوە ،چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەکەم/*** فەرزن لە دەستنوێژدا،بەڕای أحمد وإسحاق وإبن المنذر وهادي،بە بەڵگەی:

أ.لــە فــەرمودەی گێــڕاوەی أبــوداود بــە ئیــسنادێکی دروســت فــەرمانی پێکــراوە، تیایدا هاتوە: زیادەڕۆیی بکە لە ئاولە لوت وەرداندا،مەگەر بەڕۆژو بێت.[3]

---

[1] إذا إسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلا يَغْمِسَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاثاً،فَإِنَّهُ لا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ. صحيح مسلم ،كتاب الطهارة
، باب كراهة غمس المتوضئ وغيره يده المشكوك في نجاستها في الإناء ( ٤٤٢ ).

[2] في حَدِيثِ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ :أَنَّهُ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَنَثَرَ بِيَدِهِ الْيُسْرى،فَعَلَ هذا ثَلاثاً،ثُمَّ قَالَ: هذا طَهُورُ نَبِيِّ اللَّهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ). صححه الألباني في صحيح أبي داود( ١١١ ).

[3] وَبَالِغْ فِي الإِسْتِنْشَاقِ إِلا أَنْ تَكُونَ صَائِماً.أخرجه الأربعة وصححه ابن خزيمة.وصححه الألباني في صحيح أبي داود( ١٤٢ )

ب.لەفەرمودەی أبوداودو خەڵكی تریش بەإسنادیكی دروست فەرمانی پێكراوە: گەر دەستنوێژت گرت ئاو لە لوتت وەردە.[1]

ج.فەرمودەی أبوهریرە: پێغەمبەری خوا فەرمانی بە ئاو لەدەم وەردان ولەلوت وەردان كردوە.[2] دارقطنيْ گێڕاویەتەوە.

د.بەردەوامبونی پێغەمبەری خوا لەشۆردنیان لەهەموو دەستنوێژ گرتنێكیدا.

هـ.تەواوكاری شۆردنی دەموچاوە.كەواتە فەرمانكردن بەشۆردنی دەموچاو ئەوانیش ئەگرێتەوە.

دووەم: سوننەتن لەدەستنوێژدا،بەڕای مالك وشافعي وأوزاعي وليث وزوهری،بەبەڵگەی:

فەرمودەی أبوداود ودارقطني،كەتیایدا هاتوە: نوێژی هیچ كام لە ئێوە تەواو نابێت،هەتا وەك ئەوەی خوا ی گەورە فەرمانی پێكردوە دەستنوێژ نەگرێت: دەم وچاوو هەردوو دەستەكانی بە ئانیشكەوە بشوات،وە مەسحی سەری بكات،وقاچەكانیشی بەقولەپێكانیشەوە بشوات[3].

لەم فەرمودەیەدا ئاولەدەم وەردان ولەلوت وەردان باسنەكراوە،تەنها فەرزەكان باسكراوە،كەبێ ئەوانەخوای گەورە نوێژەكە وەرناگرێت،كەواتە فەرمانپێكردنی فەرمودەی (وَبالِغْ) بەسوننەت دائەنرێت.

سێهەم: لە لەشپیسیدا فەرزن ولەدەستنوێژگرتندا سوننەتن،بەڕای ابوحنيفە وهاوەڵانی وثەوري وزيد بن علی،بە بەڵگەی فەرمودەی: دە

---

[1] إذا تَوَضَّأتَ فَمَضْمِضْ. صححه الالباني في صحيح أبي داود( ١٤٤ ).

[2] أمَرَ رَسُولُ الله ( صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ ) بِالْمَضْمَضَةِ وَالإِسْتِنْشَاقِ. سنن الدارقطني ،كتاب الطهارة ،باب ما روي في المضمضة والاستنشاق في غسل الجنابة ( ٣٦١ ).

[3] أنَّهُ لاتَتَمُّ صَلاةُ أَحَدِكُمْ حَتَى يُسْبِغَ الوُضُوءَ كَما أَمَرَهُ الله تَعالى،فَيَغْسلُ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إلى المِرْفَقَيْنِ ،وَيَمْسَحُ بِرَأْسِهِ وَرِجْلَيْهِ إلى الكَعْبَيْنِ. سنن أبي داود،كتاب الصلاة ،أبواب تفريع استفتاح الصلاة ،باب صلاة من لا يقيم صلبه في الركوع والسجود،( ٧٣٩ ).

کـردار لەسـوننەتی پێغەمبـەرانن.[1] بـەڵام إبـن حجـر ئـەڵێت: ئـەم فەرمودەیـە بـەم وشـەیە نـەهاتوە بـەڵکو(مِـنَ الفِطْـرَةِ) هـاتوە.ئەگـەر ئـەو وشـەیەش ڕاسـت بێـت، نابێتـە بەڵگـەی فەرزنەبون،چـونکە سـوننەت لـەو فەرمودەیـەدا واتـە ڕێگا، نەك بەمانا زاراوەکەی لای زانایانی أصول الفقه.

**<u>باسـی چـوارەم/</u>** فـەرمودەی: ثُـمَّ غَـسَلَ وَجْهَـهُ ثَـلاثَ مَـرَّاتٍ،ثُمَّ غَـسَلَ يَـدَهُ اليُمْنَـى. ڕونکرنەوەیـە بـۆ ئایـەتی:﴿فاغْـسِلُواْ وُجُـوهَكُمْ وَأَيْـدِيَكُمْ إِلَـى الْمَرَافِقِ﴾{المائدة:٦} وە لای ڕاستیش پێش ئەخرێت.

**<u>باسـی پێنجـەم/</u>** لـەبارەی مانـای وشـەی (إلى) لەفـەرمودەی (إلى المِرْفَـق) لەفەرمودە باسلێکراوەکەدا،چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەکـەم/*** بـۆ کۆتـایی هاتنە،کـە لـە بناغـەدا بـۆ ئـەو مانایەیە،بـەڕای زفـر وأبوبکر بن داود الظاهري.

دووەم: بـەمانای (لەگـەڵ) ئەگەیەنێت،واتـە: ئانیـشکیش ئەچـێتە حـوکمی شۆردنەوە،بەڕای جمهور. فەرمودەکانیش ئەم مانایە دەرئەخەن:

أ.فـەرمودەی جـابر:پێغەمبـەری خـوا ئـاوی بەسـەر هـەردوو ئانیـشکەکەیدا ئەچۆڕانەوە.گێڕانەوەی دارقطني بەئیسنادێکی لاواز.[2]

ب.لـە فـەرمودەی شـێوە دەسـتنوێژگرتنی عوسمانـدا هـاتوە: هـەردوو دەسـتی تـا ئانیـشکی شـۆرد تـا ئـەملاولای قۆڵیـشی تـەڕکرد.[1] دارقطـني بـە ئیسنادێکی باش گێڕاویەتەوە.

---

[1] عَشْرٌ مِنْ سُنَنِ الْمُرْسَلِينَ. عن عائشة ، قالت : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " عشر من الفطرة : قص الشارب ، وإعفاء اللحية ، والسواك ، واستنشاق الماء ، وقص الأظفار ، وغسل البراجم ، ونتف الإبط ، وحلق العانة ، وانتقاص الماء " قال زكريا : قال مصعب : ونسيت العاشرة إلا أن تكون المضمضة. صحيح مسلم ، كتاب الطهارة ،باب خصال الفطرة (٤١٠).

[2] بەڵام الباني ئەم فەرمودەیەی بە صحیح داناوە.السلسلة الصحيحة(٢٠٦٧) ،حَدِيثُ جَابِرٍ: كَانَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُدِيرُ المَاءَ عَلَى مِرْفَقَيْهِ.

ج.لــه فــەرمودەى وائــل بــن حجــر لەچــۆنيەتى دەســتنوێژگرتنيدا: هەردووقۆڵى شت تا ئانيشكەكانى تێپەڕاند.[2] بەزار وگبرانى.

د.فــەرمودەى ثعلبــة بــن عبــاد لەباوكيــەوە: هــەردوو دەســتەكانى شــۆرد تائاو لەئانيشكەكانيەوە ئەچۆڕايەوە.[3]

ه.فــەرمودەى ابــوهريرە: كــە دەســتنوێژى گــرت و گەشــتە لاى باڵى،پاشــان وتــى: بــەم شــێوە پێغەمبــەرى خــوام بينيــوە(دەســتنوێژى گرتــوە)[4].موســليم گێڕاويەتەوە.

ئەم فەرمودانە يەكترى بەهێز ئەكەن.

إسـحاق بـن راهويـە ئـەڵێت: (إلى)لـە ئايەتەكـەدا مانـاى تـاكو ئـەو شـوێنە،وە مانـاى لەگـەڵ ئەوشوێنەشـدا ئەگەيەنێت،بـەڵام سـوننەتى پێغەمبـەر مانـاى دوەمى بۆ دياريكردوە.

شـافيعى ئـەڵێت: نـابينم جيـاوازى ڕا هـەبێت لـەبارەى فـەرز بـونى شـۆردنى ئانيشكەكان لەدەستنوێژدا.

زومخـــشەرى ش دەفـــەرموێت: وشـــەى(إلى) مانـــاى هـــەتا ئـــەو شـــوێنە ئەگەيەنێت،بەڵگـە ديـارى ئـەكات ئەوشـوێنەش حوكمەكـە ئەيگرێتـەوە يـان نـا.چـەند نمونەيـەكيش دێنێتـەوە لـەو بارەيـەوە.لێرەشـدا بەڵگـە هەيـە لەسەر داخڵ بونى ئانيشك لە شۆردندا.

---

[1] في حَديثِ صِفةِ وضوءِ عُثْمانَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ: أنَهُ غَسَلَ يَدَيْهِ إلى المِرْفَقَيْنِ حَتَى مَسَحَ أطْرافَ العَضُدَيْنِ. سنن الدارقطني ، كتاب الطهارة
باب وضوء رسول الله صلى الله عليه وسلم -

[2] في حَديثِ وائلِ بنِ حُجْر في صِفَةِ الوُضوءِ: وَغَسَلَ ذِراعَيْهِ حَتّى جاوَزَ المَرافِقَ.

[3] ثُمّ غَسَلَ ذِراعَيْهِ حَتّى سالَ الماءُ عَلى مِرْفَقَيْهِ.

[4] أنَهُ تَوَضَأَ حَتّى أشْرَعَ في العَضُدِ،ثُمّ قالَ: هكَذا رَأيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.رواه مسلم. صحيح مسلم ، كتاب الطهارة، باب استحباب إطالة الغرة والتحجيل في الوضوء ( ٢٨٨ ).

**باسی شەشەم/** فەرمودەی (ثُمّ مَسَحَ ) گونجاوە لەگەڵ ئایەتی﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ﴾ {المائدة:٦} لەهێنانی پیتی باءدا.(مسح)ئەتوانرێت پیتی بِ لەگەڵ بێت،یا بێ بِ بێت،قرطبی ئەڵێت: بِ لێرەدا بۆ تێپەڕاندنە(التعدی) ئەتوانرێ لابرێت یا بهێڵرێتەوە.

وتراویشە:)بِ) لێرەدا مانایەك ئەگەیەنێت،ئەویش ئەوەیە کە شۆردن لەزمانەوانیدا بونی شۆردراوێك پێویست ئەکات،بەڵام مسح کردن مەرج نیە مسح کراوێکی لەگەڵ بێت.

گەر بیوتایە: إمْسَحوا رُؤسَكُمْ،دەستهێنان بەسەرسەردا بێئاویش ئەبوو، وەك ئەوەیە بڵێت: بەئاوسەرتان تەڕ بکەن،لەبابی قلب هەڵگێڕانەوەیە،بناغە وایە بوترێت: فامسحوا بالماء رؤوسكم.

زانایان یەکدەنگن لەباشی مەسح کردنی هەموو سەر،وەك ئەوەی ئەفەرموێت.

**باسی حەوتەم/** لە بارەی فەرزبونی مسح کردنی هەمووسەر یا هەندێکی: دوو ڕا هەیە،چونکە ئایەتەکە مانای گرتنە خۆی هەمووسەر یا هەندێکی تیا نیە.

***ڕای یەکەم/*** مەسحکردنی هەموو سەر فەرزە،بەڕای مالك والمزنی گێڕانەوەیەکی أحمد وإبن علیه وزۆربەی العترە،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودەی عبداللە بن زید:پێغەمبەری خوا بەهەردوو دەستی مەسحی سەری کرد،پێش و دوای سەری پێکرد،لەپێشەسەرەوە دەستی پێکرد وبردی بۆئەملا ولای سەری وپاشان گەڕانیەوە بۆ ئەو شوێنەی دەستی پێکرد بوو.[1] جماعە ئەیگێڕنەوە.

ب.فەرمودەی طلحة بن مصرف: مەسحی سەری کرد تاگەشتە پشتەسەر.[2] أحمد وأبوداود ئەیگێڕنەوە.

---

[1] أَنّ رَسولَ الله ( صَلّى اللهُ عَلَيه وَسَلّمَ ): مَسَحَ رَأسَهُ بِيَدَيه،فَأَقْبَلَ بِهِما وَأَدْبَرَ: بَدَأَ بِمَقْدَمِ رَأسِه ثُمّ ذَهبَ بِهِما إلى قَفاهُ،ثُمّ رَدّهُما إلى المَكانِ الذي بَدأَ مِنْهُ.البخاري في الوضوء،ومسلم في الطهارة.

[2] أَنَّهُ مَسَحَ رَأْسَهُ حَتَّى بَلَغَ الْقَذَالَ. سنن أبي داود،كتاب الطهارة،باب صفة وضوء النبي صلى الله عليه وسلم ( ١١٥ ).

وەڵامی ئەم رایەش وا ئەدرێتەوە: کەئەنجامدانی کارێك بەتەنها مانای فەرزبون ناگەیەنێت،لەبارەی فەرمودەکەی طلحه ش قسه هەیە.

ج.ئایەتی﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ﴾ {المائدة:٦}. سەر، لەمانا حەقیقەکەیدا هەموو سەر ئەگەیەنێت، بەمەجازیش هەندێکی. وەڵامی ئەم قسەیەش ئەوەیە کەپیتی (ب) بۆ (تَبْعيض) ەواتە هەندێك.

د.ئام بۆ ئەم وەڵامەش ئەوترێت: بونی (ب) بەمانای هەندێك ڕاست نیە،سیبویه لەکتێبەکەیدا له١٥ شوێندا ئینکاری ئەو مانایە ئەکات.

دووەم: مەسحی هەندێکی سەر بری ئەکەوێت،بەبەڵگەی بونی لەسوننەتدا،سوننەتیش ڕونکەرەوەی یەك لەئەگەرەکانی ئایەتەکەیە.

لەو فەرمودانەش:

١.شافعی مەزهەبەکان لەعطاوە ئەگێڕنەوە: کەپێغەمبەری خوا دەستنوێژی گرت،جەمەدانەکەی لەسەری لابردو،پێشەسەری تەڕکرد[1]. ئەگەر مرسل یش بێت بەمرفوعی لەفەرمودەی انس هاتوە،لەوێشدا ئەگەر کەسێکی نادیار هەبێت،بە فەرمودەی عوسمان لەچۆنیەتی دەستنوێژگرتنیدا هاتوە کە سعید بن منصور ئەیگێڕێتەوە: پێشەسەری تەڕکرد.[2] لەم ڕیوایەتەشدا ڕاویەکی تیایە قسەی لەسەرە.

٢.ئەوەیلە إبن عمرەوە ئەگێڕدرێتەوە: تەنها هەندێك سەری تەڕکردوەو هیچ کام لەهاوەڵان بەنەنگیان نەزانیوە.[3] وەك إبن المنذر وکەسانی تر وتویانە.

ئەوانەی خاوەنی ڕای دووەمن ،لە بارەی دیاریکردنی ئەندازەی تەڕکردنەکە ، ڕای جیاوازیان هەیە:

---

[1] أَنَّ رَسولَ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ تَوَضأَ،فَحَسَرَ العَمامَةَ عنْ رَأسِهِ،وَمَسَحَ مَقْدَمَ رَأسِهِ. معرفة السنن والآثار للبيهقي ،فريضة الوضوء في غسل الوجه (١٦٤).

[2] أنَهُ مَسَحَ مقدمَ رَأسِه.

[3] الثابتُ عن إبنِ عمرَ: الإكْتِفاءُ بِمَسْحِ بَعْضِ الرَّأسِ،وَلَمْ يُنْكِرْ عَليهِ أحَدٌ مِنَ الصَّحابَةِ،كما قال إبنُ المُنْذِرِ وَغَيْرِه.

**یەکەم:** چواریەکی سەر فەرزە،بە ڕای أبو حەنیفە.

دووەم: تەڕکردنی هەندێك سەر بێ دیاریکردن بڕی ئەکەوێت. بەڕای شافیعی و طبري.

سێیەم: تەڕکردنی هەندێك لە پێشی سەر،بەڕای ثوري وئەوزاعی ولیث و أحمد وزید والناصر،بە بەڵگەی:

فەرمودەی ئەنەس:پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی خستە ژێر جەمەدانەکەی وپاشان بێ ئەوەی جەمەدانەکە تێك بدات پێشی سەری تەڕکرد.[1]

چوارەم:پێویستە هەندێك لەسەر تەڕبکرێت وپاشان دەستی تەڕ بەسەر جەمەدانیدا بهێنرێت.بەڕای إبن القیم،بە بەڵگەی فەرمودەی موغیرە:پێغەمبەر دەستنوێژی گرت پێشەسەری جەمەدانەکەی تەڕکرد.[2] موسلم وابوداود ترمذي گێڕاویانەتەوە.

**باسی هەشتەم/** لەبارەی مانای کَعْبْ قولەپێ، چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەکەم/*** ئەو ئێسقانەیە بەرزبۆتەوە لای بە یەکگەشتنی قاچ (قولە پێ).بە ڕای زۆرینە،دیارترین بەڵگەش لە سەری: فەرمودەی نعمان بن بشیرە لەبارەی شێوەی ڕیز بون بۆ نوێژ: هەریەکێك لەئێمە قولەپێی ئەنا بە قولەپێی هاوەڵەکەی.[3]

ڕای دوەم/ ئەو ئێسقانەیە کە لە سەر قاچە وشوێنی بەستنی قەیتانی پێڵاوە.ئەمەش ڕای ئیمامیەو حەنەفیەکانە.

---

[1] أَنَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:أَدْخَلَ يَدَهُ مِنْ تحت العِمَامَةِ ،فَمَسَحَ مُقَدَّمَ رَأْسِهِ وَلَمْ يَنْقُضْ العِمَامَةَ. سنن أبي داود ،كتاب الطهارة ،باب المسح على العمامة ( ١٢٨ ).

[2] أَنَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَوَضَّأَ فَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ وعَلَى العِمَامَةِ.صحيح مسلم ،كتاب الطهارة ،باب المسح على الناصية والعمامة ( ٤٣٨ ).

[3] حَدِيثُ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ فِي صِفَةِ الصَّفِّ فِي الصَّلَاةِ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ مِنَّا يَلْزَقُ كَعْبَهُ بِكَعْبِ صاحِبِهِ. مسند أحمد بن حنبل ، أول مسند الكوفيين ، حديث النعمان بن بشير عن النبي صلى الله عليه وسلم ( ١٨٠٦٨ ).

**الحديث ٧// عنَ عائشةَ رَضيَ اللهُ عنهَا قالتْ: كانَ النَّبيُّ صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ في تَنَعُّلِه وَتَرَجُّلِه وَطُهُورِه وفي شَأنِه كُلِّه.**

پێغەمبەر هەموكات بەكارهێنانی لای ڕاستی لا پەسەندبوو: لە لەپێکردندا لەقژداهێناندا ولەخۆخاوێنکردنەوەدا ولە هەمو کارەکانیدا.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري ،كتاب الوضوء ،باب التيمن في الوضوء والغسل ( ١٦٥) ، صحيح مسلم ، كتاب الطهارة باب التيمن في الطهور وغيره ( ٤٢٢).

**مانای وشەکان//** **التَّيَمُّنْ**:پێشخستنی لای ڕاست. **التَّنَعُّل**:پێڵاو یا نەعل لەپێکردن. **التَّرَجُّل**: قژداهێنان.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** إبن دقيق العيد ئەڵێت: وشەی (**كُلِّهِ**) گشتیە،بەڵام چونە پێشاوو دەرچون لەمزگەوت و هاوشێوەی ئەوانەی لێدەرئەکرێت،چونکە ئەوانە بە لای چەپ ئەنجام ئەدرێن.

وتراوە: دوپاتکردنەوە بە(**كُلِّه**) مانای گشتیەکە ئەهێڵێتەوە،بەمانای هەر ئیشێك بەمەبەست بکرێت بە لای ڕاست ئەنجام ئەدرێت ،ئەوانەش کە بەلای چەپ ئەکرێن بەمەبەست ئەنجام نادرێن،یا وازهێنانن لەکردار.

**باسی دووەم/** باش وایە لەقژداهێنان وشۆردنی وتاشینیدا، بەلای ڕاست دەست پێبکرێت،هەروەها لە دەستنوێژگرتن وخۆشتن وخواردن وخواردنەوەو ئیشی تردا بەلای ڕاست بێت،بەکۆدەنگی زانایان، وەك ئەوەوی هەروەها إبن قدامە لەمغنی دا باسی کردوە. بەبەڵگەی: وشەی (**يُعْجِبُهُ**) لەفەرمودە باسلێکراوەکەدا کەمانای باشێتی ئەگەیەنێت.

**باسی سێیەم/** ئەوەوی ئەڵێت: بناغەی شەرع لەهەموو کاتدا ئەوەیە کە: هەر کارێك مانای ڕێزگرتن وجوانکاری بوو بەڕاست ئەنجام ئەدرێت،پێچەوانەکەشی بەچەپ ئەنجام ئەدرێت.

**الحديث ٨// عنْ عُمَرِبنِ الخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ: ما مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُسْبِغُ الوضوءَ ثُمّ يَقولُ: أَشْهَدُ أَنْ لا إلهَ إلّا اللَّهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنّ مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ، إلاّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوابُ الجَنّةِ الثمانيَةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّها شاءَ..**

**هەرکەسێك لەئێوە دەستنوێژبگرێت بەرێکوپێکی پاشان بڵێت: دانئەنێم بەوەدا کەجگە لە اللە کەسیتر خوانیەو هاوبەشیشی نیە،وەدانئەنێم کە موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایە: هەرهەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆئەکرێتەوە،لەکوێوە ئارەزوی لێیە بچێتە ژورەوە.**

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//**

**صحيح مسلم ،كتاب الطهارة، باب الذكر المستحب عقب الوضوء ( ٢٣٤ ) .**

**وابوداودو إبن ماجه وإبن السنى،لای ترمذي هاتوە:(اللَّهُمَّ إجْعَلْنِي مِنَ التَّوابِينَ وَمِنَ المُتَطَهِّرِينَ) ،خوایە لەتەوبەکاران وخۆپاکراگران بمژمێرە.لای طبرانیش هاتوە:(مَنْ دَعا بِوضوءٍ فَتَوَضَّأَ فَساعَةَ فَرغَ مِنْ وُضوئِهِ يَقولُ: أَشْهَدُ أَنْ لا إلهَ إلّا الله وأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ اللّهُمَّ اجْعَلْني مِنَ التَّوّابِينَ وَاجْعَلْني مِنَ المُتَطهِّرين.) کەسێك دەستنوێژی گرت وکە تەواو بو، ووتی شایەتی ئەدەم لە الله زیاتر کەس شایەنی پەرستن نیە،وە شایەتی ئەدەم موحەمەد بەندەو نێردراوی خوایە،خوایە لەتۆبەکاران وخۆپاکراگران بمژمێرە.**

**لای حاکمیش هاتوە: (مَنْ تَوَضَّأَ فَقالَ: سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إلهَ إلّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إلَيْكَ،كُتِبَ في رقٍ ثُمَّ طُبِعَ بِطابِعٍ فَلا يُكْسَرُ إلى يَوْمِ القِيامَةِ)،کەسێك دەستنوێژی گرتوو وتی: پاکو بێگەردی و بە ستایشی تۆ شایەتی ئەدەم، جگە تۆ کەس شایەنی پەرستن نیە،داوای لیخۆشبون تەوبەوەرگرتن لەتۆ ئەکەم،لەپەڕەیەکدا ئەنوسرێت و مۆرێکی لێ ئەدرێت تا قیامەت ناشکێنرێت.**

**مانـــای وشـــەکان//** فُتِحَـتْ لَـهُ أَبْـوابُ الجَنَّـةِ: دەربڕینەکـە لەشێوەی ڕابـردوەو بـۆ داهاتوه،چـونکە هـاتنی گومـانی تیانیـە . مەبەسـتیش لێـی کردنـەوەی دەرگاکانــە لــە قیامەتدا،هــەر وەکــو ئایەتــەکانی ﴿وَنُفِـخَ فِـي الـصُّورِ﴾ {الکهف:٩٩} {یس:٥١} {الزمر:٦٨} {ق:٢٠}.

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکـــەم/** ئـەم یادکردنەوەیـە(ذکـر)ە دوای دەسـتنوێژە،نەوەوی ئـەڵێت: هاوەڵانمان وتویانە دوای خۆشۆردنیش باشە.

**باســـی دووەم/** زیـاد باسـکردنەکەی ڕیوایـەتی ترمـذي لەئایەتەکەشـدا مانـای هەیـە﴿إِنَّ اللَّـهَ يُحِـبُّ التَّـوَّابِينَ وَيُحِـبُّ الْمُتَطَهِّـرِينَ﴾ {البقـرة:٢٢٢}، لەبــەر ئـــــەوەی تەوبـــــەکردن پاکردنـــــەوەی ناوەوەیـــــە لەخڵتـــــەی تاوانەکان،دەسـتنوێژگرتنیش پاکردنـەوەی دەرەوەیـە لەوپیـسیانەی ئەبنـە ڕێگــر لــەنزیك بونــەوە لەخوا،هــەردوو ماناکــە کۆکراوەتــەوە بــەوەی داوا لـەخواکراوە کەخۆشەویـست بێـت لـەلای و لـەڕیزی خۆشەویـستانی خـۆی بیژمێرێت.

**باســـی ســـێیەم/** نــەوەوی ئــەڵێت:پاڕانــەوەکانی کــاتی دەسـتنوێژ گـرتن هیــچیان لەپێغەمبــەرەوە نەگێردراونــەوەو بناغەیــەکیان نیــە،وزانایانی پێـشوش باسـیان نـەکردوە،ابن الـصلاح یـش ئـەڵێت: فـەرمودەی ڕاسـت لەبارەیەوە نیە.

**الحَـدِيثُ ٩// عَـنِ المُغِيرَةِ بـنِ شُعْبَةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِـيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَتَوَضَّـأَ، فَأَهْوَيْتُ لِـأَنْزِعَ خُفَّيْـهِ، فَقَالَ: دَعْهُمَا، فَـإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَـا طَاهِرَتَيْنِ، فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا...**

لەگـەڵ پێغەمبـەر بـوم ودەسـتنوێژی گرت،دانەویمـەوە تـا خوففەكـەی لەپێداكەنم،فـەرموی: وازیـان لێبهێنە،بـە پـاكی كردومنەتـە پێم،پاشـان دەستی تەڕی بەسەرداهێنان.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەكـە//** متفق عليه. صحيح البخاري ،كتاب الوضوء، باب إذا أدخل رجليه وهما طاهرتان (٢٠٢). صحيح مسلم ،كتاب الطهارة،باب المسح على الخفين (٤٣٤).

**مانـای وشـەكان//** **الخُـفّ**: لەچـەرم دروسـت ئـەكرێت وتـا قولـەپێكان دائەپۆشـێت.**الجُرْمُـوق**: خفێكـی گەورەیـە بەسـەر خفێكـی بـچوكدا لـەپێ ئەكرێت.**الجَوْرَبْ**: گۆرەوی،لەجرموق گەورەترە وقولەپێكان دائەپوشێ.

**تَوَضَّـأَ**: دەسـتی بەدەسـتنوێژگرتن كرد،نـەك تـەواوی كـرد،وەك لەهەنـدێك گێڕانـەوەی تـردا هـاتوە(سـێ جـار ئـاوی لـەدەم ولـوتی وەردا) (پاشـان سەری تەڕكرد).**أَهْوَيْتُ**: دەستم درێژكرد،یان ویستم دانەومەوە.

**طـاهِرَتَيْنِ**: بـەپاكی لـەپێم كـردون. وەك لـە ڕیوایـەتی أبـوداود هـاتوە:(**فَـإِنِّي أَدْخَلْتُ الْقَدَمَيْنِ الْخُفَّيْنِ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ**).

**سەرباسەكان//**

**باسـی یەكـەم/** هـۆی دانەوینەوەكـەی لەفەرمودەكـەدا: **فَأَهْوَيْـتُ لِـأَنْزِعَ خُفَّيْـهِ**، بریتیە لە:

١.لەوانەیە نەیزانیبێت دەستهێنانی تەڕ بەخوفدا دروستە.

٢.یـا زانیویەتی،بـەڵام بەلایـەوە وابـوە كەپێغەمبـەر **صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ** چاكترینیان ئەكات كە شۆردنیەتی.

٣.یـا وای زانیـوە مـەرجی مەسـح كردنەكـە بـەدی نەهاتوە،ئـەم هۆیـەیان نزیكترە،بەبەڵگەی فەرمودەكە: **دَعْهُمَا**،وازیان لێبێنە.

**باســـــی دووەم/** دەســـتهێنانی تــەڕ بەســـەر خۆفـــدا لـــە ســـەفەردا دروستە،بەبەڵگەی:

أ.فـــەرمودەی باســـلێکراو، بەئاشـــکرادیارە،مغیرە لەســـەفەردا بـــوە لەگـــەڵ پێغەمبـــەردا،وەك لەبخاریـــدا هـــاتوە،لای مالـــك وأبـــوداود ســـەفەرەکەش دیـاریکراوە کـە جـەنگی تەبوکە،نوێژەکـەش دیـاریکراوە کەنوێـژی بـەیانی بوە.

ب.لـە علـی گێڕدراوەتـەوە:(پێغەمبـەری خـوا سـێ ڕۆژی بەشـەوەکانیانەوە بۆمـسافرو، شــەو ڕۆژێکــی بــۆ نیــشتەجێ دیاریکردوە،تــاکو دەســتی تــەڕ بێنن بەسەر خۆفدا).[1] موسلم وأبوداودو ترمذي وإبن حبان ئەیگێڕنەوە.

ج.أبـــوبکرە لەپێغەمبـــەرەوە ئەگێڕێتـــەوە:(ســـێ ڕۆژی بەشـــەوەکانیەوە، بۆنیـــشتەجێش ڕۆژوشـــەوێکی،بەمۆڵەت داناوە،ئەگـــەر دەســـتنوێژی گـــرت لـــەپێیان بکـــات وپاشـــان مەســـحیان بکـــات )[2]. دارقطـــني گێراویەتـــەوە،إبن خزیمەو خطابي وشافعی ش بەصحیحیان داناوە.

**باســـی ســـێیەم/** لـەکاتی نیـشتەجێبوندا مەسـح ی خـۆف دروسـتە،بە بەڵگەی: فەرمودەی پێشوتری علی وأبی بەکەرە.

**باسی چوارەم/** لەبارەی حوکمی مسح بەسەر خۆفدا ، دوو ڕاهەیە:

***ڕای یەکـــەم/*** دروســتە،بەڕای علــی وســعد بــن أبــی وقــاص وبــلال ....وە ڕای ابوحنیفەو شافیعیشی لەسەرە،بە بەڵگەی:

١.فــەرمودەکانی پێــشوو،فەرمودەی تــریش..إبــن عبــدالبر ئــەڵێت: نزیکــەی چل کەس لەهاوەڵان، مسح لەسەر خۆف پێغەمبەریان گێراوەتەوە.

---

[1] جَعَلَ رَسولُ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ ثَلاثَةَ أَيَامٍ ولَيالِيَهُنَ لِلمُسافِرِ،ويَوْماً وَلَيْلَةً لِلمُقيمِ،يعني في المَسْحِ عَلى الخُفَيْنِ. ). صحيح مسلم ،كتاب الطهارة ،باب التوقيت في المسح على الخفين ( ٤٤٠ ).

[2] أَنَهُ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ: رَخَصَ لِلمُسافِرِ ثَلاثَةَ أَيَامٍ وَلَيالِيَهُنَ،وَلِلمُقيمِ يَوما وَلَيلَةً،إذا تَطَهَرَ فَلَبِسَ خُفَيهِ أَنْ يَمْسَحَ عَلَيهِمَا.رواه ابن خزيمة في صحيحه( ١٩٢ )،والطحاوي في شرح المعاني١/٥٠،وقال عنه الألباني في السلسلة الصحيحة( ٣٤٥٥ ):صحيح لغيره.

٢.لەئایەتی مائدەدا﴿وَأَرْجُلَكُمْ﴾خوێنراوەتەوە،بەجەری پیتی لام،کەمانای عطفە لەسەر(رُؤُوسِكُمْ) واتە: مەسحی سەرو قاچتان بکەن.کەواتە مانای مەسحی قاچ ئەوە یە کەخۆی لەپێدا بێت،وەك لەسوننەدا ڕونکراوەتەوە،کەواتە مەسحی خوف بە قورئان وسوننەت جێگیر بوە،ئەمەش باشترین لێکدانەوەی ئەم قرائەتەیە.

دووەم: دروست نیە،کەلەهادویەو عترە وإمامیە وخوارج وأبوبکر الظاهري ئەگێڕنەوە،بەڵگەشیان:

١.ئایەتی﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾ تەنها شۆردنی قاچەکانی باسکردوە،فەرمودەکانیش کەباسی مسح ئەکات بەم ئایەتە نسخ بۆتەوە، بە بەڵگەی وتەی علی: حوکمەکەی قورئان پێش مەسحی خوف کەوت.[1] وە وتەی إبن عباس:پێغەمبەر دوای دابەزینی ئەم ئایەتە مەسحی نەکردوە.[2]

بەڵام وەڵامی ئەم بەڵگانە دراوەتەوە بە:

أ.ئایەتی دەستنوێژگرتن لەجەنگی (مريسيع) دا دابەزیوە،پێغەمبەریش لەجەنگی تەبوکدا (کەلەدوای ئەو ڕویدا) مەسحی کرد،چۆن دەقی پێشوو ئەوی دواتر نسخ ئەکات؟

ب.لەفەرمودەی جريرالبجلی دا هاتوە،کاتێك مەسح کردنی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە،پێیان وتوە: دوای دابەزینی ئایەتی مائدە بوە یا لەپێشتر؟ ئەویش وتی: من لە دوای ئایەتی مائدە موسڵمان نەبوم؟[3] فەرمودەکەش ڕاستە.

---

[1] سَبَقَ الكتابُ الخُفَّيْنِ. مصنف ابن أبي شيبة ،كتاب الطهارات ،من كان لا يرى المسح (١٩٢٩).

[2] ما مَسَحَ رَسولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ المائدَةِ. مسند أحمد بن حنبل - ومن مسند بني هاشم، مسند عبد الله بن العباس بن عبد المطلب (٢٨٦٠).

[3] أَنَّهُ (رَضيَ الله عَنْهُ) لَمَا رَوى أَنَّهُ رَأى رَسولَ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ عَلى خُفَّيْهِ ،قيلَ لَهُ: هَلْ كانَ ذلكَ قَبْلَ المائدَةِ أَمْ بَعْدَها؟ قالَ: وَهَلْ أَسْلَمْتُ إِلَّا بَعْدَ المائدَةِ؟ المعجم الكبير للطبراني ،باب الجيم باب من اسمه جابر،عبد الملك بن عمير (٢٣٩٨).

ج.ئەگــەر ئايــەتی مائــدە درەنگتريــش دابەزيبێت،هــەر دژايــەتی مــسح وشـۆردنەكە نيە،چـونكە ئايەتەكـە مطلقـةو بـە فـەرمودەكان تقييـد كراوە،يـا گشتيەو بەفەرمودەكان تايبەت كراوە.

د.فەرمودەكـەی علـی هـەروها إبـن عبـاس مُنْقَطِـعْ ن(جۆريكـە لەفـەرمودەی لاوان)،هــەروەها پێــچەوانەی رای ئــەو دوو هاوەڵەيــە لــە فتوادانيــان بــە مەسحكردن،فەرمودەكەشــيان دژە لەگــەڵ فەرمودەيــەكی بــەهێزتر لــەخۆيان (كەفەرمودەكەی جرير البجلی).

٢.لە عائشەوە گێردراوەتەوە:هەردووقاچم ببڕمەوە پێم خۆشترە تامسحيان بكەم.[1]

وەڵــام دراوەتەوە،كــە لەڕوايەتەكــەدا محمــد بــن مهــاجر هەيــە،إبن حبــان لــە بارەيەوە ئەڵێت: فەرمودە هەڵئەبەستێت.

٣.فەرمودەكانی فێركردنی دەستنوێژ كە قاچ شۆردنی تيا دياريكراوە.

وەڵــام دراوەتەوە،كەلــەم فەرمودانــە بەرچــاوناكەوێت پێــچەوانەی مــسح بێت،چونكە هەمويان بۆ كەسێكە خۆف لەپێ نەبێت.

<u>باسی پێنجەم/</u> ئەوانەی بەدروستی دائەنێن،دوو مەرجی بۆ دائەنێن:

يەكــــەم: لەفەرمودەكــــەدا ئامــــاژەی پێكراوە،لــــەپێكردنيان لەكاتێكــــدا هــەردوو قــاچ پاكە،واتــە بەتــەواوەتی دەســتنوێژ بگرێــت، پاشــان لــەپێيان بكات،ئەگەر دەستنوێژی شكا،لەقاچ شۆردندا تەنها مەسحيان ئەكات.

وتراويشە: لەوانەيە مانای پاكبون لەپيسی بگەيەنێت،بەڕای داود.

دووەم: لــەناوی خۆفەكــەوە وەرئەگيرێت،كەئــەبێت داپۆشــەرو بــەهێزو ئاونــەدزێت،كونيش نەبێت،مەســح بەســەرخۆفيكدا ناكرێــت قولــەپێ دانەپۆشـێت،يا دڕاو بێـت وقاچـی لێـوە دياربێـت، يـادوراو بێـت وئـاوی لـێ بێتە ناوقاچ،يا زەوت كرابێت،چونكە پێويستە دابكەندرێت.

---

[1] لَئِنْ أَقْطَعُ رِجْلَيَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَمْسَحَ عَلَيْهِمَا. مصنف ابن أبي شيبة ،كتاب الطهارات ،من كان لا يرى المسح ( ١٩٢٧ ).

**الحَـديث ١٠// ١.عَـنْ أبـي هُرَيْـرَةَ رَضـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قـالَ: قـالَ رَسُـولُ الله صَـلَى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ: إسْتَنْزِهُوا منَ البَوْلِ،فَإنّ عامّةَ عَذابِ القَبْرِ منْهُ.**

خۆتان بەدوربگرن لەمیز ،چونکە زۆربەی سزای گۆڕ بەهۆی ئەوەوەیە.

**٢.مَرَالنَبِـيُ صَـلَى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ بِقَبْـرَيْنِ يُعَـذّبانِ،ثُمّ أخْبَـرَ أنّ عَـذابَ أحَـدِهما لِانَـهُ كـانَ لا يَـسْتَنْزِهُ مِـنَ البَوْلِ،أوْلِانَـهُ لا يَـسْتَتِرُ مِـنْ بَوْلِه،اولِانَـهُ لا يَـسْتَتِرُ مِـنْ بَوْلِه،أوْلِانَهُ لا يَسْتَبْرِيءُ،أوْلانَهُ لايَتَوَقّاهُ...**

پێغەمبـەری خـوا بـەلای دووگـۆڕی سـزادراودا تێپەری،پاشـان هـەواڵی دا کەسـزای یـەکێکیان بـە هـۆی خـۆ نەپاراسـتنیەتی لـەمیزی،یا لـەکاتی میزکردنـدا خـۆی داناپۆشـێت، یـاخۆی پاکناکاتـەوە،یا خـۆی لـە پریـشکەی میز بەدور ناگرێت.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** ١. سـنن الـدارقطني،كتاب الطهـارة بـاب نجاسـة البـول والأمـر بـالتنزه منـه والحكـم في بـول مـا يؤكـل ( ٤٠٤). ٢.بوخـاري ،صـحيح مـسلم ،كتـاب الطهـارة، بـاب الـدليل علـى نجـاة البـول والإسـتنزاه منه (٤٧٢).

**مانـــای وشـــەکان//** **إسْـتَنْزِهُوا**: خۆتـان بـە دور بگرن،یـا داوای پـاکی بکـەن. **عامَـةَ الـشيء**: زۆرینەی،زۆربـەی هۆکـاری. **مِنْـهُ**: بـەهۆی بەرکـەوتنی میـزو خۆنەپاراسـتنە لێـی. **لایَـسْتَتِرُ مِـنْ بَوْلِـهِ**: لـەنێوان خـۆی ومیزەکەیـدا بەربەستێك دانانێت تا بەری نەکەوێت.

**سەرباسەکان//**

**باســـــی یەکـــــــەم/** لـەدوو فەرمودەکـەدا فـەرمان کـردن بـەدور کەوتنـەوە لەمیزو،حەرامبونی دەستلێوەدانی وخۆنەپاراستن لێی تیا بەدی ئەکرێت.

**باسی دووەم/** سزای خۆنەپاراستن لەمیز پێش ئەخرێت بۆ ناوگۆڕ (ناگاتە قیامەت).

**باسی سێیەم/** هەردوو فەرمودەکە بەڵگەن بۆ پیسی میز.

**باسی چوارەم/** لەبارەی حوکمی لابردنی پیسیەوە، چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەکـــەم/*** لابردنــی فــەرز نیە،بــە ڕای مالــك. بــۆ فەرمودەکــەش ئــەڵێت: لەوانەیــە ســزاکەی لەبــەر ئــەوە بێت،کــەمیز بەگیانیــدا دێتــەخوارەوەو بــێ دەستنوێژ نوێژ ئەکات،چونکە دەستنوێژ بێ خۆپاکردنەوە لەمیز نابێت.

وەڵــامی مالــك دراوەتەوە،کەئەمــە بەســتنەوەی دەقــە بــە بــێ بەڵگــە،خوای گــەورەش فــەرمانی بــەپاکڕاگرتنی پۆشــاك کــردوە،و نەیبەســتوەتەوە بەدۆخێکی تایبەتەوە.

دووەم: لابردنـــی فـــەرزە مەگەرئەوەنـــدە نـــەبێت کـــە چاوپۆشـــی لێکراوە.ئەمەش ڕای شافعیە،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودەکـــە ســـزادانی تیایـــە لەســـەر خـــۆ نەپاراســـتن لەمیز،هەرەشەکردنیش بەسزادان، بۆ وازهێنان لەفەرزێك ئەبێت.

ب.ئەو فەرمودانەی فەرمان بە خۆپاکردنەوەو بەرد بەکارهێنان.

__باســی پێنجــەم/__ فەرمودەکــە باســی میــزی مــرۆڤ ئەکات،چــونکە (ال)لــەبری مُــضافة،واتــە: عَــنْ بَوْلِــهِ،چــونکە لای بخــاری هــاتوە: (کــانَ لایَــسْتَتْزِهُ عَــنْ بَوْلِهِ)،واتە: خۆی نەئەپاراست لەمیزی خۆی.

کەسێکیش بیبڕێت بەســەر هــەموو میزێکــدا،وەك إبــن حجــر کەهــەمان حــوکم بۆ میزی حوشتریش دائەنێت، ئەوە دەقەکەی لەمانای خۆی لابردوە.

الحَـدِيثُ ١١//عَـنْ عَلـيّ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: كَـانَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ يُقْرِئُنا القُرْآنَ مالَمْ يَكُنْ جُنُباً.

پێغەمبەری خوا بەردەوام قورئانی پێ ئەخوێندین،مەگەر لەشی پیس بوایە.

**گێـــڕەرەوەی فەرموودەکـــە//** مـسند أحمـد بـن حنبـل ، مـسند العـشرة المبـشرين بالجنــة مــسند الخلفــاء الراشــدين ،مــسند علــي بــن أبــي طالــب رضــي الله عنـــه(٦٠٧)، وابـــوداودو نـــسائي وترمـــذي وإبـــن ماجـــة،إبـــن حبـــانیش بەصەحیحی داناوە[1].

**سەرباسەکان//**

لەبارەی قورئانخوێندنی لەشپیسەوە ، چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: دروستە،بەبەڵگەی:

١.بخـــاری لـــە إبـــن عبـــاس ئەگێڕێتـــەوە: قورئـــان خوێنـــدنی بۆلەشـــپیس بەئاسایی داناوە.[2]

٢.فـــەرمودەی إبـــن عبـــاس کـــەبۆلای پێغەمبـــەر بەرزیکردۆتـــەوە: هەرکـــەس لەئێوە چوە لای خێزانی با بڵێت: بسم الله.[3]

وەڵامی ئەمانە دراوەتەوە بە:

ا.کەسێك کە لەو کاتەدا بسم الله ئەڵێت ،مەبەستی قورئان خوێندن نیە.

ب.وتنەکەی پێش پیسبونی لەشی و چونەلای خێزانەکەیەتی.

٣.فـــەرمودەی إبـــن أبـــی شـــیبە: کاتێـــك پێغەمبـــەری خـــوا بـــچوبایە لای خێزانـــی و ڕەحـــەت بوایە،ئەیفـــەرموو: خوایـــە لـــەو ڕزقـــەی ئەمانـــدەیتێ، بەشی شەیتان مەدە.[1]

---

[1] البانی ئەم فەرمودەیەی بە ضعیف داناوە.

[2] أنَّهُ لَمْ يَرَ بِالقِراءَةِ لِلْجُنُبِ بَأساً.

[3] لَوْ أنَّ أحَدَكُمْ إذا أتَى أهْلَهُ ،فَقالَ:بِسْمِ اللهِ. صحيح البخاري ،كتاب الوضوء باب التسمية على كل حال وعند الوقاع (١٤٠).

وەڵامی دراوەتەوە: کەلە پاڕانەوەکەدا بسم الله ی تیانیە.

٤.فەرموودەی عائشە:پێغەمبەر لەهەموو بارێکیدا یادی خوای ئەکرد.[٢]

وەڵامی دراوەتەوە،کە ئەم فەرموودە تایبەت کراوە بەفەرموودە باسلێکراوەکە.

صەنعانی ئەڵێت: ڕای دروست ئەوەیەکە ناگاتەپلەی حەرامبون،بەڵکو لەوانەیە لەکاتی لەشپیسیدا لەبەر کراهە یان هۆکاری تر قورئانی نەخوێندبێت.

دووەم: قورئان خوێندن لەسەرلەشپیس حەرامە،بەڕای قاسم وهادی وشافعی،بەبەڵگەی:

١.فەرموودەی علی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ:پێغەمبەری خوام بینی دەستنوێژی گرت وپاشان هەندێك قورئانی خوێند،پاشان فەرموی: ئەم قورئان خوێندنە بۆ کەسێکە لەشی پیس نەبێت،بەڵام لەشپیس بۆی نیە یەك ئایەتیش بخوێنێت.[٣] هَیْثمي ئەڵێت: سەنەدەکەی باوەڕپێکراوە.

ئەمەش بەڵگەی حەرامبونیەتی،چونکە ڕێگرتنەکە لە بناغەدا بۆ حەرامبونە.

٢.بەمەوقوف لەعەلیەوە گێڕدراوەتەوە: قورئان بخوێنن تا ئەوکاتەی لەشتان پیس نەبوە،گەر لەشتان پیس بوو پیتێکیش مەخوێنن.[٤] دارقُطني گێڕاویەتەوە.

---

[١] أَنَّهُ كانَ إذا غَشى أَهْلَهُ فَأَنْزَلَ قالَ: اللَهُمَّ لا تَجْعَلْ لِلشَّيْطانِ فيما رَزَقْتَني نَصيباً). مصنف ابن أبي شيبة،كتاب النكاح

ما يؤمر به الرجل إذا دخل على أهله ؟ (١٢١٥٣). وهو قول إبن مسعود.

[٢] أَنَّهُ صَلَى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ: كانَ يَذْكُرُ اللهَ عَلى كُلِّ أَحْيانِهِ. صحيح مسلم ، كتاب الحيض باب ذكر الله تعالى في حال الجنابة وغيرها – (٥٨٤).

[٣] رَأَيْتُ رَسولَ الله صَلَى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ تَوَضَأَ ،ثُمَّ قَرَأَ شَيْئاً مِنَ القُرآنِ،ثُمَّ قالَ:هكَذا لِمَنْ لَيْسَ بِجُنُبٍ،فَأَمَا الجُنُبُ فَلا وَلا آيَةَ. مسند أحمد بن حنبل ،مسند العشرة المبشرين بالجنة مسند الخلفاء الراشدين - مسند علي بن أبي طالب رضي الله عنه ( ٨٤٦ ).

[٤] إقْرَؤوا القُرآنَ ما لَمْ تُصِبْ أَحَدَكُمْ جَنابَةٌ،فَإِنْ أَصابَتْهُ فَلا وَلا حَرْفاً.سنن الدارقطني،كتاب الطهارة،باب في النهي للجنب والحائض عن قراءة القران ( ٣٦٧ ).

وەڵام دراوەتەوە: ئەمە مەرفوع نيە ومەوقوفە.

٣.فەرمودە باسلێكراوەكە.وەڵام دراوەتەوە بەوتەی إبن خزيمە: لەم فەرمودەدا ڕێگرى قورئان خوێندنى بۆ لەشپيس تيانيە،چونكە:

ا.فەرمودەكە ڕێگرى تيانيە،بەڵكو باسى حاڵێك ئەكات كە ڕويداوە.

ب.پێغەمبەر ڕونى نەكردوەتەوە كە لە بەر لەشپيسى قورئانى نەخوێندۆتەوە.

٤.فەرمودەی: جگە لەلەشپيسى هيچ شتێك پێغەمبەرى لە قورئان خوێندن دور نەخستۆتەوە.[1] احمد وأصحاب السنن ئەيگێڕنەوە.

وتراوە: ئەم فەرمودەيە لەفەرمودە باسلێكراوەكە ڕاشكاوانەتر حەرامبون ئەگەيەنێت.

وەڵام دراوەتەوە:

ئەم حەرامبونە ڕون نيە،چونكە هەموو وشەكان تەنها باسى وازهێنانى پێغەمبەر ئەكەن لەقورئان خوێندن لە كاتى لەشپيسيدا، وازهێنانيش ناكرێتە بەڵگەی حوكمێكى دياريكراو. بۆ كەراهەتيش ناشێت، جاى(نەخوازەلا) حەرامبون.

[1] لَمْ يَحْجِب النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ يَحْجِزْهُ عَنْ الْقُرْآنِ سِوى الْجَنَابَةِ. المستدرك على الصحيحين للحاكم ،كتاب الأطعمة

حديث : ٧١٤٦

**الحَدِيثُ ١٢// عَنْ عَمَّارِ بنِ يَاسِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَاجَةٍ فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ المَاءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَتَمَرَّغُ الدَّابَّةُ. ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّمَا يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا، ضَرَبَ بِيَدَيْهِ الأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ مَسَحَ الشِّمَالَ عَلَى اليَمِينِ، وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ.**

پێغەمبەری خوا بۆ ئیشێك منی نارد پاشان لەشم پیس بوو،ئاوم دەست نەكەوت،لەخۆڵەكەدا تلامەوە وەك ئاژەڵ، كەهاتمەوە بۆلای وئەوەم بۆ باسكرد،فەرموی: ئەوەندە بەس بوو كە ئاوابكەیت: یەكجار هەردوو دەستی كێشا بە زەویدا،پاشان دەستی ڕاستی هێنا بەسەر چەپی و،وە سەردەست و دەموچاویدا.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** صحيح البخاري ،كتاب التيمم، باب التيمم ضربة (٣٤٣) .صحيح مسلم ، كتاب الحيض باب التيمم ( ٥٧٨).لای بوخاری هاتوە: وَضَرَبَ بِكَفَّيْهِ الأَرْضَ وَنَفَخَ فِيهِمَا،ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ.

**مانای وشەكان//** أَجْنَبْتُ: لەشم پیس بوو. تَمَرَّغْتُ: تلامەوە. أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ: بە دەستەكانت وابكەیت.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** تەیەموم بۆكەسێك لەشی پیس بێت وئاوی دەست نەكەوێت، فەرزە. بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكە.

**باسی دوەم/** عمار قیاس بەكارئەهێنێت،كاتێك ئەبینێت خۆڵ لەبری ئاوە بۆشۆردن،كەواتەپێویستە بەر هەموو لاشە بكەوێت.

پێغەمبەریش چۆنیەتی تێمومی بۆڕونكردەوە كە بری ئاوئەكەوێت،وشێوە دروستەكەی كەفەرزكراوە لەسەری بۆ ڕون كردەوە.

**باسی سێیەم/** لەبارەی ڕیزبەندی (بەدوای یەكهاتنی) لە شۆردنی دەمو چاو وە هەردوو لەپی دەستدا،دوورایەیە:

یەکەم: ڕیزبەندی فەرز نیە،بەڕای ئەوانەی ئەڵێن: تەیەموم یەکجار دەست کێشانە بەزەویدا،بەبەڵگەی: فەرمودەی عمار،پیتی(واو)تیایدا وَظاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ) بەڵگەی ڕیزبەندی نیە،عطف بەواویش لەئایەتەکەدا پێچەوانەی ئەو ڕایە نیە.

بەڵام لەڕیوایەتی بخاریدا (ثُمَّ) هاتوە لەنێوان (وَجْهَهُ ،كَفَّيْنِ) لای ابوداودیش:(ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمالِهِ عَلَى يَمِينِهِ،وَبِيَمِينِهِ عَلَى شِمالِهِ عَلَى الكَفَّيْنِ،ثُمَّ مَسَحَ وَجْهَهُ) لای إسماعیلیش هاتوە: (إِنَّما يَكْفِيكَ أَنْ تَضْرِبَ بِيَدَيْكَ عَلَى الأَرْضِ،ثُمَّ تَنْفُضْهُما،ثُمَّ تَمْسَحَ بِيَمِينِكَ عَلَى شِمالِكَ وَبِشِمالِكَ عَلَى يَمِينِكَ،ثُمَّ تَمْسَحَ عَلَى وَجْهِكَ).

دوەم: ڕیزبەندی واتەپێشخستنی دەم وچاو بەسەر دەستەکاندا ودەستی ڕاست پێش چەپ،فەرزە،بەڕای ئەوانەی پێیان وایە تێموم دوجار کێشانە بەزەویدا.

__باسی چوارەم/__ دەربارەی ژمارەی دەست کێشان بەزەویدا، دووڕا هەیە:

***ڕای یەکەم/*** یەك جار بۆ دەم و چاوو دو دەستەکان،بەڕای کۆمەڵێکی زۆر لەسلف وجمهوری زانایان، بە بەڵگەی:

فەرمودەکەی عمار کەبۆ فێرکردنە،دروسترین فەرمودەشە لەم بوارەدا.

دوەم:پێویستە دوجار بکێشرێت بەسەر زەویدا: جارێك بۆ دەمو چاوو جارێکیش بۆ دەستەکان،ئەمەیان ڕای کۆمەڵێکە لەهاوەڵان ودوای ئەوانیش،وەڕای زانایانی فیقهیشە،بەبەڵگەی:

فــەرمودەی إبــن عمــر کەپێغەمبــەری خــوا فەرمویــەتی: تێمــوم دوو جــار کێشانە بەزەویـدا: یـەکیان بـۆ دەموچـاو، ئـەویتریش بـۆ هـەردوو دەسـت تـا ئەنیشك.دارقطني والحاكم وبيهقي ئەیگێڕنەوە.[1]

وەڵــامی دراوەتەوە،کــە: ئــەم فــەرمودە بەرامبــەر فەرمودەکــەی عمــار ناوەســتێت لەبەهێزیــدا،ڕای دروســتیش دەربــارەی پلەکەیــەوە ئەوەیــە کــە مەوقوفـە (قسـەی هاوەڵەکـە خۆیـەتی نـەك پێغەمبـەر).لەبـەر ئـەوە بەرامبـەر فەرمودەی عمار ناوەستێت کە بۆ فێربونە.

__باســـی پێنجـــەم/__ دەربـارەی بـڕی مەسـحکردنی دەسـتەکان، چـەند ڕایـەك هەیە:

***ڕای یەکـــەم/*** تـەنها لـەپی دەسـت وپـشتی دەسـت مەسـح ئەکرێت،بـەڕای عطاء ومکحول وئەوزاعی واحمدو...بە بەڵگەی:

فەرمودەکـەی عمار،کـەدوای وەفـاتی پێغەمبـەریش عمـار فـەتوای لەسـەر ئەدا،چـــەند ڕوایـــەتێکیش گێڕاوەتـــەوە لـــەعمار کەپێـــچەوانەی ئـــەم ڕایەیە،بەڵام دروسترینیان ئەوەیە لەصەحیحەین دا باسکراوە.

دوەم: هــەردوو دەســت بــە ئانیــشکەکانیانەوە مەسـح ئەکرێن،بـە ڕای علـی وإبـن عمـر وحـسن البـصری ومالـك وأبوحنیفـە...بـە بەڵگـەی: فەرمودەکـەی پێشوی إبن عمر.

وەڵــامی دراوەتەوە،کــە لەصــــەحیحیدا بەرامبــــەر فەرمودەکــــەی عمــــار ڕاناوەستێت.

__باســی شەشــەم/__ ئـەبێت دەسـت بکێـشرێت بـە سـەر خۆڵەکەدا،بـە بەڵگـەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

---

[1] البانی ئەم فەرمودەیەی بە لاواز داناوە. التَّيَمُّمُ ضَرْبَتَانِ: ضَرْبَةٌ لِلْوَجْهِ،وَضَرْبَةٌ لِلْيَدَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ). المستدرك على الصحيحين للحاكم - كتاب الطهارة ( ٥٨٥ )،و سنن الدارقطني ،كتاب الطهارة باب التيمم (٥٩٣ ).

هادەویــە ئــەڵێن: جگــە لەدەستکێــشان بەخۆڵەکانــدا، هیــچی تردروســت نیە،بە بەڵگەی:

ا.فەرمودەکەی عمار.

ب.فەرمودەی إبن عمر: التَّيَمُّمُ ضَرْبَتانِ:

بــەڵام شــافعی ئــەڵێت: ئــەکرێت تــەنها دەســتت بخەیتــە ســەر خۆڵەکە،نــەك بکێــشیت پیایدا،چــونکە لــە ڕیوایــەتێکی تــەیمومی پێغەمبــەردا بەدیوارەکــە هاتوە،کە دەستی لەسەر دیوارەکە داناوە.

**باســی حەوتــەم/** دەربــارەی حــوکمی فــوکردن بــە دەســتە خۆڵاویەکــەدا،دوو ڕا هەیە:

یەکــەم: ســوننەتە،بە بەڵگــەی: فــەرمودەی عمــار لــە بوخاریــدا: هــەردوو دەســتی خــستە ســەر زەوی و،فــوی پێیانــدا کردوو،هێنــای بــە ســەر دەم وچاوو هەردوو دەستیدا.[1]

دوەم: سوننەت نیە.

**باســی هەشــتەم/** لەفەرمودەکانــدا تەیــەموم کــردن بــۆ کەســێکی لەشپیــسە کــەئاوی دەســت نەکــەوێت،ئافرەتی حــەیزدارو زەیــسانیش کەپاکبونــەوە وئاویان دەستنەکەوت،هەمان حوکمیان هەیە.

بەڵام إبن عمرو إبن مسعود پێچەوانەی ئەو ڕایەن.

---

[1] وَضَرَبَ بِكَفَيْهِ الأَرْضَ،نَفَخَ فِيهِما،ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَيْهِ.

**الحَديثُ ١٣//عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا قالَتْ: كانَ رَسُولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ يَأمُرُني فَأتَزِرُ، فَيُباشِرُني وَأنَا حائِضٌ.**

پێغەمبەری خوا فەرمانی پێئەدام خۆم داپۆشم، ئەوجا ئەهاتەلام لەکاتێکدا من لەسوڕی مانگانەدا بووم.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صحيح البخاري ،كتاب الحيض باب مباشرة الحائض ( ٢٩٦ ) وموسليم،لەگێڕانەوەیەکی تریاندا: وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إرْبَهُ كَمَا كانَ رَسُولُ الله يَمْلِكُ إرْبَهُ)،کێ لە ئێوە وەك پێغەمبەری خوا ئەتوانێت خۆی ڕاگرێت.

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** پێغەمبەری خوا پێستی ئەلکاند بەپێستی عائشەی هاوسەریەوە،لەسەرجلەوە. به بەڵگەی: فەرمودەی باسلێکراو.

فەرمودەکە بە ڕاشکاوی لەزەت وەرگرتنی پێغەمبەری تانیە،تەنها لکاندنی پێستی بەپێستی عائشە تیایە.

**باســـی دووەم/** لەبارەی لەزەت وەرگرتن لە نێوان ئەژنۆو ناوکی هاوسەر کە لەکاتی سوڕی مانگانەدا بێت،چەند ڕایەك هەیە:

***ڕای یەکـــەم/*** دروستە،بەڕای عكرمەو مجاهد و..أحمد و هەندێك لەزانایانی شافعی،...صەنعانی ئەڵێت،ئەم ڕایە دروستره، به بەڵگەی:

أ.فەرمودەی انس: تەنها جماع نەبێت،بۆتان هەیە لەوکاتەدا لەگەڵ خێزانەکانتان ڕابوێرن.[1]

ب.فەرمودەی مسروق: هەموو شتێك بکەن (لەگەڵ هاوسەرەکانتان)جگە لە جماع.[2]

---

[1] إصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إلّا النِّكاحَ،أوْ إلّا الجِماعَ. صحيح مسلم ،كتاب الحيض باب جواز غسل الحائض رأس زوجها وترجيله وطهارة سؤرها والاتكاء في ( ٤٨١ ).

[2] كُلَّ شَيْءٍ إلّا الفَرْجَ. شرح معاني الآثار للطحاوي ، كتاب النكاح ،باب الحائض ما يحل لزوجها منها ( ٢٨٢٠ ).

ج.تێگەشتنمان بۆ فەرموده باسلێكراوەكە.

دوەم: باش نیە (مكروهە): بەڕای هەندێك لەزانایانی شافعی مەزهەب.

سێیەم: حەرامە: بەڕای مالك و أبوحنیفەو زۆربەی زانایان،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی باسلێكراو.

ب.فەرمودەی: بۆت هەیە لەسەر جلەوە.[1].أبوداود گێڕاویەتەوە.

ج.چونكە سەرئەكێشێت بۆ جیماعكردن ،كەحەرامە لەو كاتەدا،ئەفەرموێت: كەسێك بە دەوری زەوی پارێزراودا بێت،نزیكە تێی بكەوێت.[2] بوخاری وموسلیم لە نعمان بن بشیرەوە.

**باسی سێیەم/** ئەگەر پیاو جیماعی لەگەڵ هاوسەرە كەیدا كرد كە لە سوڕی مانگانەدا بوو،پیاوەكە گوناهبار ئەبێت،بە كۆدەنگی زانایان.

دەربارەی ئەو سزایەی كە لەسەریەتی،دوو ڕا هەیە:

***ڕای یەكەم/*** پێویستە خێریك بكات،بەڕای إبن عباس والحسن البصری و ڕایەكی أحمد وڕای كۆنی شافعی.

دەربارەی بڕی خێرەكەش،چەند ڕایەك هەیە:

أ.حسن وسعید بن جبیر ئەڵێن: وەكو جیماع كردن لەڕەمەزاندا،ئەبێت كۆیلەیەك ئازاد بكات.

ب.دینارێك یا نیودینار بكات بەخێر،بە بەڵگەی: فەرمودەیەك إبن عباس ئەیگێڕێتەوە دەربارەی پیاوێك ئەچێتە لای خێزانەكەی لەسوڕی مانگانەدا: دینارێك یا نیو دینار ئەكات بەخێر.[3]پێنجەكە ئەیگێڕنەوەو الحاكم بەصحیحی داناوە.بەڵام شافعی ئەڵێت: ئەگەر ئەم فەرمودەیە ڕاست بێت،ئێمەش ئیشی پێئەكەین.

---

[1] لَكَ مَافَوْقَ الأزار.سنن أبي داود،كتاب الطهارة،باب في المذي (١٨٥).

[2] مَنْ رَتَعَ حَوْلَ الحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُواقِعَهُ. صحيح البخاري ، كتاب البيوع،باب الحلال بين (١٩٦٣). صحيح مسلم ، كتاب المساقاة، باب أخذ الحلال وترك الشبهات ( ٣٠٨١).

[3] حَدِيثُ إبْنِ عَبَّاسٍ عَنِ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الَّذِي يَأْتِي إمْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ:يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ بِنِصْفِ دِينَارٍ. المستدرك على الصحيحين،كتاب الطهارة،(٥٦٢).

دوەم: هیچی لەسەر پێویست نیە،تەنها داوای لێخۆشبون ئەکات،بەڕای زۆربەی زانایان،وەك خطابي وتویەتی. بە بەڵگەی:

أ.چونکە بناغەی مرۆڤ ئەستۆپاکیەتی،وهیچ شتێك پێویست نابێت لەسەری بۆ هەژارو کەسانی تریش،بە بێ بەڵگەیەکی رون وئاشکرا،ئەم بەڵگەیەش لێرەدا نیە.(إبن عبدالبر).

ب.لەفەرمودەکەی پێشودا لاوازی هەیە(لەإسنادو مەتنیدا).

**الحَدِيثُ ١٤// عَنْ أَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ المَرْأَةُ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ؟فَذَلِكَ مِنَ نُقْصَانِ دِينِهَا..**

ئەی ئەوەنیە کەئافرەت لەسوڕی مانگانەدابوو،نە نوێژ ئەکات،نە بەڕۆژوو ئەبێت. ئەوەیە کەموکوڕی لەدینەکەیدا.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري ،كتاب الحيض،باب ترك الحائض الصوم (٣٠٠). وموسلیم.لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا هاتوە: (تَمْكُثُ اللَّيَالِيَ مَا تُصَلِّي،وَتُفْطِرُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ فَهَذَا نُقْصَانُ دِينِهَا)، هەروەها شەو نوێژناکات ومانگی ڕەمەزانیش بەڕۆژونابێت،ئەوەیە کەم دینیەکەی.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا ،واز لە نوێژو ڕۆژوو ئەهێنێ لەو کاتەداو فەرزنیە لەسەری،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە. ب.کۆدەنگی زانایان لەوبارەیەوە.

**باسی دوەم/** پێویستە لەسەر ئافرەت ڕۆژوی ئەو کاتە بگێڕێتەوە،نەك نوێژ.بە بەڵگەی:

معاذة ئەڵێت: لەعائشەم پرسی: بۆچی ئافرەتی حەیزدار ڕۆژو ئەگێڕێتەوە نەك نوێژ؟ ئەویش وتی: لەگەڵ پێغەمبەردا بوین

ئەوحاڵەتـەمان تـوش ئەبوو،فـەرمانمان پێئـەکرا بەگێڕانـەوەی ڕۆژو،بـەڵام فەرمانی گێڕانەوەی نوێژمان پێنەئەکرا[1].الجماعە ئەیگێڕنەوە.

**باسـی سـێیەم/** ئـافرەت لـە سوڕی مانگانـەدا ،نابێـت بـچێتە مزگەوتەوە،بە ڕای جمهور،بە بەڵگەی:

فـەرمودەی: مزگـەوت بەحـەڵاڵ نـازانم بۆحـەیزدارو لەشـپیس.[2] ابـوداود گێڕاویەتەوە،إبن خزیمە بەصحیحی داناوە.

**باسی چوارەم/** ئافرەتی حەیزدار نابێت قورئان بخوێنێت،بە بەڵگەی:

فـەرمودەی: حـەیزدار ولەشـپیس هـیچ شـتێك لـەقورئان نـاخوێنن.[3] ابوداود و ترمذي و إبن ماجە ئەیگێڕنەوە.

وەڵـامی دراوەتـەوە: کـە لـە بـارەی ئـەم فەرمودەیـەوە قـسە هەیـە،ناتوانرێت شتی پێ حەرامبکرێت.

**باسـی پێنجـەم/** ئـافرەتی حـەیزدار دەسـت لـەقورئانیش نادات،بـە بەڵگـەی: ئەونوسـینەی پێغەمبـەری خـوا بـۆ عمـرو بـن حـزم ی نوسـی: بـەپاکی نـەبێت دەست لەقورئان نادرێت.[4] إبن عبدالبر ئەڵێت: ئەم نوسینە وەك (تواتر) ی لێ هاتوە.

**باسـی شەشـەم/** فەرمودەکانـەی پێشو لـە کراهـە کـەمترنین،و ئەگـەر نەشـگەنە پلـەی حەرام،هەرچـەند لـەبارەی هەندێکیانـەوە قـسەهەیە،ووشەکانی بـە ڕاشکاوی حەرامبون ناگەیەنێت.

---

[1] سَأَلْتُ عَائِشَةَ :مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ،وَلَا تَقْضِي الصَّلَاةَ؟قَالَتْ:كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلَا نُؤْمَرُ بِقَضَاءِالصَّلَاةِ. صحيح مسلم ،كتاب الحيض،باب وجوب قضاء الصوم على الحائض دون الصلاة ( ٥٣٤ ).

[2] لَا أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحَائِضٍ وَلَا جُنُبٍ. صحيح ابن خزيمة ،جماع أبواب ذكر الوتر وما فيه من السنن،جماع أبواب فضائل المساجد وبنائها وتعظيمها ، باب الزجر عن جلوس الجنب والحائض في المسجد ( ١٢٥٦ ).

[3] وَلَا تَقْرَأْ الحَائِضُ وَلَا الجُنُبُ شَيْئاً مِنَ الْقُرْآنِ. سنن الترمذي الجامع الصحيح ، أبواب الطهارة عن رسول الله صلى الله عليه وسلم

باب ما جاء في الجنب والحائض أنهما لا يقرآن القرآن ( ١٢٤ ).

[4] أَنْ لَا يَمَسَّ الْقُرْآنَ إِلَّا طَاهِرٌ. موطا مالك ، كتاب القرآن ،باب الأمر بالوضوء لمن مس القرآن ( ٤٧٠ ).

**الحَديثُ ١٥// عَنْ أمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: كانَتْ النُّفَساءُ تَقْعُدُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ نِفَاسِهَا أرْبَعِينَ يَوْماً.**

ئافرەتی زەیستان لەسەردەمی پێغەمبەردا چل ڕۆژ دوای منداڵبونەکەی دائەنیشت-نوێژی نەئەکرد-.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** پێنج کەسەکە جگە لەنسائی،گێڕانەوەکەش لای ابوداودە.[1] . سنن أبي داود ،كتاب الطهارة، باب ما جاء في وقت النفساء (٢٧٠).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** خوێنی پاش منداڵبون تا چل ڕۆژ حوکمەکەی بەردەوام ئەبێت بەبەڵگەی: فەرمودەکەی سەرەوە.

**باسی دووەم/** لەو کاتەدا ئافرەت وازلە نوێژو ڕۆژوو ئەهێنێت.ئەگەر لەفەرمودە باسلێکراوەکەشدا باسنەکرابێت،لەفەرمودەی تردا هاتوە.

**باسی سێیەم/** فەرمودەکەی انس ئەوە ئەگەیەنێت گەر پێش ئەوکاتە پاکێتی بینی پاك ئەبێتەوە،سنوریش بۆ خوارووەکەی نیە.بەڕای شافعی وموحەمەدو عترە.

**الحَديثُ ١٦// عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الكُفْرِ،تَرْكُ الصَّلَاةِ..**

لەنێوان مرۆڤی موسڵمان وبێباوەربونیدا وازهێنانە لەنوێژ.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** کۆمەڵەکە(الجَمَاعَة) جگە بوخاری ونسائی. صحيح مسلم ،كتاب الإيمان ،باب بيان إطلاق اسم الكفر على من ترك الصلاة ( ١٤١).

**مانای وشەکان//** الصَّلَاة: لەزمانەوانیدا بەمانای پاڕانەوە دێت،بۆیە ئەم پەرستشە ئەوناوەی لێنراوە،چونکە پاڕانەوەی تێدایە.

---

[1] البانی ئەم فەرمودەیە بە حسن صحيح ناو ئەبات.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** جیاوازی ڕا نیە لای موسڵمانان دەربارەی کەسێك نوێژ نەکات وباوەڕی پێی نەبێت،مەگەر تازە موسڵمان بوبێت،یا ئەوەندە تێکەڵی موسڵمانان نەبوبێت کەفەرزبونی نوێژی پێ وترابێت.

**باسی دومم/** دەربارەی کەسێك لەبەر تەمبەڵی نوێژنەکات،بەڵام باوەڕی بەفەرزبونی هەیە،وەك زۆر خەڵکی ئەمڕۆ،چەند ڕایەك هەیە:

***یەکەم:*** فاسق (گوناهبار) ئەبێت،کافر (بێباوەڕ) نابێت،ئەگەر گەڕایەوەو نوێژی کرد،باشە،ئەگەر نا ئەکوژرێت، وەك کەسێکی هاوسەردار زینابکات،کوشتنەکەشی بەشمشێرە،بەڕای عترە وکۆمەڵێکی زۆری سلف وخلف،بەمالك وشافعییەوە.

بەڵگەی کافر نەبونی:

أ.ئایەتی: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ،وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾ {النساء:٤٨} .واتە: خوای گەورە خۆش نابێت ئەگەر هاوبەشی بۆ پەیدا بکرێت،بەڵام جگە لەو تاوانە ئەگەر ئارەزوی لێبوو،خۆش ئەبێت.

ب.فەرمودەی: کەسێك ئەوپێنج نوێژە ئەنجام نەدات،ماف لای خوای گەورەنیە،ئارەزوو بکات سزای ئەدات،ئارەزوش بکات لێی خۆش ئەبیت.[1] احمد وابوداودو نسائی و إبن ماجە.

بەڵگەی نەکوشتنی:

أ.ئایەتی: ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ﴾ {التوبة:٥} .واتە: ئەگەر بێباوەڕان تۆبەیان کردوو نوێژیان ئەنجامداو زەکاتیان دەرکرد،وازیان لێبهێنن..

---

[1] وَمَنْ لَمْ يَأتِ بِهِنَّ-أيْ الصَّلَواتُ الخَمْس- فَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللهِ عَهْدٌ،إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ،وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ. سنن ابن ماجه،كتاب إقامة الصلاة، باب ما جاء في فرض الصلوات الخمس والمحافظة عليها ( ١٣٩٧).

ب.فـەرمودەی: فـەرمانم پێکـراوە شـەڕ لەگـەڵ خەڵکـدا بکـەم،تاکو ئـەڵێن لاإلَـهَ إلّـا الله،وە نوێـژەکانیان ئەکـەن،وزەکاتی مـاڵ دەرئەکەن،ئەگـەر ئـەوەی کـرد خـوێن وماڵیـان لـەمن حەرامە،بەحـەقی خـۆی نـەبێت.[1] بوخـاری وموسلیم ئەیگێڕنەوە.

فەرمودە باسلێکراوەکەش وا لێك ئەدەنەوە:

أ.بەوازهێنانی لەنوێژ شایەنی سزای بێباوەڕانە،کە کوشتنە.

ب.کوشتن بۆ کەسێکە نوێژنەکردن بەحەڵال بزانێت.

ج.کردارەکەی بەرەو بێباوەڕی ئەبات.

د.کردارەکەی کرداری بێباوەڕانە.

دوەم: بێبـاوەڕ ئەبێت،بـەڕای کۆمـەڵێکی زۆر لـەزانایانی پێـشین،علی و احمد بن حنبل و...بەبەڵگەی:

فەرمودە باسلێکراوەکان.

سـێیەم: بێبـاوەر نابێـت و ناشـکوژرێت،بەڵکو تـەمبێ ئـەکرێت و ئەهێڵرێتـەوە لەزینداندا تا نوێژ ئەکات،بەڕای ابو حنیفە وکۆمەڵێك لەئەهلی کوفە..

بەڵگەیان بۆ بێباوەڕ نەبونی: هەمان بەڵگەی ڕای یەکەمە.

بەڵگـەی نەکوشتنیـشی فـەرمودەی: لَـا يَحِـلُّ دَمُ امْـرِءٍ مُـسْلِمٍ إلّـا بِإِحْـدَى ثَلَاثٍ:....لەم فەرمودەدا نویژ نەکردن باس نەکراوە وەکو پاساوی کوشتن.

<u>باسی سێیەم</u>/ ئایا بە نەکردنی یەك نوێژ ئەکوژرێت،یان نا؟ چەند ڕایەك هەیە:

جمهـور پێـی وایـە بەنـەکردنی یـەك نوێـژ ئەکوژرێت،فـەرمودەکانیش وا ئەگەیەنێت،بەستنەوەی فەرمودەکانیش بە چەند نوێژێکەوە،بەڵگەی لەسەرنیە.

احمـد بـن حنبـل ئـەڵێت: ئەگـەر بـانگ کـرا بـۆ نوێـژکردن ونـەیکرد،وتی نایکەم،کاتی نوێژەکەش بەسەرچوو،پێویستە بکوژرێت.

---

[1] أمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لا إلهَ إلّا الله، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ،فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ ،عَصَمُوا مِنِّي دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوالُهُمْ،إلّا بِحَقِّهَا. صحيح البخاري كتاب الإيمان،باب،فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فخلوا سبيلهم ( ٢٥ ).

وازهێنـــان لەهـــەر شـــتێکیش کەدروســـتی نوێژەکـــە بـــەو بەســـتراوە،وەك دەســـتنوێژگرتن وخۆشـــۆردن ورووکردنـــە قیبلـــەو داپۆشـــینی عـــەورەت و هەرشـــتێك رووکـــن بێـــت یـــا مەرج،هـــەمان حـــوکمی نـــەکردنی نوێـــژی هەیە(بۆکوشتنی).

**الحَـدِيثُ ١٧// عَـنْ عَبْـدِاللهِ بـنِ عَمْـرو رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهُمَـا أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: وَقْـتُ الظُّهْـرِ إِذَا زَالَـتْ الـشَّمْسُ،وَكَانَ ظِـلُّ الرَّجُـلِ كَطُولِـهِ مَـا لَـمْ يَحْـضُرْ العَـصْرِ.وَوَقْـتَ العَـصْرِ مَـا لَـمْ تَـصْفَرَّ الـشَّمْس.وَوَقْـتُ صَـلَاةِ الْمَغْـرِبِ مَـا لَـمْ يَغِـبْ الـشَّفَقُ،وَوَقْتُ صَلاةِ العِشَاءِ إِلَـى نِـصْفِ اللَّيْـلِ الأَوْسَـطِ،وَوَقْتُ صَلاةِ الـصُّبْحِ مِـنْ طُلُـوعِ الفَجْرِ.فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَأَمْسِكْ عَنْ الصَّلاةِ،فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ الشَّيْطَانِ...**

کـاتی نوێــژی نیــوەڕۆ لادانــی خــۆرە لــەنیوەی ئاسمـان تـا سـێبەری مـرۆڤ وەك درێــژی خــۆی لێـدێت وپـێش نوێـژی عەسـر.نوێـژی عەسـریش تـا پـێش زەردبــونی خــۆرە.کــاتی نوێــژی ئێــوارەش تــا ئــەو کاتەیــە ســورایی لەئاسمانـــدا وون نـــەبوبێت.نوێـــژی خـــەوتنانیش تـــا ناوەڕاســـتی نیـــوەی شـــەوە،وە نوێـــژی بـــەیانیش لەدەرکـــەوتنی بەرەبەیانەوەیـــە.ئەگـــەر خۆرهەڵهات نوێژ مەکە چونکە لەنێوان دووشاخی شەیتانەوە هەڵدێت.

<u>گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//</u> صـحيح مـسلم ،کتـاب المساجد ومواضـع الـصلاة ، باب أوقات الصلوات الخمس(٩٩٨).

<u>مانـــــای وشـــــەکان//</u> المَواقِيــت: ئەوکاتـــەی خـــوای گـــەورە داینـــاوە بـــۆ ئەنجامـدانی خواپەرسـتی. زَالَـتْ الـشَّمْسُ: بـەلای خۆرئاوابونـدا لایـدا.وكَـانَ ظِـلُّ الرَّجُـلِ كَطُولِـهِ: کـاتی نوێـژی نیـوەڕۆ بەردەوامـە تـا سـێبەری هـەموو شـتێك وەك خـۆی لێـدێت. نِـصْفُ اللَّيْـلِ الأَوْسَـطِ: نیـوەی یەکـــەمی شەو.وَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ: سەرەتای نوێژی بەیانی.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە باسی دیاریکردنی سەرەتاو کۆتایی پێنج نوێژە فەرزەکە ئەکات،نوێژیش کاتێکی تایبەتی هەیەو پێش ئەوکاتە دروست نیە ئەنجام بدرێت،بە کۆدەنگی زانایان:

سەرەتای کاتی نیوەڕۆ لادانی خۆرە لە ناوەڕاستی ئاسمان،کۆتاییەکەشی،سێبەری هەرشتێك بەئەندازەی خۆی لێبێت. بەنمونەش باسی پیاو کراوە.

کۆتایی نوێژی نیوەڕۆش سەرەتای عەسرە،بەڵام ئایا بە بونی سێبەری هەرشتێك بەئەندازەی خۆی،کاتی نیوەڕۆ تەواو ئەبێت ،یان نا؟ چەند رایەك هەیە:

***رای یەکەم/*** کاتی نوێژی عەسرە،بەڵام نوێژی نیوەڕۆش هەرماوە،ئەنجامدانی چوار ركات نوێژ،کە ئەگونجێت نوێژی نیوەڕۆ یا عەسری تیابکرێت (کاتی هەردوو نوێژەکەیە)،بەرای هادی ومالك وکۆمەڵێك لەزانایان،بە بەڵگەی وتەی نەوەوی لەشرح مسلم دا،فەرمودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : لە ڕۆژی دوەمدا کاتێك نوێژی نیوەڕۆی پێکردم،کە سێبەری شتەکان وەك خۆیان لێهات،لەڕۆژی یەکەمیشدا کاتێك نوێژی عەسری پێکردم کە سێبەری شتەکان بە ئەندازەی خۆیان بون.[1]

نەوەوی ئەڵێت: وادیارە ئەوکاتە نیوەڕۆو عەسر بەشدارن تیایدا.

دوەم: کاتێك نیە نیوەڕۆو عەسر تیایدا بەشداربن،بەڵکو هەرکاتێك سێبەری شتەکان وەك خۆیان بون جگە لە سێبەری لاچونی خۆر لەنیوەی ئاسمان،نوێژی عەسر دەست پێ ئەکات. کە نوێژی عەسریش دەستپێکرد،نوێژی نیوەڕۆ نامێنێت،بەرای شافعی و زۆربەی زانایان،

[1] فَصَلَّى بِيَ الظُّهْرَ فِي الْيَوْمِ الثَّانِي حِينَ صَارَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ،وَصَلَّى الْعَصْرَ فِي الْيَوْمِ الْأَوَّلِ حِينَ صَارَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ. مسند أحمد بن حنبل - ومن مسند بني هاشم، مسند عبد الله بن العباس بن عبد المطلب (٢٩٦٢).

بە بەڵگەی فەرمودەی: وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ مَالَمْ يَحْضرْ العَصْر.کە لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا هەیە.

نەوەوی ئەڵێت: وەڵامی ئەمانە بۆ فەرمودەی سەرەوە،ئەوەیە کە: سێبەری شتەکان وەك خۆیان لێهات پێغەمبەر لە نوێژی نیوەڕۆ تەواو بوو، لە یەکەم ڕۆژدا هەر لەوکاتەدا (تەواو کردنی نوێژی نیوەڕۆ) نوێژی عەسری کرد،کەواتە کاتی هاوبەشیان نیە.ئەم لێکدانەوەش باشە بۆ کۆکردنەوەی فەرمودەکان لەگەڵ یەکتر،چونکە ئەگەر کاتی هاوبەش هەبێت لەنێوانیاندا،کاتی کۆتایی نیوەڕۆ نادیار ئەبێت،چونکە ئەگەر ئەو کاتەدەستت بەنوێژی نیوەرۆ کرد کە سێبەری هەر شتێك وەك خۆی لێدێت،نازانیت کەی تەواودەبێت،لەو کاتەشدا سنوری کاتی نوێژەکان دیار نابێت. بەڵام ئەگەر ئەو لێکدانەوەیەی بۆ بکەین، بە کۆدەنگی زانایان ئەزانین کۆتایی کاتەکەی کامەیە،بەو شێوەیەش فەرمودەکان ڕێك ئەوەستێت.

**الحَدِيثُ ١٨// عَنْ إِبْنِ مَسْعُود رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: أَفْضَلُ الأعْمَالِ الصّلَاةُ فِي أوّلِ وَقْتِهَا..**

باشترینی کردارەکان نوێژکردنە لە سەرەتای کاتەکەیدا.

**گێـــرەرەوەی فەرمودەكـــە//** ترمـذي وحـاكم. المـستدرك علـى الـصحيحين للحـاكم ، كتـاب الـصلاة،باب في مواقيـت الـصلاة ( ٦٢٨). وە بەصـحیحی دائـەنێن[١] لەبوخاریـدا هـاتوە: سَـأَلْتُ النَّبِـيَّ صَـلّى اللهُ عَلَيْـه وَسَـلّمَ: أَيُّ العَمَـلِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ قَالَ: الصَّلَاةُ لِوَقْتِهَا.

**سەرباسەكان//**

**باســی يەكـــەم/** فەرمودەكـە مانـای باشـێتی نوێـژ لەسـەرەتای کاتەکەیـەوە لەهــەموو ئیــشێکی تــر ئەگەیــەنێت.وەك لــە(ال) التعريــف دا ماناكــەی دەرئەکەوێت.

**باســی دوەم/** ئـەم فەرمودەیـە لەگـەڵ فـەرمودەی: باشـترین کردار،باوەڕبونـە بەخودا.[٢] دژ ئەوەستێت. بەڵام بەم شێوەیە کۆکراونەتەوە:

مەبەسـت لـەکردارەکان لـە فـەرمودەی إبـن مـسعوددا: جگـە لەباوەڕە،چـونکە پرسـیاری باشـترین کـرداری مرۆڤـی بـاوەڕداری لێکردوە،کەواتـە مەبەسـتی جگە لەباوەڕە.

إِبْــنُ دَقِيــقِ العِيــد ئــەڵێت: کردارەکــان لێــرەدا-لــەم فەرمودەیــەدا- کردارەجەســـــتەییەکانە،کردارەکانی نـــــاو دڵ ناگرێتەوە،کەواتـــــە دژی فەرمودەی : أَفْضَلُ الأعْمَالِ الإِيْمَانُ بِاللهِ عَزَّوَجَلّ. ناوەستێت.

**باســی ســێیەم/** ئـەم فەرمودەیـە دژ ئەوەسـتێت لەگـەڵ چـەند فەرمودەیـەکی تـردا کەباسـی باشـێتی چـەند کردارێکـی چـاکە ئەکـەن،وەڵامیش بـۆ ئـەم دژ وەستانە:

---

[١] البانیش بە صحیحی داناوە.

[٢] أَفْضَلُ الأعْمَالِ إِيمانٌ بِاللهِ. صحيح البخاري ،كتاب العتق،باب ،أي الرقاب أفضل ( ٢٤٠٢ ).

١.پێغەمبەری خوا بۆ هەرکەسێك گونجاوترینی وەڵامی داوەتەوە،کەسودی بۆکەسەکە زیاتربێت: باشترین کردار بۆ کەسی ئازا جهاد کردنە،چونکە باشترە بۆی لەخۆ خەریککردن بەخواپەرستیەوە،باشترین کرداریش بۆ دەوڵەمەند خێرکردنە،و بەو شێوەیە...

٢.وشەی (مِنْ) لەڕستەکەدا لابراوە،ماناکەشی وایە: لەباشترین ئیشەکان....

٣.مەبەست لەوشەی (أَفْضَلْ) باشترین نیە،بەڵکو تەنها بەمانای باشە دێت.

٤.هەموو دەقەکان کۆکن لەوەی نوێژ لەخێرکردن باشترە،بەڵام لەکاتی دەستگرۆیی کردنی هەژاراندا،خێرکردن باشترە.

**باسی چوارەم/** باشێتی نوێژ لەسەرەتای کاتەکەیەوە دژ ئەوەستێت لەگەڵ فەرمودەی نوێژی خەوتنان ،کەئەڵێت: ئەگەر لەسەر ئوممەتم ناڕەحەت نەبوایە دوام ئەخست،واتە بۆ نیوەی شەو یا نزیکی نیوە شەو.[1]

هەروەها دژە بە فەرمودەی کردنی نوێژی بەیانی لەکاتی ڕۆشنیدا،وە کردنی نیوەڕۆ لەکاتی فێنکیدا.

وەڵامیش بۆ ئەم دژ وەستانی فەرمودانە بەرامبەر یەکتر،ئەوەیە: ئەم فەرمودانە گشتگیری فەرمودەکانی سەرەتای کات تایبەت ئەکەن، لەنێوان دەقی گشتگیر ودەقی تایبەتدا دژ نیە.

**باسی پێنجەم/** ئەو ڕایەی پێیوایە فەرمودەی:( أَوَّلِ وَقْتِهَا ) لەناو هاوەڵەکانی شعبەدا، تەنها علی بن حفص ئەیگێڕێتەوە، ئەوانەی تر،بە بێ باسکردنی (أَوَّل) تەنها ( عَلَى وَقْتِهَا) ئەیگێڕنەوە.

---

[1] لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَخَّرْتُهَا. صحيح ابن حبان ،كتاب الصلاة،باب مواقيت الصلاة ،ذكر الوقت الذي كان يستحب المصطفى صلى الله عليه وسلم تأخير،( ١٥٥٧ ).

وەڵام بۆ ئەم ڕایەش ئەوەیە،کە: ئەگەر بەتەنهاش بیگێڕێتەوە زەرەری نیە،چونکە لەڕاویە ڕاستگۆکانی صەحیحی مسلمە،ترمذي وحاکم وإبن خزیمەش ئەم ڕیوایەتەیان بە صحیح داناوە.

لە لایەنی ماناشەوە،( عَلَى وَقْتِها) مانای سەرەتای کاتیش لەخۆ ئەگرێت،چونکە (عَلَى ) واتە هەموو کاتەکە.

ڕوایەتی (لِوَقْتِهَا)ش هەمان مانا ئەگەیەنێت: چونکە مەبەستی پێشوازیکردنی کاتەکەیەتی،دیارە پێش هاتنی کاتەکەی نوێژ دروست نیە،کەواتە دەرکەوت،مەبەستی پێشوازیکردنی زۆربەی کاتەکەیەتی،ئەویش بەوە ئەبێت کە لە سەرەتای کاتەوە بێت.

خوای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ {الأنبياء:٩٠} . واتە: ئەوان پێشبڕکێیان ئەکرد لەئەنجامدانی چاکەکاندا،پێغەمبەریش بەردەوام لەسەرەتای کاتەکانیەوە نوێژی ئەکرد، جگە لەنوێژی خەوتنان و نیوەڕۆ لە کاتە دیاریکراوانەدا، دیاریشە ئەویش باشترین کار ئەکات.

عەلی رضي الله عنە ئەڵێت: سێ شت هەیە دوانەخرێن یەکێکیان نوێژە ئەگەر کاتەکەی هات.[1] ابوداود گێڕاویەتەوە.

مەبەستیش لێی باشترینە،،ئەگینا دواخستنی لەسەرەتای کاتەکەیەوە دروستە.

[1] ثلاثٌ لَا تُؤَخَّرُ..ثمَّ ذَكَرَ مِنهَا : الصَّلَاةَ إِذا حَضَرَ وَقتُهَا.

**الحَـديث ١٩// عَـنْ عُثْمـان بـن أَبـي العـاص رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ أَنَّـهُ قـالَ: يَارَسُـولَ الله إجْعَلْنِـي إِمَـامَ قَوْمِي، فَقَـالَ: أَنْـتَ إِمَامُهُمْ، وَاقْتَـدِ بِأَضْـعَفِهِمْ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنـاً لَـا يَأخُـذُ عَلَى أَذانِهِ أَجْراً..**

وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بمکـە بەپێشەوای کۆمەڵەکـەم. پێغەمبـەریش فــەرموی: تـــۆ پێـــشەوای ئەوانیت، بــەپێی لاوازترینیـــان هـــەنگاو بنێ، بانگدەرێکیش بۆ خۆت دابنێ کە پارە لەبری بانگدان وەرنەگرێت.

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـە//** پێنج کەسەکە، ترمذي بەحسن ی داناوە، سنن ابي داود ،کتـاب الـصلاة، بـاب اخـذ الأجـر علـى التـأذين (٤٥٢)، وحـاکمیش بەصحیح.[1]

**مانـــای وشـــەکان//** وَاقْتَـدِ بِأَضْـعَفِهِمْ: لاوازترینیـان بـەهۆی نەخۆشـی و بێتاقەتیـــەوە بکـــەرە پـــێش چـــاوی خـــۆت وپـــێ بـــەپێی ئـــەوان نوێژبکە (لەکورتکردنەوەدا).

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــــەم/** داواکردنـــی پێـــشەوایەتی لـــە بـــواری چـــاکخوازیدا دروستە، بەبەڵگەی:

أ. فـــــەرمودە باســـــلێکراوەکە. ب. لەپاڕانـــــەوەکانی عبادالرحمــــــان دا هــاتوە﴿وَاجْعَلْنَـا لِلْمُـتَّقِينَ إِمَامـاً﴾ {الفُرْقَـان:٧٤}. بمانکـه بـه پێـشەوای پارێزکاران.

ب. داواکردنـــی پێـــشەوایەتی بـــۆ کـــاری خێر، ناچـــێتە بـــواری داواکردنـــی لێپرســـراوێتی مکروه، چـــونکە ئـــەمیان بـــۆ لێپرســـراوێتی دنیاییە، کەکەسـێک داوای بکات یارمەتی نادرێت وشایەنی ئەوە نیە بیدرێتێ.

**باســـــی دوەم/** داواکردنـــی پێـــشەوایەتی لەچاکەدا، ناچـــێتە بـــواری ئـــەو داواکردنـــەی کـــە بێزراوە، چـــونکە ئـــەوەی دوەمیـــان بـــۆ داواکردنـــی

---

[1] البانی بە صحیحی داناوە.

لێپرسراوێتی دنیاییه،هەرکەسیش داوای بکات،یارمەتی نادرێت و،شایەنی ئەوەش نیه بیدرێتێ.

**باسی سێیەم/** پێویسته لەسەر پێشنوێژ، چاودێری بارودۆخی کەسانی دوای خۆی بکات وبەپێی لاوازترینیان نوێژەکه بکات،لەبەر خاتری ئەو سوکی بکات.

**باسی چوارەم/** پێش نوێژ بانگوێژێك دیاری ئەکات تاکو خەڵك بۆ نوێژ کۆبکاتەوە.

**باسی پێنجەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: ئەوکەسەی ئەکرێتە بانگوێژ،پارە (کرێ) لەسەر بانگدانەکەی وەرناگرێت.

**باسی شەشەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە: کەسێك کرێی بانگدان وەربگرێت،نابێت بکرێته بانگوێژ.

**باسی حەوتەم/** لەبارەی ڕەوایەتی وەرگرتنی کرێ بانگدان ، چەند ڕایەك هەیه:

***ڕای یەکەم/*** دروسته کرێ لەسەر بانگدان وەربگیرێت،بەڵام باش نیه،بەڕای زانایانی شافعی مەزهەب.

دوەم: ئەگەر لەشوێنێکی تایبەتدا بانگیدا دروسته پارە وەربگرێت،ئەوەش بۆ بانگەکه نیه بەڵکو بۆ مانەوەیەتی لەشوێنەکە،وەك کرێی کەسێك ئێشك بگرێت.

سێیەم: کرێ وەرگرتنی حەرامه،بە ڕای حەنەفیەو هادویەو قاسمیه،بە بەڵگەی فەرمودەی باسلێکراو.

صەنعانی لەبارەی ئەم فەرمودەیەوە ئەڵێت: شاراوە نیه کە نابێته بەڵگەی حەرامبون.

چوارەم: وەرگرتنی کرێ ئاساییه بۆی،بەڕای مالك.

إبن العربي ئەڵێت: ڕای دروست ئەوەیە کە: دروسته کرێ وەرگرتن لەسەر بانگدان وپێشنوێژی کردن ودادوەریکردن وهەموو کاروبارە دینیەکان،چونکه خەلیفەی موسڵمانان خۆیشی کرێ لەسەر ئەوانە وەرئەگرێت.

بۆهەریەکێك لەم کارانە جێگرەوەی خەلیفە بۆی دروسته وەری بگرێت وەك خەلیفە خۆی.

**الحَدِيثُ ٢٠// عَنْ عامر بن رَبِيعَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، فَأَشْكَلَتْ عَلَيْنَا الْقِبْلَةُ فَصَلَّيْنَا، فَلَمَّا طَلَعَتْ الشَّمْسُ، إِذَا نَحْنُ صَلَّيْنَا إِلَى غَيْرِ الْقِبْلَةِ، فَنَزَلَتْ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾ {البقرة: ١١٥}.**

عامر کوڕی ڕەبیعە ئەڵێت: لەشەوێکی تاریکدا لەگەڵ پێغەمبەردا بوین،قیبلەمان لێ گۆڕاو نوێژمان کرد،کە خۆر هەڵهات،زانیمان بەپێچەوانەی قیبلە نوێژمان کردوە،ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:..واتە: لەنوێژدا ڕوو لەکوێ بکەن خوای گەورە لەوێیە-لێتان وەرئەگرێ-.

**<u>گێڕەرەوەی فەرمودەکە//</u>** سنن إبن ماجه،كتاب إقامة الصلاة والسنة فيها، باب من يصلي إلى غير القبلة وهو لا يعلم (١٠٢٣).

**<u>سەرباسەکان//</u>**

**<u>باسی یەکەم/</u>** وشەی (فَصَلَّيْنَا ) دیارە بێ تەماشاکردنی نیشانەو بەڵگەکان.

فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی: کەسێك بەرەو ڕوی قیبلە نوێژی نەکرد،لەبەرتاریکی یا هەور بوو،نوێژەکەی تەواوە،ئەگەر سەیری نیشانەو بەڵگەکانی کرد یان نا،دوای ئەوە بۆ دەرکەوت هەڵەیە یا نا، بە بەڵگەی:

طبراني لە معاذ بن جبل ئەگێڕێتەوە: لە ڕۆژێکدا کە هەور بوو لە سەفەردا بوین لەگەڵ پێغەمبەردا بەرەو ڕوی قیبلە نوێژمان نەکرد،کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد خۆر دەرکەوت،وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا بەرەو قیبلە نوێژمان نەکرد،فەرموی: نوێژەکەتان بەرزبوەتەوە بۆ لای خوا (وەرگیراوە).

لەسەنەدەکەدا (أبوعيلة) هەیە،إبن حبان بە کەسێکی متمانەپێکراوی داناوە.

**<u>باسی دوەم/</u>** دەربارەی حوکمی نوێژێك بەو شێوەیە ئەنجام بدرێت،زانایان چەند ڕایەکیان هەیە:

نوێژەکە دروستە،مەگەر کەسێك بێ گەڕان بە دوای قیبلە نوێژەکە بکات ودڵنیاشبێت لە بەهەڵەچونیدا،ئەمەش ڕای شەعبی وحنفیەو کوفیەکانە.

بۆ دوبارەکردنەوەی نوێژەکەش لەسەر ئەو کەسە،چەند ڕایەك هەیە:

*ڕای یەکەم/* پێویستە نوێژەکە دوبارە بکاتەوە،لەکتێبی البَحرْدا ئەڵێت: کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.

صەنعانی ئەڵێت: ئەگەر کۆدەنگی لەسەربێت،گشتگیری فەرمودەکە تایبەت ئەکات.

شافعی ئەڵێت:پێویستە دوبارەی کاتەوە،کاتی نوێژەکە مابێت،یا لە دوای کاتەکە،چونکە ڕوکردنە قیبلە واجبە، فەرمودە باسلێکراوەکەش لاوازە (ئیشی پێناکرێت).

دوەم: ئەگەر بەدوای قیبلە گەڕاو دوای ئەوەی کاتی نوێژەکە بەسەرچوو،زانی هەڵەیە،دوبارەکردنەوەی لەسەرنیە.بەڵام ئەگەر دڵنیابوو کە هەڵەیەو کاتیش مابوو،پێویستە بیکاتەوە،چونکە بە مانەوەی کاتەکە نوێژەکەی هەرلەسەر فەرزە.

خۆ ئەگەر دڵنیا نەبو (کەڕوی کردۆتە قیبلە) لەوانەشە جارێکی تریش هەڵەبکات،بۆیە واجب نیە دوبارەی بکاتەوە.

مەرجی بەدوادا گەڕانی قیبلە دانراوە لێرەدا،چونکە واجبە دڵنیا بێت لە ڕوکردنە قیبلە،ئەگەر نەتوانرا دڵنیا بێت لێی،بەپێی توانا هەوڵ ئەدات بەدوای بگەڕێ، ئەگەر کەمتەرخەمی کرد ئەوە گوناهبارە،مەگەر دڵنیا بێت لەوەی ڕوی لە قیبلەیە.

صەنعانی ئەڵێت: ڕای دروست ئیش کردنە بە فەرمودە باسلێکراوەکە،لەبەرئەوەی فەرمودەکەی موعاذیش پاڵپشتی ئەکات،بەڵکو خۆی بەتەنهاش ئەبێتە بەڵگە،زۆرجاریش کۆدەنگی زانایان باسکراوەو ڕاست دەرچوە.

**الحَديثُ ٢١// عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُقْتُلُوا الأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلَاةِ الحَيَّةُ وَالعَقْرَبُ.** ئەم دوانە لەكاتی نوێژەکاندا بکوژن: مارو دووپشك.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//** چوار کەسەکە،إبن حبانیش بەصحیحی داناوە. صحيح ابن حبان ،باب الإمامة والجماعة،باب الحدث في الصلاة ،ذكر الأمر بقتل الحيات والعقارب للمصلي في صلاته ( ٢٣٨٣) [١]

**مانای وشەکان//** الأَسْوَدَانِ: بەمارودوپشك ئەوترێت،هەر ڕەنگێك بن.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەبارەی کوشتنی مارو دوپشك لەکاتی نوێژکردندا ، دوو راهەیە:

***ڕای یەکەم/*** کوشتنیان فەرزە،بە بەڵگەی: فەرمودەی باسلێکراو،بناغەش لە فەرمان پێکردندا بۆ فەرزبونە.

دووەم: سوننەتە.

**باسی دوەم/** لەبارەی ئەو نوێژەی کردارێکی وای تیا ئەکرێت کەبێ ئەوە نابێت (وەك کوشتنی مارو دوپشك)،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: ئەو کردارە کەم بێت یازۆر،نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوە،بەڕای هەندێك لەزانایان،بە بەڵگەی: فەرمودەی باسلێکراو.

دوەم: ئەم کردارە نوێژەکەی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە،بەڕای هادەویە.

فەرمودەکەش لێك ئەدەنەوە،کە لە نوێژەکەی دەرئەچێت،وەك هەموو ئەو کردارانەی بۆ پێویستی ئەیکات لەکاتی نوێژدا،وەك ڕزگارکردنی کەسێکی خنکاو...بەو کردارەش لەنوێژەکە دەرئەچێت.

جگە لەم دوڕایە،ڕای تریش هەیە کە بەدرێژی لەباسەکە ئەدوێن و بەڵگەشیان نیە.

---

[١] البانی بە صحیحی داناوە.

**الحَديث ٢٢// عَنْ أنَس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أنّ رَسُولَ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إذا قُدِّمَ العِشاءُ، فَابْدَءُوا بِهِ قَبْلَ أنْ تُصَلّوا المَغْرِبَ.**

کاتێك نانی ئێواره دانرا، پێش ئەوەی نوێژ بکەن نانەکە بخۆن.

**گێـــــڕەرەوەی فەرمودەکــــــە//.** صـحيح البخـاري ،كتـاب الأذان، ابـواب صـلاة الجماعـة والإمامـة ، بـاب إذا حـضر الطعـام وأقيمـت الـصلاة (٦٥٢). صـحيح مـسلم ،كتـاب المـساجد ومواضـع الـصلاة، بـاب كراهــة الـصلاة بحـضرة الطعام الذي يريد اكله في الحال وكراهة ( ٨٩٨).

**ماناى وشەکان//** العِشاء:خواردنی ئێواره. بِهِ: بەخواردنی.

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکــەم/** لـەبارەی پێشخـستنی خـواردنی نـانی ئێـواره کـەدانرا بەسـەر نوێژی ئێواره دا، چەند ڕایەك هەیە:

یەکـــەم: ســـوننەتە،بەڕای جمهـــور.فـــەرمانی ( فَابْـــدَءوا)ش بـــۆ ســـوننەت دائەنێن.

دووەم: فـــەرزە،خۆ ئەگـــەر نوێژەکـــە لەوکاتـــەدا پـــێش خـــرا ئـــەوە نوێژەکـــە پـــوچ ئەبێتەوە،بـــە ڕای ظاهریـــــة،بەڵگەشـــیان: ڕوکەشـــی فـــــەرمودە باسلێکراوەکەیە.

**باســـی دووەم/** فەرمودەکـــە دیـــاره لـــەپێش خـــستنی نـــان خـــواردنی ئێـــوارەدا لەهـــەمو حاڵەتێکـــدا: برســـی بێـــت یـــا نا،ترســـی تێکـــچونی خواردنەکـــەی هەبێت یان نا،خواردنەکە سوك بێت یان نا.

**باســـــی ســـــێیەم/** لـــەبارەی هـــۆی پـــێش خـــستنی خواردنەکەوە،وتویانـــە: ســـــەرقاڵبونی مێـــــشکە بـــــە ئامـــــادەبونی خواردنەکە،کەئەبێتـــــە هۆکـــــاری وازهێنـــان لـــە خـــشوع لـــە نوێژەکـــەدا.ئـــەم هۆکـــارەش هـــیچ بەڵگـــەی لەســـەر نیە،تەنها لەوتەی هەندێك لەهاوەڵانەوە وەرگیراوە:

١.إبـــن أبـــی شـــیبە لـــە ابـــوهریرە وإبـــن عبـــاس ئەیگێڕێتـــەوە کـــە: ئـــەوان خواردنیـــان ئەخوارد،لــــەناو تەنورەکــــەدا خـــواردنی بـــرژاو هـــەبوو،کاتێك

بانگدەر ویستی بانگ بدات،إبن عباس وتی:پەلە مەکە،با کە هەستاین خەیالمان لای نەبێت.لەڕیوایەتێکدا:با لەنوێژەکەدا نەیەتە خەیالمان،بەرچاومان.[1]

ب.هەروەها لەحسن بن علی ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: خواردن پێش نوێژکردن،دەرونی اللوّامَة لا ئەبات.[2]

ج.لە ئیبن عومەرەوە ئەگێڕدرێتەوە: ئەگەر خواردنی ئێوارە ئامادەبوایە و گوێی لە قورئان خوێندنی پێشنوێژەکە بوایە،تا نانی نەخواردایە هەڵنەئەستا بۆ نوێژەکە.[3]

**باسی چوارەم/** هەرشتێکیش جگە لەخواردن،هەمان حوکمی هەیە، ئەگەر مێشکی پێ سەرقاڵ بێت،بۆیە پێویستە بەوە دەستپێبکرێت،پاشان نوێژەکە بکرێت.

**باسی پێنجەم/** ئەگەر کاتەکە تەسك بوو،خوارنەکەپێش بخرایە نوێژەکە بەسەر ئەچوو،دوورا لەبارەیەوە هەیە:

یەکەم: خواردنەکەپێش ئەخرێت،ئەگەر کاتی نوێژەکەش بەسەربچێت،تاکو پارێزگاری لەخشوع لەنوێژدا بکرێت. ئەمەش ڕای ئەوانەیە خشوع بەفەرز دائەنێن.

---

[1] أَنَّهُمَا كانَا يَأْكُلَانِ طَعَاماً،وَفِي التَّنُورِ شِواءٌ،فَأَرَادَ الْمُؤَذِّنُ أَنْ يُقِيمَ الصَّلَاةَ،فَقَالَ لَهُ إِبْنُ عَبَّاس:لَا تَعْجَلْ،لَا نَقُومُ وَفِي أَنْفُسِنَا مِنْهُ شَيْءٌ.وَفِي رِوايَةٍ : لِئَلَّا يَعْرِضَ لَنَا فِي صَلَاتِنَا. مسند ابن الجعد ، شريك عن عثمان بن أبي زرعة( ١٧٤٤ ).

[2] العَشَاءُ قَبْلَ الصَّلَاةِ يُذْهِبُ النَّفْسَ اللَّوَامَةَ. مصنف ابن أبي شيبة - كتاب صلاة التطوع والإمامة وأبواب متفرقة ،الصلاة والعشاء يحضران بأيهما يبدأ ( ٧٨٠٩ ).

[3] أَنَّهُ كانَ إِذَا حَضَرَ عَشَاؤُهُ،وَسَمِعَ قِرَاءَةَ الإِمَامِ فِي الصَّلَاةِ،لَمْ يَقُمْ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ طَعَامِهِ. مصنف عبد الرزاق الصنعاني ،كتاب الصلاة
باب إذا قرب العشاء ونودي بالصلاة ( ٢١١٧ ).

دوەم:لەبەر پارێزگاری کردنی کاتە،نوێژەکە پێش ئەخرێت،بەڕای جمهوری زانایان.

**باسی شەشەم/** فەرمودەکە بەڵگەیە: کەئامادەبونی خواردن پاساوێکە بۆ نەچونی نوێژی بەکۆمەڵ،لای ئەوانەی بەواجبی دائەنێن و ئەوانەش بەسوننەتی دائەنێن.

**باسی حەوتەم/** وتراوە، فەرمودەی: فَابْدَؤا بِهِ،بەڵگەی ئەوەیە کە زیادەڕۆیی لەخواردنەکەدا ناکات،ئەگەر کاتی نوێژەکە بوو.

**باسی هەشتەم/** فەرمودەی: قَبْلَ أنْ تُصَلّوا المَغْرِبَ،بە ڕەهایی باسی نوێژکراوەو (بەهیچ نوێژێك نەبەستراوەتەوە).

فەرمودەکە بە لفظي: إذا وُضِعَ العَشاءُ وَأحَدُكُمْ صَائِمٌ،یش هاتوە،بەڵام پێی نابەسترێتەوە: چونکەلە بنەماکاندا هاتوە: باسکردنی دەقێکی تایبەتی گونجاو،نابەسترێتەوەو تایبەتیش ناکرێت.

**الحَديث ٢٣// عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يَقُولُ: لَاصَلَاةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ وَلا وَهُوَ يُدافِعُهُ الأخْبَثانِ.**

نوێژکردن لەکاتی ئامادەبونی خواردن وتەنگاویدا دروست نیە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحیح مسلم - کتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب کراهة الصلاة بحضرة الطعام الذي یرید أکله في الحال وکراهة(٩٠١).

**مانای وشەکان//** الأخْبَثان: میزو پیسایی .وَلَا: نوێژ دروست نیە. وَهُوَ: نوێژکەرەکە

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لَاصَلَاةَ بِحَضْرَةِ طَعَامٍ: نوێژ لەشوێنێکدا ناکرێت خواردنی لی بێت،نوێژی سوننەت بێت یا فەرز،کەسەکە برسی بێت یان نا.

**باسی دووەم/** هەروا ڕاگرتنیش هەمان حوکمی تەنگەتاوی هەیە،بۆیە لەوکاتەدا نوێژناکرێت.

**باسی سێیەم/** بەڵام ئەگەر نوێژکەر،تەنها قورساییەکی هەست پێ ئەکرد لەناو سکیداو،زۆری بۆ نەهێنا،ئەوە ڕێگرنابێت لەنوێژکردن.

**باسی چوارەم/** لەبارەی نوێژکردن لەحاڵەتی تەنگاویدا،دوو ڕاهەیە:

یەکەم: باش نیە (كَرَاهَةً تَنْزِيهِيَّةً)،چونکە خشوعی تیانیە.

ئەگەر ترسی هەبوو بچێتە سەرئاوو،پێش نوێژکردنەکە،کاتی نوێژەکە نامێنێت،ئەوە نوێژەکە پێش ئەخات. نوێژەکەش دروستە بەڵام مکروهە(باش نیە)،بەڕای نەوەوی.باشتریشە دوبارەی بکاتەوە.

دوەم: نوێژەکەی پوچەڵە،بەڕای ظاهرية.

**الحَدِيثُ ٢٤// عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : أَنَّ النَّبِيَّ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: التَّثَاؤُبُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ..**

باوێشك دان لەشەیتانەوەیە،هەرکەسێکتان باوێشکی دا با بەپێی توانا زاڵ بێت بەسەریدا.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح مسلم ،كتاب الزهد والرقائق، باب تشميت العاطس (٥٤٢٠).وترمذي،لای بخاری هاتوە: وَلَا يَقُلْ ها،فَإِنَّمَا ذلِكَ مِنَ الشَّيْطانِ يَضْحَكُ مِنْهُ،با نەڵێت ها چونکە ئەوە لە شەیتانەوەیەو پێی پێئەکەنێت.

**مانای وشەکان//** فَلْيَكْظِمْ: نەیەڵێت،بیگرێتەوە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** باوێشك دان نیشانەی زۆر خواردن وتەمبەڵیە،کەشەیتانیش ئەودوانەی خۆشەوێت،کەواتە باوێشك لەشەیتانەوەیە.

**باسی دووەم/** لەترمذي وبخاريدا:( في الصَّلَاةِ )،زيادكراوه،فەرمان كردن بە زاڵبون بەسەر باوێشكدا،بەكاتی نوێژ ئەبەسترێتەوە،

**باسی سێیەم/** باوێشك دان ووتنی(هـا ) لەوكاتەدا،پێچەوانەی خشوع ودڵ ئاگابونە.

**باسی چوارەم/** پێویستە لەكاتی باوێشكدا دەست بەدەمەوە بگیرێت،بە بەڵگەی فەرمودەی: ئەگەر یەكێك لەئێوە باوێشكی دا با دەست بگرێت بەدەمیەوە،چونكە شەیتان لەگەڵ باوێشكدا دێتە ناو دەمەوە.[1] أحمد وبوخاری وموسلیم گێراویانەتەوە.

**.الحَدِيثُ ٢٥// عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: قَاتَلَ الله اليَهُودَ إِتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيائِهِمْ مَسَاجِدَ..**

خوای گەورە جولەكە بكوژێت،چونكە لە سەر گۆڕی پێغەمبەرانیان مزگەوتیان دروست ئەكرد.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** صحيح البخاري ،كتاب الصلاة،أبواب استقبال القبلة، باب الصلاة في البيعة

(٤٢٨) .صحيح مسلم ،كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب النهي عن بناء المساجد (٨٥٦).

**مانای وشەكان//** المَساجِد: كۆی المسجد،ئەگەر بە كەسری جیم بێت،ئەو شوێنەیە كە نوێژی تیا ئەكرێت،بەفتحی جیم یش ئەو شوێنەیە سوجدەی لەسەر ئەبرێت. قاتَلَ الله اليَهُودَ:لەعنەتی خوایان لێبێت،یا بیانكوژێت ولەناویان بەرێت.

---

[1] **إذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَضَعْ يَدَهُ عَلَى فَمِهِ،فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ مَعَ التَّثَاؤبِ. مسند أحمد بن حنبل ، ومن مسند بني هاشم**
**مسند أبي سعيد الخدري رضي الله عنه ( ١١٠٨٧ ).**

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** گۆڕ دروست کردن لەمزگەوتدا لەوە فراوانترە،نوێژی بۆ بکرێت یا لەسەری بکرێت: لەمسلیم دا هاتوە: لەسەرگۆڕ دامەنیشن،ونوێژی بەرەو ڕوو،وە لەسەریا مەکەن.[1]

**باسی دوەم/** بیضاوي ئەڵێت: لەبەرئەوەی جولەکەو دیانەکان،کڕنۆشیان بۆ گۆڕەکان ئەبرد،وەك بەگەورە زانینێك وئەیانکردە قیبلە و لە نوێژدا ڕویان تێئەکرد،وەکو بتیش تەماشایان ئەکرد،لەبەرئەم هۆکارانە لەعنەتیان لێکراو،ڕێگریش لەموسڵمانان کرا.

**باسی سێیەم/** بیضاوي جارێکی تریش ئەڵێت: بەڵام کەسێك مزگەوتێك لە تەنیشت پیاوچاکێکەوە دروست بکات،تاکو لەنزیکی ئەودا بەرەکەتی دەست بکەوێت،نەك بۆ گەورەزانین یا ڕوکردنە گۆڕەکە،ئەو هەڕەشەیە نایگرێتەوە.

صەنعانی لەبەدواداچونیدا بۆ قسەکەی بیضاوي ئەڵێت:

وتەکەی (نەك بۆ گەورەزانین) وەڵامەکەی ئەوەیە: بە تەنها مزگەوت دروست کردن لەنزیکیەوە،خۆی بەگەورە زانینە،پاشان فەرمودەکانی ڕێگریکردن بە ڕەهایی هاتوە،ئەوپاساوانەش هیچ بەڵگەیەکی نیە.

**باسی چوارەم/** وا دیارە هۆکاری ڕێگریکردنەکە ئەمانە بێت:

١.بۆ ڕێگرتن لە چونە ناو حەرام (بت پەرستی).

٢.دور کەوتنەوە لە خۆچواندن بەو بتپەرستانەی بێ گیانەکان بەگەورە دائەنێن،کەنابیستن وسودو زیانیان نیە.

٣.ماڵ سەرف کردنی بە خۆڕاو زیادەڕۆییەکی بێسودی تیایە.

٤.هۆیەکە بۆ داگیرساندنی چراو ئاگر لەسەر گۆڕ،کە کەسێك بیکات نەفرەتی لێکراوە.

---

[1] لَا تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ وَلَا تُصَلُّوا إِلَيْهَا وَلَا عَلَيْهَا. صحيح مسلم ،كتاب الجنائز،باب النهي عن الجلوس على القبر والصلاة عليه،١٦٦٦

٥.خراپــــی هەڵبەســــتنی گـــۆڕ، لــــەژمارە نایــــەت.إبــــن عبــــاس ئەیگێڕێتــەوە:پێغەمبــەری خــوا لەعنــەتی لەوئافرەتانــە کــردوە کــە ســەردانی گــۆڕ ئەکــەن و لــە ســەردانەکەیاندا ئەیکەنــە مزگــەوت وئــاگری لەســەر دائەگیرسێنن.[1] ابو داود ترمذي ونسائي و إبن ماجه ئەیگێڕنەوە.

<u>باســی پێنجــەم/</u> زیــادکردنی وشــەی (النَّـصَارَى)لــە صــەحیحی موســلیمدا دوای وشــەی (اليَهُـود) مایــەی پرسیارە،چــونکە النَّـصَارَى (دیانــەکان) جگــە لــە عیــسا هــیچ پێغەمبـــەرێکی تریـــان نیە،لـــەنێوان عیـــسا ومحمـــددا هـــیچ پێغەمبـــەرێك نەهاتوەو،ئەویش وەفاتی نەکردوە،بەڵکو لەئاسمانەو زیندوە.

وەڵامی ئەم پرسیارە دراوەتەوە،کە:

١.ئــەوان چــەندەها پێغەمبـــەریان بۆهـــاتوە کـــە فـــەرمانی گەیانـــدنیان پێنەکراوە،وەك حەواریەکان ومریەم لەڕایەکدا.

٢.مەبەست لە (أَنْبِيائِهِمْ) واتە پێغەمبەری هەردوولایان.

٣.یـــان مەبەســـتی پێغەمبـــەرو شـــوێنکەوتوە گەورەکانیان،بـــەڵام تـــەنها باســـی پێغەمبـــەران کراوە،بـــە بەڵگـــەی ڕیوایـــەتی موســـلیم: ئـــەوان گـــۆڕی پێغەمبەران وپیاوچاکانیان ئەکردە مزگەوت.[2]

٤.پێغەمبـــەری جولەکـــەش پێغەمبـــەری دیانە،چـــونکە فـــەرمانیان پێکـــراوە بـــاوەڕ بـــە هـــەموو پێغەمبـــەرێك بێنن،پێغەمبـــەرانی بـــەنو ئیـــسرائیلیش لای هەردولا بەپێغەمبەر ناوئەبرێن.

---

[1] لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَائِرَاتِ الْقُبُورِ وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَسَاجِدَ وَالسُّرُجَ. سنن أبي داود،كتاب الجنائز، باب في زيارة النساء القبور ( ٢٨٣٢ ).

[2] كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ. صحيح مسلم ،كتاب المساجد ومواضع الصلاة،باب النهي عن بناء المساجد ( ٨٥٩ ).

الحَـديث ٢٦// عَـنْ أَبـي سَعيد الخُـدْري رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قـالَ: قـالَ رَسولُ الله صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: لَـا تُـشَدّ الرِّحـالُ إلّـا إلى ثَلاثَـةِ مَـساجِدَ: المَـسجد الحَرام، وَمَـسْجِدي هـذا وَالمَـسْجِد الأقْـصى..بـه تايبـەتی سـەردانی هـیچ مزگـەوتێك ناكرێت، جگـە لـە سـێ مزگـەوت: مزگـەوتی حـەرام-لەمەككـە- مزگەوتی پێغەمبەر-لەمەدینە-مزگەوتی ئەقصا-لەفەلەستین-.

گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە// صـحيح البخـاري ،كتـاب الجمعـة،ابواب تقـصير الـصلاة ، بـاب فـضل الـصلاة في مـسجد مكـة والمدينـة (١١٤٧). صـحيح مسلم - كتاب الحج،باب لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد ( ٢٥٥٤).

مانـــای وشـەكان// الرِّحَـالْ: كۆپـان. شَـدُّ الرِّحَـال: خۆئامـادەكردن بـۆ سـەفەر. المَسْجِدُ الحَرَام: مزگەوتی حەرامكراو.

سەرباسەكان//

باســـی یەكـــەم/ لَـا تُـشَدّ: بـە دو شـێوە خوێندراوەتـەوە: سـكونی پـیتی دال،ئەگـەر لا ناهیـە جازمـە بێـت،وەضـم ی پـیتی دال ئەگـەر لا نافیـە بێـت. نفی ش هەر مانای نهی ئەگەیەنێت،ماناكەشی وای لێدێت:

لـە شـەرعدا دروسـت نیـە تـەنها بـۆ ئـەم سـێ شـوێنە نـەبێت، بەتایبـەتی ســـەردان بكرێـــت،بۆ خواپەرستی،چـــونكە تایبەتمەنـــدن بەكۆمـــەڵێك تایبەتمەندیەوە كەخوا پێی بەخشیون.

باســـی دوەم/ مەبەسـت لـە المَـسْجِدُ الحَـرام هـەموو حەرەمـە (واتـە شـاری مەككە)،بە بەڵگەی:

١.گێڕدراوەتـەوە لەڕێگـەی عطـاءوە،كـەپێی وتـرا: ئـەم گەورەییـە تـەنها بـۆ مزگەوتەكەیـــە،یا بـــۆ هـــەموو حەرەمەكەیـــە؟ وتـــی: بـــەڵكو بـــۆ هـــەموو حەرەمەكەیە.[1] أبوداود الطيالسي گێڕاویەتەوە.

---

[1] قيلَ لَهُ: هَذا الفَضْلُ في المَسْجِدِ الحَرامِ وَحْدَهُ أمْ في الحَرَمِ؟ قالَ: بَلْ في الحَرَمِ كُلِّهِ. مسند الطيالسي،عبد الله بن الزبير ( ١٤٤٩).

٢.کاتێك پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ویستی مزگەوتی مەدینە دیاری بکات،فەرموی: ئەم مزگەوتەی من.

**باسی سێیەم/** المسجد الاقصى بيت المقدس ە،وەك پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،فەرمویەتی.هۆی ناوەکەشی ئەوەیە: کە لەلایەوە هیچ مزگەوتێکی تر نەبوە (لەوکاتەدا).بەوتەی زمخشری.

**باسی چوارەم/** ئەم سێ مزگەوتە باشترینن،باشترینیشیان المسجد الحرامە،پاشان مزگەوتی مەدینە،ئەنجا المسجد الاقصى،بە بەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە،چونکە ئەوەی پێشتر باسبکرێت،بەڵگەی چاکیەتی.

٢.فەرمودەی ابوالدرداء بە مەرفوعی: نوێژێك لەمزگەوتی حەرامدا بە سەدهەزار نوێژە،نوێژیش لە مزگەوتی مندا بە هەزار نوێژە،نوێژیش لە مسجد الاقصیدا بەپێنجسەد نوێژە.[1] البزار بەپلەی حسن گێراویەتەوە.

**باسی پێنجەم/** ئایا ئەو خێرە بۆ نوێژی فەرزو سوننەتە،یا تەنها بۆ فەرزە؟ دوو ڕا هەیە:

یەکەم: تایبەتە بەفەرزەوە،بەڕای الطحاوي کەسانی تریش،بە بەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر: باشترین نوێژی موسڵمان ئەوەیە لەماڵەوە ئەنجامی بدات،جگە لە فەرزەکان.[2]

دوەم: فەرزو سوننەتیش ئەگرێتەوە.

---

[1] الصَّلَاةُ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ بِمِئَةِ أَلْفِ صَلَاةٍ،وَالصَّلَاةُ فِي مَسْجِدِي بِأَلْفِ صَلَاةٍ،وَالصَّلَاةُ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ بِخَمْسِمَائَةِ أَلْفِ صَلَاةٍ. مشكل الآثار للطحاوي - باب بيان مشكل ما روي عنه عليه السلام في المساجد التي ( حديث : ٥٠٠ ).

[2] أَفْضَلُ الصَّلَاةِ: صَلَاةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ. صحيح ابن حبان ، باب الإمامة والجماعة، باب الحدث في الصلاة ، ذكر البيان بأن صلاة المرء النوافل كلها في بيته كان أعظم ( ٢٥٢٨ ).

صەنعانی ئەڵێت: شاراوە نیە وشەی الصَّلَاة لام ی جنس ی تعريفي پێوەیە،کەواتە سوننەتیش ئەگرێتەوە،مەگەر بوترێت: ئەگەر الصَّلَاة بەڕەهایی وترا تەنها فەرز ئەگەیەنێت،وسوننەت ناگرێتەوە.

**باسی شەشەم/** بۆسەفەرکردن بەتایبەت بۆ جگە لەو سێ مزگەوتە،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بەدەر لەو سێ مزگەوتەحەرامە سەفەربکرێت،وەك: سەردانی پیاوچاکان زیندوو بن یا مردوو،بەمەبەستی نزیك بونەوە لەخوا،وە بۆ شوێنەپیرۆزەکان بەمەبەستی دەستکەوتنی بەرەکەت ونوێژ کردن تیایدا.ئەمەش ڕای ابومحمد الجوینی وقازی عیاض وکۆمەڵێکە،بە بەڵگەی:

أ.چەمکی بە تەنها (الحَصْرْ) لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا.

ب.ابوبصرەی غفاری إنکاری ابوهریرەی کرد،کاتێك بیستی چوە بۆ کێوی طور،وە وتی: ئەگەرپێش ئەوەی بڕۆشتیتایە تۆم ببینایە نەئەڕۆشتیت،بەڵگەی ئەم فەرمودەیەشی هێنایەوە (بۆ ابوهریرە) ئەویش ڕەزامەندی دەربڕی.[1] اصحاب السنن گێڕاوایەنەتەوە.

دوەم: حەرام نیە،بەڕای جمهور.چەند فەرمودەیەك بۆ ڕاکەیان ئەهێننەوە،وەچەندین لێکدانەوەی دوریش بۆ فەرمودەکە ئەکەن.

صەنعانی وای بۆ ئەچێت کە ئەم فەرمودانە ناتوانرێن بکرێنە بەڵگە،لێکدانەوەش نابێت مەگەر لە کاتێکدا نەبێت کە بەڵگەی پێچەوانەی فەرمودەکە هەبێت.

---

[1] إِنْكَارُ أَبِي بَصْرَةَ الغفاري عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ خُروجه إِلَى الطُور،وَقَالَ:لَوْ أَدْرَكْتُكَ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مَا خَرَجْتَ،واسْتَدَلَّ بِهَذَا الحَدِيثِ وَوَافَقَهُ أَبُو هُرَيرة. مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار حديث أبي بصرة الغفاري ( ٢٣٢٠٩ ).

**الحَديثُ ٢٧// عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَانَ إِذَا جَاءَهُ أَمْرٌ يَسُرُّهُ، خَرَّ سَاجِداً لِلَّهِ.**

**هەرکات پێغەمبەری خوا هەواڵێکی خۆشی پێبگەشتایە،کڕنۆشی بۆخوا ئەبرد.**

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** پێنج کەسەکە جگە لەنسائی. سنن ابن ماجه ،کتاب اقامة الصلاة، باب ما جاء في الصلاة والسجدة عند الشكر (١٣٩٠) [1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەبارەی حوکمی سوجدەی سوپاسکردنی خوا،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: دروستە،بەڕای هادویە وشافیعی واحمد،بەبەڵگەی:

١.فەرمودەی باسلێکراو.

٢.سوجدە بردنی پێغەمبەر دوای ئایەتی﴿وَظَنَّ دَاوُدُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعاً وَأَنَابَ﴾{ص:٢٤}.

وە فەرمویەتی: سوجدەبردنەکە بۆ ئێمە سوپاسکردنەو بۆ داودیش تەوبەکردنە.[2] مانای ئایەتەکەش ئەوەیە: داود پێغەمبەر زانی کە تاقیمان کردوەتەوە،بۆیە داوای لێخۆشبونی لە پەروەردگاری کردوو،کڕنۆشی بردوو گەڕایەوە.

دوەم: دروست نیە(مکروهە)،بەڕای مالك: چونکە هەرچەندە پێغەمبەری خوا نیعمەتی زۆری بەسەردا ڕژاوە،بەڵام نەبیستراوە سوجدەی بردبێت.

سێیەم: نە مکروهە ونە سوننەتە،واتە موباحە،بەڕای ابوحەنیفە،چونکە لەپێغەمبەرەوە نەگێڕدراوەتەوە.

---

[1] البانی پلەی حسن ی داوەتی.

[2] سُجُودُ رَسولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في الآيَةِ:وَظَنَّ داوُدُ أَنَّما فَتَنَّاهُ،فَاسْتَغْفَرَ رَاكِعاً وَأَنَابَ. وَقَالَ:هِيَ لَنَا شُكْرٌ وَلِدَاوُدَ تَوْبَةٌ.

وەڵـامی دووڕاکـەی دوایـی دراوەتـەوە کـە: فـەرمودە لەپێغەمبـەرەوە هەیـە مەشروعیەتی بسەلمێنێت.

**باسی دوەم/** ئایا پاك وخاوێنی بۆ سوجدەبردنەکە،مەرجە یان نا؟ دوو ڕا هەیە:

یەکـــەم: مەرجە،بـــەڕای أبوالعبـــاس والمؤیـــدبالله والنخعـــي وهەنـــدێك لەهاوەڵانی شافعی،ئەیشوبهێنن بەنوێژەوە.

دوەم: مـــەرج نیە،بـــەڕای إمـــام یـــەحیاو أبوطالـــب،لای صـــەنعانی ئـــەم ڕایـــە دروسترە،بە بەڵگەی:

١. سوجدەی سوپاس گوزاری ،وەك نوێژ نیە.

٢.لەفەرمودەباسلێکراوەکاندا بەمەرجی دانەناوە.

**باسی سێیەم/** ئایا الله أَكْبَرْ،بۆ سوجدەی شکر ئەکرێت؟ دوو ڕاهەیە:

یەکەم:الله أَكْبَرْ ئەکرێت،بەڕای المهدی لەکتێبی البحردا.

دوەم: الله أَكْبَـــرْ ناکرێت،چـــونکە لـــە فـــەرمودە باســـلێکراوەکاندا باسنەکراوە.

**باسی چوارەم/** ابو طالب ئەڵێت: ڕو ئەکرێتە قیبلە.

**باســـی پێنجـــەم/** إمـام یـەحیا ئـەڵێت: لـەکاتی نوێـژدا سـوجدەی شـوکر نابرێت،چونکە بەشێك نیە لەنوێژەکە.

بـــەڵام صـــەنعانی ئـــەڵێت: هـــۆی ســـوجدە بردنەکـــە بـــۆ دەســـتکەوتنی بەخشـــشێکە یـــا لاچـــونی ناخۆشیەکە،لەنوێژیـــشدا ئـــەکرێت ســـوجدە ببرێت،وەك سوجدەی تلاوە.

**الحَـديث ٢٨// ١.عَـنْ عَبْـدِالله بـنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنهُمَـا: أنّ رَسُـولَ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ قَالَ: صَلاةُ الجَمَاعَةِ أفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ الفَذّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً.**

**٢.وَعَنْ أبي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ أنّ رَسُولَ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ قَـالَ: صَلاةُ الجَمَاعَةِ أفْضَلُ مِنْ صَلاةِ الفَذّ بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ جُزْءاً.**

نوێـژی بەكۆمـەڵ بەبیـست وحـەوت پلـە لەنوێـژی تـاك باشـترە.یـا: بـە بیست وپێنج بەش لەوباشترە.

__گێـــڕەرەوەی فەرمودەكــــە//__ صـحیح البخـاري ، كتـاب الأذان، أبـواب صـلاة الجماعـة والإمامـة ، بـاب فـضل صـلاة الجماعـة( ٦٢٧). صـحیح مـسلم ، كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب فضل صلاة الجماعة ( ١٠٧٣).

__ماناى وشەكان//__ الفَذّ: تاك.

__سەرباسەكان//__

__باسـی یەكــەم/__ دژایـەتی نیـە لـەنێوان هـەردوو گێڕانـەوەی بیـست وحـەوت وبیست وپێنج،بەم شێوەی خوارەوە ماناكانیان ڕێكخراوە:

١.ژمـارە لێـرەدا مەبەسـت نیـە،ژمارە بیـست وحـەوت ،بیـست وپێـنج لـەخۆ ئەگرێت،باســكردنی كــەم ڕێگــر نیــە لــە زۆر،صــەنعانیش ئــەم ڕایــەی بەپەسەند داناوە.

٢.پێغەمبــەری خــوا لەســەرەتادا ژمــارە كەمەكــەی پێڕاگەیاندون،پاشــان ژمارە زۆرەكە،وەك زیادە فەزڵێكی خوای گەورە.

٣.بیــست وحــەوت بــۆ كەســێكە لەمزگەوتــدا نوێــژی بەكۆمــەڵ بكات،بــەڵام بیست وپێنج بۆ كەسێكە لە مزگەوتدا نوێژی بەكۆمەڵ نەكات.

٤.بیــست وحــەوت بۆكەســێكی دورە مزگەوتــە،و بیــست وپێنجەكــەش بــۆ كەسی نزیك مزگەوتە.

٥.زۆریەكە بۆ زۆرو كەم ی جەماعەتەكەیە.

٦.جیاوازیەکە بۆ باردۆخی نوێژخوێنەکە ئەگەڕێتەوە:زاناتر بێت،زیاتر ئاگای لەنوێژەکە بێت.

هەندێك کەسیش چەند ڕایەکی بێ بەڵگە ئەهێننەوە،إبن حجر لە فتح الباري دا ئەم ڕایانەی باسکردوە.

**باسی دوەم/** بەش وپلە بە نوێژ لێکدراوەتەوە،نوێژی کۆمەڵ بە بیست وحەوت نوێژی تاکە.

**باسی سێیەم/** فەرمودەکە هانمان ئەدات بۆ پابەند بون بەکۆمەڵەوە.

**باسی چوارەم/** فەرمودە باسلێکراوەکە وەڵامە بۆ ئەوانەی نوێژی تاك بێ پاساو بە پوچەڵ دائەنێن،وەکۆمەڵ ئەکەنە مەرجی دروستبونی نوێژ. چونکە پلەبەندی نێوانیان (تاك وکۆمەڵ) دروست بونی هەردوکیان ئەگەیەنێت.

**الحَديثُ ٢٩// عَنْ أَبِي موسى رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ،أَنّ رَسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قالَ: أَحِلّ الذّهَبُ وَالحَريرُ لِإناثِ أُمّتي،وَحُرّمَ عَلى ذُكورِها.**

ئاڵتون وئاوریشم بۆژنان وکچانی ئوممەتەکەم حەڵاڵ کراوەو،لەسەر پیاوانیان حەرام کراوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد،ونسائي كە بە صحيحي داناوة. السنن الصغرى ،كتاب الزينة،تحريم الذهب على الرجال ( ٥٠٨١).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە بەڵگەی حەرامبونی لەبەرکردنی ئاڵتون و ئاوریشم ئەگەیەنێت. ڕاخەری ئاوریشمیش هەمان حوکمی هەیە.

**باسی دوەم/** دەربارەی لەبەرکردنی ئافرەت بۆ ئاڵتون و ئاوریشم،دوو ڕاهەیە:

یەکەم: دروستە بۆیان،بە کۆدەنگی زانایان،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: دروست نیە،بە بەڵگەی ئەوەی: فەرمودە باسلێکراوەکە لابراوە( منسوخ ).

الحَـديثُ ٣٠// عَـنْ عِمْـران بـن الحُـصَيْن رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ: أَنَّ رَسـولَ الله صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قـالَ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ إِذا أَنْعَمَ عَلَى عَبْدِه نِعْمَةً أَنْ يُرَى أَثَر نِعْمَتِه عَلَيْه..

خـواى گـەورە پێـى خۆشـە كـە بەهرەيـەكى بەكەسـێك بەخـشى،شوێنەوارى ئەو بەخششەى پێوە دياربێت.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە// البيهقي والنسائي والترمذي والحاكم.[1]

سەرباسەکان//

ئـەم فەرمودانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەى كـە: خـواى گـەورە پێـى خۆشـە شـوێنەوارى بەخشـشەكانى لـەخواردن وپۆشـاكدا بـە بەندەكانيـەوە ببينێت،لەبەر ئەم هۆيانە:

أ.سوپاسكردنى ئەو بەخششانەيە،بەكردار.

ب.ئەگـەر كەسـێكى هـەژار لـەو شـێوەدا ببينێت،ئەچـێت بـۆ لاى تـاكو خێرى پێ بكات.

ج.خـۆ ناشـرين نيـشاندان، سـواڵكردنە بۆخـۆى و دەرخـستنى فەقيريـە بـەزمانى حـاڵ،وەك وتـراوە: زمـانى حـالم بەشـكاتكردن ئەكەوێتـە گـۆ.يـا: بينينى ديمەنم برى قسەكردنمە.

[1] سنن الترمذي الجامع الصحيح،الذبائح،أبواب الأدب عن رسول الله صلى الله عليه وسلم ،باب ما جاء إن الله تعالى يحب أن يرى أثر نعمته (٢٨١٦) . البانيش بە صحيحى داناوە.

**الحديث ٣١// عن أنس رَضيَ اللّهُ عَنْهُ قالَ: قالَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ: لا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُم المَوْتَ لِضُرٍ نَزَلَ بِه. فَإِنْ كانَ لابُدَّ مُتَمَنِّياً، فَلْيَقُلْ: اللّهُمَّ أَحْيِني ماكانَتْ الحَياةُ خَيْراً لي، وَتَوَفَّني ماكانَتْ الوَفاةُ خَيْراً لي.**

با کەستان ئاوات بەمردن نەخوازێت.ئەگەر هەر ناچار بوو،با بلێت: خوایە ئەگەر ژیان بۆ من خێری تیایە،ژیانم پێ ببەخشە،ئەگەریش مردن خێری تیایە مردنم پێ ببەخشە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري ، كتاب الدعوات، باب الدعاء بالموت والحياة ( ٥٩٩٩). صحيح مسلم ،كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار، باب كراهة تمني الموت لضر نزل به ( ٤٩٤٦).

**مانای وشەکان//** الجَنازَةُ: کەسی مردوو یا شوێنی دانانی مردوو.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ڕێگریکردنە لە خۆزگە بەمردن خواستن،لەکاتی ناڕەحەتی،یاترسان لە دوژمن یا نەخۆشی یا نەبونی یا هەر ناخۆشیەکی تری دنیا،چونکەترسان وئارام نەگرتن ورازی نەبونە بە قەزای خودا.

**باسی دووەم/** بەڵام ئەگەر خۆزگە خواستنەکە بۆ ئەوانەی سەرەوە نەبوو،بەڵکو لەترسی دین فەوتان بوو،ئەوخۆزگەیە باشە،بە بەڵگەی:

١.فەرمودەی: لِضُرٍ نَزَلَ بِهِ، لەفەرمودە باسلێکراوەکەدا.

٢.فەرمودەی: ئەگەر ویستت بەندەکانت تاقیبکەیتەوە،بممرێنە بەبێ تاقیکراوەیی.[1]

٣.عبدالله بن رواحەو چەندانی تریش لەسلف ئاواتی شەهیدبونیان خواستوە.

---

[1] وَإِنْ أَرَدْتَ بِالنّاسِ فِتْنَةً فَاقْبِضْني إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُون. سنن الترمذي الجامع الصحيح الذبائح، أبواب تفسير القرآن عن رسول الله صلى الله عليه وسلم باب ومن سورة ص ( ٣٢٣٩ ).

٤.فـــەرمودەی مـــریم ســـەلامی خـــوای لێبێـــت، وەك لـــە ئایەتەكـــەدا هـاتوە:﴿يَـالَيْتَنِي مِـتُّ قَبْـلَ هَـذَا﴾ {مـريم:٢٣}،واتـە: خۆزگـە پـێش ئـەم كاتـە بمردمایـە. ئـەبینین ئاواتـەخوازی مردنـە لەترسـی كـافربونی خـەڵكی بـۆ بینینی حاڵی ئەو،وە بەد بەختبونی كەسانێك بە هۆی ئەوەوە.

__باسـی سـێیەم/__ فـەرمودەی: (فَـإِنْ كَـانَ لاَبُـدَّ مُتَمَنِّيـاً)،واتـە ئەگـەر ئـارامی نەما،ئینجا ئەو نزایە بكات،باشتریش وایە ئەو نزایە هەر نەكات.

**الحـديث ٣٢// عـنْ عبـدالرحمان بـنِ أبـي لَيْلَـى قَـالَ: كَـانَ زَيْـدُ بـنِ أرْقَـم رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ يُكَبِّـرُ عَلَـى جَنَائِزِنَـا أرْبَعاً،وَإِنَّـهُ كَبَّـرَ عَلَـى جَنَـازَةٍ خَمْساً،فَسَأَلْتُهُ،فَقَالَ: كَـانَ رَسولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يُكَبِّرُهَا...**

زەیـدی كـوڕی ئەرقـەم لەسـەر مردوەكانمـان چـوار جـار الله اكـبری ئەكرد،بـەڵام جارێكیـان پێـنج جـار الله اكـبری كرد،كەپرسـیاری لێكرا،فەرموی:پێغەمبەری خواش ئەوەندە الله اكبری كردوە.

__گێـڕەرەوەی فەرمودەكـە//__ صـحيح مـسلم ، كتـاب الجنـائز، بـاب الـصلاة علـى القبر ( ١٦٤٠). وچواركەسەكە.

__سەرباسەكان//__

__باسـی یەكـەم/__ لـەبارەی ژمـارەی (الله اكـبر)ەكـان لەنوێـژی مـردودا، چـەند ڕایەك هەیە:

یەكـەم: تـەنها چـوار جارە،بـەڕای كۆمـەڵی پێـشینەو دوای ئەوانیش،لەناویانـدا چـوار سـەر مەزهەبەكـە،إبن عبـدالبر ئـەڵێت: لـەناو زانایاندا تەنها إبن أبي ليلى پێی وایە كە پێنج جارە.

جمهور بەچوار بەڵگە ئەم ڕایە بەڕاست دائەنێن:

١.لـە ڕێگـەی كۆمـەڵێك هاوەڵانـەوە گێڕدراوەتەوە،كـەزۆرترن لەوانـەی پێـنج جاریان گێڕاوەتەوە.

٢.گێڕانەوەكەیان لای بوخاری وموسلیم هەیە.

٣.هاوەڵان کۆدەنگن لەسەر ئیش پێکردنی.

٤.دوایین کردارێک بوو لەوبوارەدا کەپێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردبێتی،وەك حاکم لە إبن عباس ئەیگێڕێتەوە.[1]

دوەم:پێنج جار الله أكبر ئەکرێت،بەڕای زۆربەی هادەویە،بەڵگەشیان:

لەعەلیەوە گێڕدراوەتەوە خوای لێ ڕازیبێت، کە: پێنج جار الله اکبری لەسەر فاطمە کردوە،حەسەنیش پێنج الله اکبری لەسەر باوکی(علی) ردوە،ئیبن الحنفیەش پێنج الله اکبری لەسەرئیبن عباس کردوە.

فەرمودەکانی چوارجاریش والێك ئەدەنەوە،کە مەبەستی چوارالله اکبر جگە لەالله اکبری دەستپێکردن.

صەنعانی ئەڵێت: ئەمە لێکدانەوەیەکی دورە.چەند ڕایەکی تریش لە بابەتەکەدا هەن.

---

[1] المستدرك على الصحيحين للحاكم ،كتاب الجنائز ( ١٣٦١).

**الحديث ٣٢// عن جابر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قال: نَهَى رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُجَصَّصَ القَبْرُ،وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْه،وَأَنْ يُبْنَى عَليه...**

پێغەمبەری خوا هەڵبەستن و دانیشتن لەسەرگۆڕو بیناکردن لەسەر ی قەدەغەکردوە.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صحيح مسلم ،كتاب الجنائز،باب النهي عن تجصيص القبر والبناء عليه ( ١٦٦٣).

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکــەم/** کۆمەڵی زانایان پێیان وایە هەڵبەستن وبیناکردن، بۆ خۆ بەدورگرتنە لەو ئیشە. بەڵام دانیشتن لەسەری بۆ حەرامبونە.

بەڵام صەنعانی ئەڵێت: ئەمە کۆکردنەوەی حەقیقەت ومەجازە،نازانرێت چی وایلێکردون وشەکان لەسەر حەقیقەت لابەن،هەرچەندە بناغەی نهی بۆ حقیقەتە نەك مەجاز.

**باســی دوەم/** فەرمودەکە بەڵگەی حەرامبونی ئەوانەی پێشوە،چونکە نهی لەبناغەدا بۆ حەرامبونە.

**باسی سێیەم/** چەند فەرمودەیەکی تر پشتگیری ئەم فەرمودەیە ئەکەن:

أ.فەرمودەی إبن مسعود بە مەرفوعی:خوای گەورە لەعنەتی لەو ئافرەتانە کردوە سەردانی گۆڕ ئەکەن ومزگەوت وچرای لە سەر ئەکەن.[1] أبوداود وترمذي ونسائی گێڕاویانەتەوە.

ب.لەگێڕانەوەیەکی نسائیدا: ڕێگریکردوە لەدروست کردنی گۆڕو زیادکردن لەسەری وهەڵبەستنی و نوسین لەسەری.[2]

---

[1] لَعَنَ الله زائراتِ القُبورِ والمُتَّخذينَ عليها المَساجدَ والسُرَج. سنن أبي داود ،كتاب الجنائز، باب في زيارة النساء القبور ( ٢٨٣٣ ).

[2] نَهى أنْ يُبْنَى علىَ القَبرِ،أو يُزادَ عَليهِ،أو يُجَصَّصَ،أو يُكْتَبَ عَليه. السنن الصغرى،كتاب الجنائز،الزيادة على القبر ( ٢٠١٠ ).

ج.بوخـارى لەعائـشەوە ئـەڵێت:پێغەمبـەرى خـوا لـەو نەخۆشـيەى كـە پێـى وەفـاتى كـردو هەڵنەسـتايەوە،فەرموى: لەعنـەتى خـوا لـە جولەكـەو گاوران،كە گۆڕى پێغەمبەرانيان ئەكەنە مزگەوت.[1]

د.بوخارى وموسليم بەم گێڕانەوەيە لە أبوهريرەوە هاوڕان.

ه.ترمـذي لەگێڕانەوەيەكـدا كـە بـە پلـەى حەسـەنى دانـاوە: عـەلى بـە أبوالهيـاج الاسـدى ئـەڵێت: بـۆ ئـەوە ئـەتنێرم كـە پێغەمبـەرى خـوا مـنى بـۆ نـاردبوو، گۆڕێـك نەهێڵم بە تەختكراوەيى نەبێت،پەيكەرێك نەهێڵم بە لابراوەيى نەبێت.[2]

<u>باســى چــوارەم/</u> حەرامـە دروسـتكردنى بينـاو جوانكـارى و هەڵبەسـتن و دانـانى سـندوقى ڕازاوە لەناوياو،پـەردەڕاگرتن بەسـەرياو خۆهەڵـسوان پيايدا،بەم بەڵگانە:

أ.ئـەو هەواڵـەى كـە لەعنـەت وچـواندنى تيايە،كـە ئەفـەرموێ: گۆڕەكـەم مەكەنە بت وبيپەرستن.[3]

ب.چـونكە لەگـەڵ تێپـەربونى كـات و بڵاوبونـەوەى نەزانيدا،سەرئەكێـشێ بـۆ بتپەرسـتى، كـەلاى كۆمـەڵانى پێـشووتر هـەبون.لەبەرئـەوە بـە تـەواوەتى ڕێى لێگرتوە تا نەگاتە ئەو خراپەيە.

ج.حـەرامكردن،گونجاوترين حيكمەتێكـە لـەدانانى ياسـا بـۆ بەدەسـتهێنانى بەرژەوەنـدى ولابردنـى خراپـە،خۆبۆخۆى،يا بـەهۆى ئـەو هۆكارەوە.

---

[1] قالَ رسولُ الله صَلَى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ في مَرضه الذي لَمْ يَقُمْ منهُ:لَعَنَ الله اليهودَ والنصارىَ،إتَّخَذوا قُبورَ أنْبيائِهِمْ مَساجدَ. صحيح البخاري ،كتاب الصلاة، أبواب استقبال القبلة باب الصلاة في البيع (٤٢٨).

[2] أبْعَثُكَ عَلى ما بَعَثَني عَلَيْه رَسولُ الله صَلَى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ ،أنْ لا أدَعَ قَبْراً مُشْرِفاً إلّا سَوَّيْتُهُ،وَلا تِمْثالاً إلّا طَمَسْتُهُ. سنن الترمذي الجامع الصحيح ، أبواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم، باب ما جاء في تسوية القبور (١٠٠٦).

[3] لا تَجْعَلوا قَبْري وَثَناً يُعْبَدُ. موطا مالك ،كتاب قصر الصلاة في السفر، باب جامع الصلاة (٤١٩).

**الحديث ٣٤// عنْ إبنِ عبّاس رَضيَ اللّهُ عَنْهُمَا قالَ: مَرَّ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ بِقُبُورِ المَدينَةِ، فَأقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِه فَقالَ: السّلامُ عَلَيْكُمْ يا أَهْلَ القُبورِ، يَغْفِر الله لَنا وَلَكُمْ، أَنْتُمْ سَلَفُنا وَنَحْنُ بِالأَثَر...**

پێغەمبەری خوا بەلای گۆڕەکانی مەدینەدا تێپەڕی، ڕووی تێکردن و فەرموی: خەڵکانی گۆڕستان سەلامتان لێ بێت، خوا لەئێمەش و لە ئێوەش خۆش بێت، ئێوە پێشمان کەوتن وئێمەش بەدواتان دێین.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** سنن الترمذي الجامع الصحيح ، أبواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم، باب ما يقول الرجل إذا دخل المقابر (١٠٠٩)[1].

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ڕەوایەتی سەردانکردنی گۆڕە، وە سەلام کردن لە مردوانی، ئەگەر بە مەبەستی سەردانیش نەچوبێت، سەلامکردنەکەش وەك سەلامکردن لەزیندوانە.

بورەیدە ئەڵێت: پێغەمبەری خوا فێری ئەکردن کە چون بۆ گۆڕستان بڵێن: سەلام لەئێوە بێت خەڵکانی موسڵمان وباوەڕدار، ئێمەش ئەگەر خوا ئارەزوو بکات پێتان ئەگەینەوە، داوای سەلامەتی بۆ ئێمەو ئێوە ئەکەم.[2] موسلیم وأحمد وإبن ماجە، ئەیگێڕنەوە.

**باسی دوەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: مردوان هەست بە وانە ئەکەن کە بەلایاندا تێئەپەڕن وسەلامیان لێئەکەن، ئەگەرنا بە فیڕۆدانە. وا دیارە ئەم ئاگالێبونە بۆ ڕۆژی هەینی وڕۆژەکانی تریشە.

---

[1] ترمذي بە حەسەنی داناوە. البانیش ئەفەرمویت: فەرمودەیەکی لاوازە.

[2] :كانَ رَسولُ الله يُعَلّمَهُمْ إذا خَرجوا إلى المَقابِرأنْ يَقولوا: السّلامُ عَلى أهْلِ الدّيارِ مِنَ المُسْلمينَ والمُؤمِنينَ، وَإنّا إنْ شاءَ الله بِكُمْ لاحِقونَ، أسْألُ الله لَنا وَلَكُمْ العافيَةَ. صحيح مسلم، كتاب الطهارة ، باب استحباب إطالة الغرة والتحجيل في الوضوء ( ٣٩٣ ).

<u>باسی سێیەم/</u> ئەگەر مرۆڤ ویستی بۆ کەسێك بپاڕێتەوە،یا داوای لێخۆشبونی بۆبکات،لەدوعاکردن بۆ خۆیەوە دەست پێئەکات، بە بەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.نزا قورئانیەکان واهاتون:﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوانِنَا﴾{الحشر:١٠}واتە:پەروەردگارمان لە ئێمەش و لە براکانیشمان خۆش ببە.﴿وَاسْتَغْفِرْلِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ {محمد: ١٩}.واتە: داوای لێخۆشبون بۆ خۆت و بڕواداران بکە. چەندەها ئایەتی تریش.

<u>باسی چوارەم/</u> فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: ئەم نزایانەو نزای تریش،سودی بۆ مردوەکە هەیە،نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێبێت،کۆدەنگی زانایان دەربارەی گەشتنی دوعا بە مردوو لە شرح صحيح مسلم دا باس ئەکات.

<u>باسی پێنجەم/</u> دەربارەی سودی قورئان خوێندن بۆ مردوو،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم:پێی ناگات،بەڕای شافعی.

دوەم:پێی ئەگات،بەڕای احمد وکۆمەڵێك لەزانایان وهەندێك لەهاوەڵانی شافعی.

سێیەم: مرۆڤ بۆی هەیە پاداشتی چاکەکانی لەنوێژ،یا ڕۆژو یا حەج یا خێرکردن یا قورئان خوێندن یا زیکر یا هەر جۆرێکی تری پەرستش،بۆ خەڵکی تر بنێرێت،بەڕای کۆمەڵێك لە اهل السنه وزانایانی حەنەفیە.

ئەمەش دروسترین ڕایە،بە بەڵگەی:

١.دارقطني ئەیگێڕێتەوە:پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەر کرد: چۆن لەدوای مردنی دایك وباوکی لەگەڵیان باش بێت؟ لەوەڵامدا فەرموی: لەگەڵ نوێژی خۆیدا بۆ ئەوانیش بکات ولەگەڵ ڕۆژویدا بۆیان بەڕۆژوبێت.[1]

---

[1] أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَيْفَ يَبَرُّ أَبَوَيْهِ بَعْدَ مَوْتِهِما؟ فَأَجابَهُ بِأَنَّهُ: يُصَلِّي لَهُما مَعَ صَلاتِهِ، وَيَصُومُ لَهُما مَعَ صَلاتِهِ.

٢.ابوداود لە معقل بن يسار ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سورەتی یاسین بەسەر مردوەکانتاندا بخوێنن.[1] دیارە مردوش ئەگرێتەوە،(لەگەڵ کەسێك لەسەرە مەرگدا بێت)،بەڵکو لەڕاستیدا هەر بۆ مردوەکەیە.

٣.بوخاری وموسلیم ئەگێڕنەوە:پێغەمبەری خوا بەرانێکی بۆ خۆی،یەکێکی تریشی بۆ ئوممەتەکەی کرد بەقوربانی[2].

لەوانەی ڕابورد،ئاماژەیە بەوەی مرۆ سودمەند ئەبێت لەکرداری کەسانیتر.صەنعانیش بەڕایەکی بەهێزی داناوە.

[1] إِقْرَءوا على مَوْتاكُمْ سورةِ ياسين. سنن أبي داود ، كتاب الجنائز ،باب القراءة عند الميت ( ٢٧٣٠ ). البانی بەلاوازی داناوە.

[2] أَنَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كانَ يُضَحِّي عَنْ نَفْسِهِ بِكَبْشٍ،وَعَنْ أُمَّتِهِ بِكَبْشٍ. سنن أبي داود ، كتاب الضحايا ،باب في الشاة يضحى بها عن جماعة ( ٢٤٤٢ ).

**الحَـديثُ ٣٥// عـنْ إبـنِ عبـاس رَضـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا: أنّ النَّبـيَّ صَـلَى اللّـهُ عَلَيْـه وَسَـلَمَ ،بَعَـثَ معـاذاً إلى الـيَمَنْ.فَـذَكَرَ الحـديثَ..وَفيـهِ: إنَّ اللهَ افْتَـرَضَ عَلَـيهِمْ صَـدَقَةً في أمْوالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أغنيائِهِمْ،فَتُرَدُ في فُقَرائِهِمْ...**

کاتێـك پێغەمبـەر مـوعـاذي نـارد بـۆ وڵـاتی یەمـەن پێـی فەرموو،کـەپێیان رابگەیـــەنێت :.....خـــوای گـــەورە لەماڵەکانیانـــدا خێـــری فەرزکردوە،لەدەوڵەمەندەکانیان وەرئەگیرێت و بە هەژارەکانیان ئەدرێت.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صـحیح البخـاري ،کتـاب المغـازي، بـاب بعـث أبـي موسـی (٤٠٩٩). صـحیح مـسلم ،کتـاب الإیمـان، بـاب الأمـر بالإیمـان بـالله ورسوله (٥٢).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** زەکات لەزمانی عەرەبیدا واتە: زیادکردن و وپاکبونەوە.

لەشەرعیـــشدا واتـــە:بەخـــشینی بڕێـــك لـــەماڵ بەکەســـێکی نـــەدار وهاوشێوەی،وە هیچ ڕێگریەکی شەرعی لەوبەخشینەدا نەبێت.

چەند ناوێکی بۆدانراوە: الصَدَقَةُالواجِبَةُ،المَنْدوبَة،النَّفَقَة،العَفْو،الحَقّ.

یەکێکـە لەپایـەکانی ئیـسلام بـەکۆدەنگی زانایـان.لەسـاڵی دوەمـی کۆچـی پێش فەرزبونی ڕۆژوی رەمەزان،فەرزکراوە،بەڕای زۆربەی زانایان.

**باســـی دوەم/** دەربـارەی ئەوسـاڵەی پێغەمبـەری خـوا موعـازی بـۆ یەمـەن نارد،چەند ڕایەك هەیە:

یەکـەم:سـاڵی دەیـەم پـێش حـەجکردنی پێغەمبـەر،بوخاری لـە کۆتـایی بەشی المَغَازِي دا باسیکردوە.

دوەم:کۆتـــایی ســـاڵی نۆیـــەم،کاتی هاتنـــەوەی پێغەمبـــەر لەجـــەنگی تەبوك،بەڕای واقدی وإبن سعد.

سێیەم: ساڵی هەشتەم،پێش ڕزگارکردنی مەککە.

یەکران لەوەداکە: لەیەمەن مایەوە تا لەسەردەمی خەلافەتی أبوبکردا هاتەوە مەدینەوە پاشان بەرەوشام چوو،تا لەوێ وەفاتی کرد.

**باسی سێیەم/** فەرمودەی: (تُؤْخَذُ مِنْ أَمْوالِهِمْ)، کراوەتە بەڵگە بۆئەوەی: ئیمام خۆی یا جێگرەکەی زەکات کۆئەکاتەوەو،دابەشی ئەکات، کەسێکیش نەیدات بەزۆر لێی وەرئەگیرێت.پێغەمبەری خواش بەناردنی کارمەندانی زەکات،(السُعَاة) ئەمەی ڕونکردوەتەوە.

**باسی چوارەم/** فەرمودەی: (تُرَدُّ عَلَى فُقَرائِهِمْ)،کراوەتە بەڵگە بۆ وتەی مالك کە ئەڵێت: ئەگەر زەکات تەنها بەکۆمەڵێك بدرێت بری ئەکەوێت.

بەڵام وتراوە: ئەمەبەڵگە نیە،چونکە کەهەژارانی بەتایبەت باسکردوە،لەبەرئەوەی ئەوان زۆرینە بون.

**باسی پێنجەم/** لەوانەیە مەبەستی لە فقیر کەسێکە خێری پێبشێت،کەواتە مسکین یش ئەگرێتەوە،چونکە مسکین لای هەندێك لەفقیر باشترە،بەڵام ڕایتر هەیە ئەڵێت: فقیر لەمسکین حاڵی باشترە.

**باسی شەشەم/** فەرمودەی: (وَتَوَقَّ كَرائِمَ أَمْوالِ النَّاسِ)،لەوەرگرتنی ماڵە گرانبەهاکان خۆت بپارێزە،الکرائم واتە گرانبەها.

ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە: ئەوکەسەی زەکات کۆئەکاتەوە،بۆی نیە باشترینی ماڵەکەببات،چونکە زەکات بۆ دڵدانەوەی هەژارانە،بەڵام ناگونجێت ماڧ خاوەن ماڵ بخورێت،بەڕەزامەندی خۆی نەبێت.

**الحديث ٣٦//** عَنْ عَمْروبنِ شُعَيْب عَنْ ابيهِ عنْ جَدِّه؛ أَنَّ إمْرَأَةً أَتَتْ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،وَمَعَهَا إبْنَةٌ لَهَا،وَفِي يَدِ إبْنَتِهَا مَسَكَتَانِ مِنْ ذَهَبٍ،فَقَالَ لَهَا: أَتُعْطِينَ زَكَاةَ هَذا؟ قالَتْ: لا.قالَ: أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اللهُ بِهِمَا يَوْمَ القِيامَةِ سِوارَيْنِ مِنْ نارٍ؟ فَأَلْقَتْهُمَا.ئافرەتێك لە گەل كچێكی خۆیدا هات بۆ لای پێغەمبەر. كچەكەی دوو بازنی ئاڵتونی لەدەستدا بوو،پێغەمبەر پێی فەرموو: زەكاتی ئەو بازنانە ئەدەیت؟ ووتی: نەخێر. فەرموی: حەزئەكەیت خوای گەورە لە قیامەتدا لەجێی ئەو دوانە دووبازنی ئاگرینت بكاتە دەست؟ پاشان ئافرەتەكە فڕێی دان.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** سێ كەسەكە بە ئیسنادێكی بەهێز ئەیگێڕنەوە.[1]

**ماناى وشەكان//** مَسَكَة: بازن . المَرْأَة: ئافرەتەكە ناوی اسماء بنت یزید بن السكن.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** زانایان دەربارەی زەكات دانی خشڵ،چەند ڕایەكیان هەیە:

یەكەم: زەكات واجبە تیایدا،بەڕای هادویە وكۆمەڵێك زانای پێشین وڕایەكی شافعی،بە بەڵگەی:

أ.ئەو فەرمودانەی سەرەوە.

ب.فەرمودەی أم سلمە: جۆرێك بازنی ئاڵتونی لەدەست ئەكرد،وتی: ئەی پێغەمبەری خوا،ئەمە كەنزە (ئەشاردرێتەوە تاسزای لەسەربێت)؟ فەرموی: ئەگەر زەكاتی لێبدەی كەنز نیە.[2] ابوداودو دارقطني گێڕاویانەتەوە،حاكمیش بەصحیحی داناوە.

دوەم: واجب نیەتیایدا،بەڕای مالك واحمدو ڕایەكی شافعی.

---

[1] سنن أبي داود ،كتاب الزكاة،باب الكنز ما هو ؟ وزكاة الحلي ( ١٢٤٩). الباني پلەی حسن ی داوەتی.

[2] أنها كانتْ تَلبسُ أوْضاحاً منْ ذهبٍ.فقالتْ: يا رسولَ اللهِ أكَنزٌ هوَ؟ قالَ:إذا أدَّيْتِ زَكاتَه فَلَيسَ بِكَنْزٍ. المستدرك على الصحيحين للحاكم ، كتاب الزكاة،( ١٣٧٥). ئەلبانی بە حسن ی داناوە.

بەڵگەشــيان: چــەند ڕايــەك لــەزانايانى پێــشينەوە،كەپێيان وايــە زەكــات لەخشڵدا واجب نيە.

وەڵــامى ئەمانــە دراوەتــەوە: ئەگــەر فــەرمودەى ڕاســت هــەبوو،هيچ ڕايــەك كارى پێ ناكرێت.

سێيەم: زەكـاتى خـشڵ ئەوەيـە خـەڵكى تـر سـودى لێببينێـت،وەك دارقطـني لە انس واسماءي كچى ابوبكر ئەيگێڕێتەوە.

چــوارەم: تــەنها يــەكجار زەكــاتى ئەدرێت،نــەك هــەموو ســاڵێك.بەيهــەقى لەانس ئەيگێڕێتەوە.

ڕاى دروســت: يەكــەم ڕا لەهــەمويان دروستره،چــونكە فــەرمودەى ڕاســت و بەهێز دەربارەى هەيە.

<u>**باســى دوەم/**</u> ڕوكەشــى فەرمودەكــە ئــەوە ئەگەيــەنێت كــە: بــڕى ديــاريكراو نيــە بــۆ زەكاتدان،چــونكە پێغەمبــەرى خــوا فــەرمانى زەكاتــدانى دەركــردوە لێى،كەلەپێنج ئۆقيە كەمتر نەبوە.

ڕێژەكەشــى لاى ئەوانــەى بەفــەرزى دائــەنێن،بڕى واجــب بــونى زەكاتــە لــەئاڵتون وزيــودا.ڕوكەشــى فەرمودەكــە بــەڕەهايى هاتوە،لەوانەيــە بــە فەرمودەكانى زەكاتدانى ئاڵتون وزيو بەستبێتيانەوە.

**الحـديث ٣٧// عـنْ إبـنِ عبّـاس رَضـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا قـالَ: فَـرَضَ رَسـولُ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـه وَسَـلّمَ زَكـاةَ الفطرطُهْـرَةً للـصّائمِ مـنَ اللغـوِ والرّفَثِ،وَطُعْمَـةً للمَـساكين،فَمنْ أدّاهـا قَبْـلَ الـصّلاة، فَهـيَ زَكـاةٌ مَقْبولَـةٌ،وَمَنْ أدّاهـا بَعـدَ الـصّلاة فَهـيَ صَـدَقَةٌ مـنَ الـصّدَقات.** پێغەمبەری خوا سەرفیترەی فەرزکردوە بۆ پاکردنەوەی ڕۆژوەوان لە قسەی نابەجێ و،وەك خواردنێکیش بۆ هەژاران.کەسێك پێش نوێژی جەژن دەریبکات، زەکاتێکی وەرگیراوە،ئەوەیش لەدوای نوێژ دەریبکات، هەروەکو خێرێکی ئاساییە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** ابوداودو إبن ماجە ئەیگێڕنەوەو،حاکم بەصحیحی داناوە.

سنن ابي داود ،كتاب الزكاة، باب زكاة الفطر (١٣٨٤).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی حوکمی سەرفیترە،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: واجبە،بەبەڵگەی:

١.وشەی( فَرَضَ ) لەفەرمودە باسلێکراوەکەدا.

٢.وشەی(فَرَضَ) لەفەرمودەی إبن عمردا: پێغەمبەری خوا سەرفیترەی فەرزکروە،مشتێك خورما یا مشتێك جۆ،لەسەر کۆیلەو ئازاد ونێرو مێ و بچوك وگەورەی موسڵمانان،فەرمانیشی داوە پێش چون بۆ نوێژی جەژن دەربکرێت [1].

وشەی فَرَضَ بەمانای پێویستی پابەندبون دێت.

٣.کۆدەنگی زانایان،بەڕای إسحاق.

دوەم: سەرفیترە سوننەتە،بەڕای داود وهەندێك لەزانایانی شافعی.

**باسی دوەم/** فەرمودەی باسلێکراو بەڵگەی ئەوەیە کە: خێرکردن گوناهەکان ئەسڕێتەوە.

---

[1] فَرَضَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ زَكاةَ الفطرِ صاعاً منْ تمرٍ أوْ صاعاً منْ شعيرٍ علىَ العبدِ والحُرِ والذّكرِ والأُنثى وَالصغيرِ وَالكَبيرِ منَ المُسْلمينَ، وَأمَرَ بها أنْ تُؤَدّى قَبْلَ خُروجِ النّاسِ إلى الصّلاةِ. صحيح البخاري ،كتاب الزكاة،أبواب صدقة الفطر ،باب فرض صدقة الفطر (١٤٤٢).

**باسی سێیەم/** فەرموودەی باسلێکراو بەڵگەیە کە: پێش نوێژی جەژن دەرئەکرێت. فەرزبونیشی بە کاتێکەوە بەستراوەتەوە. بەڵام دەربارەی کاتەکەی، چەند رایەك هەیە:

یەکەم: لەبەرەبەیانی یەکەم رۆژی شەوالەوە فەرز ئەبێت.بە بەڵگەی فەرمودەی: لەورۆژەدا لەسواڵ کردن رزگاریان بکەن.[1]

دوەم: لەئاوابونی خۆری کۆتا رۆژی رەمەزان فەرز ئەبێت،بە بەڵگەی فەرمودەی: طُهْرَةٌ لِلصَّائِمِ.پاککەرەوەی رۆژوەوانە.

سێیەم: بە تێپەربونی دوو کاتەکە فەرز ئەبێت،تا ئیش بەهەردوو فەرمودەکە بکرێت.

**باسی چوارەم/** دەربارەی پێشخستنی لەکاتی خۆی،چەند رایەك هەیە:

یەکەم: دروستە تا دوساڵیش پێش بخرێت،وەکو زەکات.

دوەم: لەرەمەزاندا دروستە،بەڵام پێش رەمەزان دروست نیە.چونکە دووهۆکاری فەرزبونی هەیە: بەرۆژوبون وشکاندن،کەواتە پێش ئەو دوو هۆکارە ناکەوێت.

سێیەم: تەنها رۆژێك یا دوو رۆژ چاو ئەپۆشرێت لەپێشخستنی.

**باسی پێنجەم/** دەربارەی ئەو کەسەی سەرفیترەکەی ئەدرێتێ،دوو راهەیە:

یەکەم: بۆ المَساكِين سەرف ئەکرێت،بەرای کۆمەڵێك زانای ئال وبەیت،بە بەڵگەی فەرمودەی: (طُعْمَةٌ لِلْمَساكِين)،کەتایبەتی کردوە بەو چینەوە.

دوەم: ئەدرێت بە هەشت چینەکەی لەئایەتەکەدا باسکراون،﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالمَساكِينِ﴾...{التوبة:٦٠} ،ئەگەر هەندێك لەو چینانەش باسبکرێت،بەو باسکردنە تایبەت ناکرێن،چونکە لەزەکاتیشدا هەندێك چین باسکراوە،بەڵام کەس نەیوتوە زەکات تایبەتە بۆ ئەوان. لەفەرمودەی موعاذدا هاتوە: فەرمانم پێکراوە لەدەوڵەمەندەکانتانی وەربگرم وبۆ هەژارانتانی بگێرمەوە.[2]

---

[1] أَغْنُوهُمْ عَنِ الطَّوافِ فِي هَذا اليَومِ. سنن الدارقطني ،كتاب زكاة الفطر(١٨٦٩).وأصله في الصحيحين.

[2] أُمِرْتُ أَنْ آخُذَهَا مِنْ أَغْنِيائِكُمْ،وَأَرُدَّها عَلى فُقَرائِكُمْ.

**الحديث ٣٨// عن أبي سَعيد الخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبيِّ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أيّما مُسلمٍ كَسَا مُسلماً ثَوْباً عَلى عُرْيٍ، كَساهُ اللهُ مِنْ خُضْرِ الجَنَّةِ، وَأيّما مُسْلمٍ أطْعَمَ مُسلماً عَلى جُوعٍ، أطْعَمَهُ اللهُ مِنْ ثِمارِ الجَنَّةِ، وَأيّما مَسلمٍ سَقىَ مسلماً على ظَمَأٍ، سَقاهُ اللهُ مِنَ الرَّحيقِ المَخْتُومِ...**

هەر موسڵمانێك موسڵمانێكی ڕوت پۆشتەبكات، خوای گەورە لە قوماشەسەوزەكانی بەهەشت پۆشتەی ئەكات. هەر موسڵمانێكیش موسڵمانێك تێر بكات لەبرسیەتی، خوای گەورە لە بەروبومەكانی بەهەشتی ئەداتێ. وەكەسێكیش موسڵمانێك تێرئاو بكات لەدوای تینویەتی، خوای گەورە لە كانیاوی گوڵاوی سەرمۆر تێر ئاوی ئەكات.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** سنن ابي داود، كتاب الزكاة ، باب في فضل سقي الماء ( ١٤٤٥).[1]

**مانای وشەكان//** خُضْرِ الجَنَّةِ: پۆشاكی سەوزی بەهەشت. الرَّحِيق: خواردنەوەیەكی پاڵفتە كە هیچی تێكەڵ نەبێت. المَخْتُومْ: سەرمۆر، چاكترین بەشی ناو قاپ.

**سەرباسەكان //**

**باسی یەكەم/** فەرمودەكە هانمان ئەدات بۆ كردنی جۆرەها چاكە، وە بەخشینی بەو كەسەی پێویستی پێیەتی.

**باسی دوەم/** پاداشت دانەوە لەسەری، لەهەمان ڕەگەزی كاركردنەكەیە.

[1] البانی بەلاوازی داناوە.

**الحديث ٣٩// ١.عَنْ حَكيم بن حزام رَضيَ اللّهُ عَنْهُ عن النَّبيِّ صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ قال: اليَدُ العُليا خَيرٌ مِنَ اليَد السُّفلى،وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُول،وَخيرُ الصَّدقة ماكانَ عنْ ظَهْرِ غنىً،وَمنْ يَستَعْفِفْ،يُعِفَّهُ الله.وَمَنْ يَستَغْنِ يُغْنِه الله.**

دەستی بەرز لەدەستی نزم چاکترە، لەو کەسەوە دەستپێبکە کە بژێوی لەسەرتە،چاکترین بەخشین ئەوەیە لەخۆت زیاد بێت. کەسێك داوای دەستپاکی و داوێن پاکی بکات خوای گەورە ئەیداتیٚ،کەسێکیش داوای دەوڵەمەندی دڵ بکات خوای گەورە ئەیداتیٚ.

**٢.وعنْ طارقٍ المُحاربي رَضيَ اللّهُ عَنْهُ قالَ: قَدِمْنا المَدينَةَ فإذا رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ ، قائمٌ على المِنْبَر يَخطبُ الناسَ وَيقولُ: يدُ المُعطي العُليا،وَابدَأْ بِمَنْ تَعول: أُمَّكَ وَأباكَ وأُختَكَ وأخاكَ،ثمّ أدناكَ فَأدْناكَ.**

کە هاتینە مەدینە پێغەمبەر صَلَّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ وتاری بۆ خەڵکی ئەخوێندەوە وئەیفەرموو: دەستی بەخشندە بەرزە،بەخشین لەو کەسەوە دەستپێبکە کە بژێوی لەسەرتە: دایکت و باوکت و خوشکت وبرات،پاشان نزیکترین کەس.

<u>**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**</u> ١. صحيح البخاري،كتاب الزكاة ،باب لا صدقة إلا عن ظهر غنى (١٣٧٢). صحيح مسلم ، كتاب الزكاة، باب بيان أن اليد العليا خير من اليد السفلى ( ١٧٧٨).

٢.نسائي : السنن الصغرى ،كتاب الزكاة، باب أيتهما اليد العليا (٢٤٩٧).إبن حبان ودارقطني ش بەصەحیحیان داناوە.

<u>**سەرباسەکان//**</u>

<u>**باسی یەکەم/**</u> دەربارەی مانای(اليَدُ العُلْيَا)، چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: اليَدُ العُلْيا کەسی بەخشندەیە والسُّفْلَى ش سواڵکەرە،بەڕای زۆربەی لێکدانەوەکان،بەڵگەشیان:

أ.لەحكيم بن حزام ەوە گێردراوەتەوە کەوتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا،دەستی بەرز چیە؟ فەرموی: دەستی بەرز ئەوەیە ببەخشێ و وەرنەگرێت.[1]

ب.فەرمودەی دوەم (طارق المحاربي).

دوەم: بریتیە لەدەستی کەسێك سوالْ نەکات،ئەگەر پارەشی بدەنێ،بەرزیەکەشی مەعنەویە.

سێیەم: دەستی ئەوکەسەیە بێ داواکردن پارە وەرئەگرێت.

چوارەم: دەستی بەرز بەخشندەیەو،نزمیش چروکە.

**باسی دوەم/** فەرمودەکە بەڵگەی پێشخستنی خۆو خێزانە لەبەخشیندا،چونکە ئەوان گرنگترن،بە بەڵگەی:

أ.ابوهریرە وتی: پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت: ببەخشن.پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دینارێکم هەیە،فەرموی: بۆخۆتی سەرف بکە.وتی: دینارێکی ترم هەیە،فەرموی: بۆمناڵەکەتی سەرف بکە.وتی: دینارێکی تریشم هەیە،فەرموی: بۆ خزمەتکارەکەتی سەرف بکە.وتی: دینارێکی ترم هەیە،فەرموی:خۆت شارەزاتری بەبەخشینی.[2]

فەرمودەکە باسی هاوسەری نەکردوە،بەڵام لەفەرمەدەیەکی ترا خستویەتە پێش منالْ.

---

[1] قالَ:يا رَسولَ الله،ما اليَدُ العُليا؟ فَقالَ:اليَدُ العُليا الّتي تُعْطِي وَلا تَأخُذ.

[2] قال رسول الله صَلَى اللَهُ عَلَيْه وَسَلَمَ: تَصَدَّقُوا.فقالَ رَجُلٌ: يا رسولَ الله عندي دينارٌ،قال: تَصَدَّقْ به على نَفسكَ.قالَ: عندي آخرُ.قالَ: تَصَدَّقْ به على وَلَدكَ.قالَ: عندي آخرُ،قالَ: تَصَدَّقْ به على خادمكَ. قالَ: عندي آخرُ،قال: فَأَنْتَ أَبْصَرُ بِه. ابو داود ونسائى ئەيگێرنەوە ،سنن أبي داود ،كتاب الزكاة باب في صلة الرحم (١٤٥٤).حاكم وإبن حبانيش بە صحيحيان داناوە.البانيش بەحسن داينا وە.

ب.أبوهريره ئەڵێت: بەپێغەمبەری خوا وترا: باشترین خێر کامەیە؟ فەرموی: هەوڵدانی کەم(خێرکردنی بەپێی توانا)،لەوکەسەوەدەستپێبکە کە بژێوی لەسەرتە.[1]

**باسی سێیەم/** فەرمودەی(إبْدَأْ بِمَنْ تَعُول)،لەریوایەتی طارق المحاربيدا،بەڵگەی ئەوەیە کە: بەخێوکردنی خزمێك کەهەژار بێت فەرزە،بەو ریزبەندیەی لەفەرمودەکەدا هاتوە،لەسەرەتادا دایکی پێش باوك خستوە،ئەوانی تریش بەدوایدا.

**باسی چوارەم/** ئەم ریزبەندیە بەڵگەیە لە سەرئەوەی: بۆ چاکەکردن لەگەڵیا،دایك پێش باوك ئەخرێت،ئەمەش رای جمهورە،وەك قازی عیاض ئەڵێت،بە بەڵگەی:

أ.بوخاری لەأبوهريرەوە ئەیگێرێتەوە: سێ جار باسی دایك ئەکات،ئینجا باسی باوك ئەکات.

ب.معاويةبن حيدة القشيري ئەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا،لەگەل کێدا چاکەبکەم؟ فەرموی: دایکت.وتم: دوای ئەو کێ؟ فەرموی: دایکت.وتم: دوای ئەو کێ؟ فەرموی: دایکت.وتم: دوای ئەو کێ؟ فەرموی: باوکت،پاشان نزیکتر.[2]

ج.سەرنجراکێشانی قورئانی پیرۆز بۆ مافی زیاتری دایك،وەك ئەفەرموێ:﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوالِدَيْهِ إِحْسَاناً،حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً وَوَضَعَتْهُ كُرْهاً﴾ {الأحقاف:١٥}.واتە: ئامۆژگاری مرۆڤمان کردوە بە چاکەکردن

---

[1] قيلَ: يا رسولَ الله،أيُّ الصَّدَقَةِ أفْضَلُ؟ قالَ:جُهْدُ الْمُقِلِّ ،وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُول. احمد وابوداود ئەیگێرنەوە،مسند أحمد بن حنبل ،ومن مسند بني هاشم ،مسند أبي هريرة رضي الله عنه (٨٤٩٨). إبن خزيمەو حاكم وإبن حبان يش بەصەحيحيان داناوە.

[2] قُلْتُ: يا رسولَ الله،مَنْ أبَرُّ؟ قالَ:أمَّك. قُلْتُ: ثُمَّ منْ؟ قال:أمَّكَ.قلت: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: أمَّكَ. قلتُ: ثُمَّ مَنْ ؟ قالَ: أباكَ،ثُمَّ الأقْرَب فالأقْرَب. مسند أحمد بن حنبل ،أول مسند البصريين ،حديث بهز بن حكيم (١٩٥٦٣).

لــە گــەڵ دایــك وباوكیــدا،دایكی لــەناو ســكیا بەناڕەحــەتی هــەڵی گرتــوەو بەناڕەحەتیش دایناوە.

لەبـەر ئـەوە ئـەڵێن: كەسـێك تـەنها بـژێوی بـاوكی یـا دایكـی هەبێت،دایكەكـە پێش ئەخات.

**باســی پێنجــەم/** باشـترین خێـر ئەوەیـەدوای ئەنجامـدانی خاوەنەكـەی پێویـستی پێـی نەبێت،چـونكەمانای باشـترین صـدقە ئەوەیـە:خێركـەر ئەوەنـدە بـۆ خـۆی بهێڵێتــەوە كەپێویــستی و بەرژەوەندیــەكانی پــێ جێبەجێبكات،چــونكە كەســێك هــەموو ماڵەكــەی بكاتــە خێر،زۆركــات پەشــیمان ئەبێتەوەوكەپێویــستی بــەماڵ بــوو حەزئەكات ئەو خێرەی نەكردایە.

دەربارەی كردنی هەموو ماڵ بەخێر،چەند ڕایەك هەیە:

یەكەم: قازی عیاض ئەڵێت: زانایان وپێشەوایان بە دروستیان داناوە.

دوەم: طَبَرانــي ئــەڵێت: هەرچــەندە دروســتە،بەڵام باشــتر وایــە نــەیكات و،لەسێ یەك تێپەڕ نەكات.

سـێیەم: صــەنعانی ئــەڵێت: باشــترە بوترێــت: كەســێك هــەموو ماڵەكــەی بكاتــە خێر،توانــای خــۆڕاگرتنی لەســەر هــەژاری هەبوو،منداڵیــشی نــەبوو، یــا منــاڵی هەبوو،بــەڵام وەك خــۆی خۆڕاگربون،ئــەوە زۆر باشــە،بە بەڵگــەی ئایــەتی: ﴿وَيُــؤْثِرُونَ عَلَــى أَنْفُــسِهِمْ وَلَــوْ كَــانَ بِهِــمْ خَــصَاصَةٌ﴾ {الحــشر:٩} واتــە: خــەڵكی ئەخەنــە پــێش خۆیــان ئەگــەر خۆشــیان پێویـستیان پێـی بێـت. وە ئایـەتی:﴿وَيُطْعِمُـونَ الطَّعَـامَ عَلَـى حُبِّـهِ مِـسْكِيناً وَيَتِيمــاً وَأَسِــيراً﴾.{الإنــسان:٨}، واتــە: خــواردن ئەبەخــشن بــە هــەژاروو بێباوك وديل. بەڵام كەسێك وانەبوو،باش نیە.

**باســی حەوتــەم/** فـەرمودەی؛ (وَمَـنْ يَـسْتَعْفِفْ)،واتـە كەسـێك خـۆی بـەدووربگرێت لـە ســواڵ كــردن.(يعفــه الله)،خــوای گــەورە لەســەر خــۆڕاگرتن یارمــەتی ئــەدات. وَمَــنْ يَــسْتَغْنِ،كەســێك قەناعــەت بكــات بــا كەمیــشی هــەبێت.يغنــه الله، خــوای گــەورە قەناعەت ئەخاتە دڵیەوەو دڵی دەوڵەمەند ئەكات.

**الحَـديثُ ٤٠// عَـنْ إبْـنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا قـالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ يَقُـولُ: إذا رَأَيْتُمُـوهُ فَـصُومُوا، وَإذا رَأَيْتُمُـوهُ فَأَفْطِروا، فَـإنْ غُـمَّ عَلَـيْكُمْ فَاقْدُروا لَهُ...**

بـەبینینی -مـانگ- بـەڕۆژوبن، وبەبینینیـشی بیـشكێنن،گەر بـەهۆی هەورەوە لێتان دیارنەبوو،سی ڕۆژی بۆ تەواو بكەن.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەكـە//** صحيح البخاري ، كتاب الصوم ،باب هل يقال رمضان أو شهر رمضان ( ١٨١٢).صحيح مسلم - كتاب الصيام، باب وجوب صوم رمضان لرؤية الهلال (١٨٦٤).

**مانـای وشـەكان//** رَأَيْتُمُوهُ: مانگتـان بـینی. غُـمَّ: هـەور بـە ئاسمانـەوە بـوە ڕێگری بینینی مانگ.

**سەرباسەكان//**

**باســـی یەكـــەم/** صِـيامْ،واتـە: خۆگرتنـەوە لـەڕۆژدا بەشـێوەیەكی تایبەت،لـەخواردن وخواردنـەوە وجیمـاع وشـتی تـر، كەلەشـەرعدا هـاتوە،وە دوركەوتنـەوە لەقـسەی پـوچ وخراپ،لـەكاتێكی دیـاریكراوو ،بەچـەند مەرجێكی دیاریكراوو. ڕۆژوش لەساڵی دوەمی كۆچیدا فەرزكرا.

**باســی دوەم/** فەرمودەكـە بەڵگەیـە لەسـەر: فـەرزبونی ڕۆژوی ڕەمەزان،بـەبینینی مانگ،وە شكاندنیشی بە بینینی یەكەم مانگی شەوال.

**باسـی سـێیەم/** ڕوكەشـی فەرمودەكـە ئـەوە ئەگەیـەنێت كـە: پێویـستە هـەموو موسـڵمانان مـانگ ببینن،بـەڵام كـۆدەنگی زانایـان وایـە كەئـەوە فـەرز نیە،بـەڵكو تـەنها ئەوەنـدەی كـە حـوكمی شـەرعی لـەبینینی مانگـدا پـێ جێگیر ئەبێت.(یەك كەس).

**باسی چوارەم/** دەربارەی شایەتیدان بۆ چونە ناو ڕەمەزانەوە،دوو ڕاهەیە:

یەكـەم: شـایەتی یـەك كەسـی متمانـەپێكراو بەسـە،بەڕای إبـن المبـارك واحمد وڕیوایەتێكی شافعی،ئەوەوی ئەڵێت: ئەم ڕایە ڕاسترە،بەبەڵگەی:

أ.پشتبەستنی پێغەمبەر تەنها بەشایەتیدانی دەشتەكیەكە.

ب. پشتبەستنی پێغەمبەر تەنها بەشایەتیدانی إبن عمر(لەبینینی مانگدا).

دوەم: شایەتی یەك كەس وەرناگیرێت،بەڵكو دوكەس پێویستە،بەڕای مالك والليث والاوزاعی والهادویە ودواترین ڕای شافعی،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی عبدالرحمان بن زید بن الخطاب: ئەگەر دوو موسڵمان شایەتیاندا،بەڕۆژوو بن وبیشكێنن.[1] أحمد گێڕاویەتەوە.

ب.فەرمودەی ئەمیری مەككە (لەوكاتەدا) الحارث بن الحاطب: ئەگەر نەمانبینی ودوانی ڕاستگۆ شایەتیاندا.[2] أبوداودو دارقطني گێڕاویانەتەوە،بەئیسنادێكی صەحیح.

ج.بە قیاس كردن لەسەر شایەتیدان لەشتەكانی تردا.(كەپێویست بەدوو شایەت ئەكات).

**باسی چوارەم/** دەربارەی دەرچون لەمانگی ڕەمەزان،دوو ڕا هەیە:

یەكەم: بۆبینینی مانگی شەوال یەك كەسی متمانە پێكراو بەس نیە،بەڕای زۆربەی زانایان،وەك نەوەوی لەشەرحی صەحیحی مسلم باسیكردوە.

دوەم: یەك كەسی متمانەپێكراو بەسە بۆشایەتیدانی بینینی مانگ،بەڕای ابوثور.

**باسی پێنجەم/** دەربارەی مەبەست لە (إذا رَأَيْتُمُوهُ)،چەند ڕایەك هەیە:

یەكەم: بینینی مانگ لەوڵاتێك،بینینیشە بۆهەموو وڵاتان،ئەبێت هەموو پابەند بن پێوەی. بە بەڵگەی: إذا رأيتموه، لەفەرمودەكەدا.واتە: ئەگەر لە ناوتاندا كەسێك هەبوو مانگی بینیبێت.

---

[1] فَإِنْ شَهِدَ شَاهِدَانِ مُسْلِمَانِ،فَصُومُوا وَأَفْطِرُوا. مسند أحمد بن حنبل ، أول مسند الكوفيين ،حديث أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم ( ١٨٥١٠ ).

[2] فَإِنْ لَمْ نَرَهُ وَشَهِدَ شَاهِدَا عَدْلٍ. سنن أبي داود ، كتاب الصوم، باب شهادة رجلين على رؤية هلال شوال ( ٢٠٠٤ ).

دوەم: ئەوە بایەخی نیە،چونکە فەرموودەکە بۆ کەسانێکی تایبەت بوە.

سـێیەم: لەهـەر وڵاتێـك بینرا،چـوار دەورەکـەی پابەنـد ئـەبن پێـوەی.

صـەنعانی ئـەم ڕایـە بـەنزیکتر لەڕاسـتیەوە دائـەنێت. دوای ئـەوەی ئەڵێت:لەم بارەیەوە چەند ڕایەك هەیە،هیچیان بەڵگەیان نیە.

**باسی حەوتەم/** لِرُؤْيَتِهِ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی:

کەسـێك بـە تـەنها مـانگی بـینی ،پێویـستە پابەنـد بێـت بـەحوکمی بینینەکـەوە (لەبـەڕۆژبون وشـکاندن)، بـە ڕای پێـشەوایانی ئـاڵ و هەرچوار پێشەوای مەزهەب.

دەربارەی شکاندنی ڕۆژوەکەی ، چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: بەدزیەوە ئەیشکێنێت،بەڕای شافعی.

دوەم: بەردەوام ئەبێت لەبەڕۆژبوندا،بەڕای زۆرینە.

سـێیەم: یـەقین (دڵنیـا بـونی) خـۆی چـۆن بوو،بـەگوێرەی ئـەوە ئەجوڵێتەوە،بەڕای جمهور.

صـەنعانی ئـەڵێت: ڕاسـتر وایـە بـەدڵنیا بـونی خـۆی لـە بـەڕۆژبون وشـکاندنیدا،ئیش بکـات. بـاش وایـە بیـشارێتەوە (پێـچەوانەی خـەڵك نەبێت)،نەبادا خەڵکی گومانی خراپی پێ ببەن.

**باسـی هەشـتەم/** فَاقْدُرُوا لَهُ،التَّقْدير واتـە(وادابنـێن) هـاتوە، وەك خطـابي ئەڵێت،واتـە: سـی ڕۆژەکـە تەواوبکـەن. ئەمـەش ڕای زانایـانی شـافعی وحەنەفی وکۆمەڵی سەلەف وخەلەفە.

**باسـی نۆیـەم/** إبْـن بَطَـالْ ئـەڵێت: فەرمودەکـە دژایـەتی ڕای ئەسـتێرە ناسـانی تیایە،بـە تـەنها پـشت بـە بینـینی مـانگ ئەبەسـترێت،زۆر ڕۆچـونیش لە شەرعدا ڕێگری لێکراوە.

الباجی لـەوەڵامی ئەوانـەدا کـەپێیان وایـە ئەسـتێرە ناسـان بۆیـان هەیـە بـەپێی زانیـاری خۆیـان بەپـشت بەسـتن بـە شـوێنی ئەسـتێرەکان،بەڕۆژو بـن یا بیشکێنن،ئەڵێت: کۆدەنگی زانایان وەڵامە بۆ ئەوانە.

إبـن بزيـزەش ئـەڵێت: ئەمـە ڕايـەكی پوچـە،لەكاتێكدا شـەرع ڕێگـری لەئەستێرەناسی كردوە،چونكە لەسەر گومان بەندە نەك دڵنيايی.

وەڵـامی ئاشـكراتريش بۆيـان فـەرمودەی پێغەمبـەرە كـە بوخـاری لـە إبـن عمـرەوە ئەيگێڕێتـەوە: ئێمـە ميللـەتێكی نەخوێندەوارين،نانوسـين وناژمێرين،مـانگ لای ئێمـە وايـە و وايـە[1]،مەبەسـتی بيـست ونـۆڕۆژو سـی ڕۆژە.

الحَـديثُ ٤١// عَـنْ أَبِـي أَيّـوبَ الأَنْـصاري رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ: أَنَّ رَسـولَ اللهِ صَـلّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قـالَ: مَنْ صامَ رَمَضانَ ثُمّ أَتْبَعَهُ سِتّاً مِنْ شَوّال، كانَ كَصِيامِ الدّهْرِ...

كەسـێك مـانگی ڕەمـەزان بـە ڕۆژو بێـت وشـەش ڕۆژی شـەواليش بەدوايدا،وەك بە ڕۆژوبونی ساڵەكەيەتی.

گێـڕەرەوەی فەرمودەكـە// صـحيح مـسلم ،كتـاب الـصيام، بـاب اسـتحباب صوم ستة أيام من شوال إتباعا لرمضان ( ٢٠٥٨).

ڕيوايـەتێكی تـر: (مَـنْ صـامَ رَمَـضانَ فَـشَهْرُهُ بِعَـشرَة،وَمَنْ صـامَ سِـتَّةَ أَيّـامٍ بَعْدَ الفِطْرِ فَذَلِكَ صِيامُ السَّنَة) أحمد والنسائي گێڕاويانەتەوە.

سەرباسەكان//

باسـی يەكـەم/ (سِـتّاً) بـە مـؤنثي هاتوە،هەرچـەند ميزەكـەی مـذكرە،چـونكە ژمارەكان لەعەرەبيدا گەر مميزەكەی باس نەكرێت،دو شێوەی تيا دروستە.

باسی دوەم/ لەبارەی حوكمی بەڕۆژو بونی شەشەڵان،دوو ڕا هەيە:

يەكـەم: بـەڕۆژوبونی باشـە،بەڕای كۆمـەڵێك لـە ئـال وأحمـد والـشافعي وداود والعترە،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكە.

---

[1] إِنّا أُمّةٌ أُمّيّةٌ لَا نَكْتُبُ وَلَا نَحْسِبُ،الشّهْرُ هَكَذا وَهَكَذا،عَنَى تِسْعاً وَعِشْرِينَ مَرّةً وَثَلاثِينَ مَرّةً. صحيح البخاري ،كتاب الصوم
باب قول النبي صلى الله عليه وسلم : " لا نكتب ( ١٨٢٧).

دوەم: بـەڕۆژوبونی بـاش نیە،بـەڕای مالـك وأبوحنیفـە،مالك لـە الموطـأ دا ئەڵێت:

أ.لە ناو زانایاندا،کەسم نەبینیوە بەڕۆژو بوبێت.

ب.تا گومانی فەرزبونی لێنەکرێت.

وەڵام دراوەتەوە کە: لەدوای دەقەکە ئیش بەم بیانوانە ناکرێت.

إبن عبدالبر ئەڵێت: ئەم فەرمودەیەی موسلیم بە مالك نەگەشتوە.

**باســی ســێیەم/** پاداشـتی بـەڕۆژوبون لـەو ڕۆژانـەدا بۆکەسێکە جیـا بـەجیا بـەڕۆژو بێت،یـا بەیەکەوە،لـەدوای جـەژن ڕاسـتەوخۆ یـا لـە هـەر ڕۆژێکـی مانگەکەدا.

**باســی چــوارەم/** هـیچ بەڵگەیـەك نیـە بیسەلمێنێت کەئـەبێت لەسـەرەتای مانگەکـــەدا بێـــت،وەك لەســـنن الترمـــذي دا لــــە إبـــن المبـــارك ئەگێڕێتەوە،چونکە:

١.کەســێك لەهــەر ڕۆژێکــی شــوال بیگرێت،ئــەوە بــە دوای ڕەمەزانـــدا گرتویەتی.

٢.لــە إبــن المبــارك گێڕدراوەتەوە،کەوتویــەتی: کەســێك شــەش ڕۆژی شەوال بەجیا بگرێت دروستە.

**باســـــی پێنجـــــــەم/** ڕۆژوگــرتنی شەشــەڵانی بــەڕۆژوی ســاڵەکە شوبهاندوە،چـــونکە چـــاکەکردن دە بەرامبەرە،ڕەمـــــەزان واتـــــە دە مانگ،شەش ڕۆژەکەش واتە دوومانگ.

**باســی شەشــەم/** فەرمودەکـە بەڵگـە نیـە لەسـەر دروسـتی بـەڕۆژوبونی هـەموو ساڵەکە.

**الحـديث ٤٢// وَعـنْ أبـي هُرَيـرَةَ رَضـيَ اللّـهُ عَنـهُ: أنّ رَسـولَ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيـه وَسَلّمَ قـالَ: العُمْـرَةُ إلى العُمْـرةِ كَفّـارَةٌ لِمـا بَيْنَهُمـا، وَالحَجُّ المَبْـرورُ لَـيْسَ لَـهُ جَـزاءٌ إلاّ الجَنّـةُ**...عـــەمرە بۆعـــەمرە كـــەفارەتی نێوانیانە،وحـــەجی وەرگیراویـــش پاداشتەكەی تەنها بەهەشتە.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە//** صـحيح البخـاري ،كتـاب الحـج، أبـواب العمـرة ،بـاب وجـوب العمـرة وفـضلها( ١٦٩١). صـحيح مـسلم ،كتـاب الحـج ،بـاب في فضل الحج والعمرة (٢٤٨٠).

**سەرباسەكان//**

**باســــی یەكــــەم/** حـەج، یەكێكەلـە پێـنج پایـەكانی ئیـسلام بـەكۆدەنگی زانایان،لەسـاڵی شەشـی كۆچـی فـەرزكراوە (لای جمهـور)،إبـن القـیم ئـەڵێت: ساڵی ٩ یان ١٠ی كۆچی فەرزكراوە.

**باســــــی دووەم/** العُمْــرَة،لەزمانەوانیـــدا واتـــە: ســـەردانكردن،یا مەبەســت لەشتێكدا.

لەشــەرعدا: ئیحــرام پۆشــین و ڕاكــردن لــەنێوان ســەفاو مەروەو،ســوڕانەوە بــەدەوری كەعبەو،سەرتاشــین یــا كورتكردنــەوە.بۆیــە ئــەو نــاوەی لێنــراوە چونكەسەردانی ماڵی خوای تیا ئەكرێت.

**باسی سێیەم/** دەربارەی حوكمی دوبارەكردنەوەی عومرە ،چەند ڕایەك هەیە:

یەكــــەم: زۆر عـــــەمرەكردن شـــــتێكی باشـــــە،بە بەڵگـــــەی:(العُمْــــرَةُ إلى العُمْرَةِ)،لەفەرمودە باسلێكراوەكەدا.

دووەم: لەعەمرەیەك زیاتر لەساڵێكدا باش نیە،بەڕای مالكیەكان.

بـــە بەڵگــــەی ئــــەوەی كــــە پێغەمبــــەر: تــــەنها ســــاڵ بــــۆ ســــاڵ عــــەمرەی كردوە،كردارەكانی پێغەمبەریش بۆ فەرزە یا سوننەت.

وەڵــامی ئــەم ڕایـــەش ئەوەیـــە: هەنـــدێك جـــار پێغەمبـــەر وازی لـــەكارێك هێناوە،تـــا ناڕەحـــەتی لەســـەر ئومەتەكـــەی لابات،هەرچـــەندە ئەوكارەشـــی

بەباش زانیوە،بۆ عەمرەش بەوتەکانی خەڵکی هانداوە بۆ کردنی،کەواتە بێ بەستنەوە دەرکەوت کە دوبارەکردنەوەی شتێکی باشە .

**باسی چوارەم/** دەربارەی کاتی عومرە ،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: بۆ کەسێك سەرقاڵی کاروباری حەج نەبێت هەموو کاتێك دروستە،بەڕای جمهور،بە بەڵگەی: ڕوکەشی فەرمودەی باسلێکراوو.

دووەم: تەنها لە(أَيَّامُ التَّشْرِيق) سێ ڕۆژی دوای جەژنی قوربان،باش نیە،ڕایەکی هادی.

سێیەم: لەڕۆژانی عارفەوجەژنی قوربان وسێ ڕۆژی دوایی باش نیە،بەڕای حەنەفیەکان.

چوارەم: لەمانگەکانی حەجدا،عەمرەکردن باش نیە بۆ کەسێك حەج بەشێوەی( متمتع) یا (قران) بکات،چونکە لەکارەکانی حەج دوانەکەوێت،ڕایەکی هادویە.

وەڵامی ئەم ڕایەش ئەوەیە،کە: پێغەمبەر لەژیانیدا سێ جار عەمرەی بەتەنهای کردوە لەکاتی حەجیشدا.

**باسی پێنجەم/** بۆ لێکدانەوەی (الحَجُّ المَبْرُور)،چەند ڕایەك هەیە:

١.ئەو حەجەیە گوناهی تێکەڵ نەبێت.ئەوەوی بەڕایەکی دروستی زانیوە.

٢.حەجێکی وەرگیراو.

٣.کاریگەری لەسەر خاوەنەکەی جێبهێڵێت،بەوەی دوای کردنی کەسەکە کرداری باشتر بێت لەپێش حەجکردنی.

٤.أحمد وحاکم لەجابرەوە ئەگێڕنەوە: پرسیار لەپێغەمبەری خوا کرا: چاکە لەحەجدا چیە؟ فەرموی: خواردن دانە بەخەڵك وبڵاوکردنەوەی سەلامە[1]. لە ئیسنادی ئەم فەرمودەیەدا لاوازی هەیە،ئەگەر لاواز نەبێت لێکدانەوەیە بۆ (الحج المبرور).

---

[1] قِيلَ: يا رَسولَ الله،مَا بِرُّ الحَجِّ؟ قَالَ:إِطْعامُ الطَّعامِ،وَإِفْشَاءُ السَّلامِ. مسند أحمد بن حنبل ،ومن مسند بني هاشم مسند جابر بن عبد الله رضي الله عنه ( ١٤٢٩١ )

**الحَديثُ ٤٣// عَنْ إبنِ عَبّاس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قالَ: خَطَبَنا رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فَقالَ: إنّ اللهَ كَتَبَ عَلَيْكُمْ الحَجّ، فَقامَ الأقْرَعُ بنُ حابِس فَقالَ: أفي كُلّ عامٍ يارَسولَ اللهِ؟ قالَ: لَوْقُلْتُها لَوَجَبَتْ،الحَجُّ مَرّةً،فَما زادَ فَهُوَ تَطَوّعٌ.**

**پێغەمبەری خوا ووتاری بۆ داین وفەرموی: خوای گەورە حەجی لەسەر فەرز کردون،اقرع کوڕی حابس هەستاو ووتی: لەهەمو ساڵێکدا ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: گەر بڵێم-بەڵێ-فەرز ئەبێت،حەجکردن یەکجارەو لەوە زیاترە بەخۆبەخشە.**

**<u>گێڕەرەوەی فەرمودەکە//</u> پێنجەکە،جگە لە ترمذي.[1]**

**<u>سەرباسەکان//</u>**

**<u>باسی یەکەم/</u> فەرمودەکە بەڵگەیەلەسەر: فەرزبونی حەج تەنها یەکجار لەتەمەندا،بۆ کەسێکی داوا لێکراوو بەتوانا،بە کۆ دەنگی زانایان،وەك نەوەوی وإبن حجر و کەسانیتر باسیان کردوە.**

**<u>باسی دوەم/</u> لە فەرمودەی: (لَوْقُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ) ئەوە وەرئەگیرێت،کە: ئەگونجێت خوای گەورە پێغەمبەر سەرپشك بکات لە دانانی حوکمەکاندا.**

---

[1] واته: أبوداود،ترمذي ،إبن ماجه،احمد. سنن إبن ماجه،باب فرض وجوب الحج(٢٩٩٥). الباني به صحيحي داناوه.

**الحَديث ٤٤// عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: نَهى رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعِ الحَصَاةِ وَعَنْ بَيْعِ الغَرَرِ.**

**پێغەمبەری خوا ڕێگری كردوە لە مامەڵەیەك كەبەردی تیا بەكاربێت وە مامەڵەیەك كە فێڵی تیا بێت.**

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە//** صـحیح مـسلم،كتاب البیوع،بـاب بطـلان بیـع الحصاة (٢٨٦٢).

**مانـــای وشـــەكان//** بَیْـعْ لەزمانەوانیـدا ، واتـە: گۆڕینـەوەی ماڵێـك بەرابـەر مـاڵێكی تـر.لەشەرعیـشدا ڕەزامەنـدی هـەردولای بـۆی زیـادكراوە. بَیْـعْ وشِراءْ لەو وشانەن كە بۆ مانای یەكتر بەكاردێن.

**سەرباسەكان//**

**باســی یەكـــەم/** فرۆشـتن لەفەرمودەكـە دراوەتـە پـاڵ بەرد،چـونكە بـەردی تیـا بەكاردێت.

**باسی دووەم/** لەبارەی لێكدانەوەی بَیْعُ الحَصَاة ،چەند ڕایەك هەیە:

یەكـەم: بڵێـت: ئـەم بـەردە فڕێدە،بەسـەر كـام پۆشـاكدا كـەوت بـە درهـەمێك ماڵی تۆیە.

دووەم: تائەوشوێنەی بەردەكەی ئەگاتێ، زەوی پێ بفرۆشێت.

سـێیەم: مـشت بكـات بەكۆمـەڵێك بـەردداو بڵێـت: چـەند بـەردی تیـابوو ئەوەندەم لەو شتەئەوێت.

چـوارەم: شـتێكی پـێ بفرۆشێت،پاشـان دەسـت بكـات بەكۆمـەڵێك بـەردداو بڵێت: بە هەر بەردێك ئەوەندە درهەم بۆ كاڵاكە.

پێنجـەم: یـەكێكیان بـەردێك بـە دەسـتەوە بگرێـت،و بڵێـت: هـەر كاتێـك بەردەكە كەوتەخوارەوە، مامەڵەكە جێبەجێ ئەبێت.

شەشـەم: بـچێتە لای ڕا نـە مـەڕێك و، بڵێـت: بـەردێك هـەڵ ئـەدەم بـەر كـام مەڕە بكەوێت،بەوەندە.

**باســـی ســـێیەم/** هــەموو شــێوازە ڕابردوەکــانی بَیْــعُ الحَــصَاة فێڵــی تیایە،چــونکە نادیــاری یــان لــەنرخ یــان لــە کاڵاکەدایــە،ومانای خەڵەتانــدن ئەیگرێتــەوە. بۆیــە لــە فەرمودەکــەدا بَیْــعُ الغَــرَرْ بــە تایبــەت باسکراوە،چــونکە لــەو مامەڵانــە بــوە کــە لــە نەفامیــدا ئەکرا،پێغەمبــەریش صَــلَّى اللّــهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ ڕێگری لێکرد.

**باســـی چـــوارەم/** الغَــرَرْ،واتــە خەڵــەتێنراو إســم مفعولــە ،مــصدر إضــافة کراوەتەلای.

**باســـی پێنجـــەم/** الغَــرَرْ واتــە فێڵکردن،چــونکە لــەکاتی ئەنجامدانیــدا ڕازیبــون نیە،کەواتە خواردنی ماڵی خەڵکە بە ناهەق.

**باسی شەشەم/** بَيْعُ الغَرَرِ بەچەند شێوازێك ئەنجام ئەدرێت:

١. توانــــای وەرگـــــرتنی نیــــە،وەك فرۆشــــتنی بەنــــدەی هەڵاتو،ئەســــپی ڕاکردوو.

٢.نەبێت یا نادیار بێت.

٣.ماڵی فرۆشیارەکە نەبێت،وەك ماسی لەئاوێکی زۆردا.

**باسی حەوتەم/** لە بَيْعُ الغَرَرْ دا چاوپۆشی لە دوو حاڵەت ئەکرێت:

یەکــەم: شــتێك لــەناو کاڵــا کــەدا بێــت ولێــی جیــا نەبێتەوە،بــەجیا کــراویش نەفرۆشرێت.

دووەم: شــــتێك چــــاوی لــــێ بپۆشــــرێت،لەبەر کــــەم نرخــــی یــــا گــــران جیاکردنەوەو دیاریکردنی.

نمونەش بۆ ئەوانەی سەرەوە:

ا.فرۆشتنی خانوو لە کاتێکدا نازانرێت بناغەکەی چۆنە.

ب.فرۆشتنی شیر لەگوانی ئاژەڵەکەدا.

ج.فرۆشتنی بەچکە لەسکی دایکیدا.

د.فرۆشــــتنی جلێــــك نــــاواخنی هــــەبێت (لۆکــــە یاشــــتی تــــر)،ئەگــــەر ناواخنەکەشی نەبینرێت.

هـ.بـه كرێـدانی ئـاژەڵ وخـانوو بـه مانگانه،هەرچـەنده،لەوانەیه مـانگ سـی ڕۆژبێت یا بیست ونۆ ڕۆژ.

و.خۆشـتن لـه گـەرماوی نـاو بـازار بەپاره،هەرچـەند خـەڵكی لـه سـەرفكردنی ئاوەكەدا جیاوازن.

ز.خواردنەوه لەدۆلكەدا بەپاره،هەرچەنده بڕی خواردنەوەكه نادیاره.

**باسـی هەشـتەم/** كـۆدەنگی زانایـان هەیـه لـەوەی: فرۆشـتنی بەچكه لەسكی دایكی وباڵنده لەهەوادا دروست نیه.

**الحـديث ٤٥// ١.عـن أبـي هَريـرةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: نَهَـى رَسـولُ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْه وَسَلّمَ عَنْ بَيْعَتَيْنِ في بَيْعَة.**

**٢.وَعَنْ أَبِي هُرَيرةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رسـولُ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ: مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَة، فَلَهُ أَوْكَسُهُمَا أَوالرِّبَا.**

پێغەمبـەری خـوا دوومامەڵـەی نـاو یـەك مامەڵـەی لـێ قەدەغەكردوین،وەفەرمویـەتی: كەسـێك دوومامەڵـەی نـاو یـەك مامەڵـه بكـات، ئـەبێت یـا كـەمترینیان وەربگرێت،ئەگەر وا نەكات، ئەكەوێته ناو سوەوه.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەكـه//** ١.احمـد (مـسند عبـدالله بـن عمـرو بـن العـاص(٦٦٢٤))،والنـسائی،ترمـذي وإبـن حبـانیش بەصـەحیحیان داناوه.٢.ابوداود ( باب فيمن باع بيعتين في بيعة(٢٣٦٣).[1]

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** شافعی ئەڵێت: ئەم مامەڵەیه دوو لێكدانەوه هەڵئەگرێت:

یەكـەم: بڵێـت: بەقـەرز بـەدوو هـەزارو بـەحازر بەهـەزارت پـێ ئەفرۆشـم،كامیانت بـەدڵ بوو،بـەوه هـەڵی بگره،ئەمـەش مامەڵەیـەكی پوچه،چونكه خەڵەتاندن و هەڵپەساردنی تیایه.

[1] البانی به حسن ی داناوه.

قـازی ئـەڵێت : کێـشەکە لەوەدایـە ئەگـەر بـە نادیـاری بهێڵرێتەوە،بـەڵام گـەربڵێت: مـن قبوڵمـە بـە هـەزاری حازر،یـا قبوڵمـە بـە دوو هـەزاری قەرز،ئـەو کاتە دروستە (چونکە نادیاریەکە نامێنێت).

هـۆی ڕێگریکـردن لـەم جـۆرە لێکدانەوەیـەدا ئەوەیـە: جـێگیر نـەبونی نـرخ و،ربـا (سـوو) تیایـدا،لای ئەوانـەی پێیـان وایـە فرۆشـتنی شـتێك لـەنرخی خۆی زیاتر سوە.

دووەم: بڵێـت ،کۆیلەکـەمت پـێ ئەفرۆشـم بـە مـەرجێك تـۆش ئەسـپەکەتم پێ بفرۆشیت.

هـــۆی ڕێگریکـــردن لـــەم جـــۆرە لێکدانەوەیەشـــدا ئەوەیـــە: بەمـــەرجێکی داهـــاتوو ئەبەســـترێتەوە،کەلەوانەیە بێتـــەدی یـــا نەیەتەدی،بۆیـــە موڵکایەتیەکە جێگیر نابێت.

**<u>باســـی دووەم/</u>** (فَلَـهُ أَوْكَـسُهُمَا أَو الرِّبَـا)،واتـە: ئەگـەر ئـەوەی کرد،یـا ئـەبێت کـەمترین نـرخ وەربگرێت،یـا مامەڵەکـەی ئـەبێت بەسـوو.ئەمـەش پـشتگیری لێکدانەوەی یەکەم ئەکات.

**<u>باســی ســێیەم/</u>** دەربـارەی فرۆشـتن لـەنرخی خـۆی زیـاترو بەقـەرز ، چـەند ڕایەك هەیە:

یەکـەم: حەرامە،بـەڕای زیـن العابـدین علـي بـن الحـسین والناصـر والمنـصور بالله والهادویة وإمام یحیا،بە بەڵگەی:

احمـد لـە سماکـەوە ئەگێڕێتـەوەو شـافعیش هاوڕایـە لەگەڵیـدا: مـرۆڤ شـتێك ئەفرۆشێت،ئەڵێت بە قەرز بەوەندەو بەنەخت بەوەندە.[1]

---

[1] هُوَ الرَّجُلُ يَبِيعُ البيعُ،فيقول: هوَ بِنِسأ بِكَذا،وَهُوَ بِنَقْدٍ بِكَذا.مسند أحمد،مسند عبدالله بن مسعود( ٣٥٠٥ ).وقال شعيب أرناؤط:صحيح لغيره.

دووەم: دروستە،بەڕای شافعیەکان وحەنەفیەکان وزید بن علي والمؤيد بالله وجمهور،صەنعانیش پشتی ئەم ڕایەی گرتوە،بە بەڵگەی: گشتگیری ئەو بەڵگانەی بەدروستی دائەنێن.

گێڕانەوەکەی سماکیش تەنها ئەوە ئەگەیەنێت کە: ئەگەر مامەڵەکە بەو شێوەیە بوو (بڵێت: بەنەخت بەوەندەو بە قەرز بەوەندە) دروست نیە،بەڵام ئەگەر لەسەرەتادا بڵێت: بەقەرز بەوەندە،لەنرخی خۆیش زیاتر بێت هەر دروستە.

لە گەڵ ئەوەدا ئەوانەی پابەندن بەوەوە،ڕێگری ئەکەن لەوەی کە بەو شێوەیەش بکرێت،لەکاتێکدا فەرمودەکە ڕێگری ئەوشێوەیەی نەکردوە،کەواتە بەڵگەکە لە داواکە تایبەتیترە.

**الحَديثُ ٤٦// عَنْ عَمْرو بنِ شُعَيْبِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: لَا يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ،وَلَاشَرْطَانِ فِي بَيْعٍ،وَلَا رِبْحُ ما لَمْ يضمن،ولا بَيْعُ ما لَيْسَ عِنْدَكَ..**

قەرزو مامەڵە پێکەوە دروست نیە،وکۆبونەوەی دوو مەرج لە مامەڵەیەکدا،وقازانجی کاڵایەك هی خۆت نەبێت یالای خۆت نەبێت،وفرۆشتنی کاڵایەك کەلەلات نەبێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** پێنج کەسەکە. ترمذي وإبن خزيمە بەصحيحيان داناوە.سنن الترمذي،باب ما جاء في كراهية بيعتان في بيعة(١٢٧٩).[1]

**مانای وشەکان//** السَّلَفُ: واتا قەرز.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەبارەی شێوەی فرۆشتن و قەرزدان ، دوو ڕا هەیە:

---

[1] ، پێنج کەسەکە بریتین لە: ابوداود،ترمذي،نسائي،إبن ماجە،احمد بن حنبل.البانی ئەم فەرمودەی بەحسن صحيح داناوە.

يەكــەم: كەسـێك ئەيــەوێت شــتێك بەقــەرز بكرێـت بــەزياد لــەنرخی خۆی،لــە كاتێكـدا بەلايــەوە حەرامــە(ئــەم شـێوەيە)،فێڵێـك بەكارئــەهێنێت ئــەويش لــە كڕيارەكــە ئەنــدازەی نرخــی كاڵاكــە قــەرز ئــەكات وپاشــان بــەنرخی حــازری ليیّ ئەكرێت.

دووەم: ئەوەيــە كــە بڵێــت: ئــەم بەندەيــەت پــیّ ئەفرۆشــم بــە هەزار،بــە مەرجێك هەزارم بە قەرز بدەيتیّ. ئەمەش حەڵاڵ نيە. چونكە:

١.قــەرزی ئــەداتیّ تــا لــە نرخەكــەی كــەم بكاتەوە،نرخەكــە بــە ناديــاری ئەمێنێتەوە.

٢.هەموو قەرزێك سوود بەخاوەنەكەی بگەيەنێت ، سوە.

٣.لەگرێبەستەكەدا مەرجێكی تيايە كە نادروستە.

**باسی دووەم/** لەبارەی لێكدانەوەی (وَلَا شَرْطَانِ فِي بَيْعٍ)،چەند ڕايەك هەيە:

يەكــەم: بەغــەوی ئــەڵێت: ئەوەيــە كــە بڵێــت: ئــەوەت پــیّ ئەفرۆشــم بــە هــــەزاری حـــازرو دووهـــــەزاری قـــەرز.ئەمـــەش مامەڵەيەكـــە دوو مـــەرجی تيايە،كــە جيــاوازن لــە يــەكتری و مەبەســت لێــشيان جيــاوازە. دوو مــەرج بێت يا زياتر وەك يەكە. ئەمەش ڕای ابوحنيفەو زيد بن عەليە.

دووەم: فرۆشــيار مــەرج دائــەنێت لەســەر كڕيــار كــە كاڵاكــە نەفرۆشــێت و نەبەخشێت.

سـێيەم: كڕيــار بەفرۆشـيار ئــەڵێت: ئــەم شـتەت پــیّ ئەفرۆشـم بــە مــەرجێك تۆش ئەوشتەی خۆتم پیّ بفرۆشيت.

**باسی سێيەم/** بۆ لێكدانەوەی (وَلَارِبْحُ مالَمْ يُضْمَنْ)،چەند ڕايەك هەيە:

يەكـەم: قـازانج وەرگـرتنی شـتێك مـوڵكی خـۆت نـەبێت،وەك زەوتكراوێـك كـە مــوڵكی داگيركەرەكــە نيە،ئەگــەر فرۆشــتی وقــازانجی تيــاكرد ،قازانجەكــەی بۆحەڵاڵ نيە.

دووەم: قازانج لە شتێکدا کەهێشتا وەرت نەگرتبێت،چونکە کاڵاکە پێش وەرگرتنی لەئەستۆی کڕیاردا نیە،ئەگەر لەناو چوو،فرۆشیار بەرپرسیارە بەرامبەری.

**باسی چوارەم/** فەرمودەی (وَلَابَيْعُ مَالَيْسَ عِنْدَكَ)،بە فەرمودەی حکیم بن حزام لێکدراوەتەوە کە وتویەتی: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا: کڕیار کەدێت بۆلام،ئەچم لەبازاڕ بۆی ئەهێنم ولای خۆم نیە،فەرموی: شتێك لای خۆت نەبێت مەیفرۆشە.[1] ابوداود ونسائي گێڕاویانەتەوە.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فرۆشتن پێش ئەوەی ببێت بەموڵکت دروست نیە.

**الحديث ٤٧// عنْ عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده قالَ: نَهى رسولُ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عنْ بَيعِ العُرْبانِ.**

پێغەمبەری خوا مامەڵەی عوربانی قەدەغەکردوە.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//** مالیك وابوداود و إبن ماجە.موطأ مالك،كتاب البيوع،باب ما جاء في بيع العربان(١٧٨٧).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** مالیك بەو شێوەیە تەفسیری بَيْعُ العُرْبانْ ئەکات:

کەسێك بەندەیەك یا کەنیزەکێك ئەکرێت،پاشان بەفرۆشیارەکە ئەڵێت: دینارێك یا درهەمێك پێشەکیت ئەدەمێ،ئەگەر کاڵاکەم ویست،تەواوی پارەکەت ئەدەمێ. ئەگەر نەشمویست پێشەکیەکە بۆ خۆت.عبدالرزاق یش لە زید بن أسلم ەوە هەمان لێکدانەوەی بۆ کردوە.

**باسی دووەم/** لە بارەی دروستبونی ئەم مامەڵەیە،چەند ڕایەك هەیە:

---

[1] **قُلتُ: يارَسولَ اللهِ،يَأتيني الرَّجُلُ فَيُرِيدُ مِنّي المَبِيعَ لَيْسَ عِنْدي،فَأبْتاعُ لَهُ مِنَ السُّوقِ،قالَ:لَا تَبِعْ ما لَيْسَ عِنْدَكَ.مسندأحمد،مسند حكيم بن حزام (١٤٧٧٢).**

یەکەم: پوچەڵە،بەڕای مالك وشافعي وجمهور،چونکە:

١.ئەو ڕێگریانەی لە فەرمودەکەدا هاتوە.

٢.فەرمودەکـە ڕێ پێنـەدان (قەدەغـەکردن) ئەگەیەنێت،کـە لـە ڕێپێـدان بـەو مامەڵەیـە لـە پێـشترە.لـەکاتی ڕێپێـدان ورێپێنەدانـدا، ڕێپێنـەدان پـێش ئەخرێت.

٣.ئـەم مامەڵەیـە فڕوفێڵـی تیایـە،خواردنی مـاڵی خەڵکـە بـەناڕەوا، دوومەرجی پوچیشی تیایە:

(أ) مەرجی بێبەرابەری پێشەکیەکە ئەگەر کاڵاکەی بەدڵ نەبوو.

(ب) مـەرجی گەڕانـەوەی کاڵاکە،ئەگـەر مامەڵـەی پـێ بـاش نـەبوو وە ڕازی نەبوو پێی.

دووەم: دروسـتە، بـەڕای عمـرو عبـدالله ی کـوڕی و پێـشەوا أحمد،بـە بەڵگـەی: پرسـیارکرا لەپێغەمبـەر دەربـارەی بیـع العربان،ئـەویش بەحـەڵالی دانا.[1]

وەڵامی ئەم فەرمودەش وا دراوەتەوە کە:

(أ) فەرمودەیەکی مرسل ە .

(ب) لەئیسنادەکەیدا کەسێکی لاواز هەیە(إبراهيم بن يحيا).

[1] أخرَجَ عَبدُالرَّزاق في مُصَنَفِه عنْ زَيدِ بنِ أَسلَم؛ أنَّهُ سَئلَ رَسولَ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ عَن العُربانِ في البَيعِ،فَأَحَلَهُ.

**الحَدیثُ ٤٨// عنْ إبنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا قَـالَ: نَهَـى رَسـولُ اللهِ صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ عنْ النَّجْشِ.**

پێغەمبەری خوا نەجش ی قەدەغەکردوە.

**گێــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صــحیح البخــاري – کتــاب البیــوع، بــاب الــنجش (٢٠٥٣).صــحیح مــسلم – کتــاب البیــوع ،بــاب تحــریم بیــع الرجــل علــی بیــع اخیه (٢٨٧١).

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** نجـش لەزمانەوانیـدا واتـا: دەرکردنــی ئـاژەڵ یـا باڵنــدەی ڕاوکراوو لەشوێنی خۆیدا تاکو ڕاوبکرێت.

لەشەرعیـشدا واتـە: زیـادکردنی نرخـی کاڵایـەك کـە بـۆ فرۆشـتن دانراوە،بـە مەبەســتی نــرخ بەرزکردنـــەوە لــە ســەر خــەڵکانی تر،نـــەك کــڕینی. ئــەو کەســەی بــەو کــارە هەڵئەســتێت، نــاونراوە بــە نــاجِش. چــونکە بــازاڕ بــۆ کاڵاکە زیادئەکات وە نرخی بەرز ئەکاتەوە.

**باسی دووەم/** ئەم کردارە،بەسێ شێوە ئەبێت:

١. بەڕێکــەوتنی ژێــر بــە ژێــری لەگــەڵ فرۆشــیاردا،کەهەردولا پێــی تاوانبــار ئەبن.

٢.یـــان بـــێ ئاگـــاداری فرۆشـــیار ئەبێت،وگوناهەکـــەش تـــەنها بـــۆ ناجشەکەیە.

٣.یـا تـەنها فرۆشـیار پێـی ئەڵئەسـتێت: وەك کەسـێك بـۆ هەڵخەڵەتانـدنی فرۆشــیار، بڵێــت ئــەم کاڵایــەم بــەو نرخــە کڕیــوە،نرخێکی زیــاد لــەنرخی خۆی بڵێت.

إبْــن بَطّــال ئــەڵێت: زانایــان کــۆدەنگن لـــەوەدا کــە نــاجِشْ بــەگوناهبار دائەنرێت.

**باســی ســێیەم/** ئەگـەر مامەڵەکـە لـەدوای خەڵەتانـدنی فرۆشـیار ڕویـدا،دوو ڕای زانایانمان هەیە لە بارەیەوە:

یەکـەم: مامەڵەکـە پـوچ ئەبێتەوە،بـەڕای کۆمـەڵێك لـەزانایانی فـەرمودە وأهـل الظـاهر،ڕیوایـەتێکی احمـد و ڕای دیـاری حەنبەلیـەکان. بـەڵام حەنبەلیـەکان ئـەڵێن: کاتێـك پوچـە ئەگـەر لەشێوەی یەکـەم وسێیەمدا بـوو (بە ئاگاداری ئەو یا لەوەوە فێڵەکە کرابوو).

دووەم: مامەڵەکـە دروسـتە بـە ڕای مالکیەکان،پاشـان وەك مامەڵـەی المُـصَرَّاة،[1] کڕیـار ئـارەزوی خۆیـەتی لەگەڕانـەوەی کاڵـاو وەرگرتنـەوەی پارەکەدا.

لای حەنەفیـەکان وایـە: کەڕێگریەکـە بـۆ شـتێکە لـە دەرەوەی مامەڵەکـە (نیەتی هەڵخەڵەتاندنە) لەبەر ئەوە پوچ مابێتەوە.

**باسی چوارەم/** إبـن عبـدالبرو إبـن العربـي و إبـن حـزم ئـەڵێن: کاتێك حەرامە کە لـە نرخـی خـۆی بـەرزتر بێتـەوە (بە هـۆی ئـەو فێڵـەوە)،خـۆ ئەگـەر کەسـێك بـینی کاڵایـەك لـە خـوار نرخـی خۆیـەوە ئەفرۆشـرێت،ئەویش لەنرخەکـەی زیـادکرد (نـەك بـە مەبەسـتی کـڕین) تـا بگاتـە نرخـی خۆی،بـە تاوانبـارو خـاوەن فێـڵ دانانرێت،بـەڵکو پاداشـتیش ئەدرێتەوە،چـونکە جۆرێـك لەئامۆژگاری ئەنجام داوە.

بەڵام بەم شێوەیە وەڵامی ئەم قسەیە دراوەتەوە:

أ.ئامۆژگـاری کـردن بـێ دەرخـستنی نیـەتی کـڕینیش ئەبێت،ئەمـەش فرۆفێڵ وخەڵەتاندنە.

ب.بوخـاری لەگێڕانـەوەی إبـن أبـی أوفـی لـەبارەی هـۆی دابـەزینی ئایـەتی ﴿إِنَّ الـذِينَ يَـشْتَرُونَ بِعَهْـدِ اللَّـهِ وَأَيْمَـانِهِمْ ثَمَنـاً قَلِـيلاً﴾ {آل عمـران:٧٧} واتـە: ئـەو کەسـانەی پـەیمان و سـوێندی خـوا بـە نرخێکـی کـەم ئەگۆڕنـەوە..ئەفـەرموێت: لـەبارەی کەسـێکەوە بـوە کەسـوێند ئـەخوات

---

[1] کەسێك ئاژەڵێکی شیردەر ئەفرۆشێت،بەڵام پێش فرۆشتنی بۆ چەند ڕۆژێك نایدۆشێت،تاکو لای کڕیار وادیار بێت کە شیری زۆرە.

بـــەخوا كـــە ئەوەنـــدەپارەیان بەرامبـــەر كاڵاكـــەی داوەتیٚ،لەكاتێكیـــشدا وانیە.إبن ابی اوفی ئەڵێت: فێڵكەری لەو شێوە سوخۆرەو خیانەتكارە.[1]

إبــن ابــی اوفــی ئــەو فرۆشــیارەی درۆ ئــەكات لــەوتنی ئــەو نرخــەی پێیانداوە،بــە نــاجش دائەنێت،چـونكە وەك ئەوەیــە كــە بــۆ زەرەر گەیانــدن لەخــەڵكی نرخــی شــتێك بەرزئەكاتــەوە لەكاتێكــدا ناشــیەوێت بیكرێت،هــەردولا تاوانبارن،جـا ئەگــەر نــاجش فرۆشــیارەكە نــەبو كەسـێكی تــر بـوو، بـەڵام فرۆشیارەكە بڕێـك پـارەی بەرابـەر ئـەو كـارەی دابویـە: ئـەوە بە سوخۆر دائەنرێت.

**الحَديثُ ٤٩// عنْ معمر بـن عبـدالله رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ عـنْ رَسـولِ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـه وَسَلّمَ قالَ:لا يَحْتَكِرُ إلاّ خاطِيء..**

كەسێك تاوانبار نەبێت شت ناشارێتەوە.

<u>**گێــرەرەوەی فەرمودەكـــە//**</u> صـحيح مـسلم - كتـاب المـساقاة ، بـاب تحـريم الاحتكار في الأقوات (٣٠٩٨).

<u>**مانـــای وشـــەكان//**</u> إحْتَكَـرَ: كـڕینی شـتێك و هێـشتنەوەی تـا كەمبێتـەوەو گران بێت. خَاطِيء: تاوانبار.

<u>**سەرباسەكان//**</u>

<u>**باسی یەكەم/**</u> لەبارەی شاردنەوەی خواردن و شتی ترەوە،چەند ڕایەك هەیە:

یەكـــەم: شـــاردنەوەی خـــواردن وشـــتی تـــریش حەرامە،بـــەڕای ابویوســف.ئــەڵێت: هەرشــتێك بــا ئــاڵتون یــا زیــویش بێت،شــاردنەوەی

---

[1] أخرَجَ البُخاري منْ حديث إبنِ أبي أوفىَ في سبب نُزولِ قَوْله تَعالَى: إنّ الذينَ يَشْتَرونَ بِعَهْد الله وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَناً قَليلاً،قالَ: أقَامَ رَجُلٌ سلْعَتَهُ بِالله لَقَدْ أعْطِيَ بِهَا ما لَمْ يُعْطَ، فَنَزَلَتْ. قالَ إبْنُ أبي أوفَى: النّاجِشُ آكِلُ رِباً خائِنٌ. صحيح البخاري - كتاب الشهادات ،باب قول الله تعالى : إن الذين يشترون بعهد الله وأيمانهم ( ٢٥٥١ ).

حەرامە،ئەگەر زەرەری بۆ خەڵك هەبوو. ڕوكەشی فەرمودە باسلێكراوەكەش پشتگیری ئەم ڕایە ئەكات،مەگەر بوترێت شاردنەوە تەنها لە خواردندا هەیە.

دووەم: شاردنەوە تەنها لەپێویستی خەڵك و ئاژەڵاندایە،بەڕای هادویەو شافیعی مەزهەبەكان.

**باسی دووەم/** هەندێك فەرمودە ڕێگری كردن لە شت شاردنەوە تایبەت ئەكەن بە خواردن.فەرمودەی لەو شێوەش لای جمهور(مُطْلَقْ)ی پێ نابرسترێتەوە،لە بەر ئەوەی ئەم دوو جۆرە فەرمودانە دژ بە یەك نین، بەڵكو مطلق وەك خۆی ئەمێنێتەوە. كەواتە ئیش بەو فەرمودانە ئەكرێت كە ڕێگری ڕەهایی شتشاردنەوەن،تایبەت ناكرێن بەپێویستی خەڵك وئاژەڵانەوە،تەنها بە ڕای ابوثور نەبێت،كەلای زانایانی اصول وەڵامی دراوەتەوە.

كەواتەجمهور تایبەتی ئەكەن بە دوو پێویستیەكەوە،چونكە ئەوە گونجاوترە بۆ هۆكاری حەرامبونی (شت شاردنەوە)، كە لادانی زەرەرە لەخەڵكی. زۆر جاریش زەرەر لادان لەخەڵكی لە دوو پێویستیەكەدا ئەبێت. كەواتە ڕەهایی فەرمودەكەیان بە حیكمەتی گونجاو (زەرەر لادان لەخەڵك) بەستۆتەوە،یا بە بۆچونی ئەو هاوەڵەی فەرمودەكە ئەگێڕێتەوە:

موسلیم ئەیگێڕێتەوە:

كەسعید بن المسیب شتی ئەشاردەوە (هەڵی ئەگرت)، كاتێك هۆكارەكەیان لێ پرسی، وتی: معمر كە فەرمودەكە ئەگێڕێتەوە،ئەویش شتی ئەشاردەوە.[1]

---

[1] أخرجَ مُسْلمُ عنْ سعيد بنِ المُسَيِّبِ أنَّهُ كانَ يَحْتَكرُ.فقيلَ لهُ: فَإنَّكَ تَحْتَكِرَ؟ فقالَ: لِأنَّ معمراً راوي الحديثِ كانَ يَحْتَكِرُ. صحيح مسلم ،كتاب المساقاة باب تحريم الاحتكار في الأقوات (٣٠٩٧).

إبـن عبـدالبر ئـەڵێت: ئـەوان نـەوتیان ئەشـاردەوە،بەوەش دەر ئەکـەوێت کـە سـعید بـن المـسیب، ڕەهـایی فەرمودەکـەی بـە بۆچـونی گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە بەسـتۆتەوە. بـەڵام نازانرێـت معمـر بـە چـی ڕەهاییەکـەی بەستۆتەوە. لەوانەیـە بـەو حیکمـە تـەبێت کـە جمهـور باسـیان کـردوە (دیارە نەوت شاردنەوە زەرەری بۆ خەڵك نەبوە).

**باسـی سـێیەم/** ئـەو کاڵایانـەی خـەڵکی هـەڵی ئـەگرن لـە ماڵـەوە،خواردن وپێویستیەکانی تر،دروستە بێ جیاوازی ڕای زانایان،بە بەڵگەی:

ا.پێغەمبـەری خـوا بۆهـەموو خێزانێکـی ١٠٠ وسـق خورمـای ئەدانێ،کـە لـە خەیبەرەوە بۆی هاتبوو.[1]

ب.پێغەمبـەری خـوا پێویـستی خـواردن لـەخورماو شـتی تـری سـاڵێکی بـۆ خێزانەکانی هەڵئەگرت.[2]

**باسـی چـوارەم/** هۆکـاری حـەرامبونی شتـشاردنەوە،زەرەر گەیاندنـە بـە موسڵمانان بە زیادکردنی نرخ لێیان،بە بەڵگەی:

ا.فـەرمودەی پێغەمبـەر بـە گێڕانـەوەی معقـل بـن یـسار: کەسـێك نرخـی کاڵـای موسـڵمانان بـەرز بکاتـەوە،خوای گـەورە کردویـەتی بـە مـاف بەسـەر خۆیـەوە کـە لـە ڕۆژی قیامەتدا لە سەر ئێسقانێکی ئاگرین داینیشێنێت.[3] أحمد گێڕاویەتەوە.

ب.فـەرمودەی پێغەمبـەر صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بـە گێڕانـەوەی أبـوهریرە: کەسـێك شـتێك بـشارێتەوە،بە مەبەسـتی گرانکردنـی لەسـەر موسـڵمانان، ئەوە تاوانبارە.[4] أحمد گێڕاویەتەوە.

---

[1] أنَّ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كانَ يُعطي كُل واحدة منْ زوجاته مئةَ وَسْقٍ منْ خَيْبَرَ.

[2] كانَ رسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَّخِرُ لِأَهْلِه قوتَ سَنَتِهِمْ مِنْ تمرٍ وغيرِهِ.قالَهُ إبنُ رَسْلان في شَرْحِ السُّنَنِ.

[3] مَنْ دَخَلَ في شيءٍ مِنْ أسعارِ المُسلمين ليُغْلِيَهُ عليهمْ،كانَ حقّاً على الله أنْ يُقْعِدَهُ بعظمٍ منَ النّارِ يومَ القيامَةِ. مسند أحمد بن حنبل - أول مسند البصريين ،حديث معقل بن يسار – ( ١٩٨١٩ ).

[4] مَنْ احتَكَرَ حُكْرَةً،يُريدُ أنْ يغلي بِها علَى المُسلمين،فَهوَ خاطيءٌ.

ج.أبــوداود ئــەڵێت: کــە بــە سَــعِيد بـــن المُـــسَيَّبْ وتـــرا: تـــۆ شـــت ئەشاریتەوە،ووتی: معمریش شتی ئەشاردەوە.

إبـــن عبـــدالبر و کەســـانی تـــریش ئـــەڵێن: ئـــەوان نـــەوتیان ئەشـــاردەوە، فەرمودەکەشـــیان ڕاڤـــەکرد بـــو بـــۆ شـــاردنەوەی خواردەمـــەنی پێویـــستی خەڵکی،شـــافیعی وابوحنیفـــەو خـــەڵکانی تـــریش وا لـــە فەرمودەکـــە گەشتبون.

<u>**باســی پێنجــەم**</u>/ السُبُکی ئـەڵێت: ئـەوەی پێویـستە بوترێـت: گـەر نەیهێـشت خــەڵکی تــر بیکرێت،تەنگانــە بــۆ خــەڵکی دروســتبوو حەرامە،بــەڵام ئەگــەر نرخـەکان هـەرزان بو،خـەڵك پێویـستی بـەو بـڕە نـەبوو کـە ئـەیکڕێ و هـەڵی ئـەگرت،ڕێگرتن لـەو کـڕین و هـەڵگرتنی بـۆ کـاتی پێویـستی خـەڵکی ، هـیچ مانایەکی نیە.

قــازی حــسین ئــەڵێت: لەوانەیــە چــاکە بێــت ،چــونکە ســودی بــۆ خـــەڵکی هەیە.

**الحديث ٥٠// عن أنس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،قال: غلا السعر في المدينة على عهد رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،فقال الناس: يارسول الله،غلا السعر فسعر لنا. فقال رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إن الله هو المسعر القابض الباسط الرازق،إني لأرجو أن ألقى الله وليس أحد منكم يطلبني بمظلمة في دم ولا مال...**

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا لەشاری مەدینەدا نرخەکان بەرزبوەوە،خەڵکی ووتیان: ئەی پێغەمبەر نرخەکان بەرزن،بەڵکو نرخمان بۆ دابنێی. ئەویش فەرموی: خوای گەورە خۆی نرخ دانەرو وەرگرەوەو دەستکراوەو ڕۆزیدەرە. من لای خوا تکا ئەکەم کاتێك پێی گەشتم هیچ کەستان داوای ماف لەخوێن یا ماڵم لێ نەکات.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** پێنجەکە جگە لەنسائی،إبن حبانیش بەصەحیحی داناوە.[1]

**مانای وشەکان//** الغَلاءُ:بەرز بونەوەی نرخ زیاد لە نرخی سروشتی خۆی. إنَّ اللهَ هوَ المُسَعِّرُ: خوای گەورە خۆی بە ویستی خۆی نرخ دائەنێت.القَابِضُ: ئەیگرێتەوە. الباسِطُ: ئەیکاتەوە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** نرخ دانان بریتیە لەوەی: سەرۆك یا جێگرەکەی یا هەر کەسێك کەئیشی موسڵمانانی بە دەستە، بڕیار بۆ خەڵکی بازار دەربکات،کە کاڵاکانیان بە نرخی دیاریکراو نەبێت نەفرۆشن،نەبەزۆرتر،نەکەمتر. لە بەر بەرژەوەندیەکی پێویست.

**باسی دووەم/** فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە: نرخدانان ستەمە،کەواتە حەرامە.بەڕای زۆربەی زانایانە.

---

[1] البانی بە صحیحی داناوە.

**باسی سێیەم/** ستەمکردن لە نرخدانانـدا لـەوەدا خـۆی دەبینێتـەوە کـە: خـەڵکی دەسـەڵاتیان بەسـەر سـامانی خۆیانـدا هەیە،نرخـدانانیش ڕێگرتنـە لـەو دەسەڵاتەیان،پێـشەوای موسـڵمانانیش پێویـستە ڕەچـاوی بەرژەوەنـدی هـەمو خـەڵك بکـات: ڕەچـاوکردنی بـۆ بەرژەوەنـدی کڕیـار لـە هـەرزانی نرخدا،لـە پێـشتر نیـە لـە ڕەچـاوکردنی بەرژەوەنـدی فرۆشـیار لـە دەسـتکەوتنی قازانجدا،ئەگـەر هـەر دوو بەرژەوەندیەکـە یەکسانبون،پێویـستە ڕێ بـە هـەردولا بـدرێت بـە ئازادانـە هەڵـسوکەوت بکـەن.پاشـان زۆرکـردن لەفرۆشـیار تـا کاڵاکـەی خـۆی بـێ ڕەزامەنـدی بفرۆشرێت،پێـچەوانەی ئایـەتی ﴿إِلاَّ أَن تَكُـونَ تِجَـارَةً عَـن تَـرَاضٍ مِّـنكُمْ﴾ {النـساء:٢٩} .واتـە: مەگـەر بازرگـانی بێـت و بـە ڕەزامەنـدی خۆتـان بێـت. ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە.

**باسی چـوارەم/** هـەر چـەندە فەرمودەکـە بـۆ بـوارێکی تایبـەت هاتوە،بـەڵام بەڵگەیە لە سەر حەرامبونی نرخدانان بۆ هەموو کاڵایەك.

**باسی پێنجـەم/** بە ڕای پێـشەوا مالیـك: نرخـدانان دروسـتە،هەتا لـە گـەنم وجۆیشدا.

مەهـدی ئـەڵێت:پێـشەوایانی دوایـی بەباشـیان دانـاوە نـرخ دابنرێـت بـۆ جگـە لـە گـەنم وجـۆ،وەك ڕۆن وگۆشـت و..ئەمـەش بـۆ بەرژەوەنـدی خـەڵك و لادانی زەرەر لێیان.

**باسی شەشـەم/** ڕوکەشـی فـەرمودەکان وایـە کـە جیـاوازی ناکـات لـەنێوان: کـاتی گرانـی و هەرزانیدا،کاڵایـەك هێنرابێـت لـەدەرەوە،یان نـا.ئەمـەش ڕای جمهورە.

**الحَديثُ ٥١// عـنْ أَبـي هُرَيـرَةَ رَضـيَ اللـهُ عَنْـهُ ،أنّ رَسـولَ الله صَلَى اللـهُ عَلَيْـه وَسَلَّمَ ،مَرَّ علـىَ صبْرَةِ مـن طَعـام فأَدْخَلَ يـدَهُ فيها،فَنالَتْ أَصـابِعُهُ بَلَـلاً.فَقـالَ: ماهـذا يـا صاحِبَ الطَعام؟ قـالَ: أصابَتْهُ السَماءُ يـا رَسولَ الله.قـالَ: أَفَلا جَعَلْتَـهُ فـوقَ الطَعـام كَيْ يَراهُ النَاسُ؟ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنّي...**

پێغەمبـەری خـوا بـەلای کۆمـەڵێك خواردنـدا تێپـەڕی. کەدەسـتی خـستەناوی، هەسـتی بەتـەڕی کـرد.فـەرموی: ئەمەچـیە ئـەی خـاوەن خـواردن؟ ووتـی: ئـاوی ئاسمـانی بەرکـەوتوە ئـەی پێغەمبـەری خـوا.فـەرموی: بـۆ لـە سـەروی خواردنەکـە داتنـەناوە تـا خـەڵکی بیبینن،کەسێك فێڵ بکات لەمن نیە.-لەسەر ڕێبازی من نیە-.

<u>گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//</u> صـحيح مـسلم ،كتـاب الإيمـان ،بـاب قـول الـنبي صلى الله عليه وسلم : " من غشنا (١٧٢).

<u>مانای وشەکان//</u> الصُبْرَةُ: کۆمەڵێك خواردەمەنی.خواردەمەنیەکی کەڵەکە بو.

<u>سەرباسەکان//</u>

<u>باسـی یەکـەم/</u> زانایـان کـۆدەنگن لـە سـەر حـەرامی فێڵکـردن لەشـەرعدا،بە بەڵگەی: فەرمودەی باسلێکراو وە فەرمودەی تریش.

لـە سـەر ئـەوەش کـۆدەنگن کـە : کەسـی فێڵـاوی بێـزراوە لەپێوانـەی ژێریشدا.

<u>باسـی دوەم/</u> ئـەوەوی ئـەڵێت: لـە فەرمودەکانـدا (مِنّـي) هـاتوە بـەیای متکلم،ئـەوە ڕاسـتەو،واتە: کەسـێك نیـە بـە ڕێنمـایی مـن بـڕوات و،زانـست و کردارو ڕێبازی چاکی من بکات بە پێشەنگی خۆی.

بـەڵام سـفیان بـن عیینـە ئـەڵێت: لێکدانـەوەی ئـاوا بـاش نیە،ئـەبێت بڵـێین: مانـای ئەو دەستەواژەیە لێك نادەینەوە،تا کاریگەری لە سەردەرون زیاتر بێت.

**الحَديثُ ٥٢// عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْها،قالَتْ: قالَ رَسولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ: الخَراجُ بِالضَّمانِ.**

بەروبوم بۆ خاوەنی کاڵاکەیە ، چونکە مەسرەفی دەکێشی.

**گێـــرەرەوەی فەرمودەکـــە//** پێـنج کەسـەکە ئەیگێڕنـەوە. سـنن ابـي داود – كتاب البيـوع ،ابـواب الإجـارة، بـاب فـيمن اشـترى عبـدا فاسـتعمله ثـم وجـد به عيبا ( ٣٠٦١).[1]

**هــۆی وتـــنی فەرمودەکــە//** پیاوێـك بەندەیـەکی منـاڵی کڕی،تـا ماوەیـەك لای بوو،پاشـان عــەیبێکی تیــا بـینی و گێڕایــەوە.پێغەمبــەری خــواش بڕیاریــدا بــە عەیبەکــەوە بــۆ خاوەنەکــەی بگێڕێتەوە،خاوەنەکــەی وتــی: بــەکاری هێنــاوە.پێغەمبــەری خــواش فــەرموی: بــەروبوم بــۆ خــاوەنی کاڵاکەیــە چونکە مەسرەفی دەکێشی.[2]

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکـــەم/** مانـای فەرمودەکـە: ئەگـەر فرۆشـراو بـژێوی و بـەروبوم ی هەبوو،بـەرو بومەکـەی بـۆ خاوەنەکەیـەتی، چـونکە بەرپرسـیارە بەرامبـەری: ئەگــەر کەسـێك زەویــەکی کــڕی و بــەکاریهێنا،یا ماڵــاتێکی کــڕی و زا،یــا ئــاژەڵێکی کـــڕی و بـــۆ ســـواربون بـــەکاریهێنا،یا کۆیلەیـــەکی کـــڕی و بەکاریهێنا،پاشـــان عـــەیبێکی تیـــا دۆزیـــەوە،بۆی هەیـــە بیگێڕێتـــەوە بـــۆ خاوەنەکـــەی پێـــشوی. بەرامبـــەر بەوســـودانەش کـــە وەریگرتـــوە،هیچ بەرپرســـیار نیـــە لـــە قـــەرەبو کردنەوەیدا،چـــونکە ئەگـــەر لـــەماوەی نێـــوان

---

[1] البانی پلەی حسن ی داوەتی.

[2] أخْرَجَهُ الشّافعي وَأصْحابُ السُّنَنِ: أنّ رَجُلاً إشْتَرَى غُلاماً في زَمَنِ رَسولِ الله، وكانَ عِنْدَهُ ما شاءَ اللهُ،ثُمَّ رَدَّهُ مِنْ عيبٍ وَجَدَهُ،فَقَضَى رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَدِّهِ بِالعَيْبِ. فَقالَ المَقْضِي عَلَيْهِ: قَدْ إسْتَعْمَلَهُ. فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الخَراجُ بِالضَّمانِ.

پرۆسەی فرۆشتن پاشان هەڵوەشانەوەیدا،تیاچوو،کڕیار بەرپرسیارە،کەواتەپێویستە بەروبومی ئەو کاتەش بۆ ئەو بێت.

**باسی دوەم/** زانایان لەم بارەیەوە چوار ڕایان هەیە:

یەکەم: بەروبوم بەرامبەر بژێوی کردنە،وەك لەمانای فەرمودەکەدا هاتوە،هەرچی سودە سەرەکی و لاوەکیەکانی فرۆشراوە کەیە،بۆ کڕیارە،فرۆشراوە کە وەك چۆن وەریگرتوە.ئەگێڕێتەوە بۆ فرۆشیار،بەڕای شافعی.

دوەم: جیاوازی هەیە لەنێوان سودی سەرەکی ولاوەکی: سودە لاوەکیەکان بۆ کڕیارە،بەڵام سەرەکیەکان پارێزراو ئەبێت لای،ئەگەر فرۆشراوەکەی گێڕایەوە،سودە سەرەکیەکانیش ئەگێڕێتەوە لەگەڵیدا،ئەگەر ئەوسودانە لەناو چوو،پێویستە کڕیار قەرەبوی بکاتەوە. ئەگەریش ڕێککەوتن،ئەتوانێت نەیگێڕێتەوە.بەڕای هادە ویە.

سێیەم: سودە لاوەکیەکان وەك بەکرێدان،بۆ کڕیارە،سودە سەرەکیەکانیش وەك بەروبوم ،ئەگەر مابوو،لەگەڵ ماڵەکەدا ئەیگێڕێتەوە،ئەگەر لەناویش چوبو،نایگێڕێتەوە،بەڵکو تەنها نرخەکەی ئەداتەوە بە خاوەنەکەی (پێشوی). بە ڕای زانایانی حەنەفی مەزهەب.

چوارەم: لەنێوان سودە سەرەکیەکانیشدا جیاوازی ئەکرێت: خوری و موی ئاژەڵەکە،بۆنمونە بۆ کڕیارە،بەڵام بەچکەی ئاژەڵەکە ئەگێڕێتەوە بۆ فرۆشیار لەگەڵ دایکەکەدا.

ئەمە لە کاتێکا ئەگەر بەچکەکە لەکاتی فرۆشتندا لە دایك نەبوبو،خۆ ئەگەر لەوکاتەدا لەدایك بوبو،لەگەڵ دایکەکەدا فرۆشرابو،ئەوە بە کۆدەنگی زانایان پێویستە بگێڕدرێتەوە.ئەمەش ڕای مالیکە.

صەنعانی ئەڵێت: فەرمودەکە ئاشکرا ودیارە بۆ ڕای شافعی.

**الحَديثُ ٥٣// عنْ جابر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قالَ: لَعَنَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ آكِلَ الرِّبا وَمُوكِلَهُ وَكاتِبَهُ وَشاهِدَيْه،وقالَ: هُمْ سَواءٌ.**

پێغەمبەری خوا نەفرەتی کردوە لە سوخۆرو سو دەر،وە نوسەری نێوانیان وهەردوو شایەتەکە،وە فەرمویەتی: لەتاواندا وەك یەکن.

<u>**گێرەرەوەی فەرمودەکە//**</u> صحيح مسلم - كتاب المساقاة ، باب لعن آكل الربا ومؤكله (٣٠٨٠).

<u>**مانای وشەکان//**</u> الرِّبا: زۆرکردن، سوو خواردن،بە هەموو مامەڵەیەکی نادروست ئەوترێت. اللَعْنْ: دورخستنەوە لەمیهرەبانی خوا.

<u>**سەرباسەکان//**</u>

<u>**باسی یەکەم/**</u> نەفرەت کردن مانای گوناهباری خاوەنی ئەو کارانەو،حەرامبونی کارەکەش ئەگەیەنێ.

<u>**باسی دووەم/**</u> لە فەرمودەکەدا بە تایبەت باسی خواردن کراوە،چونکە زۆرتر ماڵ بۆ خواردن بەکاردێت.سود وەرگرتنی جگە لە خواردنیش هەمان حوکمی هەیە.

<u>**باسی سێیەم/**</u> (مُوكِلَهُ)،ئەو کەسەیە کەپارە سوەکە ئەدات،بۆیە نەفرەتی لێکراوە چونکە سوخواردنەکە بێ ئەو ئەنجام نادرێت. ئەویش لەتاواندا بەشدارە.

تاوانی نوسەرو شایەتەکانیش لەوەدایە کە: یارمەتیدەری کردنی حەرامبون. گەر بە ئەنقەست بیکەن وبشزانن سوە.

<u>**باسی چوارەم/**</u> ئەگەر بوترێت،پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: خوایە هەرکەسێك من نەفرەتم لێکرد،بۆی بکە بە ڕەحمەت[1] ،بەڵگەیە لە سەر

---

[1] اللهُمّ ما لَعَنْتُ مِنْ لَعْنَةٍ،فَاجْعَلْها رَحْمَةً.أصله في صحيح مسلم: اللهمّ ! إنمّا أنا بشرٌ . فأيُما رجلٍ من المسلمين سببتُه ، أو لعنتُه ، أو جلدتُه . فاجعلها له زكاةً ورحمةً.

ئەوەی کە نەفرەتکردنی پێغەمبەر لەشتێك مانای حەرامبون ناگەیەنێت. کەواتە مەبەستی پێغەمبەر لە نەفرەتکردنی کەسێك دوعا کردن نیە لێی.
صەنعانی ئەڵێت: ئەو فەرمودەیەی سەرەوە بۆ کەسێکە ئیشێکی حەرامی نەکردوەو نەفرەتی لێکراوە.یا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە کاتی تورە بونیدا نەفرەتی لێکردوە.

**الحَديثُ ٥٤// ١.عنْ عُبادَةَ بنِ الصامتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،قالَ رَسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَالفِضَّةُ بِالفِضَّةِ،وَالبُرُّ بِالبُرِّ وَالشَّعيرُ بِالشَّعيرِوالتَّمرُبِالتَّمرِ،والمِلحُ بِالمِلحِ،مثلاً بِمثْلٍ،سَواءً بِسَواءٍ،يَداً بِيَدٍ.فَإذا إختَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنافُ،فَبيعُواكَيفَ شِئْتُمْ،إذا كانَ يَداً بِيَدٍ..**

گەر ئاڵتون بەرامبەر ئاڵتون،وزیو بەرامبەر زیو،وگەنم بەرامبەر گەنم،وجۆ بەرامبەر جۆ،وخورما بەرامبەر خورما،وخوێ بەرامبەر خوێ فرۆشرا، ئەبێت وەك یەکبن و دەست بە دەست.بەڵام گەر جیاواز بون لە جۆردا بە ئارەزوی خۆتان بفرۆشن ،گەر دەست بە دەست بێت.

**٢.عنْ أَبي سَعيدِ الخُدْرِي رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ،أنَّ رَسولَ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قالَ: لاتَبيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، إلاَّ مِثلاً بِمثْلٍ،وَلاتُشِفُّوا بَعضَها على بعضٍ،وَلاتَبيعوا الوَرِقَ بِالوَرِقِ إلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ،وَلا تُشِفُّوا بَعْضَها عَلى بَعْضٍ،وَلاتَبيعُوا مِنْها غائِباً بِناجِزٍ..**

ئاڵتون بەرامبەر ئاڵتون مەفرۆشن گەر وەك یەکنەبن. یا هیچیان لەوی تر زیاتر نەبن. کاغەز (پارە) بەرامبەر خوێ مەفرۆشن گەر وەك یەکنەبن،یا لایەك لەویتر زیاتر نەبێت.نا دیارێکیان بە دیارو ئاشکرایەك نەفرۆشرێت.

<u>**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**</u> ١ .صحيح مسلم كتاب المساقاة ، باب الصرف وبيع الذهب بالورق نقدا (٣٠٥٤).
٢. صحيح البخاري ، كتاب البيوع، باب بيع الفضة بالفضة ( ٢٠٨٩) .
صحيح مسلم ، كتاب المساقاة ،باب الربا ( ٣٠٤٩).

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** هەردوو فەرمودەكە حەرامبونی (رِبا الفَضْلْ) ئەگەیەنێت،كە بریتییەلە: گۆڕینەوەی ئاڵتون بە ئاڵتون و زیو بە زیو، هەر یەكێك لەو شەش كاڵایەی لە فەرمودەكەدا باسكراون بەرامبەر هاوڕەگەزی خۆیان، بڕی یەكێكیان لەویتر زیاتر بێت،بە حازر بێت یا بە قەرز.

فەرمودەكەش (إلاّ مِثْلاً بِمِثْلٍ)،واتە: لە هیچ كاتێكدا ئەمانە مەفرۆشن ئەگەر وەكیەك نەبن.

(ولا تشفوا)یش دوپاتكردنەوەی ئەو مانایەیە.

**باسی دووەم/** هەردوو فەرمودەكە بەڵگەی حەرامبونی (رِبا النَّسيئَة) یە.

**باسی سێیەم/** ووشەی (الذَّهَبُ وَالوَرِقُ)،هەموو ماناكانی ئەو دوو وشەیە ئەگرێتەوە: لەشێوەی نەخت بن یان نا،نەخشیان لەسەر بێت،چاك بن یان خراپ،ساغ بن یان شكاو،خشڵ بن یان وورده،ساغ بن یا فێڵ كراو.

**باسی چوارەم/** زانایان لەبارەی (رِباالفَضْل)ەوە،چەند ڕایەكیان هەیە:

یەكەم: حەرامبونیەتی،سەرجەم زانایان و هاوەڵان و شوێنكەوتوان وفەقیهەكان لەسەر ئەو ڕایەن. بە بەڵگەی فەرمودەی مەبەست-باسلێكراو-.

دووەم: حەڵاڵ بونیەتی،سووش تەنها لە(رِبا النَّسيئَة) دایە،ئەمیش ڕای إبن عباس وهەندێك لە هاوەڵانە،بە بەڵگەی: فەرمودەی گێڕاوەی ئوسامە: سوو خواردن تەنها لە نەسیئەدایە.[1]

بەڵام سەرجەم زانایان بەم شێوە وەڵامی ئەم ڕایە ئەدەنەوە:

أ.مانای فەرمودەكە: سووی خراپتر لە نەسیئە نیە،هەردوكیان خراپن بەڵام نسیئە خراپترە.

---

[1] (لارِبا إلّا في النَّسيئَةِ) و(إنَّما الرِّبا في النَّسيئَةِ). مُتَّفَقٌ عَلَيْه.

ب. فـــەرمودەی ئوســـامە بـــە وورد بونـــەوە لێـــی مانـــای لـــێ دەریـــەت (مَفْهُـوم)،بـەڵام فـەرمودەکانی تـر بـە ڕاشـکاوی مانـا ئـەدات بـە دەسـتەوە (مَنْطُـوق).لـەکاتی دژ یـەکبونی دوو دەقـی وا دا،دوەمیـان پـێش ئـەخرێت (مَنْطُوقْ).

ج.حـــاکم گێڕاویەتـــەوە کـــە: ئـــیبن عبـــاس لـــەڕای خـــۆی پەشـــیمان بوەتـــەوە،کاتێك فەرمودەکـەی ئەبوسـەعیدیان بـۆ باسـکردوەو،هاتوەتە سـەر ڕای یەکەم ،و داوای لێخۆشبونی لەخوا کردوە.

د.فەرمودەکـەی ئوسـامە لابـراوە (مَنْـسُوخ)ە.بـەڵام لابـردن بـە ئەگـەر دیـاری ناکرێت،بەڵکو دەبێت لێی دڵنیا بێت.

**باسی پێنجەم/** چەند ڕایەك هەیە دەربارەی هۆکاری حەرامبونی سوو:

یەکـەم: جگـە لـەو شـەش کاڵایـەی لـە فەرمودەکـەدا باسـکراون،هەر شـتێکی تـر هاوبـەش بێـت لـە گەڵیـدا لەعیللـە و هۆکاردا،ئـەویش حەرامـە. ئەمـەش ڕای سـەرجەم زانایانـە کـە کـۆکن لـە سـەر بەشـێکی عیللـە، ئـەویش یەکـچون لـە ڕەگـەزی کاڵاکەدا. بەڵام ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی بەشەکەی تری عیللە:

ا.کێـشانەو پێوانەیـە،(هەرشـتێك بکێـشرێت و بپێورێـت سـووی تیـا ئـەبێت) ئەبوحەنیفەو عترە.

ب.نرخی هەبێت وخواردن بێت،ڕای زانایانی شافیعی مەزهەب.

ج.نرخـی هـەبێت وخـواردن بێـت وخـەڵکی پێـی بـژی.ڕای زانایـانی مـالیکی مەزهەب.

دووەم: سـوو تـەنها لـەو شـەش کاڵایەدایـە کـە دەقیـان لەسـەر هـاتوە.ئەمـەش ڕای ظاهریـــەو،صـــەنعانیش بـــە ڕایـــەکی دروســـتی زانیـــوەو وتویـــەتی: لەبەرئـــەوەی زانایـــانی ڕای یەکـــەم هۆکـــاری ڕاســـتی ســـوویان نـــەزانیوە، بۆیـــە چـــەند ڕایـــەکی جیاوازیان هەیە لەسەری و ڕاستی لەلای ڕای دووەمە.

**باسـی شەشـەم/** زانایـان یەکـدەنگن لـە سـەر دروسـتی فرۆشـتنی یـەك لـەو شـەش کاڵایـە، بەرامبـەر بـە کاڵایـەکی تـر کـە وەك خـۆی نەبێت،ئەگـەر

وەرگرتنەکەی دواش بخرێت و زیادەشی تیا بێت،وەك کڕینی گەنم بەئاڵتون،یا جۆ بە زیو،وە هەموو کێشانەکانی تر.

**باسی حەوتەم/** یەکران لەوەی: دروست نیە فرۆشتنی کاڵایەك بەکاڵایەکی وەکخۆی،گەر یەکێکیان درەنگتر وەربگیرێت.

**الحديث ٥٥// عن أبي سَعيد وَأبي هَرَيرةَ رَضيَ اللّهُ عَنهُمَا: أنّ رَسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ إستَعمَلَ رَجُلاً على خَيبَرَ،فَجاءَ بِتَمرٍ جَنيب،فَقالَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ: أكُلُ تَمرِ خَيبَرَ هَكَذا؟ فقالَ: لاوالله يا رسولَ الله،إنا لَنَأخذُ الصّاعَ مِنْ هذا بِالصّاعَين،وَالصّاعَين بِالثّلاثَةِ. فقالَ النّبِيُّ صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ: لاتَفعَلْ، بِعْ الجَمعَ بِالدّراهِمِ، ثُمّ إبتَعْ بِالدّراهِمِ جَنيباً. وَقالَ في الميزانِ مِثْلَ ذَلكَ..**

پێغەمبەری خوا کەسێکی کرد بە لێپرسراو لە خەیبەردا،ئەویش خورمایەکی جوانی هێنا (بۆ لای پێغەمبەر)،پێغەمبەری خوا **صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ** فەرموی: هەموو خورماکانی خەیبەر وایە (وا جوانە)؟ وتی: نا ئەی پێغەمبەری خوا. مشتێك لەمە ئەکڕین بە دوو مشت لە خورمای تر،وە دو مشت لەمە بەسێ مشت لەخورمای تر.پێغەمبەر **صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ** فەرموی: وا مەکە،خورماکەی خۆت بە پارە بفرۆشەو، ئەم خورما جوانەی پێبکڕە.(لەبارەی شتی کێشراویشەوە پێغەمبەر هەمان قسەی فەرموو).

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب البيوع ،باب إذا أراد بيع تمر بتمر خير منه (٢١١١).

صحيح مسلم - كتاب المساقاة، باب بيع الطعام مثلا بمثل ( ٣٠٦٨).

**مانای وشەکان//** رَجُلاً: پیاوەکە ناوی سواد بن غزية الأنصارية. الجَنيبْ: خورمای خۆش،ڕەق،خراپەکەی لێ جیا کرابێتەوە،تێکەڵ بە خورمای

جـۆریتر نـەبوبێت. الجَمْـعُ: خورمـای خـراپ، تێکـەڵ لەچـەند جۆرێـك (لـە ڕیوایەتی موسلیمدا).

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** فەرمودەکە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە: یەکسان بون مەرجە لـە کـاتی فرۆشـتنی کاڵایـەك بـە هـاو ڕەگـەزی خۆی،لـە چـاکی وخراپیـدا وەکو یەکبن یان نا،چاك وخراپ هەر یەك ڕەگەزن.

**باســـــی دووەم/** (وَقَـــالَ فِي المِيـــزَانِ مِثْـــلَ ذَلِـــكَ): المِيـــزَان: واتـــە کێـشراو،مەبەستیش لێـرەدا: ئەوانـەش کـە ئەکێـشرێت،بە زیـاتر لـەخۆی نافرۆشـرێت. ئەگـــەر بـــە هاوڕەگـــەزی خـــۆی فرۆشـــرا،وەکو ئەوانـــەی ئەپێورێن.

**باســـی ســـێیەم/** فەرمودەکـە ڕێگـە چـارەی گونجـاو دائـەنێت بـۆ خـۆ قوتـارکردن لـە سـوو لـەو ماڵانـەی سـویان تیایە،ئەگـەر بەرامبـەر یـەك فرۆشـران بـە زیادە،ئـەوەش: فرۆشـتنی لایـەکیان بـەپارەو پاشـان کـڕینی ئەوەی ئەتەوێت.

کـۆدەنگی زانایـانیش هەیـە کـە لـەم چارەسـەرەدا جیـاوازی کێـشراوەو پێوانەکراو نیە.

**باسـی چـوارەم/** زانایـانی حەنـەفی ئـەم فـەرمودە ئەکەنـە بەڵگـەی ئـەوەی کـە: هـــەر شـــتێك لەســـەردەمی پێغەمبـــەردا صَـــلَّى اللّـــهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ بپێورێت،دروسـت نیـە بفرۆشـرێت بـە کێـشانە بـە ئەنـدازەی خۆی،بـەڵکو پێویـــستە بـــە پێوانـــە وەك یـــەکبن. هـــەروەها کاڵایـــەکیش کـــە بکێشرێت،پێویستە فرۆشتنەکەی بە کێشانە بێت.

إبـــن عبـــدالبر ئـــەڵێت: زانایـــان کـــۆدەنگن لـــەوەدا کـــە شـــتێك بکێـشرێت،دروست نیـە بەپێوانـە بفرۆشـرێت،بەڵام کاڵایـەك بپێورێـت. هەنـدێك ڕێیـان داوە کـە بـە کێشانەش بفرۆشـرێت،وەکیەکی لەکێـشانەدا لـە هەموو شتێکدا پەیڕەو ئەکرێت.

کەسانی تریش ئەڵێن: پێوانەو کێشانە بەعادەتی ئەو شوێنەیە،ئەگەر پێچەوانەی سەردەمی پێغەمبەریش بێت. خۆ ئەگەر عادەتەکە جیاواز بوو،عادەتی زۆرینە حساب ئەکرێت. ئەگەر پێوانەو کێشانە وەك یەکبون،حوکمی پێوانەکراوەکەی هەیە ئەگەر ئەپێورا،یا حوکمی کێشانەکراوەکەی هەیە ئەگەر ئەکێشرا.

**<u>باسی پێنجەم</u>/** لە فەرمودەکەدا باسنەکراوە کەپێغەمبەری خوا فەرمانی کردبێت بە گەڕاندنەوەی خورماکە،بەڵکو وا دیارە مامەڵەکەی هێشتۆتەوە وەك خۆی، تەنها حوکمەکەی پێڕاگەیاندوەو، نەزانینەکەشی کردوەتەپاساو بۆی.

بەڵام إبن عبدالبر ئەڵێت: بێدەنگ بونی ڕاویەکە لە باسکردنی هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەکە،بەڵگەنیە لە هەڵنەوەشاندنەوەیدا . لە ڕیواتیکی تریشدا هاتوە کە فەرمویەتی: ئەمەڕیبایە بیگێڕەوە.

لەوانەشە ئەمە بەسەرهاتێکی تر بێت،بەسەرهاتەکەی تر مامەڵەکە وەك خۆی ماوەتەوە.

**<u>باسی شەشەم</u>/** فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر: دروستی هەڵبژاردنی شتی باش بۆ خۆی.( هەموو کەسێك بۆ هەیە بە دوای باشترین جۆری کاڵادا بگەڕێت وبەکاری بهێنێت).

**الحَـديث ٥٦// عـنْ إبـنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا قـالَ: سَـمِعْتُ رسـولَ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ يقـولُ: إذا تَبـايَعْتُمْ بِالعَيْنَةِ،وَأخَـذْتُمْ أذنـابَ البَقَرِ،وَرَضِـيتُمْ بِـالزَرْعِ،وَتَرَكْتُم الجِهادَ،سَـلّطَ اللهُ علـيْكُمْ ذُلّـاً لايَنْزِعُـهُ شَـيْءٌ،حَتّى تَرْجِعـوا إلى دينِكُمْ.**

ئەگـەر مامەڵـەی قـەرزتان کردو،کلکـی مانگاتـان گـرت و بـە کـشتوکاڵ کـردن ڕازیبـون و،وازتـان لـە جیهـادکردن هێنـا: خـوای گـەورە سەرشـۆڕیەکتان بەسـەردا ئـەهێنێت،لاینابات لەسـەرتان تـا بـۆ بڕیـاری دینەکەتان نەگەڕێنەوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** ابوداود واحمد.[1]

**مانـای وشـەکان//** الـذُلّ: سـوکبون ولاوازی. أخَـذْتُمْ أذنـابَ البَقَـرِ:پەرلەیـە(كِنايَـة) لەسـەر قـاڵبون بـە کێڵـان و پشتگوێخستنی جیهـاد. رَضِـيتُمْ بِـالزَّرْعِ: پەرلەیـە لـەوەی کـشتوکاڵ بـوە بـە مـەراقیان و ئەوپـەڕی هەوڵـدانیان. سَـلّطَ اللهُ: پەرلەیـە لـە سەرشـۆڕیان بـە زاڵبـونی خـەڵك بەسـەریاندا. حَتّـى تَرْجِعُـوا إلىَ دِيـنِكُمْ: تـا ئەگەڕێنـەوە بـۆ کاروبـاری دینەکـەتان. ئـەم دەسـتەواژەیەش سەرزەنـشتێکی زۆری تیایـە، تـا گەیانویەتە پلەی هەڵگەرانەوە لە دین.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** العَيْنَةَ: قەرزکردن.

بَيْـعُ العَيْنَـةِ ش: فرۆشـتنی کاڵایەکـە بـە نرخێکـی دیـاریکراو بـۆ ماوەیـەك (بەقـەرز)،پاشـان کڕینـەوەی هـەمان کاڵایـە بـە نرخێکـی کـەمتر،تا کڕیـاری یەکەم قەرزی زیاتری کڕیارە(خاوەن قەرزەکەی ) لابێت.

---

[1] سنن أبي داود ،كتاب البيوع ، أبواب الإجارة ، باب في النهي عن العينة ( ٣٠٢٠). ئەلبانی پلەی حەسەن ی داوەتی.

هـۆی ناوهێنانیـشی بـه (العَيْنَـة) ئەوەیـە: لـە مامەڵەکـەدا نـەخت هەیـە،وەك هەمان کاڵاکەش بۆ خاوەنەکەی ئەگەڕێتەوە.

**باسی دووەم/** لەبارەی حوکمی بَيْعُ العَيْنَة ، چەند ڕایەك هەیە:

یەکـــەم: حەرامە،بـــە ڕای مالـــك واحمـــد وهەنـــدێك لـــەزانایانی شـــافعی وابوحنیفە،بەڵگەشیان:

ا.فەرمودەی باسلێکراو.

ب.مەبەسـتی خـوای گـەورە لـە ڕێگـرتن لـە ڕیبـا بـەدی نایـەت،ڕێگرتن لـە هۆکاری چونە ناو حەرامیش پێویستە.

قرطبـی ئـەڵێت: هەنـدێك شـێوازی ئـەم جـۆرە مامەڵەیە،سەرئەکێـشێت بـۆ فرۆشـتنی خورما بە خورما بە زیاد،پارەکەش (کەباس ئەکرێت) تەنها بۆ ڕوکەشە.

دووەم: دروستە،بە ڕای شافعی وهاوەڵانی،بە بەڵگەی:

ا.فـەرمودەی: (بِـعْ الجَمْـعَ بِالـدَّراهِمِ،ثُمَّ ابْتَـعْ بِالـدَّراهِمِ جَنِيبـاً): دروسـتە فرۆشـیار ئـەو کاڵایـە بکڕێـت کـە مـاڵی خـۆی بـوەو پێـشتر فرۆشـتویەتی. چـونکە لـە بـەر ئـەوەی لـە کاتێکـدا بـواری ئەگـەری تیـا بـوەو درێـژەی نەداوەتی،ئەوە بەڵگەی دروستی مامەڵەکەیە.

ب.بۆپـشتگیری ڕای شـافعیش: کـۆدەنگی زانایـان هەیەلـە سـەر دروسـتی شتفرۆشـتن لەلایـەن فرۆشـیارەوە،لەدوای ماوەیەك،بـەڵام بـەو مەبەسـتە نەبێت کە بەزیادەوە بۆی بگەڕێتەوە.

سـێیەم: ئەگـەر مامەڵەکـە فرۆفێڵـی تیـا نەبێت،دروسـتە،بەڕای هادەویـە. جیـاوازیش نیەلـە نێـوان پێشخـستن و دواخـستنیدا،گرنگ بـون ونـەبونی مەرجە لە کاتی گرێبەستەکەدا:

ئەگـەر لـە کـاتی گرێبەسـتەکە وپێـشیدا بـە مـەرج دانرابـوو کـە ماڵەکـە بـۆ فرۆشـیارەکە بگێڕدرێتەوە،ئـەو مامەڵەیـە فاسـدە یـان باطلـە. ئەگـەر مـەرج نەبوو،ئـەوە دروسـتە. لەوانەشـە بوترێـت: فـەرمودە باسـلێکراوەکە قـسەی لەسەرە،وحەرامبون ناگەیەنێت.

**باســــى ســــێیەم/** هــۆی سەرشــۆڕیەکە ئەوەیــە: چــونکە ئــەوان وازیــان لــە جیهــاد لــەپێناوی خــوادا هێناوە،کــە مایــەی ســەربەرزی ئیــسلام و سەرخــستنیەتی بەســەر هــەموو دینێکــدا،خوای گــەورە بەپێــچەوانەی کردارەکــەیان هەڵــسوکەوتی لــە گــەڵ کــردون، کــە بریتیــە لــە سەرشــۆڕکردنیان،هەتا وایــان لێهــاتوە بــەدوای کلکــی مانگــادا ئەڕۆن،لەکاتێکدا ئەوان سواری ئەسپ ئەبون کە سەربەرزترین شوێنە.

**الحَديثُ ٥٧// عنْ إبنِ عُمَـرَ رَضـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا ؛ أَنَّ النَّبِـيَّ صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ نَهَـى عَنْ بَيْعِ الكالِىءِ بِالكالِىءِ.يَعْني ؛ الدَّيْن بِالدَّيْن.**

پێغەمبەری خوا ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی قەرز بە قەرز.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//** إسحاق والبزار بەسەنەدێکی لاواز ئەیگێڕنەوە.[1]

**سەرباسەکان//**

**باســــى یەکــــەم/** لــە فەرمودەکــەدا دیــارە کــە لێکدانــەوەی (الــدَّيْنُ بِالدَّيْنِ)،فەرمودەی پێغەمبەرە صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

**باســــى دوەم/** لــە النِّهایــة دا ئــەڵێت[2]: بریتیــە لــەوەی کەســێك بــۆ ماوەیــەك شــتێك ئــەکڕێت،کاتی دانــەوەی پارەکــە ئەگــەر نەیبو،بــە فرۆشــیارەکە ئــەڵێت: تــا کــاتێکی تــر پــێم بفرۆشــەو شــتێکت لەنرخەکــەی بــۆ زیــاد ئەکەم،ئەویش پێی ئەفرۆشێت و لەنێوانیاندا وەرگرتن ڕونادات.

**باســــى ســــێیەم/** فەرمودەکــە بەڵگــەی حــەرامبونی ئــەو مامەڵەیەیــە ،ئەگــەر ڕوشیدا ئەوە پوچەڵە.

---

[1] البانی بە لاوازی داناوە. السنن الكبرى للبيهقي - كتاب البيوع ،جماع أبواب الربا ،باب ما جاء في النهي عن بيع الدين بالدين ( ٩٨٨٧ ).

[2] النِهايَةُ في غَريبِ الحَديث، لە دانراوی إبنُ الَاثيرالجَزَرية، کە یەکێکە لە زانا کوردەکان.

**الحديث ٥٨// ١.عن زيد بن ثابت رَضيَ اللَهُ عَنهُ؛ أنّ رَسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ رَخّصَ في العَرايا أنْ تُباعَ بِخَرْصِها كَيْلاً.**

پێغەمبەری خوا لەخورمادا مۆڵەتی داوە کە بەسەر دارەکەوە بفرۆشرێت.

**٢.عنْ أبي هُرَيرَةَ رَضيَ اللَهُ عَنهُ؛ أنّ رَسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ رَخّصَ في بَيْعِ العَرايا بِخَرْصِها مِنَ التَّمْرِ فيما دونَ خَمْسَةِ أوْسُقٍ أوْ في خَمْسَةٍ.**

پێغەمبەری خوا مۆڵەتی فرۆشتنی خورمای بەسەر دارەکەوە داوە،ئەگەر لە پێنج ویسق کەمتر بون.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** ١. صحيح البخاري ،كتاب البيوع ،باب تفسير العرايا ( ٢١٠٣) .

صحيح مسلم – كتاب البيوع ، باب تحريم بيع الرطب بالتمر إلا في العرايا (٢٩٢٣).

٢. صحيح البخاري ، كتاب البيوع ،باب بيع الثمر على رءوس النخل بالذهب أو الفضة( ٢١٠١).

**مانـای وشـەکان//** التَّرْخِيص: ئاسانکاری،لەشەرعیشدا: ئەو حوکمانەیە لە بەر بونی هۆکارێک دانراون،ئەگەر ئەو هۆکارە نەبێت،حوکمەکە وەك خۆی ئەمێنێتەوە بەحەڵاڵ بون یا حەرامبون. العَرَايا : دارخورما في العَرَايا: فرۆشتنی بەری دارخورما.

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** العَرِيَّة: لەبناغەدا بەری خورماکەیە نەك دارەکەی. لەپێش ئیسلامدا ئەگەر گرانی بوایە،ئەوانەی دارخورمایان هەبوایە،خورمایان ئەدا بەهەژارەکان،هەروەها بەروبومی مەڕو وشتریشیان ئەدانێ.

مالك ئەڵێت: العَرِيَّة ئەوەیە: کەسێك دارخورمایەك ئەبەخشێتە کەسێکی تر،پاشان ئەوەی بەخشیویەتی حەز ناکات هەموو جارێك کابرای تر

بێتــە نــاو بێــستانەکەیەوە،بۆیە مۆڵــەت دراوە تــا خورمــا تەڕەکــەی لێبکڕێت،بەرامبەر خورمای وشك.

شــەرعزانەکانیش واپێناســەی ئەکــەن: فرۆشــتنی خورمــای تــازە بەســەر دارەکەوە،بــە ئەنــدازەی خــۆی بــە گــۆترە ، کــەمتر بێــت لــە پێــنج ویسق،بەمەرجی وەرگرتنی دەم ودەست.

**باســی دوەم/** هــەردو فەرمودەکــە بەڵگەیــە کــە: ئــەم جــۆرە خورمــا فرۆشــتنە بەدەرە لە حەرام،وحوکمەکەی تایبەتە.

فەرمودەی جابریش بە ڕیوایەتی بوخاری ئەم جیاکرنەوەیەی تیایە:

پێغەمبــــەری خــــوا فرۆشــــتنی بــــەروبومی بەســــەر دارەکــــەوە قەدەغــەکردوە،پێش ئــەوەی پێبگــات،هیچ بــەروبومێکی تــر بــە پــارە دینــارو درهەم نافرۆشرێت،جگە لە العَرَايا.[1]

کۆمەڵی زانایان ڕایان وایە کە ڕێدراوە بەم جۆرە فرۆشتنە.

**باســی ســێیەم/** مالك وشافعی یەکڕان لەوەی فرۆشتنی خورما بەو شێوەیە تــا پێــنج ویــسق دروســتە،و زیــاتر دروســت نیــە. بــە بەڵگــەی فــەرمودەی أبــــوهریرة. بــــەڵام لــــەپێنج ویــــسقدا جیــــاوازی ڕا هەیە،ڕاســــترینیان حەرامبونیەتی. جابر ئەڵێت:

گــوێم لەپێغەمبــەری خــوا بــوو ئەیفــەرموو:-کاتێــك مۆڵــەتی بــەخاوەن دارخورماکــان دا بەســــەر دارەکــەوە خورمــا بفرۆشــن- یــەك ویــسق ودوان وسیان وچوار.[2] احمد گێڕاویەتەوە.

إبن حبان ئەڵێت: باشترە لە چوار ویسق زیاتر نەبێت.

---

[1] نَهَى رَسولُ الله صَلَى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ عنْ بيعِ الثَمَرِ حَتَى يَطِيب،وَلا يُباع شيءٌ مِنْهُ إلاَ بِالدَنانير وَالدَراهِم إلَا العَرَايَا.

[2] سَمعتُ رسولَ الله صَلَى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ يقولُ-حِينَ أذِنَ لِأصْحابِ العَرايا أنْ يَبيعُوها بِخَرْصِها- يقولُ:الوَسْقَ والوَسْقَينِ والثَلاثَةَ وَالأَرْبَعَة.

**باسی چوارەم/** لە مەرجی وەرگرتندا ئاسانکاری نیە، چونکە ئاسانکاری لە فرۆشتنی ئەوانەی پێشوتردا هەیە. تەنها ئەگەر دڵنیا نەبێت لە یەکسانبونیدا.بەڵام لەوەرگرتندا وەك خۆی ئەمێنێتەوە بێ ئاسانکاری،بەڵگەش بۆ ئەم مەرجە،شافعی لەزید بن ثابت ئەگێڕێتەوە:

ناوی کۆمەڵێك لەئەنصار باس ئەکات کەهەژاربون،هاتنەلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ ڕونکردنەوەی حاڵی خۆیان: کەپارەیان نیە تا خورمای چاکی پێبکڕن،لە گەڵ خەڵکیشدا خورما ئەخۆن،بەڵام خورمای خراپیان هەیە کە بۆ قوت ی ڕۆژانەیانە،ئەویش مۆڵەتیدان خورما بەسەر دارخورماکەوە بکڕن،بەرامبەر ئەو جۆرە خورمایەی هەیانە.[1]

**باسی پێنجەم/** فەرمودەکە دەربارەی کڕینی خورمای جوانە بەسەردارەکەوە بەرامبەر خورمای خراپ.

بەڵام بۆ کڕینی خورمای باش دوای لێکردنەوەی،بەرامبەر خورمای خراپ،دوو ڕاهەیە:

یەکەم: دروستە،بە ڕای زۆر لە زانایانی شافعی، بە بەڵگەی:

أ.چواندنی بەخورمای سەردارەکە (چۆن بە سەردارەکەوە دروستە بفرۆشریت،لە لێکردنەوەشیدا هەمان حوکمی هەیە)،وەك بوخاری بابێکی بۆ داناوە.

ب.چونکە ئاسانکاریەکە لەخورما باشەکەدایە،بەسەردارەکەوە بێت،یان لێبکرێتەوە،کەواتە بە دەقەکە حەڵاڵە نەك قیاس.

ج.صەنعانی ئەڵێت: هیچ ڕێگریەك نیە،چونکە لەوانەیە هەمان حیکمەتی ئاسانکاری فرۆشتنی خورمای بە دارەکەوە،لەخورما

---

[1] أَنَّهُ سَمَّى رِجالاً مُحْتاجِينَ مِنَ الأَنْصارِ شَكَوا إلى رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،وَلا نُقْدَ في أَيديهِمْ يَبْتاعونَ بِهِ رُطَباً،وَيَأْكلونَ مَعَ النّاسِ، وَعِندهمْ فُضولُ قوتِهِمْ مِنَ التَّمْرِ،فَرَخَّصَ لَهُمْ أَنْ يَبْتاعُوا العَرايا بِخَرصها مِن التَّمْرِ.

لێكراوەكەشـــدا هـــەبێت. لەوانەیـــە فرۆشـــیار خورمـــای خراپـــی پێبێـــت و بیەوێت باشەكەی پێبكرێت.

دوەم: دروســـت نیە،بـــە ڕای إبـــن دقیـــق العیـــد. وەڵـــامی ئـــەم ڕایـــە دراوەتەوە،بە بەڵگەكانی ڕای یەكەم.

یـــەكێك لـــەهۆكاری ئاســـانكاریەكە ئەوەیـــە بـــەپاراوی و تـــازەیی خورماكـــە بخورێت،ئەگەر لێبكرێتەوە،ئەو مەبەستە(تازەییەكەی) نایەتە دی.

**الحَديثُ ٥٩// عـنْ إبـنِ عَبّـاس رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا قـالَ: قَـدِمَ النَّبِـيُّ صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ المَدينَـةَ، وَهُمْ يُـسْلِفونَ في الثِّمـارِ الـسَّنَةَ وَالـسَّنَتَيْنِ.فقـالَ: مَـنْ أسْـلَفَ في تَمْرٍ، فَلْيُسْلِفْ في كَيْلٍ مَعْلومٍ، وَوَزْنٍ مَعلومٍ، إلى أجَلٍ مَعْلومٍ..**

كاتێـــك پێغەمبـــەری خـــوا هاتـــە مەدینـــە،بینی تـــا ســـاڵێك ودوســـاڵ لەبەروبومەكانـــــدا قـــــەرزی پێـــشینە ئەكەن،فـــەرموی: كەســـێك قـــەرزی پێـــشینەی كـــرد لـــە خورمادا،بـــا بەپێوانەیـــەكی دیـــاریكراو وە كێـــشانەیەكی دیاریكراو،وە بۆ كاتێكی دیاریكراو بێت.

<u>**گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە//**</u> صـحیح البخـاري - كتـاب الـسلم، بـاب الـسلم في وزن معلـــوم ( ٢١٤٧). صـــحیح مـــسلم - كتـــاب المـــساقاة ،بـــاب الـــسلم ( ٣٠٩٥).

<u>**مانـــای وشـــەكان//**</u> الـسَّنَةُ والـسَّنَتَیْنِ: تـا سـاڵێك ودوو سـاڵ. تَمْـر: بەهـەردوو ڕیوایەتەكـە هـاتوە (تَمْر،ثَمْـر). في كَیْـلٍ مَعْلُـوم: ئەگـەر بەپێوانـە بـوو.وَوَزْنٍ مَعْلُـــوم: ئەگـــەر بەكێـــشانە بـــوو، الـــسَّلَف: الـــسَّلَم پێـــشینەی قـــەرز،یان لەعێراقدا پێی ئەوترێت السَّلَمْ،لە حیجازیش السَّلَفْ.

<u>**سەرباسەكان//**</u>

<u>**باســـــی یەكـــــەم/**</u> الـــسَّلَمْ لەشـــەرعدا واتـــە: فرۆشـــتنی كاڵایـــەكی وەسفكراو،لەئەســـتۆدا بێـــت (تـــسلیم نـــەكرێت)،بەرامبـــەر ماڵێـــك كـــەپێش وەخت ئەدرێت.

**باسی دوەم/** جگە لە سعید بن المسیب،جمهوری زانایان،سەلەمیان لا پەسەندە.

**باسی سێیەم/** سەلەم پێچەوانەی قیاسە،چونکەفرۆشتنی شتێکی نەبوە،وگرێبەستێکی فێڵاویە.

**باسی چوارەم/** لەسەر بونی چەند مەرجێك تیایدا کۆکن(زانایان):

١.ئەومەرجانەی لەکڕین وفرۆشتندا هەبێت،پێویستە لەمیشدا هەبێت.

٢.سەرمایەکە ئەبێت لەشوێنی ڕێکەوتنەکەدا،تەسلیم بکرێت. بەڵام مالك ڕێی داوە دو ڕۆژو سێ ڕۆژ دوا بکەوێت.

٣.بە یەکێك لەو دوو پێوانەی لەفەرمودەکەدا باسلێکراوە،بپێورێت.

ئەگەر ماڵێك نەبوو بەپێوانەو کێشانە بێت، ئەوە إبن حجر لە فتح الباریدا ئەڵێت:

أ.پێویستە ژمارەکەی دیاریکراو بێت،ابن بطال ئەیگێڕێتەوە ،پێی وایە زانایان کۆدەنگن لەسەری.

ب.یان باڵی دیاریکراو بێت،چونکە ژمارەو باڵ وەك کێشان وپێوانەن،چونکە نادیاری لەکاڵاکە لائەبات،بە دیاریکردنی بڕەکەی.

٤.ئەگەر پێوانەبوو،جۆری پێوانەکە دیاری بکرێت،وەك صاع الحجاز،یا قفیز العراق،یا أردب مصر،بەڵام ئەگەر بە ڕەهایی باسکرا،مەبەستی پێوانەی ئەو شوێنەیە کە سەلەمەکەی تیا ئەنجام ئەدرێت.

٥.ناساندنی ئەو کاڵایەی سەلەمی تیا ئەکرێت بەشێوەیەك لە شتی تر جیای بکاتەوە،لەفەرمودەکەدا باسنەکراوە،چونکە زانرابوو لایان.

**باسی پێنجەم/** دەربارەی مەرجی دواخستن،دوو ڕاهەیە:

یەکەم: دواخستنی(کاڵاکە) مەرجە لە سەلەمدا،ئەگەر دەم ودەست بوو،یا کاتی دانەکەی نا دیاربوو،دروست نیە. ئەمەش ڕای ئیبن عباس وکۆمەڵێك لەسەلەف وجمهورە،بە بەڵگەی:

١.ڕوکەشی فەرمودەکە.

٢.شافعى وحاكم ئەيگێڕنەوە،حاكم بەصەحيحى داناوە،لەئيبن عباسەوە كە وتويەتى: شايەتى ئەدەم كەقەرزى پێشينە بۆ ماوەيەك،خواى گەورە لەقورئاندا حەڵاڵى كردوەو ڕێى پێداوە،پاشان ئەم ئايەتەى خوێندەوە:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ﴾ {البقرة:٢٨٢}[1] واتە: ئەى ئەوانەى باوەڕتان هەيە،ئەگەر بۆ ماوەيەك قەرزتان بە كەسێك دا،بينوسن.

وەڵامى ئەم ڕايە ئەدرێتەوە كە: ئايەتەكە بەڵگەيە لەسەر دروستى قەرزى پێشينە تا ماوەيەك،نەك بەڵگە بێت لەسەر ئەوەى كە بەدواخراوى نەبێت، دروست نيە.

دوەم: دواخستن مەرج نيە،بەڵكو سەلەمى دەم ودەستيش دروستە. بەڕاى زۆر لەزانايانى شافعى،بە بەڵگەى:

١.ئەگەر بە دواخستنى دروست بێت كە خەڵەتاندنى تيايە،ئەوە بەدەم ودەستى دروستە.

٢.باسكردنى ماوە لە فەرمودەكەدا بۆ مەرج گرتن نيە،بەڵكو ماناكەى وايە: ئەگەر بۆ كاتێك و ماوەيەك بوو،با دياريكراو بێت.

بەڵام واديارە،لەسەردەمى پێغەمبەرى خوادا، تەنها بەدواخراويى بوە. چواندنى دەم ودەستى بەسەلەمى دواخراو،چواندنە بەشتێكى پێچەوانەى چواندن(قياس)،چونكە سەلەم پێچەوانەى قياسە.

<u>باسى شەشەم/</u> دەربارەى مەرجى دياريكردنى شوێنى دان و وەرگرتن،چەند ڕايەك هەيە:

يەكەم: هەندێك ئەڵێن مەرجە لەپێوانەو كێشانەو دواخستنيدا.

دوەم: هەندێكيتر بە مەرجى دانانێن.

---

[1] أَشْهَدُ أَنَّ السَّلَفَ الْمَضمونَ إلى أجَلٍ، قَدْ أَحَلَّهُ اللهُ في كتابِهِ،وَأَذِنَ فيهِ.ثُمَّ قَرَأَ .......الآيَة؛

سـێیەم: حەنەفیـەکان درێـژەی پێئـەدەن و ئـەڵێن: ئەگـەر گواسـتنەوەی کاڵاکـە پێویـستی بـەپارە بوو،پێویـستە شـوێن بـە مـەرج بگیرێت،ئەگـەر نا،پێویست ناکات.

شـافعیەکانیش ئـەڵێن: ئەگـەر وا ڕێکـەوتن کـەدان و وەرگـرتن نـەکرێت تیایدا،ئەوە مەرجە شوێن باس بکرێت.

ئەم باسکردنانەش بەدرێژی عورف دیاری ئەکات.

**الحَديثُ ٦٠// عنْ أبي هُريـرةَ رَضـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قـالَ: قـالَ رسـولُ الله صَلّى اللّـهُ عَلَيْـه وَسَـلّمَ: الظّهـرُ يُرْكَـبُ بِنَفَقَتِـه إذاكـانَ مَرْهونـاً.وَلَـبَنُ الـدّرّ يُـشْرَبُ بِنَفَقَتِـه إذا كـانَ مَرهوناً،وَعلى الّذي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ النّفَقَةُ...**

ئـاژەڵی سـواربون،ئەگەر لەڕەهنـدا بوو،بـەپێی بـژێوی کردنـی بەسـواربون سـودی لـێ ئـەبینرێت. ئـاژەڵی شـیرداریش ئەگـەر لەڕەهندابوو،بەئەنـدازەی بـژێوی کردنـی سـود لەشـیرەکەی ئـەبینرێت.بژێویەکەشـی لـە سـەر ئـەو کەسەیە،سواری ئەبێت و شیرەکەی ئەخواتەوە.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** صـحیح البخـاري - كتـاب الـرهن بـاب : الـرهن مركوب ومحلوب (٢٣٩٧).

**مانـای وشـەکان//** الرَّهن: هێشتنەوە،خوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿كُـلُّ نَفْـسٍ بِمَـا كَـسَبَتْ رَهِينَـةٌ﴾{المـدّثر:٣٨} .واتـە: هـەموو کەسـێك لێپرسـراوە بەرامبـەر کردارەکـانی. لـە شەرعیـشدا واتـە: دانـانی ماڵێـك لەبارمتـەی قەرزێکدا،هەروەها بە ماڵە ڕەهنکراوەکەش ئەوترێت. الدَّر: شیر.

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** دەربـارەی بکـەری (فاعل)ی يَرْكَـبُ وَيَـشْرَبُ لـە ڕستەکەدا،دوو ڕا هەیە:

یەکـــەم: ئـــەو کەســـەیە ڕەهنەکەئەکات،بـــە بەڵگـــەی ســـواربونی ئاژەڵەکەی،لەبری بەخێوکردنی.

دوەم: خـــــاوەن ماڵەکەیە،بــــــە ڕای شـــــافعی،ئەڵێت: مەبەســـــــت لەفەرمودەکــە:ڕێگــری لەقــەرزدار ناکرێــت،بۆ ســواری وڵاخەکــەو گــرتنی شیرەکەی.

بەڵام ئەم مانایە دورە،لە بەر دوو هۆ:

أ.لەفەرمودەکەدا، وشەی(المُرْتَهِنْ) ئەو کەسەی ڕەهنەکە ئەکات، هاتوە.

ب.چــونکە بژێویەکــە لــە ســەر ئــەوە لــە بــەر ئــەوەی ماڵەکــە هــی خۆیەتی،بــەڵام لــە فەرمودەکــەدا بژێویەکــە لــە ســەر ئــەو کەســەیە ســواری ئــەبێت وشــیرەکەی ئەخوات،کەخاوەنەکــەی نیە،چــونکەلەهەموو حاڵەتێکــدا بژێوی لەسەر خاوەنەکەیەتی.

<u>**باســـــی دوەم/**</u> دەربــارەی ســـود وەرگــرتنی ڕەهنکــەر لــە ماڵــە ڕەهــن کراوەکە،سێ ڕا هەیە:

یەکــەم: بەرامبــەر بــژێوی دابینکردنەکــەی، ســود وەرئــەگرێت لــە ماڵەکــە. ســودەکەش تایبەتــە بــە ســواربون وشــیرەکەی،کە بــە ئەنــدازەی خزمەتەکــەی ســودیان لــێ ئەبینێت،جگــە لــەو دوانــەش قیــاس لەســەر ناکرێــت. ئەمــەش ڕای احمـــــد وإســـــحاق وحەســــــەنە،بە بەڵگـــــەی: ڕوکەشـــــی فـــــەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: بــە هــیچ شــێوەیەك ســودی لێنابینێت،بــەڵکو ســودەکەی بــۆ خــاوەن ماڵــەو خزمەتیــشی هــەر لەســەر ئــەوە. ئەمــەش ڕای جمهــورو شــافعی وئەبوحەنیفەو مالکە.

ئەڵێن: فەرمودە باسلێکراوەکە لە دوو ڕوەوە پێچەوانەی قیاسە:

یەکەم: ڕێ ئەدات بێ پرسی خاوەن ماڵ، سود لەماڵەکە وەربگرێت.

دوەم: قەرەبوکردنــەوەی ســود وەرگرتنەکــە بەخزمــەت کردنــی ئاژەڵەکــە دائەنێت،نەك بەنرخەکەی.

إبــن عبــدالبر ئــەڵێت: ئــەم فەرمودەیــە لای جمهــوری شـــەرعزانەکان پێــچەوانەی چــەند بنەمایــەکی شــەرعی و یاســایەکی نەگۆڕە،کــە گومــان لــە

دروستیاندا نیه،بەڵگەی نسخ بونەوەشی، فەرمودەی ئیبن عومەرە:
ئاژەڵی هیچ کەسێك بێ پرسی خۆی حەڵاڵ نیه بدۆشرێت.[1]
بەڵام صەنعانی وەڵامی ئەو ڕایەی سەرەوە بەو شێوەیە ئەداتەوە:
أ.لەنەسخدا پێویستە مێژوەکەی دیاربێت. لە کاتێکیشدا پەنای بۆ ئەبرێت کە نەتوانرێت دوو فەرمودەکە کۆبکرێتەوە (یەکبخرێت). بەڵام کۆکردنەوە لێرەدا ئاستەم نیە،چونکە گشتگیری قەدەغەکردنەکە تایبەت ئەکەین بەم فەرمودەیە.
ب.پێچەوانەبونی فەرمودەکەش بۆ قیاس:حوکمە شەرعیەکان لەسەر یەك ڕەوت نین،بەڵکو بەڵگەکان جیایان ئەکاتەوە ،یاسادەنەریش (کە لێرەدا پێغەمبەری خوایە) بڕیاریداوە کە: ئەتوانرێت سواری ئاژەڵە ڕەهن کراوەکە ببێت،وە سود لە شیرەکەی وەربگیرێت لەبری خزمەتکردنی. وەك چۆن ڕێی بە دادوەر داوە بەپرسی کەسی هەڵگەڕاوە ماڵەکەی بفرۆشێت،وە خورمای باشیشی لەبری شیر داناوە.....
ج.شەوکانی ئەڵێت: وەڵام بۆ ئەو قسەیەی کە پێی وایە: فەرمودەکەپێچەوانەی بنەما شەرعیەکانە،ئەوەیەکە: سوننەتی ڕاست خۆی بنەمای شەرعیە،بۆیە لە کاتێکدا نەتوانرا یەکبخرێت،ڕەت ناکرێتەوە مەگەر بە بەڵگەیەکی لەخۆی بەهێزتر.
د.هەروەها ئەڵێت: فەرمودەی ئیبن عومەر گشتگیرەو،فەرمودە باسلێکراوەکەش تایبەتە،دەقی گشتگیریش لە سەر تایبەتی بینا ئەکرێت.
سێیەم: مەبەست لەفەرمودەکە ئەوەیە:

[1] لا تُحْلَبُ ماشِيَةُ إمْرِيءٍ بِغَيْرِ إذْنِه. صحيح البخاري - كتاب في اللقطة ،باب لا تحتلب ماشية أحد بغير إذنه ( ٢٣٢٣ ).

ئەگــەر خــاوەن ماڵــە ڕەهنکراوەکە،خزمــەتی ماڵەکــەی خــۆی نەکرد،ئــەوە بۆپاراســتنی گیــانی ئاژەڵەکــە دروســتە خزمــەتی بکرێــت. لەبەرامبــەر ئەوەشــدا بــۆ ســواربون یــا شــیرەکەی ســودی لــێ وەرئەگیرێت،بەمــەرجێك بــری ســود وەرگرتنەکــە لــە خزمــەت کردنەکــە زیــاتر نــەبێت. ئەمــەش ڕای ئەوزاعي و الليث و ابوثورة.

بەڵام صەنعانی ڕای وایە کە:

ئــــەم ڕایــــە بەســــتنەوەی فەرمودەکەیــــە کەپێغەمبــــەری خــــوا وا نەیبەســــتۆتەوە،بەڵکو بەســتویەتیەوە بــە ڕێکخــەرێك کــە لــە بەڵگــەکان کۆیکردۆتــەوە.ئــەو ڕێکخــەرەش بریتیەلــە: هــەرماڵێك لــە ژێردەســتی خاوەنەکــەی نــەبوو بــەڵام شــەرع ڕێــی پێــدا بوو،خزمــەتی ئــەو ماڵــە ئــەکرێت بــە مەبەســتی گەڕانــەوەی بــۆ خــاوەن ماڵەکــە (نــەك داگیرکردنــی)،لــە بەرامبەریــشدا بــۆی هەیــە بیداتــە کــرێ یــا ســود لەشــیرەکەی وەربگرێت،بــەڵام ئەگــەر لــە شــارەکەدا دادوەر هــەبوو ڕێــی بــەو کــارە نەئــەدا (یاســای وڵاتەکــە)،ئــەوە بــۆی نیــە ســود لــە ماڵەکــە وەربگرێت،پێویــستە بــە ئەنــدازەی ســـواربون و شـــیرەخواردنەکە،قەرەبو بـــەخاوەن ماڵەکـــە بداتــەوە.خــۆ ئەگــەر لــەو وڵاتــەدا حــاکم نــەبوو،یا ئاژەڵەکــە ئەگــەر خزمــەت نــەکرا زەرەری پــێ ئەگەشــت،بۆی هەیــە خزمــەتی بکــات و بەئەنــدازەی خزمەتەکەش سود وەربگرێت.

بــەڵام لەوانەشــە بوترێــت: ئەمــە بنەمایــەکی گــشتیەو بــە فــەرمودە باسلێکراوەکە تایبەت ئەکرێت.

**الحَـديثُ ٦١// عـنْ أبـي هُرَيـرةَ رَضـيَ اللّـهُ عَنْـهُ عـنْ النَّبِـيِّ صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ قـالَ: مَـنْ أخَـذَ أمْـوالَ النّـاسِ يُرِيـدُ أداءَهَـا،أدّىَ اللهُ عَنْـهُ.وَمَـنْ أخَـذَها يُرِيـدُ إتْلافَها،أتْلَفَهُ اللهُ..**

کەسـێك مـاڵ لەخـەڵك وەرگرێـت ومەبەسـتی هـەبێت بیگێڕێتـەوە،خوای گـەورە لـەجیاتی ئـەو ئەیگێڕێتەوە،کەسـێکیش وەری بگرێـت و مەبەسـتی دانەوەی نەبێت،خوای گەورە لەناوی ئەبات.

گێــڕەرەوەی فەرمودەکـــە// صـحيح البخـاري - كتـاب في الاسـتقراض وأداء الـديون والحجـر والتفلـيس، بـاب مـن أخـذ أمـوال النـاس يريـد أداءهـا أو إتلافها ( ٢٢٧٩).

سەرباسەکان//

باسـی یەکـەم/ (أخْـذَ أمْـوالَ النّـاسِ)،وەرگـرتنی مـاڵ لەخـەڵکی: ئـەگونجێت بـە قەرز بێت،ئەشگونجێت بۆ پاراستنی بێت.

باســــــی دوەم/ مەبەسـت لەنیـەتی دانـەوەی: لـە دنیـادا قەرزەکـە بداتـەوە.خـوای گـەورەش لـەبری ئـەو قەرزەکـە ئەداتـەوە: واتـە ئاسـانکاری دانـەوەی قەرزەکـەی بـۆ ئەداتەوە،ئەوەنـدەی بـۆ ئـەنێرێت بتوانێـت قەرزەکـەی بداتـەوە. دانـەوەی قەرزەکـەش لـە قیامەتدا،واتـە: ڕازیکردنـی بەرامبەرەکەیەتی بەوەی خوای گەورە ئارەزوو بکات.

پێغەمبـەری خـوا ئەفـەرموێت: هـەر موسـڵمانێك قـەرزبکات و مەبەسـتی دانـەوەی هەبێت،کـە خـوای گـەورە ئاگـادارە بـە مەبەسـتەکەی،ئەوە خـوای گەورە لەبری ئەو لەدنیاو قیامەتدا قەرزەکە ئەداتەوە.[1]

---

[1] ما منْ مُسلمٍ يُدانُ دَيْناً يَعلَمُ اللهُ أنَّهُ يُريدُ أداءَهُ،إلاّ أدّاهُ اللهُ عَنْهُ في الدُّنيا والآخرَةِ.أخرَجَهُ إبنُ ماجَةَ وَإبنُ حِبّان والحاكِمُ مَرفوعاً. سنن ابن ماجه ،كتاب الصدقات، باب من ادان دينا وهو ينوي قضاءه ( ٢٤٠٥ ).

**باســی سـێیەم/** فـەرمودەی يُرِيـدُ إِتْلَافَهَـا: وا ديـارە بـۆ كەسـێكە،ماڵێك قـەرز ئـەكات بۆنمونە،پێويـستی پێـی نيـە وبازرگانيـشی پێوەناكات،بـەڵكو تـەنها مەبەستی لەناودانی ماڵەكەيە،نيەتی دانەوەيشی نيە.

وە فەرمودەی أَتْلَفَهُ اللهُ، دووليێكدانەوە هەڵئەگرێت:

يەكـەم: مانـا ديارەكـەی ئەوەيـە: كەسـەكە لـە دنيـادا لـەناو ئـەبات،يا ژيـانی لـــیَ تـــاڵ ئـــەكات،كاروباری قـــورس ئـــەكات،داواكانی جێبـــەجیَ نابێت،بەرەكەتيش لەماڵەكەيدا نامێنێت.

دوەم: لەقيامەتدا بەسزادانی لەناوی ئەبات.

**باســی چــوارەم/** إبـن بطـال ئـەڵێت: فەرمودەكە بەڵگـەی هاندانـە بـۆ وازهێنـان لــەخواردنی مـــاڵی خەڵكی،ودەستخۆشـــيكردنيانە لـــە دانـــەوەی قەرزەكـــە بەشێوەيەكی جوان ،ئەگەر داواكرايەوە.

**باســـی پێنجـــەم/** فەرمودەكـە بەڵگـەی ئەوەيـە كـە:پاداشـت لـە هاوڕەگـەزی كردارەكەيە.

**باســـــی شەشـــــەم/** داودی لـە فەرمودەكـە ئـەوە وەرئەگرێت،كـە: كەسـێك قـەرزی لابێت،بۆی نيە خێربكات يا ببەخشێت،بەڵام صەنعانی ئەم ڕايە بەدور ئەزانێت.

**باســـی حەوتـــەم/** فەرمودەكـە بەڵگـەی هاندانـە بـۆ نيـەت پـاكی، وترسـاندن لـە نيـەت خراپی تێدايە،ڕونيشی ئەكاتەوە كە: بنەمای هەموو كردارەكان نيەتە.

**باســی هەشـــتەم/** فەرمودەكـە بەڵگـەی ئەوەيـە: كەسـێك قـەرزی كـردوو نيـەتی دانەوەی هەبوو،خوای گەورە يارمەتی ئەدات.

عبـــدالله بـــن جعفـــر خـــەڵكی بـــۆ قـــەرزكردن هـــان ئـــەدا. كـــە لـــەو بـــارەوە پرســـياری لێئەكرا،ئـــەيوت: لەپێغەمبـــەری خـــوام بيـــستوە كـــە ئەيفـــەرموو: خوای گەورە لە گەڵ قەرزاردايە، تا قەرزەكەی ئەداتەوە.[١]

---

[١] إِنَّ اللهَ مَعَ الدَّائِنِ حَتَّى يَقْضِيَ دَيْنَهُ.رَوَاهُ إِبنُ ماجَه والحاكِم، وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ. سنن ابن ماجه - كتاب الصدقات ،باب من ادان دينا وهو ينوي قضاءه - حديث : ٢٤٠٦

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە: هەر بەندەیەك نیەتی دانەوەی قەرزەکەی هەبێت،لەلای خواوە یارمەتیدەرێکی هەیە.عائشە ئەڵێت: من بەدوای ئەو یارمەتیە خواییەدا ئەگەڕێم.[1]

**باسی نۆیەم/** ئەگەر بوترێت فەرمودەی: جگە لە قەرز لە هەموو تاوانێکی شەهید ئەبورێت.[2] وە فەرمودەی: ئێستە ماندویەتی حەسایەوە.[3] هاتوە،کەپێغەمبەری خوا بەرامبەر بەکەسێکی وتوە کە قەرزی کەسێکی داوەتەوە کە بە قەرزاری مردبوو.

صەنعانی ئەڵێت: لەوانەیە مانای فەرمودەی یەکەم ئەوەبێت: شەهید قەرزەکەی هەر لە سەر ئەمێنێت،تا لەقیامەتدا خوای گەورە بۆی ئەداتەوە. مەرجیش نیە کە لە گۆڕدا بە هۆی قەرزەکەوە سزا بدرێت.

مانای (بَـرَدَتْ جِلْدَتُـهُ)،ئەوەیە: ڕزگاریکرد لەقەرزاری.لەوانەیە فەرمودەکە بۆ کەسێك بێت قەرزبکات ونیەتی دانەوەی نەبێت.

---

[1] مَا مِنْ عَبْدٍ كانَتْ لَهُ نِيَّةٌ فِي وَفاءِ دَيْنِه ،إلاَّكانَ لَهُ مِنَ اللهِ عَوْنٌ.قالتْ عائشَةُ :فَانا ألْتَمِسُ ذلكَ العَوْنِ.. المستدرك على الصحيحين للحاكم - كتاب البيوع وأما حديث إسماعيل بن جعفر بن أبي كثير - حديث : ٢١٤٥

[2] إنَّهُ يُغْفَرُ لِلشَّهيدِ كُلُّ ذَنْبٍ،إلاَّ الدَّيْن. صحيح مسلم ، كتاب الإمارة، باب من قتل في سبيل الله كفرت خطاياه إلا الدين - ٣٥٨٩

[3] الآنَ بَرَدَتْ جِلْدَتُهُ. مسند أحمد بن حنبل - ومن مسند بني هاشم، مسند جابر بن عبد الله رضي الله عنه ١٤٢٤٥.

**الحَـديثُ ٦٢// عـنْ عَلـيّ رَضـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قـالَ: قـالَ رَسـولُ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـه وَسَلَمَ: كُلُّ قَرْضٍ جَرّ مَنْفَعَةً،فَهُوَ رِباً.**

هەر قەرزێك سود بە خاوەنەكەى بگەيەنێت،سوە (بە سوو دائەنرێت).

**گێـــرەرەوەى فەرمودەكـــە//** الحـارث بـن أبـي أسـامة بـه إسـنادێك ئەيگێرێتـەوە كـە ئيـشى پـىٰ ناكرێـت،بيهقـيش لـە المعرفـةو الـسنن الكـبرى ئەيگێرێتـەوە. الـسنن الكـبرى للبيهقـي - كتـاب البيـوع ،جمـاع أبـواب الخـراج بالـضمان والـرد بـالعيوب وغـير ذلـك - بـاب كـل قـرض جـر منفعـة فهـو ربـا، حـديث : ١٠٢٣٠. [1]

**سەرباسەكان//**

**باســـى يەكـــەم/** فەرمودەكـە بـۆ كەسـێكە قەرزبـدات و مـەرجى گەڕانـەوەى زيادەيەك لەگەڵيدا دابنێت.

**باســـــى دوەم/** ئەگـــەر قـــەرز وەرگـــر بەخۆبـــەخش شـــتێكى دايـــە خـــاوەن قـــەرز،باش وايـــە چـــاكتر لـــەوەى باتـــەوە كـــەلێى وەرگرتوە،ئەمـــەش لـــەڕوى عـــادەت وشەرعيـــشەوە،بە ئـــەخلاقێكى جـــوان دائـــەنرێت. بـــە بەڵگـــەى فـــەرمودەى أبـــى رافـــع: پێغەمبـــەرى خـــوا وشـــترێكى بـــچكۆلەى قـــەرزكرد،كاتێك وشـــترێك لەوشـــترەكانى صـــدقاتى بـــۆ هات،فـــەرمانى بـــە ئـــەبو رافـــع دا كەوشـترێكى بـچكۆلە بداتـەوە خـاوەن قەرزەكە،ئـەويش وتـى: تـەنها وشـترى حـــەوت ســـاڵەم لايـــە كـــە دانـــەكانى نەكەوتوە،فـــەرموى: بيدەرێ،چـــونكە باشترين كەس ئەوەيە بە جوانترين شێوە قەرز ئەداتەوە. [2]

---

[1] ضعفه الألباني في ضعيف الجامع (٤٢٤٤).

[2] أنّ النّبيّ صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَمَ: إسْتَلَفَ منْ رَجُلٍ بكْراً،فَقَدمَتْ عليه إبلٌ منْ إبل الصّدَقَة،فَأمَرَ أبا رافعَ أنْ يَقْضي الرّجُل بكْره،قالَ:لا أجدُ إلاّ خياراً رُباعياً. فَقالَ: إعْطه إيّاهُ،فَإنّ خيارَ النّاس أحْسَنُهُمْ قَضاءاً. صحيح مسلم - كتاب المساقاة باب من استسلف شيئا فقضى خيرا منه (٣٠٨٧).

**الحَـديثُ ٦٣// عـنْ عَمـرو بـنِ الـشّريدِ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قـالَ: قـالَ رَسـولُ الله صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ: لَـيُّ الواجِـدِ يُحِـلُّ عِرضَـهُ وَعُقوبَتَـهُ.** دەسـتی دەسـتی كردنـی دەوڵەمەند بۆ قەرزدانەوە،هۆكارە بۆ سزادانی.

**گێـــــڕەرەوەی فەرمودەكـــــە//** ابوداود،النـسائي،بخاري بـةمعلقي،إبن حبـان بةصـــحيحي داناوة،احمـــد،إبن ماجـــة،بيهقي. ســـنن أبـــي داود – كتـــاب الأقضية، باب في الحبس في الدين وغيره ( ٣١٦٢) .[١]

**مانـــای وشـــەكان//** التَّفْلِيس: لـە بارودۆخێكدایـە فلـسی پـێ نیـە. الحَجْـرْ: ڕێگریكردن،لــە شەرعیـشدا واتــە: دادوەر بــە قــەرزار بڵێـت: ڕێگــریم كــردوی لــە هەڵــسوكەوت بــە ماڵەكەتــەوە. لَــيّ: دەســـتی دەســـتی كــردن. الواجِــدْ: دەوڵەمەنـد. حِـلُّ العِـرْضْ: لەناوخەڵكـدا بڵێـت: دەســتی دەســتی پێكــردوم (بوخاری لەسفيانەوە ئەيگێڕێتەوە). عُقوبَتُهُ: دەستبەسەركردنی.

**سەرباسەكان//**

**باســـی یەكـــەم/** فەرمودەكـە بەڵگـەی حـەرامبونی دەســتی دەسـتیپێكردنی دەوڵەمەندی قەرزارە، بۆ خاوەن قەرز،بۆیە ڕێ بەسزادانی دراوە.

**باسی دوەم/** دەربارەی سزادانی دەوڵەمەند،دوو ڕا هەیە:

یەكـەم: تـا قەرزەكـە ئەداتــەوە دەستبەســەر ئــەكرێت،وەك تــەمبێ كردنێـك بۆی،بەڕای زيد بن علی حەنەفيەكان،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكە.

دوەم:حیجـــری ئەخرێتەســـەر،وە دادوەر مـــاڵی پـــێ ئەفرۆشــێت،بەڕای جمهور.

ئەمـــەش هـــەر وەك ســـزادانیەتی،بە تایبـــەتی كەلێكدانـــەوەی ســـزا بـــە دەستبەسەركردن،لەپێغەمبەرەوە نەهاتوە.

**باسی سێیەم/** دەربارەی سزادانی هەژارو نەبوو،دوو ڕاهەیە:

---

[١] البانی بە حەسەن ی داناوە. الإرواء (١٤٣٤).

یەکەم: دەستبەسەر ناکریت،بەڕای جمهور.

بـەڵام ئەبوحەنیفـە ئـەڵێت: لـە ژێـر چـاودێری خـاوەن قەرزەکـەدا ئەبێت،بـە بەڵگەی:

ا.تێگەشتنمان بۆ فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئایەتی: ﴿فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾ .{البقرة:٢٨٠}.

دوەم: دەستبەسەر ئەکرێت،بەڕای شورەیح.

باســی چــوارەم/ زانایـان ڕایـان جیـاوازە دەربـارەی دەوڵەمەنـدێك،ئایا بـە یـەکجار دەسـتی دەسـتی پێکردن،ئەگاتـە گوناهـە گـەورەکان وپێـی فاسـق ئەبێت،وە شایەتی وەرناگیرێت،یان نا؟

هادویە ئەڵێن: بەڵێ بەفاسق دائەنرێت.

لەبارەی بڕی پارەکەوە کە پێی فاسق ئەبێت،چەند ڕایەك هەیە:

ا.لـە دە درهـەم زیاتربێـت،وەك بـڕی ئـەو پـارەی کـە ئـەدزرێت وسـزاکەی پـێ واجب ئەبێت،ئەمەش ڕای جمهورە.

ب.بەکـــەمتریش لـــەوە فاســـق ئەبێت،بـــەڕای هـــادی و مالکیـــەکان وشـافعیەکان. بـەڵام لـە دوبارەکردنـەوەی ئـەوکردارەدا دودڵن،شـافعی بـە مەرجی داناوە (کە دوبارەی کردەوە ئینجا بەفاسق دائەنرێت).

**الحديث ٦٤// عَنْ عَطِيَّةَ القُرَظِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: عُرِضْنَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ قُرَيْظَةَ، فَكَانَ مَنْ أَنْبَتَ قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ خُلِّيَ سَبِيلُهُ، فَكُنْتُ مِمَّنْ لَمْ يُنْبِتْ فَخُلِّيَ سَبِيلِي..**

لەرۆژی جەنگی بەنو قورەیزەدا بۆ لای پێغەمبەریان هێنایین، هەر کەسێك سمێڵی دەربکردایە ئەکوژرا، منیش لەوانەبوم سمێڵم دەرنەکردبوو، بەردرام.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** چوارکەسەکە، إبن حبانیش بەصەحیحی داناوە، حاکم ئەڵێت: لەسەر مەرجی بوخاری وموسلیم صحیحە. سنن ابن ماجه - كتاب الحدود ،باب من لا يجب عليه الحد ( ٢٥٣٨).[١]

**سەرباسەکان//**

فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی: بالغ بون بە سمێڵ دەرکردن ئەبێت (بۆپیاو)، هەموو حوکمەکان داوالێکراوو (مُكَلَّفْ) ئەیگرێتەوە. ئەمەش وەك کۆدەنگی زانایان وایە.

---

[١] صححه الألباني في صحيح الترمذي (١٥٨٤).

**الحَـديثُ ٦٥// عَـنْ عَمْـرو بـن شُـعَيب عـن أبيـه عـن جَـدّه: أنّ رَسـولَ اللهِ صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ قـالَ: لايَجـوزُ لـإمرَأةٍ عَطِيّـةٌ، إلاّ بـإذْنِ زَوجِهـ. وَفي لَفْـظ: لايَجـوزُ لِلمَـرْأةِ أمْرٌ في مالِها إذا مَلَكَ زَوْجُها عِصْمَتَها..**

**بەخـشینی مـاڵ بـۆ ئـافرەت دروسـت نیـە بەپرسـی مێردەکـەی نـەبێت. لەڕیوایـەتێکی تـردا: مامەڵـەکردن بـە ماڵەکـەی خۆیـەوە دروسـت نیـە ئەگـەر هاوسەری هەبوو.**

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** احمد واصحاب السنن جگە لـەترمذي، حـاكميش بەصـحیحی دانـاوە. سـنن أبـي داود - كتـاب البيـوع، أبـواب الإجـارة ، بـاب في عطية المرأة بغير إذن زوجها (٣٠٩٧).[1]

**سەرباسەکان//**

_دەربـارەی هەڵـسوکەوتی ئـافرەت لەماڵەکـەی خۆیـدا بـێ پرسـی مێردەکـەی ، چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: ئەگەر کەم عەقل نەبوو، دروستە، بەڕای جمهور، بە بەڵگەی:

أ.تێگەشـتن لەدەقـەکانی قورئـان وفـەرمودە (کـە ئـازادی ئەدەنـە ئـافرەت لـەو بوارەدا).

ب.فــەرمودەی جــابر کــە پێغەمبــەری خــوا بــە ئافرەتــانی فــەرموو: خێربکــەن، ئافرەتانیش لــەگوارەو مــستیلەکانیان ئــەهێنا، بیلالیش لێــی وەرئەگرتن وئەیخستە ناوجلەکەیەوە.[2]

ئەمەش بەخشینێکە بێ پرسی مێرد.

---

[1] البانی بە حسن صحيح دایناوە.صحيح ابی داود (٣٥٤٦).

[2] حديثُ جابر: أنّ النّبيّ صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ قالَ لِلنّساء: تَصَدّقْنَ.فَجَعَلَتْ المَرْأةُ تُلقي القُرطَ والخاتَمَ،وَبِلالُ يَتَلَقّاهُ بِرِداءِه. مُتّفَقٌ عَلَيْه.

ج.عائشه ئـەڵێت:پێغەمبـەری خـوا صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فـەرموی: ئەگـەر ئـــافرەت بـــێ زیـــادەڕۆیی لـــەخواردنی مێردەكـــەی بەخـــشی،خێری بەخـــشینەكەی ئـــەگات، وە مێردەكەشـــی خێـــری ئەگات،چـــونكە پەیـــدای كردوە،ئەوكەســـەش خێـــری ئـــەگات كـــە لای دانراوە،لەپاداشـــتی كەســـیان كەم نابێتەوە.[1]

ئەگـەر دروســـت بێـت بـێ پرسـی مێردەكـەی پـارەی مێردەكـەی سـەرف بكات،دروستیشە لەماڵی خۆی بكات بەخێر.

خَطّـابي لـەبارەی فـەرموده باسـلێكراوەكەوە ئـەڵێت: زۆربـەی زانایـان ئەیخەنـە بـواری هەڵـسوكەوت باشـی نێـوان ژن ومێرد،یـان ڕێگریەكـە بـۆ ئافرەتی كەم عەقڵە.

دوەم: ئـافرەت ئەگـەر هاوسـەرداربوو،بێ پرسـی مێردەكـەی ناتوانێـت مـاڵ ببەخشێت،بەڕای لیث،بە بەڵگەی: فەرمودەی باسلێكراوو.

سـێیەم: ئـافرەت تـا سـێیەك بـۆی هەیـە بـێ پرسـی مێردەكـەی ماڵەكـەی سەرف بكات. ئەمەش ڕای مالك وتاووسە.

مالیك بەڵگەكانی جمهور بۆ بەخشینی كەم دائەنێت.

---

[1] إذا أنْفَقَتْ المَرْأةُ منْ طعام زَوْجِها غيرَ مُفسدَة،كانَ لَها أجْرُها بِما أنْفقَتْ،ولِزَوْجِها أجْرُهُ بِما كَسَبَ،وَلِلخازِنِ مِثْلُ ذلِكَ،لايَنْقُصُ بعضُهُمْ مِنْ أَجْرِ بَعْضٍ شَيْئاً. رَواهُ الجَماعَةُ.

**الحَديثُ ٦٦// عَنْ قَبيصَةَ بنَ مُخارِقٍ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ قالَ: قالَ رسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إنَّ المَسْأَلَةَ لاتَحِلُّ إلاَّ لأَحَدِ ثَلاثَةٍ : رَجلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً، فَحَلَّتْ لَهُ المَسْأَلَةُ حَتّى يَصيبَها ثُمَّ يُمْسِكَ.وَرَجُلٍ أصابَتْهُ جائِحَةٌ إجْتاحَتْ مالَهُ، فَحَلَّتْ لَهُ المَسْأَلَةُ حَتّى يُصيبَ قَواماً مِنْ عيشٍ.وَرَجُلٍ أصابَتْهُ فاقَةٌ حتّى يقولُ ثلاثَةٌ مِنْ ذَوي الحِجا مِنْ قَومِهِ : لَقَدْ أصابَتْ فُلاناً فاقَةٌ فَحَلَّتْ لَهُ المَسْأَلَةُ...**

داواکردنی پارە تەنها بۆ سێ کەس ڕێگەدراوە:پیاوێك بوەتە بارمتەو قەرزار بوە،بۆی دروستە تا پارەکەی تەواو ئەکات، پاشان واز ئەهێنێت. وەپیاوێك کارەساتێك بەسەر ماڵەکەیدا هاتوە،پارە داواکردنی بۆ حەڵاڵە تا دەوڵەمەند ئەبێت. وە پیاوێك توشی کارەساتێك بوە تا سێ کەسی شارەزاو خاوەن عەقڵی خزمانی خۆی ئەڵێن: فڵان کەس توشی هەژاری بوەو سواڵکردنی بۆ حەڵاڵە.

<u>گێڕەرەوەی فەرمودەکە//</u> صحيح مسلم - كتاب الزكاة، باب من تحل له المسألة - حديث : ١٧٩٤

<u>**سەرباسەکان//**</u>

کەسێك باری لێقەوماوێك هەڵبگرێت،قەرزارئەبێت،ناشێت ئازادی لەماڵەکەی لێزەوت بکرێت وەك کەسانی قەرزار،بەڵکو ڕێی ئەدرێت پارە لەخەڵك وەرگرێت،تا قەرزەکان ئەداتەوە.ئەم ڕایەش لەگەڵ بنەما شەرعیەکان گونجاوە،ئەگەر نەبوبێتە بارمتەی ئەو ماڵە.

الحديث ٦٧// عنْ أبي هُرَيرةَ رَضيَ اللهُ عَنهُ :أنّ النّبِيَّ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ قَالَ: لايَمْنَعُ جارٌ جارَهُ أنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً في جِدارِهِ. ثُم يقولُ أبوهُرَيرة: مالي أراكُمْ عَنْها مُعْرِضِينَ.واللهِ لَأرْمِيَنَّ بِها بَيْنَ أكْتافِكُمْ.

با كەس ڕێگرى دراوسێكەى نەبێت دار بەسەر ديوارەكەى ئەمدا دابكوتێت،پاشان ئەبو هورەيرە وتى: بۆچشتان لەم حوكمە هەڵكردوە،سوێندبەخوا بە سەر ناو شانيشتاندا بێت دايئەكوتم.

گێڕەرەوەى فەرمودەكە// صحيح البخاري - كتاب المظالم والغصب باب : لا يمنع جار جاره أن يغرز خشبه في جداره - حديث : ٢٣٥١. صحيح مسلم - كتاب المساقاة ،باب غرز الخشب في جدار الجار - حديث : ٣١٠٤

سەرباسەكان//

باسى يەكەم/ ئەبوهورەيرە ئەم قسەيەى لەسەردەمى لێپرسراوێتيدا لەشارى مەككە يا مەدينە لەسەردەمى مەرواندا وتوە.واديارە كاتێك بينيويەتى ئەم بڕيارە جێبەجێ ناكەن،ئەويش توندە لە گەڵيان،وەك لە ڕيوايەتى ئەبوداوددا هاتوە: كاتێك فەرمودەكەيان بيست،هەموو سەريان داخست.[1]

باسى دوەم/ لەوانەيە ئەوانەى فەرمودەكەيان بۆ وتراوە،ئەم حوكمە نەزانن،وە لە هاوەڵان نەبن.

باسى سێيەم/ دەربارەى مافى دراوسێ لە دانانى كۆڵەكە دار لە سەر ديوارى دراوسێكەى،دوو ڕاهەيە:

يەكەم: دراوسێ بۆى نيە ڕێ لەدراوسێكەى بگرێت،ئەگەر ڕێگريش بوو،دادوەر بە زۆر پێى ئەكات،چونكە مافێكى ديارى دراوسێيە. ئەمەش ڕاى احمد وإسحاق والشافعي لەڕاى يەكەميدا،إبن حبيب لە مالكيەكان،وە ئەهلى حەديث،بە بەڵگەى:

---

[1] فَنَكَسوا رُؤوسَهُمْ.

١.فەرموده باسلێکراوەکە.

٢.عومەر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ لەسەردەمی خۆیداو بە ئامادەبونی زۆربەی هاوەڵان،ئەو بریارەی داوە.شافعی ئەڵێت: کەس لەهاوەڵان ڕای پێچەوانەی نەبوە لەگەڵیدا.

مالك بەسەنەدێکی ڕاست ئەیگێڕێتەوە: ضحاك بن خلیفة داوا لە محمد بن مسلمه ئەکات کە جۆگە لە ئاوێك لێبدات،بۆ زەویەکەی خۆی کە بەزەوی محمدا تێیبەڕێت،ئەویش ڕێی نەدا،کاتێك عومەر لەوبارەوە قسەی لەگەڵ کرد،هەر ڕازی نەبوو.پاشان عومەر فەرموی: سوێند بەخوا،ئەگەر بەسەر سکیشتدا بێت،هەر جۆگەلەکە ئەڕوات.[1]

ئەمەش هاوشێوەی چیرۆکەکەی ابوهریرەیە،بەڵام عمر گشتگیری کردوە لە هەموو شتێکدا کە دراوسێ پێویستی پێبێت،ماڵ بێت یا زەوی.

دوەم: بێ پرس دروست نیە دار لەسەر دیواری خانوی دراوسێ دابنێت،ئەگەر ڕێی نەدا دروست نیە،ئەمەش ڕای شافعیە لەڕای تازەیدا،وە ڕای حەنەفیەکان وهادەویە ومالك وجمهورە.

ئەڵێن: ئەو ڕێگریەی لە فەرمودەکەدا هاتوە،بۆ خۆ دورخستنەوەیە،چونکە فەرمودەی: ماڵی هیچ کەس بۆ کەس حەڵاڵ نیە بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت.[2] ڕێگرە لەم حوکمە.

بە وتەکەی بەیهەقی وەڵامی ئەم ڕایە ئەدرێتەوە:

١.لە فەرمودە ڕاستەکاندا پێچەوانەی ئەم حوکمە نابینین، مەگەر بڵێین گشتین و ئەم فەرمودەیە تایبەتی ئەکات.

---

[1] أنّ الضَحَاكَ بن خَليفَةَ سَألَهُ مُحَمّدُ بن مَسْلَمَةَ أنْ يَسوقَ خليجاً لَهُ،فَيَجْريه في أرضِ لِمُحَمّدِ بنِ مسلمة،فَامْتَنَعَ،فَكَلّمَهُ عُمَرُ في ذلكَ فَأَبَى. فَقالَ:وَاللهِ لَتَمُرّنّ بِهِ وَلَوْ عَلى بَطْنِكَ.

[2] لا يَحِلّ مالُ امْرِيءٍ مُسْلِمٍ،إلّا بِطيبَةٍ مِنْ قَلْبِه.

٢.ڕاوی فەرمودەکە (ابوهریرە) حەرامبونەکە دیاری ئەکات،ئەویش لە هەموو کەس شارەزاترە بە مەبەستی فەرمودەکە. بە بەڵگەی فەرمودەی: بۆ پشتان لەم حوکمە کردوە. ئەمەش ڕەخنە گرتنێکە لەپشتکردنیان لەم حوکمە،کە بەڵگەی حەرامبونە.

خَطّابِي ئەڵێت مانای فەرمودەی؛ (بَيْنَ أَكْتافِكُمْ)،ئەوەیە: ئەگەر بە ڕەزامەندی خۆتان ئەم حوکمە قبولْ نەکەن وئیشی پێنەکەن،دارەکە بەسەر ملتاندا بە زۆرە ملێ دائەکوتم. مەبەستیشی زیادە ڕۆییە نەك بەڕاستی بێت.

صەنعانیش ئەڵێت: وەڵام بۆ ئەوانەی ڕێگریەکە مانای تَنْزِيە ی ئەدەنێ،ئەوەیە:

لێکدانەوە کاتێك ئەکرێت،ئەگەر نەتوانرا دەقەکان یەکبخرێن،بەڵام لێرەدا بە تایبەتیکردن ئەو یەکخستنە ئەکرێت،فەرمودەی ئەبوهریرە تایبەتەو،فەرمودەی: لايَحِلُّ مالُ إمْرِيءٍ....گشتیە.

<u>باسی چوارەم/</u> ئەو مانایەی لە فەرمودەی: (لَأَرْمِيَنَّ بِها)،تێی دەگەین ئەوەیە: فەرمانم پێکراوە ئەم سوننەتەتان پێ ڕابگەیەنم و لێتان نەشارمەوە،بەڵگەتان لەسەر ڕابگرم لەبارەیەوە.

**الحـديث ٦٨// عـن أبـي حُمَيْـد السـاعدي رَضـيَ اللّـهُ عَنْـهُ ،قـالَ: قـالَ رَسـولُ الله صَلَى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ : لايَحِلُ لِامْرِيءٍ أنْ يَأخُذَ عَصَا أخيه بِغَيرِ طِيبَة نَفسٍ مِنْهُ.**

بۆ هیچ کەس نیە بێ ڕەزامەندی براکەی ،دارگۆچانەکەی ببات.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** حـاکم وابـن حبـان لەصـحیحەکەیاندا. صـحیح ابـن حبـان - کتـاب الحظـر والإباحـة کتـاب الـرهن - ذکـر الخـبر الـدال علـی أن قوله صلی الله علیه وسلم ٦٠٦٣ .[1]

**سەرباسەکان//**

**باســــی یەکـــــەم/** بردنــی مــاڵی موســڵمان حەرامە،بــە ڕەزامەنــدی خــۆی نەبێت،باکەمیش بێت. بە بەڵگەی:

١.ئایــەتی: ﴿وَلاَ تَــأْكُلُواْ أَمْــوَالَكُم بَيْــنَكُم بِالْبَاطِــلِ﴾ {البقــرة:١٨٨}.واتــە: مــاڵی خۆتــان بــە ناهــەق لــەناو خۆتانــدا مــەخۆن. کەسـێك بــێ ڕەزامەنــدی ماڵی موسڵمان بخوات،ئەوە خواردنی بە ناهەقە.

٢.چەند فەرمودەیەك هەیە لەو بارەیەوە ،لەوانە:

ا.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.بوخــاری وموســلیم لــە عمــر ئەگێڕنــەوە: نابێــت کــەس بــێ پرســی خاوەنەکەی مەڕەکەی بدۆشێت.[2]

ج.فەرمودەی: کەستان شتومەکی هاوڕێکەی نەبات،بە گاڵتە بێت یا بەڕاستی.[3]

٣.کۆدەنگی لەو بارەوە لە ناو موسڵماناندا هەبوە.

٤.عەقڵ و شەرعیش لە گەڵ ئەم مانایەدا یەك ئەگرنەوە.

---

[1] البانی ئەڵێت: إسنادەکەی صحیحە.الارواء ٢٨٠/٥

[2] لا يَحْلِبَنَّ أحدٌ ماشيَةَ أحد بغَيرِ إذْنه.

[3] لا يَأخُذَنَّ أحَدُكُمْ مَتاعَ أخيهِ لاعباً أوْ جاداً. أخْرَجَهُ أبوداودُ والتِّرْمِذيّ وَحَسّنَهُ. سنن أبي داود - كتاب الأدب باب من يأخذ الشيء على المزاح - حديث : ٤٣٧١

**باســـی دوەم/** ئـەم فـەرمودەو هاوشـێوەکانی گـشتین،بەڵام چـەند بابـەتێك لـەم گـشتیە بەدەرە،لەوانــە: وەرگــرتنی زەکــات بــە زۆرە ملیّ،مــاڤ هەڵگرتنــەوە بــــۆ دراوســـــیّ،ناندانی کەســـــی ناچـــــار،ژیاندنی خزمــــی نزیکـــــی هەژار،وژیانــــدنی هاوســـــەر،دانەوەی قـــەرز،وە زۆر لـــەو مافـــەماڵیانـــەی کـــەخاوەن مـــاڵ بـــەئارەزوی خـــۆی دەری ناکات،بـــەڵکو بـــە زۆرە ملـــیّ لێـــی ئەســـــتێندرێت،داکوتانی دارەکـــەش بەســـــەر دیـــــواری دراوســـــێدا،هەمان مانایەو تەنها سود وەرگرتنیشە،کاڵاکە بۆ خاوەنەکەی ئەمێنێتەوە.

**الحَـديثُ ٦٩// عَـنْ أَبِـي هُرَيـرَةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنـهُ ،قَـالَ: قَـالَ رَسـولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ.وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ،فَلْيَتبعْ...**

دەســـتی دەســـتی پێکردنـــی قـــەرزاری دەوڵەمەنـــد بـــەخاوەن قەرز،ســـتەمە. ئەگـــەر کەسێکیـــشتان ڕەوانـــەی کەسـێکی دەوڵەمەنـــد کـــرا (بـــۆ وەرگرتنـــەوەی قەرزەکەی) با بچێت.

**گێــــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صـحيح البخـاري – كتـاب الحـوالات بـاب الحوالـة – حـديث : ٢١٨٨ . صـحيح مـسلم – كتـاب المـساقاة بـاب تحـريم مطـل الغني – حديث : ٣٠٠٨

**مانــــای وشــــەکان//** الحَوالَـةُ: گواسـتنەوەی دانـەوەی قەرز،لەکەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی تـر. المَطَـلْ: دەسـتی دەسـتی پێکردن،دواخـستنی مافێـك بـەبیّ هـۆ لـە کەسـێك کـەتوانای دانـەوەی مافەکـەی هەیـە. مَلِـيءْ: دەوڵەمەنـد فَلْيَتبِعْ: ئەگەر ڕەوانەکرا با بچێت.

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** فەرمودەکـە بەڵگـەی حـەرامبونی دەسـتی دەسـتیپێکردنە لەلایەن دەوڵەمەندەوە.

**باسی دوەم/** دەربارەی ئیزافەی (المَطْلْ) بۆ لای (الغَنيّ)،دوو ڕا هەیە:

یەکــــەم: مـــصدر(چـــاوگ) ئیزافەکراوەتـــە لای فاعـــل (بکـــەر)،بـــەڕای جمهور،واتـــە: حەرامـــە لەســـەر دەوڵەمەنـــدی بەتوانا،قـــەرز دوابخـــات لـــە وادەی خۆی،بەڵام بۆ کەسی بێتوانا حەرام نیە.

دووەم: مـــصدر ئیزافـــەی مفعـــول کراوە،واتـــە: پێویـــستە قـــەرز بدرێتەوە،ئەگـــەر خـــاوەن ماڵەکـــەش دەوڵەمەنـــد بێت،دەوڵەمەندیەکـــەی نابێتـــە پاســـاو بـــۆ دواخـــستنی قەرزەکەی،ئەگـــەر بەرامبـــەر دەوڵەمەنـــد دروست نەبێت،بەرامبەر هەژاریش دروست نیە.

إبن حجر ئەم ڕایە بەدور ئەزانێت.

**<u>باســـی ســـێیەم/</u>** دەربـارەی جـۆری فـەرمان کـردن لەفـەرمودەی( فَلْيُتْبَعْ )،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بۆ إسْتِحْبَاب ە،بە ڕای جمهور.

بـەڵام صـەنعانی ئـەڵێت: نـازانم چ هۆکارێـك هەیـە بـۆ لادانـی فەرمودەکـە لە مانا ڕاستەکەی.

دووەم: بـۆ وجوبـة،بـە ڕای ظاهریـة وزۆربـەی حەنبەلیـەکان وابوثـور وابـن جریر،بە بەڵگەی: ڕوکەشی فەرمانکردنەکە لەفەرمودەکەدا.

**<u>باســـی چـــوارەم/</u>** ئایـا دەسـتی دەسـتی پێکردنـی دەوڵەمەنـد،گوناهی گەورەیە یان نا؟ جمهور پێی وایە،ئەو کەسە پێی فاسق دەبێت.

**<u>باســـی پێنجـــەم/</u>** ئایـا پـێش ئـەوەی داوای قەرزەکـەی لێبکرێت،بەفاسـق دائەنرێت،یان ئەبێت داوای لێبکرێت،ئەگەر نەیدا ئینجا فاسقە؟

لـــە فەرمودەکـــە ئـــەوە وەرئـــەگرین کـــە: ئـــەبێت داوای لێبکرێت،چـــونکە دەستی دەستی پێکردن لەگەڵ داواکردندایە.

**<u>باســـی شەشـــەم/</u>** ئـەم حـوکمی دەسـتی دەسـتیپێکردنە،هەموو کەسـێك ئەگرێتـەوە کـە مـافی خـەڵکی تـری لابێـت،وەك پیـاو بەرامبـەر ژنەکـەی، ئاغـا بۆ خزمەتکارەکەی.

**باسی حەوتەم/** بە تێگەشتن لە فەرمودەکە،ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە: کەسێك توانای دانەوەی نەبێت،دەستی دەستیش بکات بە ستەم دانانرێت. کەسێکیش ڕای لەگەڵ (مَفْهُوم المُخالَفَة) دا نەبێت،ئەڵێت: کەسی بێتوانا بە ماطِلْ دانانرێت،هەروەها دەوڵەمەندێکیش ماڵەکەی لانەبێت،وەك نەبوە.

**باسی هەشتەم/** کەسێك نەیبێت،تا دەوڵەمەند نەبێت داوای لێناکرێت.

شافعی ئەڵێت: ئەگەر لەوبارەوە ڕەخنەی لێبگیرێت،بە ستەمکار دائەنرێت. بەڵام لەبەر ئەوەی نەبوە،بە ستەمکار دانانرێت.

**باسی نۆیەم/** ئەگەر ئەو کەسەی قەرزەکەی بۆ ڕەوانە کرابوو،لە بەر هەژاری نەیدەتوانی بیداتەوە،لەو بارەوە دوو ڕاهەیە:

یەکەم: خاوەن قەرز بۆی نیە بگەڕێتەوە لای قەرزارەکە. چونکە ئەگەر بۆی هەبێت بگەڕێتەوە،مەرجی دەوڵەمەندی لەفەرمودەکەدا بێسودە،کاتێك پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (دەوڵەمەندی) بەمەرج داناوە،خاوەن قەرز مافەکەی لای ڕەوانە بۆ کراو وەرئەگرێتەوەو بۆی نیە بگەڕێتەوە لای کەسەکەی تر،وەك کەسێك لەبری قەرزەکەی شتێك وەربگرێت،پاشان ئەو شتە لای خاوەن قەرز لە ناوچوو.

دوەم: ئەگەر نەتوانرا مافەکە بدرێتەوە،ئەگەڕێتەوە بۆ لای قەرزارەکە،بە ڕای حەنەفیەکان.

حەواڵەش بە زەمانەت ئەشوبهێنن،بەڵام ئەگەر مایەپوچی لەحەواڵەدا نەزانرا،ئەوە بۆی هەیە بگەڕێتەوە لای قەرزارەکە.

**الحَديث ٧٠// عنْ أَبِي هُرَيـرَةَ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ: أَنَّ رَسـولَ الله صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ ،كانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ المُتَوَفَّى عَلَيْـهِ الدَّيْنُ،فَيَسْأَلُ: هلْ تـركَ لِدَيْنِـهِ مِنْ قَـضاءٍ؟ فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّـهُ تَـرَكَ وفـاءً، صَلّى عَلَيْـهِ.وَإِلّـا قـالَ: صَلّوا على صـاحِبِكُمْ،فَلَمّا فَتَحَ اللّهُ عليـهِ الفُتـوحَ قـالَ: أنـا أَوْلى بِـالمُؤْمِنِينَ مِـنْ أَنْفُـسِهِمْ،فَمَنْ تُـوُفِّيَ وَعليـهِ دَيْنٌ،فَعَلَـيَّ قَضاؤُهُ..**

ئەگــەر كەســێكى مردويــان بهێنايــە بــۆ لاى پێغەمبــەرو قــەرزى لەســەر بوايە،ئەيفــەرموو: ئەوەنــدەى جێهيــشتوە قەرزەكــەى پێبداتــەوە؟ ئەگــەر بيانوتايە،بەڵێ،نوێــژى لەســەرئەكرد. ئەگــەر نــا، ئەيفــەرموو: خۆتــان نوێــژ لەســەر هاوەڵەكــەى خۆتــان بكــەن. بــەڵام كاتێــك خــواى گــەورە بــە ســەريدا ڕژان دواى ڕزگــاركردنى شــارەكان،فەرموى: مــن بــە موســڵمانان لەپێــشترم (نــزيكترم) لــە خۆشــيان. كەســێك مــردوو قــەرزى لەســەربوو،من قەرزەكــەى ئەدەمەوە.

**گێــــڕەرەوەى فەرمودەكــــە//** صــحيح البخــاري - كتــاب الحــوالات ، بــاب مــن تكفــل عــن ميــت دينــا - حــديث : ٢١٩٦ . صــحيح مــسلم - كتــاب الفرائض ، باب من ترك مالا فلورثته - حديث : ٣١٢٥

**سەرباسەكان//**

**باســــــى يەكـــــــەم/** فەرمودەكــــە بەڵگــــەى ئەوەيــــە:پێــــشەواى موسڵمانان،لەسەريەتى قەرزى مردوو بداتەوە.

إبــــن بطــــال ئــــەڵێت: ئــــەبێت كاربەدەســــتى موســــڵمانان بــــەو شــــێوەيە بكات،بەرامبەر كەسێك بمرێت و قەرزاربێت،ئەگەر وانەكات،گوناهبارە.

رافعـي لـه کۆتـايی فەرمودەکـەدا باسـيکردوه ،وتيـان: ئـەی پێغەمبـەری خوا،هـەموو کـار بـه دەسـتێك لـەدوای تـۆ ئـەبێت وا بکـات؟ فـەرموی: لەسـەر هەموو کاربەدەستێکی دوای من پێویسته.[1]

هـەمان مانـا لەفەرمودەيـەکی تـردا هـاتوه کـه طبرانـي لەسـەلمانی فارسـيەوه ئەيگێڕێتـەوه: پێغەمبـەری خـوا فـەرمانی پێکـردين بـەپاره ديلـی موسـڵمان ڕزگاربکـەين وکەسـێکيش داوای کـرد پـارەی بـدەينێ.پاشـان فـەرموی: کەسـێك مـاڵێکی جێهێـشت،بۆ ميراتگرەکانيەتی،قـەرزاريش بوو،قەرزەکـەی لەسـەر مـن و ئـەو پێـشەوايانەی دوای منه،کەلـەبيت المـال ی موسـڵمانان ئەيدەنەوه.[2]

**باسـی دوەم/** ڕوکەشـی فـەرمودەی: (فَعَلَـيَّ قَـضَاؤُهُ)،ئەوەيـه کـه: واجبـه کاربەدەسـت قەرزەکـه بداتەوه،بـەڵام ئايـا لـه مـاڵی خـۆی يـا لـەبيت المـال؟ فەرمودەکه هەردوو ماناکه ئەگرێتەوه.

**باسـی سـێيەم/** فـەرموده باسـلێکراوەکه فَلَمَّـا فَـتَحَ اللهُ عَلَيْـهِ الفُتُـوحَ.....حـوکمی ئـەو فەرمودانـه لائـەبات کەتێيـدا هـاتبوو: پێغەمبـەری خوا نوێژی مردوی لەسەر کەسی قەرزار نەئەکرد.لەو فەرمودانەش:

أ.سەرەتای فەرمودەکه خۆی.

ب.فـەرمودەی عـەلی رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ کـه ئـەڵێت: ئەگـەر مردويـەکيان بهێنايـه لای پێغەمبەر،پرسـياری دەربـارەی کردارەکـانی نەئەکرد،بـەڵکو لـه قەرزاريەکـەی ئەپرسـی،ئەگەر بيانوتايـه: قـەرزی لەسـەرە،وازی ئەهێنا،ئەگـەر بوترايـه قـەرزی لەسـەر نيه،نوێـژی لەسـەر ئەکرد،لاشـەی مردويـەکيان بـۆ هێنا،کاتێـك هەسـتا بـۆ الله اکـبر کـردن لەسەری،پرسـی :

---

[1] قيلَ: يارَسولَ الله،وَعلى كُلّ إمامٍ بَعْدَكَ؟ قالَ: وَعَلى كُلّ إمامٍ بَعْدي.

[2] أَمَرَنا رَسولُ الله صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ أنْ نفْدي سَبايا المُسْلمينَ وَنُعْطي سائلَهُمْ.ثُمَّ قالَ:مَنْ تَرَكَ مالاً،فَلوَرَثَتِه.وَمَنْ تَرَكَ دَيْناً،فَعَلَيَّ وَعَلى الوُلاةِ مِنْ بَعْدي مِنْ بَيْتِ مالِ المُسْلِمين.وَفيهِ راوٍ مَتروك وَمُتَّهَم.

ئايـا قــەرزی لەســەرە؟ وتيــان: دوو دينــار قــەرزارە.ئــەويش وازی لێهێنــاو پـشتی تێکــرد.عــەلی وتــی: دوو دينارەکــە لەســەر مــن بێت،گــەردنی ئــەو ئــازاد بێــت.پاشــان نوێــژی لەســەرکرد وە فــەرمووی: خــوا پاداشــتی خێــرت بداتەوەو لەقەرزاری رزگارت بکات.[1]

ج.جــابر ئــەڵێت: پياوێــك لەئێمــە مرد،ئێمــەش شــۆردمان وبۆنخۆشمــان کــردو کفنمــان کــرد،و هێنامانــەلای پێغەمبــەری خــواو وتمــان: نوێــژی لەســەر ئەکــەيت؟ چــەند هــەنگاوێکی نــاو پاشــان فــەرمووی: قــەرزی لەســەرە؟ وتمــان: دوو دينار،ڕۆشــت وئەبوقــەتادە خــستيە ئەســتۆی خــۆی.هاتينــە خزمــەتی وئەبوقــەتادە وتــی: دوو دينارەکــە لەســەرمن.پێغەمبــەری خــوا فــەرمووی: مــافی خــاوەن قــەرز درايــەوەو مردوەکــەش ڕزگــاری بــوو.فــەرمووی: بــەڵێ ونوێــژی لەسەرکرد.[2]

---

[1] كانَ رَسولُ الله صَلَى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ إذا أُتيَ بِجَنازَة،لَمْ يَسأَلْ عَنْ شَيْءِ منْ عَمَل الرَجُل،وَيَسأَلُ عنْ دَيْنه،فإنْ قيلَ:عَليه دَيْنٌ كَفّ،وَإنْ قيلَ: لَيْسَ عَلَيْه دَيْنٌ صَلَى .فَأُتيَ بِجَنازَة،فَلَمّا قامَ ليُكَبِّرَ سَألَ: هَلْ عَلَيْه دَيْنٌ؟ قالوا: ديناران، فَعَدَلَ عَنْهُ.فَقالَ عَليٌّ: هُما عَلَيَّ يا رَسولَ الله،وَهُوَ بَريءٌ منْهُما.فَصَلَى عَلَيْه،ثُمَّ قالَ:جَزاكَ اللهُ خَيْراً،وَفَكَّ اللهُ رهانَكَ. الدارقطني

[2] تُوفِّيَ رَجُلٌ مِنّا فَغَسَلْناهُ وَحَنَطْناهُ ثُمَّ أتَيْنا بِه رَسولَ الله فَقُلْنا:تُصَلّي عَلَيْه.فَخَطا خُطاً،ثُمَّ قالَ:أعَلَيْه دَيْنٌ؟ فَقُلْنا: ديناران، فَانْصَرَفَ ، فَتَحَمَّلَهُما أبو قَتادَة فَأَتَيْناهُ،فَقالَ أبو قَتادَة:الدّيناران عَلَيَّ.فَقالَ رَسولُ الله صَلَى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ:حَقّ الغَريم وَبَريءَ منْهُما المَيِّت، قالَ: نَعَمْ فَصَلَى عَلَيْه.رَواهُ أحْمَدُ وَأبوداود وَالنَسائي وَصَحَّحَهُ ابْنُ حبّان وَالحاكم.وقال الألباني: إسناد صحيح على شرط الصحيحين ،الإرواء( ١٤١٦).

**الحَديثُ ٧١// عَنْ عَمْرو بِن شُعَيْب عَنْ أبيهِ عَنْ جَدِّه،قَالَ: قَالَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ : لَاكَفالَةَ في حَدّ.**

کەفالەت لەسزاکاندا دروست نیە.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** بەیهـەقی بەإسـنادێکی لاواز. السنن الصغير للبيهقي – كتاب البيوع ، باب الضمان – حديث : ١٦١٧ .[١]

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** فەرمودەکـە بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: کەفالـەت (لـەبری) لەسزاکاندا نیە.

**باسی دوەم/** دەربارەی کەفالەتی نەفس (ضَمَانٌ بِالوَجْه)،دوو ڕا هەیە:

یەکـەم: بـەهیچ شـێوەیەك دروسـت نیە،نـە لـە ماڵـدا نـە لـە سـزاکاندا نـە لەهیچ شتێکی تردا.ئەمەش ڕای إبن حەزمە،لە بەر ئەم هۆیانە:

١.چونکە مەرجێکە لەقورئاندا باس نەکراوە،کەواتە پوچەڵە.

٢.لەڕێگـەی عەقڵیـشەوە،پرسیار لەوانەئەکـەین کـە بـە دروسـتی دائـەنێن: کەسـێك بـوە کـەفیلی کەسـێك و،کەفالـەت بـۆ کراوەکـە دیارنەبوو،چـی لەکەفیلەکـە ئـەکرێت؟ ئەگـەر بڵـێن: بـژاردنی ماڵەکـەی لەئەسـتۆیە،ئەوە سـتەمەو خـواردنی ماڵـە بەناحەق،چـونکە ئـەو کەسـە پابەنـد نـەبوە بـە بژاردنـەوەی.ئەگـەر بـشڵێن،واز لەکەفیلەکـە ئەهێنرێت،کەفالەتەکـەخۆی پوچـەل ئەبێتـەوە.ئەگـەر داوا لـە کەفیلەکـەش بکرێـت داواکراوەکـە بهێنێـت: ئـەوە داواکردنێکـە لـە توانـادا نیـە،خوای گـەورەش ئـەو داواکردنانـەی داوا نەکردوە.

دوەم: کەفالەت کردن دروستە،بەڕای کۆمەڵێك لەزانایان،بە بەڵگەی:

١.پێغەمبەری خوا بو بە کەفیلی تۆمەتبارێك.[١]

---

[١] البانی بە لاوازی داناوە.الإرواء (١٤١٥).

بەڵام ئیبن حەزم ئەم ڕیوایەتە بەپوچ دائەنێت،چونکە إبراهیم بن خثیم بن عراك ئەیگێڕێتەوە،کەخۆی و باوکی لەوپەڕی لاوازیدان، دروست نیە فەرمودەیان لێ بگێڕدرێتەوە.

٢.چەند ڕیوایەتێك لەعمر بن عبدالعزیزەوە.

بەڵام ئیبن حەزم ئەو ڕیوایەتانە بە بەڵگە دانانێت،چونکە تەنها قورئان وفەرمودە ئەکرێنە بەڵگە.

**الحَدِيثُ ٧٢// عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،قَالَ: قَالَ رَسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللهُ تَعَالى: أَنَا ثَالِثُ الشَّرِيكَيْنِ مَا لَمْ يَخُنْ أَحَدُهُمَا صاحِبَهُ.فَإِذا خانَ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِمَا.**

خوای گەورە ئەفەرموێت: من سێیەمی دوو شەریکم،گەر خیانەت لەیەك نەکەن،بەڵام کاتێك خیانەتیان کرد، لە نێوانیان دەرئەچم.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکە//** ئەبوداود،حاکم بەصەحیحی داناوە. سنن أبي داود ،كتاب البيوع، باب في الشركة – حديث : ٢٩٥٣. [2]

**مانـای وشـەکان//** الشَّرْكَةُ: حاڵەتێکە لە نێوان دوکەس و زیاتر بە ئارەزوی خۆیان ڕوئەدات.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکـەم/** فەرمودەی: (إِنَّ اللهَ مَعَهُمَا)،واتە: لەگەڵیاندایە بەپاراستن و چاودێریکردن و یارمەتیدانیان بە ماڵ و ڕژاندنی بەرەکەت لە بازرگانیەکەیاندا،ئەگەر خیانەت ڕویدا بەرەکەت لەماڵەکەیاندا نامێنێت.

**باسی دوەم/** فەرمودەکە هاندانی تیایە بۆ هاوبەشیکردن،بێ خیانەت،وە هەڕەشەی خیانەتکردنیشی تیایە.

---

[1] كَفَلَ رَسُولُ اللهِ فِي تُهْمَةٍ.

[2] البانی ئەڵێت لاوازە.الإرواء (١٤٦٨).

**الحَديثُ ٧٣// عَـنْ الـسَّائِبِ المَخْزومي رَضيَ اللّهُ عَنْـهُ ،أَنَّـهُ كـانَ شَـريك النَّبِـيّ صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ البِعْثَةِ،فَجاءَ يَوْمَ الفَتْحِ فَقالَ: مَرْحَباً بِأَخي وَشَرِيكي.**

سـائبی مخزومـی هاوبەشـی پێغەمبـەر بـوە لـەپێش پێغەمبەرایەتیدا،لـە ڕۆژی ڕزگـارکردنی مەککـەدا کاتێـك هاتـە لای،وتـی: مەرحـەبا لـەبراو هاوبەشم.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** احمـد،ابوداود،إبن ماجـە. مـسند احمـد بـن حنبـل ،مسند المكيين ،حديث السائب بن عبد الله - حديث : ١٥٢٠٩ [1]

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** إبـن عبـدالبر ئـەڵێت: سـائب بـن ابـی الـسائب لـەو کەسـانە بـوە کـە پێغەمبـەری خـوا دڵـی ڕائـەگرتن (المُؤَلَّفَـةِ قُلُـوبُهُمْ)، ئیـسلامەتیەکەشی ڕێکبوو،لەوانـە بـوو کـە تەمـەنی زۆریـان هـەبوو،تا سـەردەمی معاویـە ژیا،لـە سـەرەتای هـاتنی ئیـسلامدا هاوبەشـی پێغەمبـەر بـوە لـە بازرگانیـدا.لـە ڕۆژی ڕزگـارکردنی شـاری مەککـەدا،وتی: مەرحـەبا لـە براکـەم وهاوبەشەکەم،کەسـێك بـوو ڕێکرنـەبوو لـەهیچ وزۆریـش لەسـەر مامەڵـە نەئەڕۆشت.[2] حاکم بە صەحیحی داناوە.

لـە ڕیوایـەتی إبـن ماجـەدا هـاتوە: تـۆ هاوبەشـی مـن بـوی لەسـەردەمی نەفامیدا.

ئـەم فەرمودانـە-بـە فـەرمودە باسلێکراوەکەشـەوە-بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: هاوبەشـکردن لـەپێش هـاتنی ئیـسلامیش دروسـت بوە،ئیـسلامیش وەك خۆی هێشتویەتەوە.

---

[1] البانی بە صەحیحی داناوە. صحیح ابی داود.

[2] مَرْحَباً بِأَخي وَشَريكي،كانَ لايُداري وَلا يُماري..

**باسی دوەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: دروستە ئەگەر کەسێك بەسەرتدا هەڵبدات بە حەق،تۆش بێدەنگ بیت.

**باسی سێیەم/** فەرمودەکە بەڵگەیە لە سەر: نەرم ونیانی و چاك هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا لەگەڵ خەڵکیدا،لەپێش بون بەپێغەمبەرو دوای ئەویش.

**الحَديثُ ٧٤// عنْ عَبْدِالله بنِ مَسْعود رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ ،قالَ: إشْتَرَكْتُ أنَا وَعَمَّارُ وَسَعْدٌ فِيمَا نُصِيبُ يَوْم بَدْر،فَجاءَ سَعْدُ بِأسِيرَيْنِ،وَلَمْ أجِيءْ أنَا وَعَمَّارُ بِشَيْءٍ.**

ئیبن مەسعود ئەڵێت: لە ڕۆژی جەنگی بەدردا،من وعەممارو سەعد ڕێکەوتین لە سەر هاوبەشبونمان لە دەستکەوتەکانی جەنگەکە،سەعد دوو دیلی هێنا و من وعەممار هیچمان نەهێنا.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** السنن الصغری النسائي- کتاب المزارعة باب شرکة الأبدان ٣٨٩٧.[1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە بەڵگەی دروستی هاوبەشیکردنە لەدەستکەوتدا،کە بە (شِرْكَةالأبْدَان) ناو ئەبرێت.

**باسی دوەم/** ئەم هاوبەشکاریە بریتیە لەوەی: کەسێك هاوەڵەکەی خۆی ئەکاتە وەکیل،تاکو بە برێکی دیاریکراو ئیشی بۆ بکات.کارەکەش دیاری ئەکرێت.

**باسی سێیەم/** دەربارەی دروستی ئەم جۆرە هاوبەشیکاریە،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: دروستە،بە ڕای هادەویەونەبوحەنیفە،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

---

[1] البانی بە لاوازی داناوە.ضعیف النسائي (٤٧١١).

دوەم: دروست نیە (پوچەڵە)،بە ڕای شافعی وابوثور و إبن حزم.

إبـن حـزم ئـەڵێت: ئـەم جـۆرە هاوبەشـیکاریە دروسـت نیـە لـە هـیچ شـتێکدا،ئەگەر ڕوشـیدا،ئەوە پوچـەو،هەریەکێکیان چـی پەیـدا کـرد بـۆ خـۆی ئەبێت،ئەگـەر ماڵەکـەیان دابـەش کردبوو،پێویـستە بـۆ یـەکی بگێڕنەوە،ئەگـەر نـا نرخەکـەی ئـەبێت بگێڕنەوە،چـونکە مەرجێکـە لـە قورئاندا نیە،کەواتە پوچەڵە.

بەڵگەی ئەم ڕایەش ئەوەیە:

١.لەسـەر خەڵەتانـدن بیناکراوە،نازانرێـت قازانجەکـە چەندە،چـونکە بـڕی ئیشەکە نازانرێت.

٢.هـەر یـەکێکیان جەسـتەو سـودەکانی هـی خۆیەتی،کەواتـە سـودێکیش لەجەستەی وەربگیرێت،بۆ کەسەکە خۆیەتی.

٣.ئـیبن حـەزم وەڵـامی فەرمودەکـەی ئـیبن مەسـعود ئەداتـەوە کـە : لەڕیوایـەتی (بـی عبیـدە بـن عبـدالله یە،ئـەم ڕیوایەتـەش مُنْقَطِـعْ ە،چـونکە ابوعبیـدە فـەرمودەی لـەباوکی نەگێڕاوەتـەوە: عمـرو بـن مـرە ئـەڵێت: بـە ابوعبیدەم وت: لە بارەی باوکتەوە هیچت لەبیرە؟ وتی: نەخێر.

شـافعیەکانیش ئـەڵێن: دەسـتکەوتەکانی بـەدر بـۆ پێغەمبـەری خـوا بوە،بـە ئارەزوی خۆی دابەشی کردوە.

٤.إبـن حـزم ئـەڵێت: ئەگـەر فـەرمودە باسـلێکراوەکەش ڕاسـت بێت،بەڵگەیـە دژی ئەوانـەی ئـەم هاوبەشـیکاریە بـە دروسـت ئەزانن،چـونکە ئـەوانیش یەکـەم کەسـن وەك هـەموو موسـڵمانان کەئـەڵێن دروسـت نیە،لـە بـەر ئـەوەی هـیچ سـەربازێك بـۆی نیـە بـە جیـا لـە سـەربازانی تـر دەسـتکەوت بـۆ خـۆی ببات،تـەنها شـت وەکـی کـوژراو بـۆ بکوژەکەی،کـە ئـەویش جیـاوازی ڕاهەیـە دەربارەی،گـەر کەسـێکیش ئـەوە بکـات، خیانەتـەو لـە گوناهـە گەورەکانە.

٥.ئەگەر فەرمودەکە ڕاستیش بێت،بە ئایەتی﴿ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ {الأنفال:١} واتە پێیان بڵێ: دەستکەوتی شەڕ بۆ خوا و پێغەمبەرە. پوچەڵ بۆتەوە،دەستکەوتەکانیشی بەسەر شەڕکەراندا دابەشکردوە.

٦. حەنەفیەکان هاوبەشکاری لەڕاوکردندا بەدروست نازانن،مالکیەکانیش بەدروستی دانانێن لە ئیش کردن لە دوو شوێندا،کەواتە هاوبەشکاری لەفەرمودەیەدا دروست نیە لایان.

__باسی چوارەم/__ شەرعزانان هاوبەشکاری ئەکەن بەچوار بەشەوە.

إبن بطال ئەڵێت: کۆدەنگن لەوەدا کە هاوبەشکاری دروست ئەوەیە هەر یەکێکیان وەك یەك ماڵ دەربکەن،پاشان وا تێکەڵی بکەن تا نەناسرێتەوە،ئینجا هەڵسوکەوتی پێوە بکەن،مەگەر هەرکەسێکیان خۆی بخاتە بری ئەویتر لە هەڵسوکەوت بەماڵەکەوە،ئەمەش پێی دەوترێت (شِرْكَةُ العِنَانْ).

ئەکرێت ئەگەر هەر یەکێکیان کەمتر لەوی تر پارەبدات،قازانج و زەرەکەش بە ئەندازەی ماڵەکە ئەبێت لەنێوانیاندا.

هەروەها ئەگەر کاڵایەکیان پێکەوە کڕی،یا یەکێکیان لەوی تر شتی زیاتر کڕی،بە ئەندازەی پارەکەیان قازانج و زەرەر دابەش ئەکرێت لەنێوانیاندا،بەڵگەش بۆ ئەوە:

ئەگەر دوو ماڵیان تێکەڵ بەیەك کرد،ئەو تێکەڵکراوە بۆ هەردوکیانە،شتێکی پێبکڕن هەر بۆ خۆیانە. کەواتە نرخەکەی و قازانج و زەرەرەکەی بۆ هەردوکیانە. ئەو کاڵایەش کە ئەیکڕن،هەمان حوکمی هەیە،چونکەلەبری نرخەکەیە.

**الحَديثُ ٧٥// عَنْ جابِر بِنِ عبدالله رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ ،قالَ:أرَدْتُ الخُروجَ إلَى خَيبَرَ فَأتَيتُ النَبِيّ صَلَى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ ،فَقالَ: إذا أتَيتَ وَكيلي بِخَيبَرَ فَخُذْ مِنْهُ خَمْسَةَ عَشَرَ وِسقاً.فَإنْ إبتَغَى مِنكَ آيَةً فَضَعْ يَدَكَ عَلَى تَرْقُوَتِه.**

جابر ئەڵێت: ویستم بۆ خەیبەر بچم،کەهاتمەلای پێغەمبەر فەرموی: کاتێك چویتەلای بریکارەکەم لەخەیبەر،پانزەویسقی لێوەربگرە،ئەگەر داوای نیشانەشی لێکردیت،دەستت بخەرەسەر شانی.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//** ابوداود و بەصحیحی داناوە. سنن أبي داود – كتاب الأقضية ، باب في الوكالة – حديث : ٣١٦٦. [1]

**مانای وشەکان//** الوَكالَة: لەزمانی عەرەبیدا بەواتای لەبری وپاراستن دێت. لەشەرعیشدا: کەسێك یەکێکی تر لەبری خۆی دائەنێت، بەرەهایی یا بە بەستراویی. آيَة:نیشانە. تَرْقُوَة: ئەو ئێسقانەی لەنێوان شان و ملدایە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** بریکاری لە وەکالەتدا دروستە،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.کۆدەنگی زانایان لەسەری.

**باسی دوەم/** فەرمودەکە ئەوە ئەگەیەنێت کە: حوکمەکان بە بریکارەوە بەستراونەتەوە.

**باسی سێیەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: ئیش بە نیشانە ئەکرێت،ئەگەر پەیوەست بێت بە ماڵی خەڵکیەوە.

**باسی چوارەم/** دەربارەی باوەڕکردن بەو کەسەی لای خاوەن ماڵەوە نێردراوە،زانایان چەند ڕایەکیان هەیە:

یەکەم: بۆ وەرگرتنی ماڵ، بە نیشانە باوەڕی پێ ئەکرێت. بە ڕای هەندێك لە زانایان، بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

---

[1] الباني بە فەرمودەیەکی لاوازی داناوە.ضعيف أبي داود ( ٣٦٣٢ ).

دوەم: ئەگەر دڵنیا بو لێی باوەڕی پێنەکرێت.

سێیەم: باوەڕی پێنەکرێت،ئەشتوانرێت ماڵەکەی پێبدرێت،ئەگەر نێرداوەکەی بە ڕاست زانی. ئەمەش ڕایەکە لەهادەویەوە ئەگێردرێتەوە.

چوارەم: نابێت باوەڕ بکرێت بە نێرداوەکە بە ڕای هادەویە،چونکە ماڵی خەڵکی ترە.

**باسی پێنجەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: پێشەوای موسڵمان بۆی هەیە بۆ وەرگرتن و دابەشکردنی زەکات بە سەر هەژاراندا،کەسێك بکاتە بریکاری خۆی،وە نیشانەیەکیش دابنێت لەنێوان خۆی و بریکارەکەدا.

**باسی شەشەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: دانانی نیشانە لەنێوان کەسێك و بریکارەکەیدا،کە تەنها خۆیان بیزانن، شتێکی باشە. تاکو لەکاتی پارەداندا بریکارەکەپشتی پێ ببەستێت،چونکە نیشانە لە نوسین ئاسانترە،لەوانەیە یەکێکیان نوسین نەزانن،یان زۆر جار نوسینی دو کەس لێکدەچێت.

**الحَدِيثُ السَّادِسُ وَالسَّبْعونَ// عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : قُلْ الحَقَّ وَلَوْ كانَ مُرّاً...**

ئە بوذە ر ئەڵێت:پێغەمبەری خواپێی وتم: قسەی ڕاست بڵێ،با تاڵیش بێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** إبن حبان بەصحیحی داناوە، صحيح ابن حبان - كتاب البر والإحسان باب ما جاء في الطاعات وثوابها - ذكر الاستحباب للمرء أن يكون له من كل خير حظ رجاء ،حديث : ٣٦٢.[١]

**تەواوی فەرمودەکە//** ابوزەر ئەڵێت: خۆشەویستەکەم پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریکردم کە سەیری خوار خۆم بکەم،و سەیری سەروو خۆم نەکەم،وەهەژارانم خۆش بوێت،ونزیك بمەوە لێیان،خزمەکانم بەسەر

---

[١] ئەلبانی بە لاوازی داناوە. ضعيف الجامع (٢١٢٢).

بکەمەوە،ئەگەر ئەوان لێشم دابڕێن و لەگەڵمدا ساردبن،وە قسەی ڕاست بڵێم با تاڵیش بێت،بەرامبەر مافەکانی خوا لەلۆمەی لۆمەکاران نەترسم،وە هیچ شت لەکەس داوانەکەم،وە زۆر بڵێم:لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ،چونکە ئەوە خەزێنەی بەهەشتە[1].

**مانـــای وشــەکان//** الإِقْرَار: لەزمانەوانیدا: ئیسپاتکردن،لە زاراوەی شەرعیشدا: هەواڵ دانی مرۆڤە بەو مافانەی لە سەریەتی، پێچەوانەکەشی نکولیکردنە.

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکــەم/** فەرمودەی: (قُلْ الحَقَّ)،ڕاستی وتن دژی خۆی بێت،یا دژی کەسانیتر بێت،لەهەردوو ئایەتی:﴿كُونُوا شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الوَالِدانِ وَالأَقْرَبِينَ﴾ {النساء:١٣٥} ،واتە: بۆ ڕەزامەندی خودا شایەتی بدەن،با لەسەر خۆشتان یا دایك وباوکتان یا خزمەکانتان بێت.وە ئایەتی ﴿وَلَا تَقُولُوا عَلَى اللهِ إِلَّا الحَقَّ ﴾{النساء: ١٧١} واتە: دەربارەی خوای گەورە بە هەق نەبێت قسە مەکەن.وەرگیراوە.

**باســی دوەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیەکە: دانپیانانی مرۆڤ لە سەرخۆی لە هەموو کارێکیدا،وەرگیراوە.

**باســی سـێیەم/** فەرمان کردن لە فەرمودەکەدا بۆ هەموو حوکمەکانە،چونکە وتنی ڕاست لە سەر مرۆڤ خۆی ،واتە هەواڵدانە بەو مافانەی لە سەریەتی کە پێویستە خۆی لێ ڕزگار بکات،ماڵ بێت یا ماف جەستەیی یا ناموس.

**باســـی چـــوارەم/** فەرمودەی: (وَلَوْ كَانَ مُرّاً)، لەبابەتی چواندنە تَشْبِيهْ،چونکە لەوانەیە ڕاست وتن بەسەر دڵی مرۆڤەوە نارەحەت بێت،هەروەك چۆن تاڵی چەشتنی بەلاوە نارەحەتە.

---

[1] أَوْصانِي خَلِيلِي رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْ أَنْظُرَ إِلَى مَنْ هُوَ أَسفَل مِنِّي،وَلَا أَنْظُرَ إِلَى مَنْ هوَ فَوْقِي،وَأَنْ أُحبَّ المَساكِين،وَأَنْ أَدْنُوَ مِنْهُمْ،وَأَنْ أَصِلَ رَحِمِي وَإِنْ قَطَعُونِي وَجَفَونِي،وَأَنْ أَقولَ الحَقَّ وَلَوْ كانَ مُراً،وَأَنْ لا أَخافَ فِي اللهِ لَوْمَةَ لائِم،وَأَنْ لَا أَسْأَلَ أَحَداً شَيْئاً،وَأَنْ أَسْتَكْثِرَ مِنْ لا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِالله،فَإِنَّها مِنْ كُنوزِ الجَنَّةِ.

**الحَـديثُ ٧٧// عَـنْ سَمرَةَ بـن جنـدب رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ ،قـالَ: قـالَ رَسـولُ اللهِ صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: عَلَى اليَدِ مَا أخَذَتْ حَتّى تُؤَدِّيه..**

کەسـێك شـتێکی وەرگرتبێـت کەلـەژێر دەستیابێت،بەرپرسـیارەلێی تـا ئەیگێرێتەوە.

**گێرانـــەوەی فەرموودەکـــە//** احمد،چوارکەسـەکە،حاکم بەصـحیحی دانـاوە.

مـسند احمـد بـن حنبـل – أول مـسند البـصريين ومـن حـديث سمـرة بـن جندب – حديث : ١٩٦١٧.[1]

**مانـای وشـەکان// العَارِيَـةُ** واتـە: مـاف سود وەرگرتنـە لەکاڵایەکدا کـە موڵکی خۆت نەبێت.

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** پێویستە ئـەو شـتەی لـە کەسـانیتر وەری ئـەگریت و مـوڵکی خـۆت نیـە،بۆ خاوەنەکـەی بگێڕیتەوە،تـەنها بەگەڕانـەوەی بـۆ خاوەنەکـەی یا بریکارەکەی،لە بەرپرسیاری دەرئەچیت،بە بەڵگەی:

فەرمودەی: (**حَتّى تُؤَدِّيه** )،لە فەرموده باسلێکراوەکەدا.

**باسی دوەم/** فەرمودەکە گشتگیرە بۆ زەوتکردن و وەرگرتن و خواستن.

**باسـی سـێیەم/** دەربـارەی حـوکمی قەرەبوکرنـەوەی مـاڵی خواسـتراو،لە لایـەن ئەو کەسەی خواستویەتی،چەند ڕایەك هەیە:

یەکـەم: بـە تـەواوەتی بەرپرسـیارە بەرامبەری،ئەگـەر لـە ناوچـوو لـەژێر دەسـتیدا،ئەبێت قـەرەبوی بکاتـەوە، مەگـەر بـە شـێوەیەك بێـت کـە پرسـی کردبێـت. ئەمـەش ڕای إبـن عبـاس وزیـد بـن علـی و عطـاءو أحمـد وإسـحاق وشافعی،إبن حجر ئەڵێت: ڕای جمهوریشە،بە بەڵگەی:

أ.فەرموده باسلێکراوەکە.

---

[1] ئەلبانی بە لاوازی داناوە. الإرواء ( ١٥١٦ ).

بەڵام صەنعانی وەڵامیان ئەداتەوە کە: فەرمودەکە بە ڕاشکاوی ئەوەی تیا نیە،چونکە کەسی دەستپاکیش پێویستە شمەکی خەڵکی بگێڕێتەوە.

ب.ئایەتی:﴿إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلى أَهْلِهَا﴾ {النِّسَاء:٥٨}. واتە: خوای گەورە فەرمانتان پێ ئەکات کە ئەمانەتەکان بۆ خاوەنەکەی بگێڕنەوە.

وەڵام دراوەتەوە کە: دانەوەی ئەمانەت ئەوە ناگەیەنێت لە کاتی لەناوچونیدا قەرەبو بکرێتەوە.

**ج.فەرمودەی صفوان بن أمیە کە: پێغەمبەری خوا زرێیەکی لێخواستوە لەرۆژی حونەیندا،صفوان پێی ئەڵێت: بە زۆر لێم ئەسەنیت؟ فەرموی: نەخێر بەڵکو ماڵێکی خواستراوو لەئەستۆمدایە.**[1]

صەنعانی ئەڵێت: تەنها بەڵگە بۆ لە ئەستۆگرتنی خواستراو،فەرمودەی: عَارِيَة مَضْمُونَة یە،لە فەرمودەکەی صەفواندا،وەسف کردنی خواستراو بەوەی قەرەبو ئەکرێتەوەو لە ئەستۆدایە: یان سیفەتێکی ڕونکراوەیە،کە پێویستە لە ئەستۆدا بێت،یان سیفەتێکە بۆ بەستنەوەیەتی،ئەمەش مانا دیارەکەیە.

پاشان ڕوکەشەکەی وا دیارە مەبەست لێی ئەوەیە: ماڵێکە لەئەستۆماندایە، کەواتە بۆت قەرەبو ئەکەینەوە،یا وەکو وەعدێکە،بەڵام ئەم مانایە دورە،کەواتە فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە:ماڵی خواستراو لە ئەستۆدایە: یا خاوەنەکەی داوای بکات،یا کەسی دوەم بە خۆبەخشی بۆ ببژێرێت.

دوەم: ماڵی خواستراو،قەرەبوی نیە،مەگەر بەمەرج بگیرێت. بەڕای هادی والعترە والعنبری،بە بەڵگەی فەرمودەکەی پێشوی صەفوان.

سێیەم: ماڵی خواستراو،قەرەبوی نیە،ئەگەر بە مەرجیش بگیرێت.ئەمەش ڕای حسنی بصری وابو حنیفەو نخعی وأوزاعی وشریح،بە بەڵگەی:

---

[1] حَدِيثُ صَفْوَانَ بن أُمَيَّةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إسْتَعَارَ مِنْهُ دِرْعاً يَوْمَ حُنَيْنٍ،فَقَالَ:غَصْباً يا مُحَمَّدُ؟قَالَ:بَلْ عارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ. رَوَاهُ أَبو داود وَأَحْمَد وَالنَّسائي وَصَحَّحَهُ الحاكِمُ. السنن الكبرى للنسائي - كتاب العارية والوديعة، باب ذكر اختلاف شريك - حديث : ٥٦٠٨

فـەرمودەی: قەرەبوكردنـەوە لەسـەر ئـەو كەسـەنیە ماڵێـك ئـەخوازێت،یا لای دائەنرێت،مەگەر خیانەت لە ماڵەكە بكات.[1]

لـەكتێبی النِّهایَـة دا ئـەڵێت: المُغِـلّ : ئەگـەر خیانـەت لـە ماڵـە خواسـتراوو دانراوەكەدا نەكات،قەرەبوی لەسەر نیە.

**الحَـدیثُ ٧٨// عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ ،قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنْ ائْتَمَنَكَ،وَلاتَخُنْ مَنْ خانَكَ..**

ئەمانـەت بگێـڕەوە بـۆ كەسـێك كـە بـە دەسـتپاكی داناویت،خیانـەتیش لـە كەسێك مەكە كە خیانەتت لێ ئەكات.

__گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــــە//__ ترمـــذي،أبوداود بەحـــسنی دانـــاوە،حـــاكم بەصـحیحی دانـاوە. سـنن أبـي داود - كتـاب البيـوع، أبـواب الإجـارة - باب في الرجل يأخذ حقه من تحت يده حديث : ٣٠٨٤.[2]

__سەرباسەكان//__

__باسی یەكەم/__ ئەم فەرمودەیە ماڵی ئەمانەت وخواستراویش ئەگرێتەوە.

__باسی دوەم/__ گەڕانەوەی ئەمانەت فەرزە،بەبەڵگەی:

١.ئایەتی﴿إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ {النِّسَاء:٥٨}.

٢.فەرمودە باسلێكراوەكە.

__باسـی سـێیەم/__ مەبەسـت لـە فـەرمودەی : وَلَـا تَخُـنْ مَـنْ خَانَـكَ،ئەوەیـە: ناكرێـت كەسـی ناپـاك وەك كـرداره ناپاكیەكـەی خـۆی وەڵـام بدرێتـەوە.ئـەو ناپاكیە یاساغەش كە لە ئەمانەتدا ئەكرێت،بە فێڵ و بەپەنهانی ئەكرێت.

---

[1] لَيسَ عَلَى المُستَعِيرِ غَيرِالمُغلّ وَلَا عَلى المُستودعِ غَيرِ المُغلّ ضَمَانٌ.أخرَجَهُ الدّار قُطني والبَيْهَقي عنْ إبنِ عُمَر وَضَعّفاهُ،وَصَحّحَا وَقْفَهُ عَلَى شُرَيْح.

[2] ئەلبانی بە حسن صحیح ی داناوە. الإرواء (١٥٤٤).

**باســـی چـــوارەم/** دەربــارەی ســزادانەوەی ناپــاك بەوێنــەی ناپاكیەكــەی خۆی،چەند ڕایەك هەیە:

١.دروســتە،وەك كردارەكــەی ئــەو بێــت یــا بــە كردارێكــی تــر.ئەمــەش ڕای جمهور ودیارترین ڕای شافعیە،بەبەڵگەی:

ئایـــەتی﴿وَجَـــزَاءُ سَـــيِّئَةٍ سَـــيِّئَةٌ مِثْلُـــهَا﴾ {الـــشُّورى:٤٠}،ســـزای خراپە،خراپەیــەكی وەك خۆیــەتی. وە ئایــەتی﴿وَإِنْ عَــاقَبْتُمْ فَعَــاقِبُوا بِمِثْــلِ مَــا عُــوقِبْتُمْ بِــهِ﴾ {النَّحْــل:١٢٦} .ئەگــەر ســزاتان دا بەئەنــدازەی خــۆی ســزا بــدەن. وە ئایــەتی﴿فَمَــنْ إِعْتَــدَى عَلَــيْكُمْ فَاعْتَــدُوا عَلَيْــهِ بِمِثْــلِ مَااعْتَــدَى عَلَــيْكُمْ﴾{البَقَــرَة:١٩٤} ،كەســێك دەســتدرێژی كــردە ســەرتان،بە ئەنــدازەی كردارەكەی خۆی دەستدرێژی بكەنەوە سەر.

ئەم مانایانەش ئەدەنە فەرمودە باسلێكراوەكە.

٢.ئەگــەر هاوشــێوەی كردارەكــەی ئــەو بێــت دروســتە،ئەگەر نــا دروســت نیە.بەڕای حەنەفیەكان و المؤید،بە بەڵگەی:

ڕوكەشی ئایەتی ﴿بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ وە ئایەتی﴿مِثْلُهَا﴾.

٣.بە بڕیاری دادوەر نەبێت، دروست نیە حەقی لێبكرێتەوە،بە بەڵگەی:

أ.ڕوكەشی نَهْي لە فەرمودەكەدا.

ب.ئایــەتی: ﴿وَلَــا تَــأْكُلُوا أَمْــوالَكُمْ بَيْــنَكُمْ بِالبَاطِــلِ﴾ {البَقَــرَة:١٨٨} ،مــاڵی خۆتان لەناو خۆتان بە ناهەق مەخۆن.

وەڵــامی ئــەم رایــە دراوەتــەوە كــە: ئەمــە خــواردنی مــافی خــەڵك نیە،بــەڵكو وەرگرتنــەوەی مافــە. نهــی كــردن لــە فەرمودەكەشــدا بــۆ خــۆ پارێزكردنــە لێی.

٤.پێویــستە بــە ئەنــدازەی مافەكــەی خــۆی ببــات،وەك ماڵەكــەی خــۆی بێــت یــا شــێوەیەكیتر،ماڵەكە بفرۆشــێت ومــافی خــۆی لێهەڵبگرێت،ئــەوەی زیــاد بــوو بیگێڕێتــەوە بــۆ خاوەنەكــەی یــا میراتبەرەكانی،ئەگــەر كــەمیش بوو،لەئەســتۆی ئــەو كەســەدا ئەمێنێتــەوە. ئەگــەر وا نــەكات (زیــاد لــەمافی

خۆی هەڵبگرێت)،لای خوا گوناهبار ئەبێت،مەگەر گەردنی ئازاد بکات،لەو کاتەشدا لای خوا پاداشتی ئەبێت.

ئەگەر مافی لای کەسێك بوو،بەڵام بەڵگەی پێ نەبوو،ماڵێکی کابرای دەستکەوت،بۆی هەیە بیبات.ئەگەر داوای لێکرا نکولی لێبکات،ئەگەر سوێندیش درا با سوێند بخوات،پاداشتی ئەگات.

إبن حزم ئەڵێت: ئەمە ڕای شافعی وابوسلیمان و هاوەڵەکانیانە. هەروەها ئەڵێت: هەروەها هەر کەسێك پارەی ستەمکارێك ببات،فەرزە لەسەری نەیداتەوەو بیداتە ستەملێکراوان.بۆ ڕایەکەشی ئەم بەڵگانە ئەهێنێتەوە:

١.ئایەتی:﴿وَلَمَنْ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبيل﴾{الشُّوْرَى:٤١} ،واتە: کەسێك دوای ئەوەی ستەمی لێکرا،حەقی خۆی سەند،لۆمەی لەسەر نیە.

٢.ئایەتی:﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُم البَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ﴾{الشُّوْرَى:٣٩}،واتە: ئەوانەی دەستدرێژیان کراوەتەسەر خۆیان هەقی خۆیان ئەستێنن.

٣.ئایەتی: ﴿وَالحُرُمَاتُ قِصَاصٌ﴾{البَقَرَة:١٩٤} ،واتە: شکاندنی پیرۆزیەکان،تۆڵەی هەیە.

٤.ئایەتی:﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾{البَقَرَة:١٩٤}.

٥.ئایەتی:﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلها﴾{الشّورى:٤٠}.

٦.ئایەتی:﴿وَإِنْ عاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ ما عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾{النَّحْل:١٢٦}.

٧.پێغەمبەری خوا بە هیندی هاوسەری أبوسفیان ئەفەرموێت: بە ئەندازەی پێویستی خۆت ومنداڵەکەتی ببە.کاتێك هیند وتی: أبوسفیان

کەسێکی چروکەو،ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆم ومناڵەکانم بکات، گوناهبار ئەبم ئەگەر لە ماڵەکەی هیچ ببەم؟[1]

٨.فەرمودەی: ئەگەر بونە میوانی کۆمەڵێك و ئەوانیش هەستان بە ئەرکی میوانداری لێیان قبولێ بکەن،ئەگەر نا ماڧ میوانیان لێبسەنن.[2]

ئەگەر وانەکات گوناهبار ئەبێت: إبن حزم ئەم ئایەتەش ئەکاتە بەڵگە:﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى البِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الاثْمِ وَالعُدْوَانِ﴾{المائِدَة:٢}.واتە: لەسەر چاکەو تەقوا یارمەتی یەکتر بدەن،وە لەسەر خراپەو دەستدرێژیکردن ،یارمەتی یەکتری مەدەن.

إبن حزم ئەڵێت: کەسێك بە بڕی ماڵەکەی خۆی کە لێی زەوتکرابوو،یا ماڵی زەوتکراوی موسڵمانێك یا زیمیەك دەستکەوێت،وماڵەکە بۆ ستەملێکراوەکە نەگێڕێتەوە،خۆیشی بە ستەمکار ئەژمێردرێت: چونکە یارمەتیدەر نەبوە لەسەر خێرو چاکە،بەڵکو یارمەتی گوناهو دەستدرێژی داوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا فەرمانی داوە: کەسێك لە ئێوە خراپەکەیەکی بینی،با تا ئەتوانێت بە دەست بیگۆڕێت.[3]

کەواتە کەسێك توانای لابردنی ستەمی هەبێت و بتوانێت ماف بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە،بەڵام نەیکرد،ئەوە توانیویەتی خراپەیەك لاببات،بەڵام لاینەبردوە،بەوەش لەخواو پێغەمبەری خوا یاخیبوە.

پاشان إبن حزم وەڵامی فەرمودەکەی أبوهریرە ئەداتەوە کە: فەرمودەیەکی لاوازە،چونکە طلق بن غنام لە شریك وقیس بن الربیع ئەیگێڕێتەوە.

---

[1] قَوْلُهُ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِهِنْد إمْرَأَة أَبِي سُفْيان:خُذِي مَا يَكْفِيك وَوَلَدَك بِالمَعْرُوف.لمَّا ذَكَرَتْ لَهُ:أَنَّ أَبا سُفْيانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ،وَأَنَّهُ لا يُعْطِينِي ما يَكْفِينِي وَبَنِي، فَهَلْ عَلَيَّ مِنْ جُنَاحِ أَنْ آخُذَ مِنْ مالِه شَيْئاً.

[2] إنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا،وَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ. صحيح البخاري - كتاب المظالم والغصب ،باب قصاص المظلوم إذا وجد مال ظالمه - حديث : ٢٣٤٩

[3] مَنْ رَأى مِنْكُمْ مُنْكَراً أَنْ يُغَيِّرَهُ بِيَدِه إنْ إسْتَطاعَ.

هەروەها ئەڵێت: ئەگەر ڕاستیش بێت،ناکرێتە بەڵگە،چونکە مرۆڤ مافی خۆی وەربگرێتەوە بە ناپاك دانانرێت،بەڵکو ماف وئەرکی سەرشانیشیەتی کە حەق جێبەجێبکات وخراپە لاببات،ناپاکی ئەوەیە کە بەستەم وناهەقی مافی خەڵکی بخوات.

صەنعانیش پشتگیری ڕای إبن حزم ئەکات،بە فەرمودەی: پشتی براکەت بگرە ستەمکاربێت یا ستەملێکراوو.[1]

فەرمانکردن تیایدا دیارە کە بۆ فەرزبونە،سەرخستنی ستەمکاریش بەوە ئەبێت کە لەستەمکردن دەریبکەیت،بە لێسەندنەوەی ئەو مافانەی کەزەوتی کردوە.

**الحديث ٧٩// عن سعيد بن زيد رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ،أن رسول الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قال: من إقتطع شبرا من الأرض ظلما طوقه الله يوم القيامة إياه من سبع أرضين..**

کەسێك بستێك زەوی بەستەم ببات بۆ خۆی،خوای گەورە لەقیامەتدا لەحەوت چین زەویدا،ئەوبستەی ئەخاتەوە مل.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە// صحيح البخاري - كتاب بدء الخلق باب ما جاء في سبع أرضين - حديث : ٣٠٤١ . صحيح مسلم - كتاب المساقاة باب تحريم الظلم وغصب الأرض وغيرها - حديث : ٣١٠٥

سەرباسەکان//

باسی یەکەم/ دەربارەی مانای التَّطْوِيقْ چەند ڕایەك هەیە:

١.سزائەدرێت بەڕۆچون بەناو حەوت چینی زەویدا،لەو کاتەدا هەر چینێك،تەوقێکە لە گەردنی،بە بەڵگەی فەرمودەی إبن عمر: لە قیامەتدا تا حەوت چینی زەوی ڕۆئەچێت..[1]

---

[1] أنصُرْ أخاكَ ظالماً أوْ مَظلوماً. صحيح البخاري - كتاب المظالم والغصب، باب : أعن أخاك ظالما أو مظلوما - حديث : ٢٣٣١

٢.لەقیامەتـــدا داوای لێئـــەکرێت ئـــەو زەویـــەی کـــە زەوتـــی کردوە،بیگوازێتـــەوە بـــۆ مەحـــشەر،ئەوەش وەك تەوقێکـــە لـــە گەردنیدا،نـــەك بەڕاستی تەوق بکرێتە گەردنی،بە بەڵگەی:

أ.هـــەر کەســـێك بەئەنـــدازەی بـــستێك زەوی داگیربکـــات،خوای گـــەورە داوای لێئـــەکات تـــا حـــەوت چـین زەویەکـــە هەڵکـــەنێت ،پاشـــان ئەکرێتـــە ملـــی تـــا ئـــەو کاتەی دادوەری لەناو خەڵکدا ئەکرێت.[٢]

ب.فـــــەرمودەی: کەســـــێك زەویـــــەك بەبێحـــــەق داگیربکـــــات،داوای لێئەکرێت،خۆڵەکەی بۆ مەحشەر بگوازێتەوە.[٣]

٣.داوای لێئەکرێت بیکات بە تەوق،کەناتوانێت،لەبەر ئەوە سزا ئەدرێت.

٤.تەوقکردنـــە واتـــە گوناهـــەو لەگەردنیدایە،ئـــەو ســـتەمە تاوانێکـــەو لەگەردنیدایـــە لێی نابێتەوە،خوای گەورە ئەفەرموێت:﴿أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾ {الإسرَاء:١٣}.

<u>باســـی دوەم/</u> فەرمودەکـــە بەڵگەیـــە لەســـەر: حـــەرامبونی ســـتەم وزەوتکـــردن.وە توندی سزاکەش.

<u>باســـی ســـێیەم/</u> فەرمودەکـــە بەڵگەیـــە لەســـەر ئـــەوەی کـــە: زەویـــش زەوت ئەکرێت،وە لە گوناهە گەورەکانە.

<u>باسی چوارەم/</u> فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر:

١.کەســـێك خـــاوەنی زەویـــەك بێت،خـــاوەنی ژێـــر زەویەکەشـــە،بۆی هەیـــە ڕێگری بکات لە کەسێك بیەوێت بیر یا تونێل لەژێریا هەڵکەنێت.

---

[١] خُسِفَ بِهِ يَوْم الْقِيامَةِ إلى سَبْعِ أَرَضِينَ. رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالبُخَارِي. البخاري ،كتاب المظالم والغصب باب إثم من ظلم شيئا من الأرض – حديث : ٢٣٤٠

[٢] أَيُّمَا رَجُلٍ ظَلَمَ شِبْراً مِنَ الأَرْضِ كَلَّفَهُ اللهُ أَنْ يَحْفِرَهُ حَتَّى يَبْلُغَ سَبْعَ أَرَضِينَ،ثُمَّ يُطَوَّقَه حَتَّى يُقْضَي بَيْنَ النَّاسِ.الطَّبَرَاني وَابْنُ حِبَّان. المعجم الكبير للطبراني – باب الياء من اسمه يعلى – أيمن بن ثابت أبو ثابت حديث : ١٨٥٢٠

[٣] مَنْ أَخَذَ أَرْضاً بِغَيْرِ حَقِّهَا كُلِّفَ أَنْ يَحْمِلَ تُرابَهَا إِلَى الْمَحْشَرِ. الطَّبَرَاني وَأَحْمَدَ. المعجم الكبير للطبراني – باب الياء من اسمه يعلى – أيمن بن ثابت أبو ثابت حديث : ١٨٥١٨

٢.کەسێك زەویەکی هەبێت،هەرچی لەژێر زەویەکەدایە لە بەردوو بیناو کانزا موڵکی ئەوە.

٣.کەسێك خاوەنی زەویەك بێت،بۆی هەیە تا ئەتوانێت زەویەکە هەڵکەنێت،بەمەرجێك زیان بەدراوسێکانی نەگەیەنێت.

٤.حەوت چینی زەویەکە لەسەریەکن،وجیاناکرێنەوە،چونکە گەر وانەبونایە،کەسی زەوتکەر تەنها ئەو بەشەی ئەکرایە ملی کە زەوتی کردوە نەك هەموو چینەکانی.

**باسی پێنجەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە: ئەگەر زەوی دەستی بەسەردا گیرا،بە زەوتکراو دائەنرێت.

**باسی شەشەم/** دەربارەی قەرەبوکردنەوەی ئەو زەویەی دوای زەوتکردن لەکار کەوتوە،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: قەرەبوناکرێتەوە،چونکە تەنها ئەوە قەرەبوئەکرێتەوە کە وەربگیرێت،زەویش شتێك نیە وەربگیرێت.پێغەمبەری خواش ئەفەرموێت: عَلَى اليَدِ ما أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِيه.[1]

**الحديث ٨٠// عنْ رافع بنِ خديجٍ رَضيَ اللّهُ عَنْهُ قالَ: قالَ رسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ : مَنْ زَرَعَ في أرْضِ قَوْمٍ بِغَيرِ إذْنِهِمْ،فَلَيسَ لَهُ مِنَ الزَّرْعِ شيءٌ،وَلَهُ نَفَقَتُهُ.** .

کەسێك بێپرس لەزەوی خەڵکی تردا بچێنێت،هیچ لەزەویەکەی پێنابڕێت،بەڵام خزمەتکردنی زەویەکەی بۆ ئەگێڕدرێتەوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** أحمد،چوارکەسەکە جگە لەنسائی،ترمذي بەحسنی داناوە. سنن أبي داود - كتاب البيوع باب في زرع الأرض بغير إذن صاحبها - حديث : ٢٩٧١.[1]

---

[1] لەفەرمودەی ژمارە ٧٧دا ماناکەی لێکدراوەتەوە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی مەبەست لە فەرمودەی :وَلَهُ نَفَقَتُهُ،دوو ڕا هەیە:

١.ئەو ماڵەیە کە مرۆڤی زەوتکەر لە کشتوکاڵەکەدا بۆ کێڵان وئاودان وپارەی تۆو شتی تر سەرفی ئەکات.ئەوەش مانا دیارەکەیە.

٢.وتراوە: واتە نرخی بەروبومەکە،چەندە،ئەدرێتە خاوەنەکەی.

**باسی دووەم/** دەربارەی خاوەنداریتی بەروبومی زەویەك کە زەوتکرابێت،شەرعزانان دوو ڕایان هەیە:

یەکەم: کەسێك زەویەك داگیربکات وبیچێنێت،نابێتە خاوەنی بەروبومەکەی،بەڵکو بۆ خاوەنی زەویەکەیە،چەندی تیا سەرف کردوە لە تۆو وە شتیتر،خاوەن زەویەکە ئەیداتەوە.ئەمەش ڕای احمد بن حنبل وإسحاق ومالك و...بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.فەرمودەی: ستەمکار مافی لە ماڵی زەوتکراودا نیە[2] . مەبەستیش لە ستەمکار کەسێکە لەزەوی کەسێکی تردا ئەچێنێت یا ئەکێڵێت یا بینا دروست ئەکات یا هەڵئەکەنێت،بێ ئەوەی هەقی لەزەویەکەدا هەبێت یا گومانیش هەبێت لەوەی هەقی هەیە تیایدا.

ج.پێغەمبەری خوا زەرعاتێکی لەزەویەکی ڤهیر ناوێکدا بینی وپێی جوانبوو،فەرموی: زەویەکەی ڤهیر چەند جوانە،وتیان: زەرعاتەکە هی

---

[1] ئەلبانی بە صەحیحی داناوە. الإرواء (١٥١٩).

[2] لَيسَ لِعرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌ.أبوداود بە إسنادێکی حسن گێڕاویەتەوە،لە عروە بن الزبیر. سنن أبي داود - كتاب الخراج والإمارة والفيء
باب في إحياء الموات - حديث : ٢٦٨٧

ظهـیر نیـەو هـی کەسـێکی تـرە (واتـە لێـی زەوتکـردوە).فـەرموی: کەواتـە زەرعاتەکەی خۆتان بۆ خۆتان وەمەسروفەکەی بۆ بگێڕنەوە.[1]

دوەم: زەرعاتەکـە بـۆ ئـەو کەسـەیە زەوتـی کردو،.بـەڵام کرێـی زەویەکـە ئەدات،ئەوەی ڕای شافعی زۆربەی زانایانە،بە بەڵگەی:

ا.فەرمودەی: بەروبوم بۆ ئەو کەسەیە بیچنێت،با زەوتیشی کردبێت.[2]

وەڵـامی دراوەتـەوە کـە: ئـەم فەرمودەیـە کـەس نەیگێڕاوەتـەوە،خاوەنی کتێبی المنار ئەڵێت: زۆری بۆ گەڕاوەم،نەمدۆزیوەتەوە.

ب.فەرمودەی: ستەمکار ماف لەو ماڵەدا نیە کە زەوتی کردوە.

وەڵـام ئەدریتـەوە کـە: بـڕینی بەسـەر ئـەم مانایـەی ڕای دوەمدا،پێـچەوانەی ڕوکەشـی فەرمودەکەیـە.چـۆن پێغەمبـەری خـوا بـە سـتەمکاری ناوئەبات،وبەناهەق ناوی ئەبات،ئێمەش چۆن بیکەینە خاوەن هەق.

کەواتە: ئەم فەرمودەیە زیاتر بەڵگەیە بۆ ڕای یەکەم.

---

[1] أنّ النّبيّ صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ رَأى زَرْعاً في أرْض ظُهَيْر فَأعْجَبَهُ،فَقالَ: ما أحْسَنَ زَرْعَ ظُهَيْر؟ فَقالوا:لَيْسَ لظُهَيْر وَلَكنّهُ لفُلان،قالَ: فَخُذوا زَرْعَكُمْ وَرُدّوا عَلَيْه نَفَقَتَهُ. أحمد وأبوداود وطَبراني گێڕاویانەتەوە. سنن أبي داود - كتاب البيوع باب في التشديد في ذلك - حديث : ٢٩٦٧

[2] الزّرْعُ للزّارِعِ وَإنْ كانَ غاصباً.

**الحَديث ٨١// عَنْ جابِرِ بنِ عَبْدالله رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: قَضَى رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بِالشُّفْعَةِ في كُلِّ ما لَمْ يُقْسَمْ،فَإذا وَقَعَتْ الحُدودُ وَصُرِّفَتْ الطُّرُقُ فَلا شُفْعَةَ.**

**پێغەمبەری خوا بڕیاری مافی هەڵگرتنەوەی لەهەموو ماڵێکدا کە :بەشنەکرێت،ئەگەر سنور جیابوو،ڕێگا هەبوو لەنێواندا،ئەو مافە نامێنێت.**

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب البيوع ،باب بيع الشريك من شريكه - حديث : ٢١٢٢ .لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا هاتوە: هەڵگرتنەوە لە هەموو ماڵێکی شەراکەتدایە:زەوی بێت یا خانوو یا بێستان.لەڕیوایەتێکی تردا: بۆی نیە بیفرۆشێت،تا شەریکەکەی ئاگادار نەکاتەوە.لەڕیوایەتی طَحاویشدا هاتوە: پێغەمبەری خوا هەڵگرتنەوەی بۆ هەموو ماڵێك داناوە.[1]

**مانای وشەکان//** الشُّفْعَة واتە کۆکردنەوە،لەزمانی عەرەبیدا بۆ سێ مانا دێت:

١.جوت یا دوانە ٢.زیادکردن ٣.یارمەتیدان.

لەشەرعیشدا واتە: گواستنەوەی بەشێك بۆ سەر بەشێکی تر،بە هۆکارێکی شەرعی،وەك ئەوەی بۆ کەسێکی بێگانە بگوازرێتەوە،بەرامبەر بڕێك پارە.صُرِّفَتْ الطُّرُقْ ڕێگاکان جیاکرانەوە، شِرْكْ بەشدار، رَبْعْ خانوو یازەوی.

**سەرباسەکان//**

---

[1] وفي رواية مُسلم: الشُّفْعَةُ في كُلِّ شِرْكٍ في أَرْضٍ أَوْ رَبْعٍ أَوْ حائِطٍ لايَصلُحْ.وَفي لَفظ:لَا يَحِلُّ لَهَ أَنْ يَبيعَ حَتّى يَعْرِضَ عَلى شَريكِه. صحيح مسلم - كتاب المساقاة ،باب الشفعة - حديث : ٣١٠٢..وَفي رِوايَةِ الطّحاوي: قَضَى النَّبِيُّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بِالشُّفْعَةِ في كُلِّ شَيْءٍ. شرح معاني الآثار للطحاوي - كتاب الشفعة باب الشفعة بالجوار - حديث : ٣٩٦٤

**باسی یەکەم/** وشەکانی ئەم فەرمودەیە بەڵگەن لەسەرئەوەی: بەشداربوو،ماڧ هەڵگرتنەوەی هەیە لەخانوو بیناو بێستاندا.

**باسی دووەم/** شەرعزانەکان دەربارەی ئەوماڵەی دابەشئەکرێت وئەوەی دابەش ناکرێت،کە هەڵگرتنەوەی تیایە،بەم شێوەیە دواون:

یەکەم: ئەو ماڵەی بەش ئەکرێت: کۆدەنگن لەوەدا کە ماڧ هەڵگرتنەوە بۆ بەشداربوو هەیە.

دوەم: ئەو ماڵەی بەش ناکرێت وەك حەمامێکی بچوك و...چەند ڕایەکیان دەربارەی هەیە:

یەکەم: هەڵگرتنەوە لە هەموو ماڵێکدا هەیە،بەڕای هادویەوالعترةو حەنەفیەکان،وەك لە کتێبی البحردا هاتوە.بە بەڵگەی فەرمودەی طَحاوي:الشُفْعَةُ فِي كَلِّ شَيْءٍ.وەڵام دراوەتەوە کە ئەم فەرمودەیە مرفوع نیە(قسەی پێغەمبەر نیە).

بەڵام وەڵامی ئەمانیش ئەوەیە کە: فەرمودەکە مرسلی إبن عباسە،ئەگەر مرسلی یەکێك لە هاوەڵان،سەنەدەکەی ڕاست بوو،بەڵگەیە.

دوەم: هەڵگرتنەوە لەکێشانەو پێوانەدا نیە،بەڕای منصور،بە بەڵگەی ئەوەی کە: ئەمانە هیچ زەرەر ناگەیەنن.

وەڵامیان دراوەتەوە کە:

١.زەرەرەکەی ئەوەیە کە ماڧ دراوسێ پێشیل ئەکات.٢.کێ ئەڵێت هۆی هەڵگرتنەوە زەرەرەکەیە.

سێیەم: هەڵگرتنەوە لە ماڵی گوازراودا نیە،بەڕای زۆرینە،بە بەڵگەی:

١.فەرمودەی: فَإِذا وَقَعَتْ الحُدودُ وَصُرِّفَتْ الطُرُقُ فَلَا شُفْعَةَ.ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەتەنها لە ماڵی عەقاردا هەیە،کە خانوش ئەگرێتەوە،وەك پێغەمبەری خوا فەرمویەتی:أَوْرَبْعٍ.

٢.زەرەر لە ماڵی گواستراودا دەگمەنە.وەڵام دراوەتەوە کە: باسکردنی حوکمی بەشێك لە زۆرێك،حوکمەکە بە بەشەکەوە تایبەت ناکات.

٣.بەزار فەرمودەیەك لە جابر ئەگێڕێتەوە: هەڵگرتنەوە تەنها لە زەوی و بێستاندایە،بەیهەقیش ئەیگێڕێتەوە: هەڵگرتنەوە تەنها لە خانوو لە عەقاردایە.[1]

وەڵامدراوەتەوەکە: تێگەیشتن لەو دوو فەرمودەیە ڕووبەرووی فەرمودەی: فِي كُلِّ شَيْءٍ،ناوەستێت.

چــوارەم: لەماڵی گوازراوەدا،پۆشاك مافی هەڵگرتنەوەی تێدا نیە،هەندێکیش ئەڵێن: هەڵگرتنەوەی تیا دروستە.

پێنجەم: لەئاژەڵدا مافی هەڵگرتنەوە نیە،احمد ئەڵێت: ئەمیش هەڵگرتنەوە دروستە تیایدا.

<u>باسی سێیەم/</u> دەربارەی فرۆشتنی بەشدار بوو بۆ بەشەکەی خۆی،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بۆی نیە بەشەکەی خۆی بفرۆشێت،تا هاوەڵەکەی ئاگادارنەکاتەوە،بە بەڵگەی فەرمودەی موسلیم.

دوەم: باش نیە بیفرۆشێت بێ ئاگادارکردنەوەی،فەرمودەکەی موسلیمیش بۆ کەراهەتە.

وەڵام دراوەتەوە کە: نَهيٌ لە فەرمودەکەدا ئەگەر بۆ کەراهەت بێت،پێچەوانەی بناغەی نهیە بەبێ بەڵگە،کە بۆ حەرامبونە.

<u>باسی چوارەم/</u> ئایا ئەگەر بەشدار بوو هاوەڵەکەی ئاگادار کردەوە،پاشان فرۆشتی بەکەسێکی تر،هاوەڵەکەی مافی هەڵگرتنەوەی ئەمێنێت؟ دوو ڕا هەیە:

یەکەم: دوای ئەوەی پێی وترا،مافی هەڵگرتنەوەی نامێنێت،بەڕای الثوري وحكم وابی عبید و ڕوایەتێکی احمد وکۆمەڵێك لە زانایانی

---

[1] وَلَا شُفْعَةَ إِلَّا فِي رَبْعٍ أَوْ عَقَارٍ..وَلَا شُفْعَةَ إِلَّا فِي دارٍ أَوْ عَقَارٍ.قَالَ الْبَيْهَقِي:الإِسْنَادُ ضَعِيفٌ.
السنن الكبرى للبيهقي - كتاب الشفعة
باب لا شفعة فيما ينقل ويحول - حديث : ١٠٨٢٠

فـەرمودە. صـەنعانیش لـە کتێبـی حواشـي ضـوء النهـاردا بـە دروسـتی داناوە.بە بەڵگەی:

١.مـەفهومی مـەرجگرتن لـە فەرمودەکـەدا: فَـإِنْ باعَـهُ وَلَـمْ يُؤْذِنْـهُ : جـابر ئـەڵێت: پێغەمبـەری خـوا هەڵگرتنـەوەی بـۆ هـەموو مـاڵێکی شـەراکەت کەبـەش نـەکرێت،داناوە: زەوی بێـت یـا بێـستان،بۆی نیـە بیفرۆشـێت، تـا شـەریکەکەی مۆڵـەتی نەدات،ئەگـەر ئـارەزوی لێبـوو هەڵیئەگرێتەوە،ئەگـەر نـا وازیلێئەهێنێت،ئەگـەر فرۆشتیـشی وپرسـی پێنەکرد،ئـەوە شـەریکەکەی لەپێشترە بە ماڵەکە.[1]

مـەفهومی مەرجـدانان لـە فەرمودەکـەدا ئـەوە ئەگەیـەنێت کـە: ئەگـەر فرۆشـیار مۆڵـەتی لـە شـەریکەکەی وەرگـرت،دوای ئـەوە شـەریکەکە مـافی هەڵگرتنەوەی نامێنێت.

٢.ئەم مانایە زیاتر لەگەڵ مانای فەرمودەکەدا ئەگونجێت.

دوەم: مافەکـەی هـەر ئەمێنێت،هەرچـەند کـاتێکی زۆریـشی بەسـەردا بـچێت،ئەمەش رای زۆرینەیـە: مالـك وشـافعي وابوحنیفەوهادویـەو.....بـە بەڵگەی:

مـەفهومی مەرجـدانان ناتوانێـت ڕوبـەروی ئـەو فەرمودانـە بێتـەوە کـە بـە ڕاشـکاوی باسـی مـافی هەڵگرتنـەوەی شـەریك ودراوسـێ ئەکـەن،بیَ بەستنەوەی.

وەڵامدراوەتـەوە کـە: ئـەگونجێت ئـەم مەفهومـە فـەرمودەکان ببەسـتێتەوە،لای ئـەو کەسـانەی ئـیش بـەو مەفهومـە ئەکـەن،کاتێك پـەنا ئەبرێتـە بـەر تەرجیح،کـە نـەتوانرێت فـەرمودەکان یـەکبخرێن.بـەڵام لێـرەدا بواری یەکخستن هەیە ئەگەر ڕەهایی فەرمودەکان ببەسترێنەوە..

---

[1] أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شِرْكَةٍ لَمْ تُقْسَمْ رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ،لَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ،فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ.فَإِنْ بَاعَهُ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ. رَوَاهُ مُسْلِم وَالنَّسَائِي.

**باسی پێنجەم/** فەرمودەی: أَنْ يَبِيعَ، وا ئەگەیەنێت کە: هەڵگرتنەوە لەماڵێکدایە کە بفرۆشرێت،ئەمەش کۆدەنگی لەسەرە.

**باسی شەشەم/** دەربارەی هەڵگرتنەوەی لەماڵێکدا بە کریَ بدرێت،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: دروستە،بە بەڵگەی:.

١.فەرمودەی: فِي كُلِّ شَيْءٍ، هەڵگرتنەوە لەبەکرێدانیش لەخۆ ئەگرێت.

٢.چونکە هۆکاری هەڵگرتنەوە لە بەکرێدانیشدا هەیە.

دوەم: دروست نیە،بەڕای الهادویە،بە بەڵگەی: هەڵگرتنەوە لەخودی کاڵاکەدایە نەك سودەکانی.

بەڵام ئەم ڕایە بە لاواز دائەنرێت،چونکە:

١.سود بە (شَيْءٍ) ناو ئەبرێت،شەریکایەتیشی تیا ئەکرێت،فەرمودەی: (فِي شِرْكٍ)،ئەیگرێتەوە.چونکە ئەگەرشت نەبێت و هاوبەش نەبێت،بە کرێدان و دابەشکردنی تیا دروست نەئەبوو.

٢.بەکرێدان فرۆشتنێکی تایبەتە،فەرمودەی: لَايَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ، ئەیگرێتەوە.ئەبێت ماف هەڵگرتنەوەی تیا بێت،چونکە بەڵگەکە ئەیگرێتەوە،و هۆکاری دانانی ماف هەڵگرتنەوە،لەئەمیشدا هەیە.

**باسی حەوتەم/** ڕوکەشی فەرمودەی: فِي كُلِّ شِرْكٍ،ئەوە ئەگەیەنێت کە: ئەم مافە بۆ ئەهلی کتابیشە، ئەگەر لە گەڵ موسڵماندا شەریك بون لە موڵکێکدا،جیاوازی ڕاش هەیە لێرەدا.

ڕای دروستتر ئەوەیە کە: ئەگەر لە دورگەی عەرەبیدا نەبون ئەو مافەیان هەیە،ئەگەرنا مافیان نیە.

**الحَديثُ ٨٢// قَالَ أبورافع للمِسْوَرِ بنِ مَخْرَمَةَ: لَا تَأمُرُ هَذَا-يُشِيرُ إلى سَعْد-أنْ يَشْتَري منِّي بَيْتَيَّ اللَّذَيْنِ في دارِهِ. فَقَالَ لَهُ سَعْد: وَالله لا أزِيدُكَ عَلى أرْبَعمائَة دينار مُقَطَّعَة أومُنَجَّمَة. فَقَالَ أبو رافع: سُبْحانَ الله، لَقَدْ مَنَعْتُهُمَا مِنْ خَمْسمائَة نَقْداً. فَلَوْلا سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقولُ: الجارُ أحَقُّ بِصَقَبِهِ، مابِعْتُكَ...**

ابورافع بە مسورەی وت: بۆچی فەرمان بەوە-واتەسەعد-ناكەیت،ئەم دوو خانوەم لێبكڕێت،سەعدیش پێی وت: سوێند بەخوا چوارسەد دینارت زیاتر نادەمێ،بە یەكەوە یا بەچەند جارێك.ابورافعیش وتی: سوێند بە خوا بەپێنجسەد دینارم نەفرۆشتوە،ئەگەر لەپێغەمبەرم نەبیستایە كە ئەیفەرموو: دراوسێ لەپێشترە بەدراوسێكەی،پێم نەئەفرۆشتی.

گێڕەرەوەی فەرمودەكە// صحيح البخاري - كتاب الحيل باب في الهبة والشفعة - حديث : ٦٥٩٣

سەرباسەكان//

باسی یەكەم/ هەرچەندە ابو رافع ئەم فەرمودەیەی لە فرۆشتندا باسكردوە،بەڵام هەڵگرتنەوەش ئەگرێتەوە.

باسی دوەم/ دەربارەی بونی ئەم مافە بۆ دراوسێ، دوو ڕا هەیە:

یەكەم: دراوسێش ئەم مافەی هەیە،بەڕای هادوية وحنفية وعترةو ثوري وإبن أبي ليلى وإبن سيرين،بە بەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێكراوەكە.

٢.فەرمودەی انس،كە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: دراوسێ ی خانوو بە خانوەكە لە پێشترە.[1]

---

[1] جَارُ الدَّارِ أحَقُّ بِالدَّارِ.رَواهُ النَّسائي وَصَحَّحَهُ إبنُ حِبَّان.

٣.فـەرمودەی شـەریدی کـوڕی سـوید،کە ئـەڵێت:وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا: زەویـەکم هەیەکـەس بەشـدارو هاوبەشـم نیـە تیایدا،تـەنها دراوسـێم هەیە.فەرموی: دراوسێ بە زەویەکەت لەپێشترە.[1]

٤.فـەرمودەی جـابر کـە ئـەڵێت:پێغەمبـەری خـوا فـەرموی: دراوسـێ بـەخانوی دراوسـێکەی لەپێـشترە،ئەگەر لـەوێش نـەبوو، چـاوەڕێ ئەکات،مادام یەك ڕێگای هاتوچۆیان هەیە.[2]

دوەم: دراوسـێ مـافی هەڵگرتنـەوەی نیە،بـەڕای عمـر وعوسمـان وعلـی وشافعی ومالك و...ئەڵێن:

١.دراوسـێ لـە فەرمودەکانـدا بـە مانـای: شـەریکێك دێـت کـە لەگـەڵ شـەریکەکەیدا ماڵەکـەیان تێکـەڵ بێـت.بـە بەڵگـەی فـەرمودەی أبـو رافع،کەئـەو مانایـەی سـەرەوەی بـۆ دراوسـێ بەکارهێناوە،فەرمودەکەشـی کردوەتە بەڵگە،ئەویش شارەزاترە بە زمان و مەبەستی فەرمودە.

وەڵـام دراوەتـەوە کـە: أبـو رافـع شـەریکی سـەعد نەبوە،بـەڵکو دراوسـێی بوە،چـونکە دوو ژوری لـە خانوەکـەی سـەعدا هەبوە،نـەك لایـەکی سەربەخۆی هەبێت لە خانوەکەی سەعدا.

٢.هـەروەها فـەرمودەکانی پێـشوش ئەکەنـە بەڵگە،کـە باسـی مـافی هەڵگرتنەوە بۆ شەریك ئەکەن.

وەڵامدراوەتـەوە کـە: ئـەو فەرمودانـە تـەنها باسـی مـافی شـەریك ئەکـەن بـۆ هەڵگرتنەوە،بـەبێ ئـەوەی بەڕاشـکاوی یـا بەهـەر شـێوەیەکی تـر باسـی دراوسێ بکەن.

---

[1] قُلْتُ:يارَسولَ الله:أَرْضٌ لي لَيْسَ لِأَحَدٍ فيها شِرْكٌ وَلا قَسْمٌ إلاَّ الجِوار.قال:الجارُ أَحَقُّ بِصَقْبِه.أخْرَجَهُ إبْنُ سَعْد.

[2] الجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جارِه،يَنْتَظِرُ بِهَا وَإنْ كانَ غائِباً إذا كانَ طَرِيقُهُما واحِداً.رَواهُ أَحْمَدوَالأَرْبَعَة وَرِجالُهُ ثِقاتٌ.

٣.فـەرمودەی: فَـإِذَا وَقَعَـتِ الحُـدُودُ وَصُـرِّفَتِ الطُّـرُقُ فَـلاَ شُـفْعَةَ،لەگـەڵ ئـەو فەرمودانەدا کە ماف هەڵگرتنەوە تەنها پێش دابەشکردن باسئەکەن.

وەڵام ئەدریتەوە کە:

أ.مـــەفهومی فـــەرمودەی: إِنَّمَـــا جَعَـــلَ النَّبِـــيُّ صَـــلَّى اللَّـــهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ الـشُّفْعَةَ...پـێش ئـەو کاتەیـە کـە فرۆشـراوو لـەنێوان کڕیـارو فرۆشـیاردا دابـەش بکرێـت. ئەمـەش ئـەوە ئەگەیـەنێت کـە: بەشـکردن مـاف هەڵگرتنـەوە پوچـەڵ ئەکاتەوە،ڕیوایـەتی: وَإِنَّمَـا جَعَـلَ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، بەڕاشکاوی باسی ئەکات.

ب.ئـەو فەرمودانـەی مـافی هەڵگرتنـەوە ئەدەنـە کەسـێك ماڵەکـەی تێکـەڵی کەسـێکی تربێت،ئەو مافە لە دراوسێ ناسێنێتەوە،دوای ئەوەی بەڵگەی زۆر هەبوو لەبارەیەوە.

الحَـدِيثُ ٨٣// عَـنْ حَكِيم بِـنْ حِـزَام رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ ؛ أَنَّـهُ كَـانَ يَـشْتَرِطُ عَلَـى الرَّجُـلِ إِذَا أَعْطَـاهُ مَـالاً مُقَارَضَـةً،أَنْ لَـا تَجْعَـلَ مَـالِي فِي كَبِـدٍ رَطْبَـةٍ،وَلَا تَحْمِلَـهُ فِي بَحْرٍ،وَلَـا تَنْزِلَ بِهِ فِي بَطْنِ مسيل.فَإِنْ فَعَلْتَ شَيْئاً مِنْ ذَلِكَ فَقَدْ ضَمِنْتَ مَالِي.

حـەکیم بـن حـزام ئەگـەر کەسـێك بازرگـانی بەماڵەکەیـەوە بکردایـە مـەرجی لێئـەگرت کـە: ماڵەکـەم مـەدە بـە ئاژەڵ،مەیـدە بـە مـاڵێکیش بـە ئـاو بگوازرێتـەوە،وە ئاژەڵیـشی پـێ مـەکڕە. ئەگـەر ئـەوەت کرد،ماڵەکـەی منـت لە ئەستۆیە.

<u>گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//</u> الـدارقطني بەسـەنەدێکی متمانـەپێکراو. سـنن الدارقطني - كتاب البيوع ، حديث : ٢٦٦١

<u>سەرباسەکان//</u>

<u>باســی یەکــەم/</u> لـەناو موسـڵمانانذا جیـاوازی ڕا نیـە دەربـارەی ڕەوایـەتی مامەڵـەکردن بـە مـاڵی خەڵکیەوە،ئەمـەش پـێش ئیـسلام هـەبوەو ئیـسلامیش هێشتویەتەوە.

**باسی دوەم/** عـەلی رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ ئـەڵێت: لـە مُـضَارَبَة دا مامەڵەکـە بـە ماڵەکە ئەکرێت وقازانجیش بە پێی ڕێکەوتنە.

**باسی سێیەم/** قِـرَاضْ جۆرێکـە لـە بەکرێدان،بـەڵام چاوپۆشـی کـراوە لـە نادیاری کرێکە تیایدا،ئەویش بۆ ئاسانکاری بۆ خەڵك.

**باسی چوارەم/** ڕوکنەکانی قِرَاضْ:

ا.نیشاندانی ئارەزوو بۆ گرێبەستەکە.

ب.ڕەزامەندی دەربڕین بۆ گرێبەستەکە.

ئـەوەش لـەنێوان دوو کەسـدایە کـە هەڵـسوکەوتیان لـەڕوی شـەرعەوە دروسـتە،مەگەرلە نێـوان موسـڵمانێك و بێباوەڕێـك بێت،پارەکـە مـوڵکی موسڵمانەکە بێت.

**باسی پێنجـەم/** ئەم مامەڵەیە چەند حـوکمێکی هەیە،کە زانایـان یـەکڕان لـە سەری:

١.نا دیاری تێیدا چاوپۆشی لێکراوە.

٢.کرێکارەکە ماڵەکەی لەئەستۆ نیە ئەگەر فەوتا،مادام زیادەڕۆ نەبوە.

٣.ئایا سەرمایەکە،قەرزە بەسەر کرێکارەکەوە؟ دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بەڵێ قەرزە.

دوەم: قەرز نیە لای،ئەوەش ڕای جمهورە،چونکە:

ئەگـەر کرێکارەکـە لـەکاتی خۆیـدا نـەیتوانی پارەکـە بداتـەوە،دوای خـست تـا قـازانج بکات،ئـەو قازانجـە ئەبێتـە ڕیبـا.هـەروەها ئـەو ماڵـەی لـە ئەسـتۆیدایە ئـەبێت بـە مـاڵی ئەمانەت،ئـەو ماڵـەش لەبـەر ئـەوەی ئامادەنیە،کەواتە نابێتە ماڵێك ئیشی پێوە بکرێت.

٤.ماڵێك هەبێت،لە لایەن خاوەن پارەوە.

**باسی شەشـەم/** ڕێکـەوتون لەسـەر ئـەوەی ئەگـەر یـەکێکیان مـەرجی دانا،کە قـازانجێکی دیـاریکراوی زیـاد لـەوەی بڕیاردراوە،پێبدرێت،مەرجەکـەی ئیشی پێناکرێت.

**باسی حەوتەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە:
خاوەنی پارەکە بۆی هەیە کرێکارەکە بە مەرج ببەستێتەوە،ئەگەر ئەویش مەرجەکەی شکاند،ماڵەکە تیاچوو: ئەبێت قەرەبوی بکاتەوە.ئەگەر لە ناویش نەچوو،مامەڵەکە هەر ئەمێنێت.
خۆ ئەگەر مەرجەکە تایبەت بوو بەشێوەی بازرگانیەکەوە: رێگری لێبکات کە شتێکی دیاریکراو بکڕێت،یا بە کەسێکی دیاریکراوو شت بفرۆشێت،ئەگەر پێچەوانە جوڵایەوە،بە فُضُولِي دائەنرێت،خاوەن ماڵ رێی دا مامەڵەکە دروستە،ئەگەر نا هەڵدەوەشێتەوە.
**باسی هەشتەم/** فەرمودەی: أنْ لَا تَجْعَلَ مالِي فِي كَبِدٍ رَطبَةٍ، واتە ئاژەڵی پێمەکڕە،بۆیە رێگریشی لێکردوە،چونکە ماڵێکە بەمردن،لەناوئەچێت.

**الحَديثُ ٨٤// عنْ إبنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما؛ نّ رَسولَ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ ،عامَلَ أَهْل خَيْبَر بِشَطرِ ما يَخرُجُ مِنْها مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ...**
پێغەمبەری خوا لە گەڵ خەڵکی خەیبەردا رێکەوت،بەنیوەی بەروبومی زەویەکانیان.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب المزارعة باب إذا لم يشترط السنين في المزارعة - حديث : ٢٢٢٥. صحيح مسلم - كتاب المساقاة باب المساقاة - حديث : ٢٩٧٩.
لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتوە: داوایان لێ کرد،کە ئیشی لەکۆڵ بکەنەوە،بەرامبەر نیوەی بەروبومەکە،ئەویش فەرموی: تا ئارەزومان بێت وا ئەتان هێڵینەوە،وا مانەوە تا عومەر،دەریکردن.[1]

[1] فَسَألوهُ أنْ يُقرّهُمْ بِها،عَلَى أنْ يَكفوا عَمَلها وَلَهُمْ نصفُ الثّمَر.فَقالَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: نُقِرُكُمْ بِها عَلَى ذلِكَ ما شِئْنا.فَقَرّوا بِهَا،حَتّى أَجْلاهُمْ عُمَر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ.

**ماناى وشـەكان//** المُساقَاة ئـاودان: خزمـەتكردن وئـاودانی درەختی بـەردار وەك دارخورمـا و ڕەز،بەرامبـەر بڕێكـی دیـاریكراوی بەروبومەكـە.
المُزارَعَـة ئیـشكردن لەزەویدا،بەرامبـەر بڕێـك لـە بەروبومەكەی،تۆوەكـەش لەسەر خاوەن زەویەكەیە.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** دەربارەی ڕەوایەتی ئەم دوو مامەڵەیە،دوو ڕا هەیە:
یەكەم:دروستە،بەڕای علی و أبوبكرو عمرو احمد و...بە بەڵگەی:
١.فەرمودە باسلێكراوەكە.
٢.بـەردەوامبونی پێغەمبـەری خـوا لـە سـەر ئیـشكردن پێیان،تـا وەفـاتی. نەسـخیش نەبۆتەوە،بـەڵكو كردارەكـەی نەسـخی ڕێگریەكانە،كـە لـە پێـشدا باسكراون.وەك إبن حزم ئەڵێت.
٣.بـەردەوامبونی خولـەفای ڕاشـدین وموسـڵمانان لـە ئیـشكردن بـەو دوو مامەڵەیـە. بـەدوریش ئـەزانرێت كـە ئـەوان بێئاگـابن لـە ڕێگریەكـە.ڕافـع كـوڕی خـدیج یـش لـە كۆتـایی خەلافـەتی موعاویـەدا فەرمودەكـە ئەگێڕێتەوە.
٤.ئـەم دوو مامەڵەیـە وەك مُـضارَبَة وان،كەسـێك ئـەو بـە حـەڵاڵ دابنێـت و ئـەمان بەحـەرام،جیاوازی كـردوە لـە نێـوان دوو مامەڵـەی وەك یـەك: چـونكە پێغەمبـەری خـوا كـە زەویەكـەی دانێ،تـا بـە مـاڵی خۆیـان بیكێڵن،تۆویـشی نەدانێ،لـە مەدینەشـەوە تـۆوی بـۆ ڕەوانـە نەكردون،ئەمـەش بەڵگـەی ئەوەیـە كەپێغەمبـەری خوا،بـە مـەرجی دانـەناوە كـە تـۆو لەسـەر خـاوەن زەوی بێت،ئەشكرێت لەسەر كرێكارەكە بێت.
ئـەوەی لـە پێغەمبـەرو خولـەفای ڕاشـیدینەوە گێڕاوەتەوە،لەقیاسـدا ئـەگونجێت،زەوی لـە مُزارَعـەو مُـساقاة دا وەك سـەرمایە وایـە لـە مُـضَارَبَةدا،تۆوەكـەش وەك ئاودانەكەیە،هـەر بۆیـە تۆوەكـە لـەناو زەویەكـەدا لەناو ئەچێت و ناگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەكەی.

دوەم: مامەڵەکـە دروسـت نیـەو پوچـە،بەڕای هادویـە وحەنەفیە،فـەرمودە باسـلێکراوەکەش وا لێـک ئەدەنـەوە کـە: خەیبـەر بـە زۆر گیراوە،خەڵکەکەشـی ئەبنـە کۆیلـەی پێغەمبەر،ئـەوەی بیبـات بـۆ خۆیەتی،ئەوەش وازی لێبهێنێت،بۆ خۆیەتی.

صەنعانی ئەڵێت: ئەم قسەیە ناڕاستە،وپشتی پێ نابەسترێت.

**<u>باسـی سـێیەم</u>/** ئـەکرێت هـەردوو مامەڵەکـە پێکـەوە بکـرێن لەیـەک زەویـدا،ئاودانی دارخورمـاو خزمـەتی زەویەکـە،وەک لـە خەیبـەر رویدا،ئەشکرێت،بەجیا بن.

**<u>باسـی چـوارەم</u>/** دەربـارەی مـاوەی ئـاودان وخزمـەتکردنی زەویەکـە،دوو ڕا هەیە:

یەکـەم: ئـەکرێت ماوەکـە نادیـار بێت،بـەڕای الظاهریـة،بـە بەڵگـەی فەرمودەی: مَا شِئْنَا.

دوەم: ئـەبێت بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو بێت،بـەڕای جمهور،بـە بەڵگـەی: شوبهاندنی بە بەکرێدان.

فەرمودەکـەی پێـشوش واتـە: تـا ئـەو کاتـەی مـاوەی پەیمانەکـە تـەواو ئـەبێت،تا ئـەو کاتـەی ڕێتـان ئـەدەین لـە خەیبـەردا بمێننەوە،پاشـان ئەگـەر ئارەزومـان کرد،دەرتـان ئەکەین،چـونکە پێغەمبـەری خـوا نیـازی دەرکردنـی جولەکەی هەبوە لە دورگەی عەرەب.

بەڵام صەنعانی هەروەها شەوکانی ش ئەم ڕایە بە دور ئەزانن.

بـەڵام ئـاودان کاتەکـەی دیاریکراوە،چـونکە بەکرێدانە،بەکرێـدانیش بـۆ ماوەیەکی دیاریکراوو نەبێت،دروست نیە.

**الحَديثُ ٨٥// عـنْ ثـابِـت بـنِ الـضّحاك رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ : أنّ رَسـولَ اللهِ صَـلّى اللّـهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ ،نَهى عَنِ المُزارَعَةِ،وَأمَرَ بِالمُؤاجَرَةِ..**

**پێغەمبـەری خـوا ڕێگریکـردوە لەچـاندنی زەوی بـە بەرامبـەر، وە فـەرمانی داوە بە بەکرێدانی.**

**گێــڕەرەوەی فەرموودەکــە//** صـحیح مـسلم کتـاب البیـوع بـاب في المزارعـة والمؤاجرة : ٢٩٧٤.

لـە ڕیوایـەتیکی تریـشدا هـاتوە: عبـدالله کـوری عمـر زەویەکـەی بـەکرێ ئـەدا،تا پێیگەیـشت کـەرافع کـوڕی خـدیج ڕێگریکـردوە لـە بەکرێـدانی، کاتێـک عبـدالله بـە ڕافـع گەیـشت،وتی: دەربـارەی بەکرێـدانی زەوی چـی لەپێغەمبـەرەوە ئەگێڕێتـەوە؟ ڕافـع بـە عبـدالله ئـەڵێت: گـوێم لـە هـەردوو مامەکـەم بـوو-کەلـە جـەنگی بـەدردا بەشـدار بـون-بـۆ ماڵـەوەیان باسـئەکرد کـە پێغەمبـەری خـوا ڕێگریکـردوە لـە بەکرێـدانی زەوی. عبـدالله ئـەڵێت: ئـەمزانی کـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا زەوی بـەکرێ ئەدرا،پاشـان عبـدالله ترسـا، نـەوەك پێغەمبـەری خـوا لـەو بـارەوە فـەرمانێکی دەرکردبێـت (بە عبدالله نەگەشتبێت)،بۆیە ئەویش وازی لێهینا.[1]

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکــەم/** بـۆ ڕێگریکـردن لـە مُزارَعَـة چـەند فەرمودەیـەك هەیە،لەوانـە: ئەم دوو فەرمودەیە.

---

[1] أخرَجَ مُسلِمُ:أنّ عَبدَالله بنِ عُمَرَ رضي الله عنه كانَ يُكري أرضَهُ حَتّى بَلَغَهُ أنّ رافِعَ بنَ خُدَيج الأنصاري كانَ يَنهى عَنْ كِراءِ المَزارِعِ.فَلَقيَهُ عَبدُالله فَقالَ:يا إبنَ خديج،ماذا تُحدّثُ عَنْ رَسولِ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ في كِراءِ الأرضِ؟فَقالَ رافِعُ لِعَبدالله :سَمِعتُ عَمّيَّ وكَانا شاهَدا بَدراً يُحَدّثانِ أهلَ الدارِ:أنّ رَسولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ نَهى عَنْ كِراءِ الأرضِ.فَقالَ عَبدُالله :لَقَدْ كُنتُ أعلَمُ في عَهدِ رَسولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم،أنّ الأرضَ تُكرَى.ثُمّ خَشيَ عَبدُالله أنْ يَكونَ رَسولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ أحدَثَ في ذلِكَ شَيئاً لَمْ يَكُنْ،فَتَرَكَ كراءَ الأرضِ. صحيح مسلم - كتاب البيوع باب كراء الأرض - حديث : ٢٩٦٧

**باسی دووەم/** لەزەیدی کوری ثابت گێردراوەتەوە: خوالە رافع خۆش بێت، بەخوا من لەو زاناترم بە فەرمودەکە، دوو پیاوی انصار هاتن بۆ لای پێغەمبەر، ناکۆکیان لەناودابوو، فەرموی: ئەگەر وابکەن، جارێکیتر زەوی بەکرێ مەدەن.[1]

وەك ئەوەیە زەید بڵێت: رافع فەرمودەکەی پچڕ کردوە، تەنها رێگریەکەی باسکردوە کەلە کۆتایی فەرمودەکەدایەو، سەرەتاکەی نەگێراوەتەوە کە رەوایەتی پێئەدات، بۆیە ماناکەی تێکداوە.

**باسی سێیەم/** بۆ یەکخستنی ئەم فەرمودەیەو ئەو فەرمودانەی رەوایەتی پێئەدەن، چەند شێوازێك هاتوە:

یەکەم: فەرمودەکانی رێگریکردن، بۆ خۆبە دورگرتنە لێی نەك تەحریم.

دوەم: فەرمودەکانی رێگریکردن بۆ ئەو کاتەیە کە خاوەن زەویەکە ،چاندنی لایەنێکی دیاریکراوی زەویەکە بەمەرج دابنێت.

سێیەم: کەلەهەمویان دروستترە وەك صەنعانی ئەڵێت:

رێگریەکە لەسەرەتاوە بۆ پێویستی خەڵك بوە، مهاجرەکانیش زەویان نەبوە، بۆیە پێغەمبەری خوا فەرمانی بە ئەنصار کردوە دڵی مهاجرین رابگرن. بە بەڵگەی:

موسلیم لە جابرەوە ئەگێڕێتەوە کە وتویەتی: چەند پیاوێکی انصار زەوی زیاد لەخۆیان هەبوو، بە سێیەك وچواریەك بەکرێیان ئەدا، پێغەمبەری خواش فەرموی: هەرکەسێك زەوی هەیە با بیچێنێت، یا بیداتە براکەی.[2]

---

[1] يَغْفر اللهُ لرافع بن خديج، أنَا وَالله أعْلَمُ بالحَديث منهُ، إنَّمَا أتَاهُ رَجُلانِ منَ الأنْصار قَدْ إختَلَفا، فَقَالَ: إنْ كانَ هذَا شَأنُكُمْ فَلا تَكْرُوا المَزارِعَ. سنن أبي داود - كتاب البيوع باب في المزارعة - حديث : ٢٩٥٩

[2] كانَ لرجالٍ منَ الأنْصار فُضُول أرْض، وَكانُوا يكْرونَها بالثُلث وَالرُبع، فَقالَ النَّبيُّ صَلَى اللهُ عَلَيْه وَسَلَم: مَنْ كانَتْ لَهُ أرضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أوْ ليَمْنَحْهَا أخاهُ، فَإنْ أبَى فَليُمْسكْهَا.

هـــەروەك چـــۆن ڕێگريـــان لێكـــرا گۆشـــتی قوربـــانی پاشـــەكەوت بكـــەن،تا بيكەنـــە خێر،بـــەڵام دوای باشـــبوونی بـــارودۆخی موسڵمانان،پێويـــستيەكە نەما،مزارعـــەيان بـــۆ ڕەوا كرا،هـــەر خـــاوەن زەويـــەك بـــە ويـــستی خـــۆی زەويەكەی بداتە كریێ، يا چۆن ئارەزوی لێيە؟.

بـە بەڵگـەی ئـەوەی كـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خـواو خەليفـەكانی دوای ئەويش،ئەم مامەڵەيە كراوە،بەدور ئەزانرێت كە لەڕێگريەكە بێ ئاگابن.

خَطّـابي ئـەڵێت: إبـن عبـاس لـەم مانايـە بـە باشـی تێگەشـتوە،كە مەبەسـت لێـی ڕێگريكـردن نيـە لـە مُزارَعَـة بـە نيـوەی بـەروبومی زەويەكە،بـەڵكو بـۆ ئەوەيە بەخشندە بن لەگەڵ يەك،ونەرمی بۆ يەكتری بنوێنن.

**<u>باسـی چـوارەم/</u>** بيـانو هێنانـەوەش بـۆ ناديـاری كرێكەش،بـەم شـێوە وەڵـام دراوەتەوە:

١.بـۆ ئـافرەتی شـيردەر،بژێوی وپۆشـاكی ئەدرێتی،هـەر چـەندە نازانرێـت چەند شير ئەدات.

٢.يا وەك ئەوە وايە كە ديار بێت،چونكە زۆرينە حوكمی هەمووی هەيە.

٣.بـە نيـوەو سـێيەك دياريكراوە،بـەڵام دەقەكـە-كـەناديارە- هـەموو ئـەم لێكدانەوانە ڕەت ئەكاتەوە.

**الحَـديثُ ٨٦// عـنْ إبـنِ عَبّـاس رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهمـا ،قـالَ: إحْـتَجَمَ رَسـولُ اللهِ،وَأعْطَـى الّذي حَجَمَهُ أجْرَهُ.وَلَوْ كانَ حَراماً لَمْ يُعْطِه..**

**پێغەمبـەری خـوا کەڵـە شـاخی گرتوو،کرێکـەی دا بـە ئـەو کەسـەی بـۆی کردبوو.ئەگەر حەرام بوایە کرێکەی نەئەدا پێی.**

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکــە//** صـحيح البخـاري - كتـاب الطـب ،بـاب الـسعوط - حديث : ٥٣٧٤

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــــەم/** دەربـارەی کرێـی ئـەو کەسـەی کەڵەشـاخ بـۆ خـەڵکی ئەکات،چەند ڕایەك هەیە:

یەکـــەم: حەڵاڵە،ئەگـــەر کەســـابەتێکی نەشـــیاویش بێت،ئەمـــەش ڕای جمهورە،بە بەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.فـەرمودەی انـس: پێغەمبـەری خـوا کەڵەشـاخی کـرد،ابـو طيبـة ناوێـك بـۆی کرد،ئـەویش دوو مـست خورمـای دایی،قـسەشی لەگـەڵ خاوەنەکـەی کرد تا ئیشی ئاسانی پێبکەن.[1]

إمـامی طَحـاوي ئـەڵێت: ئـەم حوکمـە نەسـخ بۆتەوە،لەسـەرەتادا کـرێ حەرامبوە،پاشـان حـەڵاڵ کـراوە.ئەگـەر مێـژوی فـەرمودەکان بزانرێت،ئـەم مانایە ڕاستە.

دوەم: حەرامــە کرێــی وەربگیرێت،ئەمـــەش ڕای زانایـــانی فەرمودەیـــە،وەك لە کتێبی البَحْرْدا هاتوە،بە بەڵگەی:

---

[1] أنّ النّبيّ صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ إحْتَجَمَ.حَجَمَهُ أبو طيبَة،وَأعْطاهُ صاعَيْنِ مِنْ طَعام،وكَلّمَ مَواليه فَخَفّفُوا عَنْهُ.مُتّفَقٌ عَلَيْه. صحيح البخاري - كتاب الطب باب الحجامة من الداء - حديث : ٥٣٧٨ . صحيح مسلم - كتاب المساقاة باب حل أجرة الحجامة - حديث : ٣٠٣٦

١.محيصه ئەڵێت: کەپرسیاری لەپێغەمبەر کردوە دەربارەی کرێی کەڵەشاخ گرتن،ئەویش ڕێگری لێکرد،کاتێك باسی پێویستی کردوە بەپارەکەی،پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: بیدە بە ئاژەڵەکانت-بۆ ئەوانی سەرف بکە-.[1]

ڕێگریکردنیش لە بناغەدا بۆ حەرامبونە.

بەڵا، جمهور وەڵامی ئەدەنەوە کە:

أ.ڕێگریەکە بۆ خۆدورگرتنەلێی،چونکە کەڵە شاخگرتن بۆ موسڵمان واجبە لەسەر براکەی،کاتێك پێویستی پێی بێت.

ب. کاتێك دەربارەی کرێکەی پرسیاری لێکراوە،پێغەمبەری خوا ڕێگەی داوە،بدرێتە ئاژەڵ و بۆ کۆیلە سەرف بکرێت،ئەگەر حەرام بوایە،بەهیچ شێوەیەك سودی لێ وەرنەئەگیرا.

٢.رافع بن خدیج ئەیگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: کرێی کەڵەشاخگر پیسە.[2] موسلیم گێڕاویەتەوە،پیسیش واتە حەرام.

بەڵام جمهور وەڵامی ئەداتەوە کە: ڕوکەشی فەرمودەکە حەرامبون ناگەیەنێت،ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿وَلَا تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾ {البَقَرَة:٢٦٧}.واتە: بەدوای ماڵە حەرامکانتانىدا مەگەڕێن تا ببیەخشن.ئەو ماڵە بە پیس ناوئەبات وحەرامی نەکردوە،پیسیش دژی پاکە.

٣.فەرمودەی: کرێی کەڵەشاخگر،لە سوحتەکانە.[1] بەڵام جمهور ئەڵێن: سُحْتْ واتە پیس.

---

[1] مَا أَخْرَجَهُ مالكُ وَأَحْمَدُ وَأَصْحابُ السُّنَنِ بِرِجالٍ ثِقَاتٍ مِنْ حَدِيثِ مُحَيصَةَ: أَنَّهُ سَأَلَ رَسولَ اللهِ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كَسْبِ الحَجّامِ فَنَهاهُ،فَذَكَرَ لَهُ الحاجَةَ،فَقَالَ:أَعْلِفْهُ نَواضِحَكَ. سنن ابن ماجه - كتاب التجارات باب كسب الحجام - حديث : ٢١٦٣

[2] كَسْبُ الحَجّامِ خَبِيثٌ.

سێیەم: جیاوازی هەیە لەنێوان کەسی ئازادو کۆیلەدا،بە باشیان نەزانیوە،مرۆڤی ئازاد بیکاتە پیشەی خۆی.وەئەڵێن: حەرامە لەکرێی کەڵەشاخەکە بخوات یا بیداتە خیزانەکەی.بەڵام دروستە بیداتە کۆیلەو ئاژەڵەکانی.

بەڵام بۆ کۆیلە بە دروستیان داناوە،بە بەڵگەی فەرمودەکەی پێشوی محیصە،وەك إبن حجر لە فتح الباری دا لە إمام أحمدو کۆمەڵێکی ئەگێڕنەوە.

**الحَـديثُ ٨٧// عـنْ إبْـنِ عَبـاس رَضـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا ،أنّ رَسـولَ الله صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ قـالَ: إنّ أحَقّ مَا إتّخَذْتُمْ عَلَيْهِ أجْراً كِتابُ الله..**

قورئانی پیرۆز لە هەموو شتێك لە پێشترە تا کرێی لە سەر وەربگیرێت.

گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە// صـحيح البخـاري – كتـاب الطـب بـاب الـشرط في الرقية بقطيع من الغنم – حديث : ٥٤١٢

سەرباسەکان//

باســی یەکــەم/ دەربارەی وەرگرتنی کرێ لەسەر فێرکردنی قورئان،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: دروستە کرێی لەسەر وەربگیرێت،فێرخوازەکە بچوك بێت یا گەورە،با لە سەر مامۆستاکەشی فەرزبێت،هەر دروستە بۆی،ئەمەش ڕای جمهورو مالك وشافعیە،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.پێغەمبەری خوا فێرکردنی قورئان بۆ ئافرەتێك،ئەکاتە مارەییەکەی.

---

[1] مِنَ السُحْتِ كَسْبُ الحَجّامِ.. السنن الكبرى للنسائي – كتاب المزارعة الشقاق بين الزوجين – حديث : ٤٥٥٠

ج.بخاری لە ابوسەعیدەوە ئەیگێڕێتەوە: دەربارەی چارەسەرکردنی هەندێك لە هاوەڵان بۆ هەندێك خەڵکی عەرەب،ئەویش چارەسەری نەکرد بەمەرجی ڕانە مەڕێك نەبێت،کاتێك تفی کردە سەر والحمدلله رب العالمینی لەسەر خوێندەوە.چاکبویەوە،کەڕۆشت بەڕێگادا وەك ئەوەی هەر نەخۆش نەبوبێت،ئەویش مەرجەکەی خۆی بردەسەر،کاتێك بۆ پێغەمبەری خوایان باسکرد فەرموی: چاکتان کرد،بەشی بکەن وبەشی منیش دابنێن.[1]

هەرچەندە فەرمودەکە دەربارەی وەرگرتنی پارەیە بەرامبەر چارەسەرکردن،بەڵام ئەشکرێتە بەڵگەی ڕەوایەتی وەرگرتنی پارەیەك،بەرامبەر قورئان خوێندن،بۆ پشتگیری کردنی ڕەوایەتی وەرگرتنی کرێ بەرامبەر قورئان خوێندن،بۆ فێرکردن بێت یا بۆ شتی تر،چونکە جیاوازی نیە لەنێوان قورئان خوێندنێك بۆ فێربون بێت،یا بۆ چارەسەری.

دوەم: وەرگرتنی کرێ بەرامبەر فێرکردنی قورئان حەرامە،بەڕای هادویە وحەنەفیە واحمد و عطاءو.....بە بەڵگەی:

أبو داود لە عبادە کوڕی صامت ەوە ئەیگێڕێتەوە،ئەڵێت:

خەڵکێکم لە أَهْلِ الصُّفَّة فێری نوسین و قورئان خوێندن ئەکرد.یەکێك لەوانە کەوانێکی پێشکەش کردم،وتم: بۆ خۆم ئەوە ماڵی من نیە،لەپێناوی خوادا بەکاری ئەهێنم،چومە لای پێغەمبەرو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا،پیاوێك لەوانەی نوسین وقورئان خوێندنەوەم

[1] أَخرَجَ البُخاريّ منْ حَديث أَبي سَعيد في رُقْيَةِ بَعْضِ الصّحابَةِ لبَعْضِ العَرَب،وَأَنَّهُ لَمْ يُرقْه حَتّى شَرَطَ عَلَيْه قَطيعاً منْ غَنَم،فَتَفَلَ عَلَيْه،وَقَرَأَ عَلَيْه :الحَمْدُ للّه رَبّ العَالَمِينَ..فَكَأَنّما نُشطَ منْ عقال،فَانْطَلَقَ يَمْشي وَما بِهِ منْ قَلَبه-عِلّة-فَأَوْفاهُ ما شَرَطَ. وَلَمّا ذَكَروا ذلكَ لرَسولِ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ ،قالَ:قَدْ أَصَبْتُمْ، اقْسِمُوا،وَاضْرِبُوا لي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ. صحيح مسلم - كتاب السلام باب جواز أخذ الأجرة على الرقية بالقرآن والأذكار - حديث : ٤١٧٤

فێرئەکرد،کەوانێکی پێبەخشیم،ماڵی من نیەو لەپێناوی خوادا بەکاری ئەهێنم،فەرموی: ئەگەر حەزئەکەیت تەوقێکی ئاگر بکەیتە ملت،وەریبگرە.[1]

بەڵام جمهور بەم شێوەیە وەڵامی ئەدەنەوە:

١.فەرمودەکەی عوبادە پێچەوانە نیە لە گەڵ فەرمودە ڕاستەکەی إبن عباس دا: چونکە لە فەرمودەکەی عبادەدا،مغیرە کوڕی زیاد هەیە کە ڕاویەکەو قسەی لەسەرە...

٢.ئەگەر فەرمودەکەی عوبادە ڕاستیش بێت،وا لێك ئەدرێتەوە کە عبادە بە خۆبەخش وبێ داواکردنی پارە،قورئانی فێرکردون. پێغەمبەریش ئاگاداری کردۆتەوە کە با پاداشتەکەی پوچەڵ نەبێتەوە،لەو بارەیەوە هەڕەشەی لێکردوە.هەروەها پارە وەرگرتنیش لە أهل الصفة کە خۆیان هەژارن ولە سەر خێری خەڵکی ئەژین،بۆ خۆی مکروهە.

[1] أخرَجَهُ أبوداود منْ حَديث عُبادةَ بنَ الصَامت،قالَ:عَلَمْتُ ناساً منْ أهْلِ الصُفَةِ الكتابَ وَالقُرآن،فَأهْدَى إليَّ رَجُلٌ مِنْهُمْ قَوساً، فَقُلْتُ: لَيسَتْ لي بِمالٍ فَأرمي عَلَيْها في سَبيلِ الله.فَأتَيْتُهُ فَقُلْتُ:يا رَسولَ الله،رَجُلٌ أهْدى إليَّ قَوساً ممَنْ كُنتُ أعَلِمهُ الكتابَ وَالقُرآن،وَلَيسَتْ لي بِمالٍ فَأرمي عَلَيْها في سَبيلِ الله.فَقالَ:إنْ كُنتَ تُحِبُ أنْ تُطَوَقَ طَوْقاً مِنْ نَارٍ،فَاقْبَلْهَا.

**الحَـديثُ ٨٨//١.عَـنْ إبْـنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمَـا قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اعطُوا الَاجِيرَ أجْرَهُ قَبْلَ أنْ يَجُفَّ عَرَقَهُ...**

کـرێ بەکرێگرتـە بـدەن، پـێش ئـەوەی ئـارەقی ئیـشکردنەکەی وشـك بێتەوە.

**٢.عنْ أبي سَعيد رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ ،أنَّ النَّبِـيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: مَـنْ إسْتَأجَرَ أجيراً،فَلْيُسَمِّ لَهُ أجْرَتَهُ.**

کەسێك کەسێکی بەکرێ گرت،با لەسەرەتادا کرێکەی پێبڵێت.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** ١. سـنن ابـن ماجـه - کتـاب الرهـون بـاب أجـر الأجراء - حديث : ٢٤٤٠،[1]

لای بەیهـەقیش بـەو شـێوەیەیە: لەئیـشەکەیدا بـڕی کرێکـەی پـێ بڵێـت.[2]

٢.عبدالرزاق،بەیهەقی. مصنف عبد الرزاق الصنعاني - كتاب البيوع

باب : الرجل يقول : بع هذا بكذا - حديث : ١٤٥٢٩[3]

**سەرباسەکان//**

فەرمودەکـە بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: سـوننەتە کرێـی کرێکـار دیـاری بکرێت،تـا نادیار نەبێت وسەرنەکێشێت بۆ ناکۆکی وناخۆشی.

---

[1] صححه الالباني في الإرواء( ١٤٩٨ ).

[2] وَأعْلمْهُ أجْرَهُ وَهوَ في عَمَله. ثُمَّ قَالَ:هذا ضَعيفٌ. السنن الكبرى للبيهقي - كتاب الإجارة باب لا تجوز الإجارة حتى تكون معلومة - حديث : ١٠٨٨١

[3] ضعفه الألباني في الإرواء.٣١١/٥

**الحَدِيثُ ٨٩// عَنْ عُروَةَ عَنْ عائشةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ،أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ عَمَّرَ أَرضاً لَيْسَتْ لِأَحَدٍ،فَهُوَأَحَقُّ بِهَا.قَالَ عُرْوَةُ: وَقَضَى بِهِ عُمَرُ في خلافته..**

**کەسێك زەویەکی بێ خاوەن ئاوەدان بکاتەوە،لەهەموو کەس لەپێشترە بەو زەویە.عومەریش لەکاتی جێنشینیدا قەزاوەتی بەوەئەکرد.**

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـە//** صحيح البخاري - كتاب المزارعة باب من أحيا أرضا مواتا - حديث : ٢٢٣١ بلفظ(من أعمر).

**مانـای وشـەکان//** إِحْيَاءُ بریتیە لەوەی: کەسێك بچێت بەلای زەویەکدا کە کەس نەچوە بەلایدا،زیندوی بکاتەوە بە ئاودان،یا کێڵان یا چاندن یا بینا کردن،پاشان ئەبێتە موڵکی.

المَوَاتُ: ئەو زەویەی ئاوەدان نەکرابێتەوە.ئاوەدانکردنەوەی زەویەکە بە زیندوکردنەوەی،وئاوەدان نەکردنەوەشی بە مراندنی ناوبراوە.

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: زیندوکردنەوە بە موڵککردنی زەویەکەیە،ئەگەر پێش ئەو موسڵمانێك یا کتابیەك،نەیکردبێتە موڵکی خۆی،یا مافی کەسی تری بەسەرەوە نەبێت.

**باسـی دوەم/** دەربارەی پرسکردن بە پێشەوای موسڵمانان لەو زیندوکرنەوەیەدا،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: مەرج نیە پرسی پێبکرێت،ئەمەش ڕای جمهورە.بە بەڵگەی:

أ.ڕوکەشی فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.بە شوبهاندنی بە ئاوی دەریاو ڕوبارو ئەو باڵندەو ئاژەڵانەی کە ڕاو ئەکرێن،کە ئەمانە بە کۆدەنگی زانایان،پێویست بە پرسکردن بە پێشەوا ناکات.

دوەم: مەرجــە ڕای پێــشەوا وەربگیرێت،لــە ئاوەدانکردنەوەکەدا،ئەمــەش ڕای ئەبو حەنیفەیە.

**باسی سێیەم/** دەربارەی مافی زیندوو کردنەوەی شیوو دۆڵ،دوو ڕا هەیە:

١.بــێ پرســی ئیمــام دروســت نیە،ئەگــەر زەرەری بــۆ بەرژەوەنــدی گــشتی نەبێت،بە ڕای هەندێك لە هادەویەکان.

٢.بــە هــیچ شــێوەیەك دروســت نیــە.ئەمــەش ڕای المؤیــد بــالله وابــو حنیفەو،مەهدی ش بە دروستی داناوە،لەبەر ئەوەی:

وەك موڵك وایە،چونکە شوێنی لافاوو ئاوی موسڵمانانە.

مهــدی ئــەڵێت: ئەگــەر ڕوی لافاوەکــەی لــێ وەرگێڕا،بــە پرســی ئیمــام دروســته ئــاوەدان بکرێتەوە،چــونکە مــافی کەســی پێــوە نامێنێــت،وە ناشــزانرێت کێیــە خاوەنەکــەی.ئیمــامیش بــۆی نیــە مۆڵــەت بدات،مەگــەر بــۆ بەرژەوەندەکی گشتی کە زەرەری تیا نەبێت.

**باسی چوارەم/** دروست نیە مۆڵەتی ئاوەدانکردنەوە بە بێباوەڕ بدرێت،بە بەڵگــەی فــەرمودەی: زەوی بــێ خــاوەن بــۆ خواو،پێغەمبەرەکــەی و،پاشــان بۆ ئێوەیە-واتە موسڵمانان-.[1]

**باسی پێنجەم/** فــەرمودەی: وَقَـضَى بِـهِ عُمَـر مرسەلە،چــونکە عــروە لــە کۆتایی خەلافەتی عومەردا لەدایك بوە.

---

[1] عادِيُّ الْأَرْضِ لِلّٰهِ وَلِرَسُولِهِ، ثُمَّ هِيَ لَكُمْ.

**الحديث ٩٠// عَنْ إبْنِ عَبّاس رَضيَ اللّهُ عَنْهُمَا : أنّ الصّعْب بن جُثَامَة أخْبَرَهُ، أنّ النّبِيّ صَلّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلّمَ قَالَ: لَا حِمَى إلاّ لِلّهِ وَرَسُولِه...**

جیاکردنەوەی زەوی گشتی بۆ لەوەڕگا،تەنها بەمۆڵەتی خواو پێغەمبەرەکەی ئەبێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير باب أهل الدار يبيتون - حديث : ٢٨٧١

**مانای وشەکان//** الحِمَى شوێنی پارێزراو.لەشەرعیشدا واتە:پێشەوای موسڵمانان ڕێگری لە شوانی ئاژەڵەکان بکات،بۆ هاتنە ناو زەویەکی تایبەت،ئەم ڕێگریەش بۆ ئەوەیەکە بۆ نمونە وشتری بیت المال ی تیا بەخێو بکرێت.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەپێش ئیسلامدا،ئەگەر لێپرسراوێك بیویستایە،شوێنێك بۆ خۆی داگیربکات،لەشوێنێکی بەرزەوە سەگێکی ئەهێنا تا بوەڕێت،تا کوێ دەنگی سەگەکە بگات،لەهەر چوارلاوە،تایبەتی ئەکات بە ئاژەڵەکانی خۆیەوەو بۆ کەس نیە لەوەڕی تێ بکات،بەڵام بۆ ئەو هەیە لە زەوی ئەواندا بەشدار بێت.ئیسلامیش ئەو عادەتەی پوچەڵ کردەوە وماڵی ئەو شوێنەی تەنها بۆ خواو پێغەمبەر هێشتەوە.

**باسی دوەم/** شافعی ئەڵێت: دوو مانا هەڵ ئەگرێت:

یەکەم: کەس بۆی نیە زەوی بۆ موسڵمانان بپارێزێت،مەگەر تەنها ئەو برە نەبێت کە پێغەمبەر دیاریکردوە.

کەواتە: هیچ کەس لە لێپرسراوان دوای پێغەمبەر بۆی نیە زەوی تر بپارێزێت.

دوەم: کەس بۆی نیە زەوی بۆ موسڵمانان بپارێزێت،مەگەر تەنها وەك ئەوە نەبێت کە پێغەمبەری خوا دیاریکردوە.

کەواتـــە: جیاکردنـــەوەی زەویەکـــە تایبەتـــە بەوکەســـەی جێنـــشینی پێغەمبەرە،کەبریتیە لە خەلیفە.

مانای دوەمیان ڕاسترە:

أ.بوخـاری لـە زوهریـەوە بـە هەڵپەسـێردراوی ئەیگێڕێتـەوە: عومـەر هـەردوو شوێنی الشَّرَفْ والرَّبْذَةَی پاراست.[١]

ب.عومەر رَبْذَةَی بۆ وشترەکانی بەیت والمال پاراست.[٢]

**باســـی ســـێیەم/** هەنـدێك لـە شـافعی مەزهەبـەکان، مـاف ئەدەنـە والـی هەریمـــــەکانیش تابۆیـــــان هـــــەبێت،زەوی بپارێزن،بەمـــــەرجێك زەرەر بەموسڵمانان نەگەیەنن.

**باسی چوارەم/** ئایا إمام بۆی هەیە زەوی بۆ خۆی دابڕێت ؟ دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بۆی هەیە زەوی بۆ خۆی دابڕێت.

دوەم: بـۆ خـۆی دانابڕێت،ئەگـەر زەوی دیـاری بکـات تـەنها بـۆ ئەسـپی موســـڵمانان وحوشـــتری بیـــت المـــال ە،وئـــەو موســـڵمانانەی نـــاتوانن ئاژەڵـەکانیان بـۆ شـوێنی لـەوەڕ بـەرن.ئەمـەش ڕای إمـام یـەحیاو مالـك وشافعیەکان وحەنەفیەکان وهادەویەکانە،بەبەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.عومـەر کـوڕی خگـاب بەندەیـەکی بـەناوی هونـەی لەسـەر زەویـەکی پـارێزراو دانـا،پێی وت: ئـەی هونـەی: بـاڵی میهرەبانیـت بـۆ موسـڵمانان بکـەرەوە،وە لـە نـزای سـتەملێکراوو خـۆت بپارێزە،چـونکە پاڕانـەوەی سـتەملێکراو گیرایـە،خاوەنی حوشـترو مـەڕیش بخـەرە ژورەوە،بـەڵام وریابـە لـە ئاژەڵـەکانی عبـدالرحمن کـوڕی عـەوف و عوسمـان کـوڕی عفـان.چـونکە

---

[١] أنَّ عُمَرَ حَمى الشَّرَفَ وَالرَّبَذَةَ. السنن الكبرى للبيهقي - كتاب إحياء الموات باب ما جاء في الحمى - حديث : ١١٠٢٩

[٢] أخْرَجَ إبْنُ أبِي شَيْبَةَ بِإسْنادٍ صَحِيحٍ عَنْ نافِعٍ عَنْ إبنِ عُمَرَ:أنَّ عُمَر حَمَى الرَّبْذَةَ لِإبِلِ الصَّدَقَةِ.

ئەگـــەر ماڵاتەکـــەیان لـــەناو بـــچێت،ئەگەڕێنەوە بۆدارخورمـــاو زەرعـــات کردن،بـەڵام خـەڵکی تـر کـە خـاوەنی وشـترو مەڕە،ئەگـەر ماڵاتەکـەی لـەناو بـچێت،منداڵەکانیم بـۆ ئـەهێنێت وئـەڵێت: ئـەی پێـشەوای موسـڵمانان،واز لـەم منداڵانـە بێـنم؟ باوکـت نـەمێنێت،ئاوو لـەوەڕ لام ئاسـانترە لـە ئـاڵتون وزیو،ســوێند بەخوا،وائــەزانن ســتەمم لێکردون،ئێــرە وڵــاتی خۆیانــە،پێش ئیـسلام شـەڕیان لەسـەر کردوە،لەسەریـشی موسـڵمان بون،سـوێند بـەوەی گیانی منی بەدەستە،ئەگەر لەبەر ئەو ماڵە نەبێت کە
لـەپێناوی خـوادا جـەنگی لەسـەر ئەکەم،لەوڵاتەکەیانـدا هـیچ زەویـەکم دیاری نەئەکرد.[١]

ئەمـەش بەڕاشـکاوی ئـەوە ئەگەیـەنێت کـە پێـشەوا بـۆ خـۆی زەوی دانابڕێت.

---

[١] أخرَجَ أبو عُبَيد وَابنُ أبي شَيبَة والبُخاري وَالبَيهَقي عنْ أسْلَم:أنّ عُمَرَ بنَ الخطّاب رضي الله عنه إستَعمَلَ مَولىً يُسَمى هُنَيّاً عَلى الحمَى، فَقَالَ لهُ:أضمُمْ جَناحَكَ عنْ المُسلمينَ،وَاتَّقِ دَعوَةَ المَظلوم،فَإنّ دَعوَةَ المَظلوم مُجابَةٌ.وَأدخلْ رَبّ الصّريمَة وَربَّ الغُنَيمَة.وَإيّاكَ وَنعَم إبْنِ عَوف وَنعَم إبْنِ عَفّان،فَإنّهما إنْ تَهلَك ماشِيَتُهما يَرجعان إلى نَخلٍ وَزَرعٍ.وَإنّ رَبّ الصُّرَيمَة وَربّ الغُنَيمَة إنْ تَهلَك ماشِيَتُهما،يَاتيني بِبَنيه.يَقولُ:يا أميرَ المُؤمنينَ أفَتارِكُهُم أنَا؟لَا أبا لَكَ.فَالماءُ وَالكَلَأُ أيسَرُ عَلَيّ مِنَ الذّهَبِ وَالوَرِقِ.وَأيمَ الله إنّهُمْ يَرَونَ إنّي ظَلَمتُهُمْ،وَإنّها لَبِلادُهُمْ،قاتَلوا عَلَيها في الجاهِلِيَّة،وَأسلَموا عَلَيها في الإسلامِ.وَالّذي نَفسي بِيَدِه لَولا المالُ الّذي أحمِلُ عَلَيهِ في سَبيلِ الله ما حَمَيتُ عَلَى النّاسِ في بِلادِهِمْ.

**الحَـديثُ ٩١// عـنْ إبْـنِ عَبّـاس رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا ،قـالَ: قـالَ رَسـولُ اللهِ صَلّـى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: لَا ضَرَرَ وَلَاضِرَارَ.**

زەرەر گەیانـدن دروسـت نیە،وتۆڵەکردنـەوە بـەزەرەر گەیانـدنیش دروسـت نیە.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** احمد،إبن ماجه. سنن ابن ماجه - كتاب الأحكام باب من بنى في حقه ما يضر بجاره - حديث : ٢٣٣٧ .[١]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی مانای الضَّرَر وَالضِّرار،چەند ڕایەك هەیە:

یەکـەم: زەرەر پێـچەوانەی سـود گەیاندنـە.واتـە: بـا کـەس زەرەر لەبراکـەی نەدات وهیچ مافێکی کەم نەکاتەوە.

الـضِّرارُ،واتـە بـەزەرەر گەیانـدن پێـی تۆڵـەی لێنەکاتـەوە.کەواتـە: الـضَّرَرُ،واتـە لەسـەرەتادا زەرەر گەیاندنـە،الـضِّرَاریش زەرەر گەیاندنـە لـە تۆڵـەی زەرەردا.

صـەنعانی ئـەڵێت: ئـەو لێکدانەوەیـە دورە،چـونکە دروسـتە کەسـێك سـتەمی لێکرا،پـشتی بگیرێـت.خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿وَلَمَـنْ إنْتَـصَرَ بَعْـدَ ظُلْمِـهِ﴾ {الشُّورَى:٤١}، وە دەفەرموێت:﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾ {الشُّورَى:٤٠}.

دوەم: الـضَّرَرُ ئەوەیـە: زەرەر لـە هاوڕێکـەی ئەدات،لەبەرامبـەردا خۆشـی قـازانج ئـەکات. الـضِّرَارُ ئەوەیـە زەرەری پـێ ئەگەیەنێت،خۆشـی هـیچ قازانجێك ناکات.

سێیەم: الـضَّرَرُ ئەوەیـە یـەك کـەس ئـەنجامی بـدات،الـضِّراریش دوو کـەس وزیاتر زەرەرەکە بگەیەنن.

چـوارەم: هـەردوکیان یـەك مانایـان هەیـە،بۆ دوپاتکردنـەوەش دوبارەبونەتەوە.

---

[١] وصححه الألباني في الإرواء( ٨٩٦ ).

**باســـــی دووەم/** فەرمودەکــە بەڵگــەی حــەرامبونی زەرەر گەیاندنــە.چــونکە ئەگــەر خــۆی نەبوبێت،واتــە ڕێگــری لێکــراوە: چــونکە ڕێگریکــردن بــۆ وازهێنانە لەو کارە،واتەخۆی کردارەکە بەنەبو دائەنرێت.

**باســـی ســـێیەم/** حـەرامبونی زەرەر گەیانـدن لەشـەرع ولای ژیـری مـرۆڤیش ئاشـکرایە،مەگەر ئەوانـە نـەبێت شـەرع ڕێـی پێـداون،بۆ بەرژەوەندیـەك كـە لـە خراپەی زەرەرەکە زیاتربێت،وەك: بەجێگەیاندنی سزاکان و...

لەوانەشــە بوترێــت: ئــەو ســزایانە وەك کوشــتن ولێــدان و..زەرەر گەیانــدن نیــە بــە خاوەنەکــەی لەلایــەن ئــەو کەســەوە جێبەجێنەکات،چــونکە جێبــەجێکردنی فــەرمانی خوایــە بەســەر تاوانبارانـدا،کەواتــە ســزایەکە لەلایــەن خواوە،زەرەرگەیانــدنی جێبەجێکــەری ســزاکەیە،بەڵام لۆمــە ناکرێت،بەڵکو خەڵاتیش ئەکرێت.

**الحَديثُ ٩٢// عنْ رَجُلٍ منَ الصَّحابَةِ قـالَ: غَـزَوْتُ معَ النَّبِـيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ ،فَسَمِعْتُهُ يَقولُ: النَّاسُ شُرَكاءُ في ثَلاثَةٍ: الكَلَا وَالماءِ وَالنَّارِ.**

لەگــەڵ پێغەمبــەردا لــە شــەڕێکدا بەشــدار بوم،گــوێم لێبــوو ئەیفــەرموو: خەڵکی لەسێ شتدا بەشدارن: خواردنی ئاژەڵ وە ئاو وە ئاگر.

**گێــــڕەرەوەی فەرمودەکــــە//** أحمـد ،ابـوداود بەسـەنەدێکی متمانـەپێکراوو. سـنن أبـي داود - كتاب البيوع أبواب الإجارة - باب في منع الماء حديث : ٣٠٢٣[1]

**مانــای وشــەکان//** الكَلَأ،ڕووەك تـەڕبێت یـا وشـك.بـەڵام ئەگـەر وشـك بێـت،پێی ئـەوترێت: الحَـشِيش والهَـشِيم،ئەگـەر تـەڕیش بێـت پێـی ئـەوترێت: الخَلَـأ وة العُشْبْ.

---

[1] صححه الألباني في الإرواء ( ٦/٧ ).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: هیچ کەس تایبەتمەند نیە بە هیچ یەکێك لەو سیانەوە کە لە فەرمودەکەدا هاتون (لەوەڕو ئاوو ئاگر).

**باسی دوەم/** زانایان کۆدەنگن لەوەدا کە لەوەڕێك لەزەویەك،یا لە شاخێکی بێ خاوەندا ڕوا بێت،بۆ هەموو کەسە،مەگەر پێشەوای موسڵمانان بۆ خۆی گلی دابێتەوە.

**باسی سێیەم/** دەربارەی حوکمی لەوەڕێك لە زەویەکی خاوەندار یا بەرداویدا ڕوابێت،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: موباحە(بۆ هەموو کەسە)،بەڕای هادویە،بە بەڵگەی: گشتگیری فەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: لە گەڵ زەویەکەدایەو هەمان حوکمی ئەوی هەیە،بەڕای المؤید بالله.

**باسی چوارەم/** دەربارەی مەبەست لە وشەی ئاگر لە فەرمودەکەدا،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: ئەو دارەیە کە ئاگری پێئەکەنەوە.

دوەم: خۆ ڕوناککردنەوە بە ڕوناکیەکەی.

سێیەم: ئەوبەردەی کە ئاگرەکەی پێئەکرێتەوە،ئەگەر لە زەویەکی بێخاوەندا بوو.

چوارەم: ئاگر خۆی،ئەمەش ڕای دروستە لای صەنعانی.

**باسی پێنجەم/** دەربارەی حوکمی ئاگر،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: وەکو بناغەکەی وایە،ئەگەر لە دارێکی خاوەندارەوە پەیدا بو.

دوەم: وەك حوکمی ئاوە،لەبەر پێویستی هەموو خەڵك بۆی وچاوپۆشیکردنی خەڵك لەو بارەیەوە.

**باسی شەشەم/** حەرامە ڕێگریکردن لە ئاوی دروستبوو لەباران لە زەویەکی بێ خاوەندا،کەس نزیکتر نیە لەسود وەرگرتن لەو ئاوە،مەگەر کەسێك لەهەموو کەسێك زەویەکەی لێوە نزیکتر بێت. ئەگەر زەویەکە خاوەنیشی هەبێت،هەمان حوکمی هەیە: ئەگەر کەسێك لە زەویەکەیدا یا لە ماڵەکەیدا،کانیاوێك هەڵقوڵا یا بیرێکی لێدا،ئاوەکە نابێتە موڵکی،بەڵکو تەنها لە سود وەرگرتن لێی،پێش خەڵکی تر ئەکەوێت،بۆ خەڵکی تریش هەیە بێتە ناو ماڵەکەیەوە (بۆ سود وەرگرتن لەئاوەکەی).

**باسی حەوتەم/** چەند جۆرێك ئاو هەیە،کە زاناکان باسیان کردوە:

یەکەم: ئاوێك کەخاوەنی هەیە بە کۆدەنگی زانایان،وەك ئاوێك لە گۆزەیەکدا یا هەر شتێکی تردا هەڵگیرابێت.ئەگەر ئەم کۆدەنگیەش ڕاست بێت،فەرمودە باسلێکراوەکە تایبەت ئەکات.

دوەم: ماڵی هەموو کەسێکە،بەکۆدەنگی زانایان،وەك ئاوی روبارو لافاو.

سێیەم: ئاوێك جیاوازی بۆچون هەیە دەربارەی،وەك: ئاوی بیرو کانیاوو جۆگەیەك لە زەویەکی خاوەنداردا لێبدرێت. وتراوە:

أ.ماڵی هەموو کەسێکەو کەس خاوەنی نیە،بەڕای شافعیەکان وحەنەفیەکان وابوالعباس وابوطالب،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئەبێتە موڵك،ب ەڕای إمام یەحیاو المؤید باللە لەڕایەکیدا،هەندێك لە هاوەڵانی شافعی،بە بەڵگەی: شوبهاندنی بەئاوێك خرابێتە گۆزەوە.

**باسی هەشتەم/** فرۆشتنی کانیاو و بیریان بە ڕەوا داناوە،بە بەڵگەی:

أ.چونکە ڕێگریکردنەکە لە ئاوی زیادە لەپێویستیەکەیانە،نەك بیرو کانیاوەکە خۆیان،کە قەدەغەنین،کەسێك بیکرێت،بۆ پێویستی خۆی لە هەموو کەس لەپێشترە بەو ئاوە.

ب.عوسمان كوڕی عفان بیری ڕومەی بە فەرمانی پێغەمبەری خوا لە جولەكەكە كڕی،وكردی بە وەقف بۆ موسڵمانان[1].

باسی نۆیەم/ ئەگەر بوترێت: ئەگەر كەس خاوەنی ئاو نیە،ئەی چۆن جولەكەكە بیرەكەی لە موسڵمان قەدەغەكرد،هەتا بە عوسمانی فرۆشت؟

وەڵامەكەش ئەوەیە كە: ئەمە لە سەرەتای ئیسلامدا بوە،كاتێك پێغەمبەری خوا هاتە شاری مەدینە،پێش ئەوەی بڕیارەكان بەسەر جولەكەكاندا جێبەجێبكرێن،پێغەمبەری خواش لەسەرەتادا وەك خۆی هێشتنیەوە،لەوانەی لەژێر دەستیاندا بوو.

**الحَديثُ ٩٣// عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا مَاتَ ابْنُ آدَمَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلا مِنْ ثَلاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ،أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ.**

ئەگەر مرۆڤ مرد،لەكردارەكانی ئەپچڕێت،تەنها سیانیان نەبێت: خێرێكی بەردەوام،یا زانیاریەكی بەسود،یا منداڵێكی چاك نزای بۆ بكات.

گێڕەرەوەی فەرمودەكە// صحيح مسلم - كتاب الوصية باب ما يلحق الإنسان من الثواب بعد وفاته - حديث : ٣١٦٩.

مانای وشەكان// الوَقْفُ لەزمانەوانیدا واتە هێشتنەوە.لەشەرعیشدا: هێشتنەوەی ماڵێك كە ئەتوانرێت سودی لێببینرێت،لەگەڵ مانەوەی ماڵەكە خۆی، هێشتنەوەی بەمەبەستی هەڵسوكەوتكردن پێوەی بۆ كاری چاكەو ڕێگەپێدراو.

[1] ثَبُتَ شراءُ عُثْمانَ لِبِئْرِ رومَةَ مِنَ اليَهودِي بِأَمْرِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،وَسَبَّلَها لِلْمُسْلِمِينَ. صحيح ابن خزيمة - كتاب الزكاة
جماع أبواب الصدقات والمحبسات - باب اباحة حبس آبار المياه حديث : ٢٣١٦

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** زانایان فەرمودەی الصَّدَقَةُ الجَارِيَة، بە وەقف لێك ئەدەنەوە.

**باسی دوەم/** یەکەم وەقفێك لە ئیسلامدا وەقفەکەی پێشەوا عمر بوە،وەك إبن أبی شیبه ئەیگێڕێتەوە.

**باسی سێیەم/** دەربارەی ئەسڵی وەقفەکە،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: دروستە ئەسڵی وەقفەکە بکرێتە خێر،ئەوەش ڕای کۆمەڵی زانایانە،بە بەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.کۆدەنگی زانایان: قرطبی ئەڵێت:کەسێك نکولی دروست بونی وەقف بکات،پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانەو،گوێی پێ نادرێت.ترمذي ئەڵێت:لەنێوان هاوەڵان وزانا پێشوەکانی شەرعدا،جیاوازی ڕا نیە دەربارەی دروستی وەقف. شافعی ئەڵێت: وەقف لەتایبەتمەندیەکانی ئیسلامەو،لە نەفامێتیدا نەبوە.

دوەم:نکولیکردن لە وەقف.ئەمەش ڕای شريحه.

**باسی چوارەم/** ئەو وشانەی بۆ وەقف بەکاردێن،بریتین لە:

ڕاشکاوی(صراحة): بۆ نمونە بڵێت: وەقفی ئەکەم،حەبسی ئەکەم،ئەیهێڵمەوە بۆ صەدەقە...

کینایە،بڵێت: ئەیکەم بە خێر.

دەربارەی وشەی حەرامم کرد،هەندێك ئەڵێن،وشەیەکی ڕاشکاویە،هەندێکی تریش ئەڵێن ڕاشکاونیە.

**باسی پێنجەم/** مەبەست لە سود گەیاندن لە فەرمودەی: یا زانیاریەکی بەسود،ئەو زانستەیە سودی لەقیامەتدا هەبێت.کەواتە ئەو زانیاریانە ناگرێتەوە کە هیچ سودێکی نیە،وەك ئەستێرەناسی.بەڵام ئەگەر کەسێك زانستێکی سودبەخش دابنێت،یا بڵاوی بکاتەوە،کەسانێك دوای خۆی

بیگێڕنـەوەو سـودی لێببینرێت،یـا زانـستێکی سـود بـەخش بنوسـێتەوە بـا بەپارەش بێت،بەڵام نیەتی لەگەڵدا بێت،یا کتێب بکاتە وەقف.

**باسی شەشەم/** وشەی الوَلَدْ،کوڕو کچیش ئەگرێتەوە.

**باسـی حەوتـەم/** فەرمودەکـە بـە مـەرجی دائەنێت،منداڵەکـە کـە بـۆ بـاوکی ئەپاڕێتەوە،صالح بێت،تا پاڕانەوەکەی گیرا بێت.

**باسی هەشـتەم/** فەرمودەکـە بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: پاداشـتی هـەموو کردارێـك بـەمردن کۆتـایی دێت،جگـە لـەم سـیانە،کەلە دوای خـۆی پاداشـتەکەی بەردەوام ئەبێت،وە تازە ئەبێتەوە.

زاناکان ئەڵێن:چونکە هەر بە کرداری خۆی دائەنرێت.

**باسـی نۆیـەم/** لـەو سـیانە زیـاتر باسـکراوە لـە فەرمودەیەکدا کـە إبـن ماجـە ئەیگێڕێتـەوە: لـەو کـردارو ئیـشە باشـانەی کـە بـە موسـڵمان ئـەگات دوای مردنـی: زانـستێك کـە بڵاوکردبێتـەوە،یا منـداڵێکی چـاکی جێهێـشتبێت،یا قورئـانێکی دوای خـۆی جێهێـشتبێت،یا مزگـەوتێکی دروسـت کردبێت،یـا مـاڵێکی بـۆ حەواندنـەوەی ڕێبـواران دروسـت کردبێت،یـا ڕوبـارێکی هەڵکەنـدبێت،یا خێرێکـی لـە ماڵەکـەی خـۆی دەرکردبێـت لـەژیانی ولەشساغیدا،تا دوای مردنیشی پێی بگات.[1]

**باسـی دەیـەم/** فەرمودەکـە بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: پاڕانـەوەی کـوڕ بـۆ دایـك وبـاوکی لـەدوای مردنیان،پێیـان ئەگات،هـەروەها خێرکـردن بۆیـان و قەرزدانەوە لەبریان و...

[1] إنَّ ممَا يَلحَقُ المُؤمن منْ عَمَله وَحَسناته بعدَ مَوْته :علماً نَشَرَهُ،وَوَلَداً صالحاً تَرَكَهُ،أوْ مُصْحَفاً وَرثَهُ،أوْ مَسْجداً بَنَاهُ،أوْ بَيْتاً لابْنِ السَّبِيل بَنَاهُ،أوْ نَهراً أجْرَاهُ،أوْ صَدَقَةً أخْرَجَها منْ ماله في صحَّته وَحَيَاته، تَلحَقُهُ بَعْدَ مَوْته. صحيح ابن خزيمة - كتاب الزكاة جماع أبواب الصدقات والمحبسات - باب فضائل بناء السوق لأبناء السابلة حديث : ٢٣١٩

**الحَـدِيثُ ٩٤// عَـنْ إبْـنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا ،قَـالَ: أصَـابَ عُمَـرُ أرْضـاً بِخَيْبَرَ.فَأتَى النَّبِـيَّ صَلَى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ يَسْتَأمِرهُ فِيهـا.فَقَـالَ: يارَسُولَ الله،إنِّـي أصَبْتُ أرْضاً بِخَيْبَرَ،لَمْ أصِبْ مـالاً قَـطّ هـوَ أنْفَسُ عِنْـدِي مِنْـهُ،فَقالَ: إنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أصْـلَهَا وَتَـصَدَّقْتَ بِهـا.قَـالَ: فَتَـصَدّقَ بِهـا عُمَر،وَأنَّـهُ لايُبَـاعُ أصْـلُها وَلا يُورَثُ،وَلايُوهَـبُ.فَتَصَدّقَ بِهـا فِي الْفُقَـراءِ وَفِي الرِّقَـابِ وَفِي سَبِيلِ الله وَإبْـنِ الـسَّبِيلِ وَالـضَّيْفِ.لاجُنـاحَ عَلَـى مَـنْ وَلِيَهـا أنْ يَأكُـلَ مِنْهـا بِـالْمَعْرُوفِ،أوْيطعم صَـدِيقاً غَيْـرَ مُتَمَوِّلٍ مالاً.**

عومـەر لـە جـەنگی خەیبـەردا زەویـەکی دەسـتکەوت،هات بـۆ لای پێغەمبـەر تـا پرسـی پێبکـات،وتی: ئـەی پیغەمبـەری خوا،لەخەیبـەر زەویـەکم دەستکەوت،تائێـستا لـەو بەبـەهاترم دەسـتنەکەوتوە.(واتـە چـۆن بیکـەم بـەخێر؟) فـەرموی: ئەگـەر ئـارەزوت لێبوو،زەویەکـە وەك خـۆی نەهێڵێتـەوەو بەروبومەکـەی ئەکـەیت بـەخێر.پاشـان عومـەر کـردی بـە خێـر بەشـێوەیەك: زەویەکـە خـۆی نەفرۆشـرێت ومیراتگـریش نەیبات،نەشبەخـشرێت،بکرێتە خێـر بـۆ هـەژاران ولـەپێناوی خـوادا(جیهـاد کـردن) وبـۆ رێبـواران ومیوانان،کەسـێك سەرپەرشـتیبکات قەیناکـە بـەپێی پێویـستی خـۆی لێـی بخوات،یا دەرخواردی هاوەڵێکی خۆی بدات،ونەیکاتە موڵکی خۆی.

<u>**گێـرەرەوەی فەرمودەکـە//**</u> صـحيح البخـاري - كتـاب الـشروط بـاب الـشروط في الوقـف - حـديث : ٢٦٠٥. صـحيح مـسلم - كتـاب الوصـية بـاب الوقـف - حديث : ٣١٧٠

<u>**سەرباسەکان//**</u>

<u>**باسی یەکەم/**</u> دەربارەی لازمبونی وەقف،دوو را هەیە:

یەکـەم: وەقـف لازم نیە،کەواتـە دروسـتە بفرۆشـرێت،بەرای أبوحەنیفـە وزوفەر،بەبەڵگەی:

إبن عباس ئەیگێڕێتەوە: کاتێك ئایەتەکانی میرات دابەزی،پێغەمبەری خوا فەرموی: دوای دابەزینی سورەتی النساء وەقف نیە.[1]

وەڵام دراوەتەوە کە:

أ.لە إسنادی فەرمودەکەدا إبن لهیعە هەیە،کە ناکرێتە بەڵگە (ڕیواتەکانی).

ب.مەبەستی وشەی وَقْفْ حَبْسْ لەفەرمودەکەدا ئەوەیە:ماڵەکە لای میراتگر بوەستێنرێت،وەك لە النهایة في غریب الحدیث ئاماژەی پێکراوە.

دوەم: وەقف لازمە،نافرۆشرێت و نابەخشرێت،بەڕای جمهوری زانایان وابویوسف ومحمد لە حەنەفی مەزهەبەکان،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.لەفەرمودەی: صَدَقَةٌ جارِیَةٌ،ئەوە ئەخوێنرێتەوە کەوەقف لازمەو نابێت هەڵبوەشێتەوە،ئەگەر هەڵوەشاندنەوەی دروست بوایە،وەقف بەخێرێکی پچڕاو دائەنرا،نەك لەبەر ڕۆشتوو.ابو یوسف ئەڵێت: ئەگەر ابو حنیفە ئەم فەرمودەی پێبگەشتایە،ئەم ڕایەی ئەبوو،وە لە فرۆشتنی وەقف پەشیمان بوەوە.

ج.کۆدەنگی زانایان.قُرْطُبی ئەڵێت: کەسێك نکولی لە دروست بونی وەقف بکات،پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانەو،گوێی لیْ ناگیرێت.

<u>باسی دوەم/</u> فەرمودەی: أَنْ یَأْکُلَ مِنْها مَنْ وَلِیَها بِالمَعْروفِ. قُرطُبي ئەڵێت: عادەت وایە سەرپەرشتیکاری وەقفەکە،لە بەروبومی وەقفەکە ئەخوات،هەتا ئەگەر وەقف کەرەکەش بە مەرج دابنێت کە سەرپەرشتیکار لێی نەخوات،مەرجەکەی بە باش دانانرێت و مایەی گاڵتەجاڕیە.

[1] أخْرَجَهُ البَیْهَقِي في الشُّعَب: عنْ إبنِ عَبّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا،أنّ النَّبِيَّ صَلّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ قَالَ لَمّا نَزَلَتْ آیاتُ المِیراثِ:لَا حَبْسَ بَعْدَ النِّساءِ. السنن الکبرى للبیهقي - کتاب الوقف باب من قال : لا حبس عن فرائض الله عز وجل - حدیث : ١١١٢٥

**باسی سێیەم/** دەربارەی مەبەست لە وشەی المَعْرُوفْ لە فەرمودەکەدا،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: ئەو بڕەی کە عادەتی خەڵکیە.لای صەنعانیش دروسترین ڕایە.

دوەم: ئەوبڕەی ئارەزوی بۆ خواردن ناهێڵێت.

سێیەم: بەئەندازەی ئیشکردنەکەی پارە هەڵبگرێت.

**باسی چوارەم/** فەرمودەی: غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ،واتە: نەیکات بە موڵکی خۆی.مەبەستیش لێی: هیچ بڕێك لە وەقفەکە نەبات بۆخۆی و بە بەروبومەکەشی شتێك نەکرێت ،بیێتە موڵکی،بەڵکو تەنها بۆی هەیە بۆ بژێوی خۆی بەکاریبهێنێت.

**باسی پێنجەم/** مەبەست لە فەرمودەی: وَفِي القُرْبَى،خزمەکانی عمر خۆیەتی،لە ڕیوایەتی أحمددا هاتوە: **عمر وەسیەتی کرد،کە بۆ حەفصە دایکی ئیمانداران بێت،دوای ئەویش بۆ نەوە گەورەکانی عمر.**

**الحَديثُ ٩٥// ١.عنْ إبْنِ عَبّاس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا ،قَالَ: قَالَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: العائِدُ في هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يَقيءُ،ثُمّ يَعودُ في قَيْئِهِ..** کەسێك لەدیاریەکەی پەشیمان بێتەوە،وەك سەگ وایە کە ڕشانەوەکەی خۆی ئەخوات.

**٢.عنْ إبْنِ عُمَرَ وَإبنِ عَبّاسَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا ،عَنْ النَّبِيَ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ ، قالَ: لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أنْ يُعْطِي العَطِيّةَ،ثُمّ يَرْجِعُ فيها إلّا الوالِد فيما يُعْطى وَلَدَهُ..** بۆ هیچ موسڵمانێك نیە لەبەخشین پەشیمان بێتەوە،جگە لەبەخشینی باوك بۆ کوڕەکەی.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**

١ . صحيح البخاري ،كتاب الهبة وفضلها والتحريض عليها باب هبة الرجل لامرأته والمرأة لزوجها( ٢٤٧٠). صحيح مسلم ،كتاب الهبات باب تحريم الرجوع في الصدقة والهبة بعد القبض إلا ما وهبه (٣١٣٦). ٢.أحمد

وضــوارقكة.ترمــذي وإبــن حبــان وحــاكم بەصــحيح يــان دانــاوە. ســنن أبــي داود - كتاب البيوع أبواب الإجارة - باب الرجوع في الهبة حديث : ٣٠٨٩

**مانـــــای وشــــەكان//** الهِبَــةُ: خاوەنــداریكردنی ماڵێــك بــەپێی گرێبەســتێك لەســــەر برێكـــی دیـــاریكراو لەبریدا،لەژیانیـــدا.بەماڵـــە بەخـــشراوەكەش ئەوترێت هِبَةٌ.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** لەبارەی پەشیمان بونەوە لە دیاری،دوو ڕا هەیە:

یەكـــەم: دوای وەرگـــرتنی حەرامـــە وەرگرتنەوەی،جگـــە لەبەخـــشینی بـــاوك بـــۆ كوڕەكەی،بـە ڕای كۆمـەڵی زانایـان.بخـاری بـابێكی بـۆ دانـاوە بـەناوی: بـابُ لَـا يَحِـلُّ لِأَحَـدٍ أَنْ يَرْجِـعَ فِي هِبَتِـهِ وَصَـدَقَتِهِ.بـە بەڵگـەی دوو فـەرمودەی پێـشوو: خواردنـەوەی ڕشانەوە،حەرامە،كەواتە ئەوەیش لەو بچێت حەرامە.

أحمد ئەڵێت: قتادە وتویەتی: خواردنەوەی ڕشانەوە بە حەرام ئەبینم.

دوەم: پەشـیمانبونەوە لەبەخـشیندا دروسـتە،تەنها لـە دیـاری بەخـشین بـۆ خزم نەبێت.بەڵام لە خێركردندا دروست نیە،بەڕای هادەویەو أبوحنیفە.

١.طَحـــاوي ئـــەڵێت فـــەرمودەی: كَالعَائِـــدِ فِي قَيْئِـــهِ،هەرچـــەندە مانـــای حـــــەرامبون ئەگەیەنێت،بـــــەڵام لەڕیواتەكـــــەی تـــــردا كـــــە ئـــــەڵێت: كَالكَلْـــبِ،بەڵگـــەی حـــەرام نەبونیـــەتی: چـــونكە عبـــادەتی لەســـەر واجـــب نیە،كەواتـــە خواردنـــەوەی ڕشـــانەوە،حەرام نیـــە لەســـەری.مەبەســـت لـــە فەرمودەكەش دوركەوتنەوەیە لەكردارێك كە وەكو كرداری سەگ بێت.

وەڵـــامی ئـــەم ڕایـــە دراوەتـــەوە كـــە: ئـــەم جـــۆرە شـــێوازە بـــۆ ئـــەو پـــەری لۆمەكردنـــە،وەك ئـــەو فەرمودەیـــەی باســـی یـــاری تاوڵـــە ئـــەكات: وەك ئەوەیـــە دەستبخاتە گۆشتی بەرازەوە.[1]

---

[1] فَكَأَنَّمَا غَمسَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ. سنن أبي داود - كتاب الأدب باب في النهي عن اللعب بالنرد - حديث : ٤٣٠٩

بۆیە لێکدانەوەکەی سەرەوە بەدور ئەزانرێت،چونکە لەگەڵ مانای گشتی فەرمودەکەدا یەکناگرێتەوە،شەریعەتی ئیسلامیش ئەو جۆرە دەستەواژانە بۆ لۆمەکردنی زۆر بەکار ئەهێنێت،وەك ڕێگریکردنی لەنوێژدا لەشێوازی دانیشتنی وەك سەگ،ودانەوینەوە وەك دەنوکدانی قەلەرەش،وئاوڕدانەوەی ڕێوی..تەنها حەرامبونیش لەو دەستەواژانە ئەخوێنرێتەوە،لێکدانەوەی دور لەماناش بێبایەخ سەیری ئەکرێت.

٢.طَحاوي ئەڵێت فەرمودەی: لَا تَحِلُّ،حەرامبون ناگەیەنێت،وەك فەرمودەی؛ لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغنى،کەماناکەی وایە: خێربە دەوڵەمەند ناشێت،وەك چۆن بە کەسانی خاوەن پێویستی ئەشێت،مەبەستیشی توندبونە لە کەراهەتدا.

وەڵام دراوەتەوە کە: فەرمودەی لَا تَحِلُّ،ڕاشکاوانەو دیارە لە حەرامبونیدا. گەر بوترێت بەشێوەی مەجاز بۆ کەراهەتێکی توند بەکاردێت،لادانیەتی لە مانا دیارەکەی.

٣.پەشیمان بونەوە لە خێرکردن دروست نیە و لە دیاری بەخشین دروستە،چونکە خێرکردن بۆ پاداشتی قیامەتە.ئەم جیاکاریەش لە نێوان دیاری وخێرکردندا،کاریگەری نیە لەسەر حوکمەکە.

<u>**باسی دوەم/**</u> دەربارەی بەخشینی باوك بۆ منداڵەکانی،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بۆ باوك دروستە لە بەخشینەکەی بۆ کوڕەکەی پەشیمان بێتەوە،گەورە بێت یان منداڵ، بەڕای جمهور،بە بەڵگەی:

فەرمودەی جابر: خۆت و ماڵەکەت موڵکی باوکتن.[1]

کەواتەپەشیمانبونەوەش لەدیاریەکە،پەشیمان بونەوە نیە لەڕاستیدا: (چونکە ماڵی کوڕەکەش هی خۆیەتی)،لەوانەشە بۆ تەمبێکردن پەشیمان بوبێتەوە.

---

[1] أَنْتَ وَمالُكَ لِأَبِيكَ. سنن ابن ماجه - كتاب التجارات باب ما للرجل من مال ولده - حديث : ٢٢٨٨.

دووەم: بەهیچ شێوەیەك بۆى نیە پەشیمان بێتەوە،بەڕاى احمدو ابوحەنیفەو الناصر والمؤید بالله.

سێیەم:پەشیمانبونەوە تایبەتە بەوەى منالْ بێت،بەڕاى هادویە.

وەڵام دراوەتەوە کەئەمە پێچەوانەى ڕوکەشى فەرمودەکەیە.

**باسی سێیەم/** دەربارەى حوکمى شت بەخشینى دایك،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: دایك وەك باوکە لەم حوکمەدا،بەڕاى زۆربەى زانایان،چونکە وشەى الوالِدْ باوك ئەویش ئەگرێتەوە.

دووەم: بۆى نیە پەشیمانبێتەوە،بەڕاى المؤید بالله وابوطالب وإمام یەحیا: چونکە پەشیمان بونەوەى باوك،پێچەوانەى قیاسە،پێچەوانەى قیاسیش،قیاسى لەسەر ناکرێت.

سێیەم: ئەگەر باوکەکە زیندوو بوو،دایك بۆى هەیە لە دیارى بەخشینەکە پەشیمان بێتەوە،ئەگەر مردو بو،بۆى نیە،بەڕاى مالکى مەزهەبەکان وإسحاق.

**باسی چوارەم/** دەربارەى پەشیمان بونەوەى ژن،لەو بڕە مارەییەى ئەیبەخشێت بە مێردەکەى،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بۆى نیە پەشیمان بێتەوە،بەڕاى هادى و،بوخاریش لە نەخەعى و عمر بن عبدالعزیز بە هەڵپەسێردراوى تعلیقا ئەیگێڕێتەوە.

دووەم: ئەگەر پیاوەکە فێڵی لێکردبێت،پارەکە بۆ ژنەکە ئەگێڕدرێتەوە،بەڕاى زوهرى.

سێیەم: هەرکات ئارەزوى لێبوو،بۆى هەیە وەرى بگرێتەوە لە مێردەکەى،بە بەڵگەى فەرمودەى: ئافرەتان کەشت ئەبەخشن بۆ دەستکەوتە ولەترسایە،هەر ئافرەتێك بە هاوسەرەکەى بەخشى ویستى پەشیمان بێتەوە،بۆى هەیە..[١]

---

[١] إنَّ النِّسَاءَ يُعْطِينَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً،فَأَيُّمَا إمْرَأَة أَعْطَتْ زَوْجَهَا فَشَاءَتْ أَنْ تَرْجِعَ رَجَعَتْ. أَخْرَجَهُ عَبْدُالرَّزَّاق بِسَنَدٍ مُنْقَطِعْ. مصنف عبد الرزاق الصنعاني - كتاب المواهب باب هبة المرأة لزوجها - حديث : ١٦٠٠١

الحَديثُ ٩٦//١.عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،عَنِ النبِيِّ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ ، قَالَ: تَهادُوا تَحَابوا.

دیاری بۆیەكتری ببەن،هەتا لە لای یەكتر خۆشەویست بن.

٢.عَنْ أنسِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،قَالَ : قَالَ رَسولُ اللهِ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ: تَهَادوا،فَإِنَّ الهَدِيَّةَ تُسلُّ السَّخيمَةَ.

دیاری بۆ یەكتر ببەن،چونكە كینەی ناو دڵان نامێڵێت.

٣.عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ صَلَى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ: يا نِساءَ المُسلِماتِ،لَا تَحقِرَنَّ جَارَةٌ لِجارَتِها،وَلَوْ فِرْسَنَ شاةٍ..

ئەی ئافرەتانی موسڵمان،با هیچ كەسێكتان بەسوك تەماشای دیاری دراوسێكەی نەكات،با سمی وڵاخیش بێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//**

١. الأدب المفرد للبخاري - باب قبول الهدية حديث : ٦١٢. ابويعلى.إبن حجريش بە إسنادێكی حسن ی داناوە[1] .

٢. شعب الإيمان للبيهقي - التاسع والثلاثون من شعب الإيمان قصة إبراهيم في المعانقة في الثالث والثلاثين من التاريخ - حديث : ٣٨٦٦٤.[2]

٣. صحيح البخاري - كتاب الأدب باب : لا تحقرن جارة لجارتها - حديث : ٥٦٧٧ ، صحيح مسلم - كتاب الزكاة باب الحث على الصدقة - حديث : ١٧٧٣

**ماناى وشەكان//** السَّخيمَة: كینەی دل. فِرْسَنْ: سمی ئێستر.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** ئەم فەرمودانە كاریگەری دیاری لەسەر دڵان دەردەخات.

[1] قال الألباني في الإرواء: حسن الإسناد ٤٥/٦

[2] ضعفه الألباني في الإرواء ٤٥/٦

**باســـی دووەم/** لەفەرمودەکــەدا وشــەیەك لابــراوە،(لَـا تَحْقِـرَنَّ جَـارَةٌ لِجَارَتِهَـا هَدِيَّةً،وَلَوْ فِرْسَنَ شَاةٍ).

**باســی ســێیەم/** باسکردنی سمی وڵـاخ،بۆ زیـاتر هانـدانی دیـاری بەخـشینی دراوســێیە بــە دراوســێکەی،نەك بەخــشینی سمەکــە بەڕاستی،چــونکە نەبیستراوە ئەوە بکرێت بە دیاری.

**باسی چوارەم/** لەوانەیە ڕێگریکردن لە فەرمودەکەدا بگەڕێتەوە بۆ:

أ.دیـاری بەخـشەکە،ئەمەش ڕوکەشــی ڕێگریکرنــی بەســوك ســەیرکردنی ئەو دیاریەی ئەیبەخشێت،چونکە سەرئەکێشێت بۆ دیاری نەبەخشین.

ب.دیـاری وەرگر،واتــە: بەســوك تەماشــای ئــەوە مەکــە بــۆت ئــەهێنرێت،با سوکیش بێت.

ج.یا بۆ هەردوو لا ئەگەڕێتەوە.

**باســی پێنجــەم/** فەرمودەکـە هاندانـە بـۆ دیـاری بەخشین،بە تایبـەت لـەناو دراوسێیاندا،با بێ نرخیش بێت،چونکە خۆشەویستی وهۆگری لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێت.

**الحَدِيثُ ٩٧// عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،بِتَمْرَةٍ فِي الطَّرِيقِ،فَقَالَ: لَوْلاَ أَنِّي أَخَافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لَأَكَلْتُهَا.**

پێغەمبـەری خـوا لـەڕێگادا دەنکـە خورمایـەکی بـینی.پاشـان فـەرموی: گـەر نەترساما یە کە ماڵی صەدەقەیە،ئەمخوارد.

**گێــڕەرەوەی فەرمودەکــە//** صـحیح البخـاري - کتـاب في اللقطـة بـاب إذا وجـد تمـرة في الطريـق - حـديث : ٢٣٢٠. صـحيح مـسلم - كتـاب الزكـاة بـاب تحـريم الزكـاة علـى رسول الله صلى الله عليه وسلم وعلى - حديث : ١٨٤٧

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەبارەی هەڵگرتنەوەی شتی بێ نرخەوە،دوو ڕا هەیە:

یەکــــەم: هەڵگرتنـــــەوەی دروســـــتە،بەوەش ئـــــەبێت بەخاوەنی،گــــەر خاوەنەکەشی زانراو بێت،بە بەڵگەی : فەرمودەی باسلێکراو.

دووەم: دروست نيە مەگەر خاوەنەكەى نەزانراو بيّت،بەلاّم گەر زانراو بيّت،با كەميش بيّت بە بىّ پرس هەلّگرتنەوەى دروست نيە.

**باسى دومم/** دەربارەى ناساندنى مالّى بىّ نرخ،چەند رايەك هەيە:

١.پيّويست بە ناساندن ناكات،بە بەلّگەى:

(أ)فەرمودەى باسليّكراو.

(ب) مەيمونەى خيّزانى پيّغەمبەر دەنكە خورمايەكى دۆزيەوە،وخواردى،وتى: خواى گەورە خراپ بونى خۆش ناويّت.[1] لە كتيّبى فتح البارى دا هاتوە: واتە ئەگەر هەلّى نەگرتايەتەوە،و نەيخواردايە،تيّك ئەچوو.

٢.پيّويستە وەك مالّى بەنرخ سالّيّك بناسيّنريّت،بەراى زيدو ناصرو القاسميە وشافعى،بە بەلّگەى فەرمودەى: تاسالّيّك بيناسيّنە[2]،باسى كەم وزۆرى مالّەكەى نەكردوە.

٣.تا سىّ رۆژ ئەناسيّنريّت،بەراى المؤيد بالله وإمام يحياو حەنەفيەكان،بە بەلّگەى:

أ.فەرمودەى: كەسيّك شتيّكى بچوكى دۆزيەوە،پەتيّك بيّت يا درهەميّك يا شتيّك لەو بابەتە،با تا سىّ رۆژ بانگەوازى بۆ بكات،ئەگەر شتەكە بەهاى زياتر بوو،تا شەش رۆژ بانگەوازى بۆ بكات.لاى طبرانى ئەم زيادەيەش هاتوە:ئەگەر خاوەنەكەى هاتەوە بيدەرىّ،ئەگەرنا،بيكە بە خيّر.[3]

---

[1] رَوى إبنُ أَبي شَيْبَة عنْ مَيمونة زَوْج النَّبيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:أَنَّها وَجَدَت تَمْرَةً فَأَكَلَتْها،وَقالَتْ:لا يُحِبُّ اللهُ الفَسَاد. مصنف ابن أبي شيبة - كتاب البيوع والأقضية ما رخص فيه من اللقطة - حديث : ٢١١٩٥

[2] عَرِّفْها سَنَةً.

[3] مَنْ إلْتَقَطَ لقَطَةً يَسيرَة حَبْلاً أوْ دِرْهَماً أوْ شِبْه ذلِكَ،فَلْيُعَرِّفْها ثَلاثَة أَيّام.فَإِنْ كانَ فَوقَ ذلِكَ،فَلْيُعَرِّفْهُ سِتَّة أَيّامٍ. مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين حديث يعلى بن مرة الثقفي

ب.عەلی ڕەزای خوای لێبێت: دینارێکی لە بازاڕ دۆزیەوەو هێنایە لای پێغەمبەر،ئەویش فەرموی: سێ ڕۆژ بیناسێنە ،ئەویش وایکرد،کەکەس خاوەنی نەبوو،پاشان فەرموی: بیخۆ.[1]

ئەم دوو فەرمودەیە فەرمودەی ناساندن تا یەك ساڵ،تایبەت ئەکەن.

**باسی سێیەم/** دەربارەی فەرمودە باسلێکراوەکەوە وتراوە: چۆن پێغەمبەری خوا،خورماکەی لەڕێگادا جێهێشتوە،لە کاتێکدا پێویستە پێشەوای موسڵمانان ماڵی ونبوو بپارێزرێت،هەروەها ماڵی زەکات بپارێزێت و لەشوێنی خۆیدا سەرف بکات؟

وەڵام دراوەتەوە کە: بەڵگە نیە کە پێغەمبەر هەڵی نەگرتبێتەوە تا بیپارێزێت،بەڵکو تەنها نەیخواردوە وەك وەرەعێك،یان هەڵی نەگرتۆتەوە،تا جێیبهێڵێت بۆ کەسێك کەخێری پێ ئەشێت.

پێویست نیە لەسەر لێپرسراو تەنها ئەو ماڵە بپارێزێت کە ئەزانێت خاوەنەکەی بەدوایدا ئەگەڕێت،نەك ئەو ماڵەی کە عادەت وایە لە بەر کەم نرخیەکەی هەڵنەگیرێتەوە.

**باسی چوارەم/** لە فەرمودەکەدا ئەوەی تیایە کە: خۆ بپارێزرێت لەخواردنی ئەو ماڵەی کە گومانی حەرامبونی لێ ئەکرێت.

---

عن النبي صلى الله عليه وسلم - حديث : ١٧٢٣٢ ..وَعِنْدَ الطَّبَراني: فَإِنْ جاءَ صاحِبها،وَإِلاَّ فَلْيَتَصَدَّقْ بِها.

[1] رَوى عَبْدُالرَّزّاق عَنْ أبي سَعيد:أَنَّ عَلِياً رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ جاءَ إِلى النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) بِدينارٍ وَجَدَهُ في السّوقِ،فَقالَ النبيُّ:عَرِّفْهُ ثَلاثاً.فَفَعَلَ،فَلَمْ يَجِدْ أَحَداً يَعْرِفه،فَقالَ:كُلْهُ. مسند أبي يعلى الموصلي - من مسند أبي سعيد الخدري حديث : ١٠٣٥

الحَديثُ ٩٨// ١.عَنْ زَيدِ بنِ خالِدِ الجُهَنيِ رَضيَ اللّهُ عَنهُ قالَ: جاءَ رَجُلٌ إلى النَّبيِّ صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ ، فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ، فقالَ: إعرِفْ عفاصَها ووِكائَها،ثُمَّ عَرِّفْها سَنَةً،فإنْ جاءَ صاحِبُها وإلّا فَشَأنُكَ بِها.قالَ: فَضالَّةُ الغَنَمِ؟ قالَ: هيَ لَكَ أوْلأَخيكَ أوْ للذِّئبِ.قالَ: فَضالَّةُ الإبِلِ؟ قالَ: مالَكَ ولَها؟ مَعَها سِقاؤُها وحِذاؤُها،تَرِدُالماءَ وتَأكُلُ الشَّجَرَ،حَتّى يَلقاها رَبُّها.

پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەرو پرسیاری حوكمی شتی دۆزراوەی لێكرد، ئەویش فەرموی: سەیركە بزانە دەمی تورەكەكەی بەچی بەستراوەو،تورەكەكەیش چیەو چۆنە؟ پاشان تا ساڵێك جاڕی بۆ بدە.ئەگەر خاوەنەكەی هاتەوە بیدەرەوە،ئەگەر نا لای خۆت بێت.وتی: ئەی حوكمی مەڕی دۆزراوە؟ فەرموی: یا بۆ تۆیە،یا كەسێكی تر ئەیبات،یا گورگ ئەیخوات.وتی: ئەی وشتری دۆزراوە؟ فەرموی: تۆ چیتە بە سەریەوە؟ پێڵاوی خۆی وجەوەنەی ئاوی خۆی پێیە،خۆی دێتە سەر ئاوو درەخت دەخوا،تا خاوەنەكەی دەیدۆزێتەوە.

٢.عنْ زَيْدِ بنِ خالِدِ رَضيَ اللّهُ عَنهُ ،قالَ: قالَ رَسولُ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ: مَنْ آوَى ضالَّةً،فَهُوَ ضالٌّ مالَمْ يُعَرِّفْها. هەر كەسێك دۆزراوەیەك لای خۆی گل بداتەوە،هەتا بانگەوازی بۆ نەكات،بەگومڕا دائەنرێت.

گێــڕەرەوەی فەرمودەكــە// ١. صحيح البخاري ، كتاب المساقاة، باب شرب النـاس والدواب من ( ٢٢٦٥). و صحيح مسلم ،كتاب اللقطة(٣٢٢٣). ٢. صحيح مسلم ، كتاب اللقطة ،باب في لقطة الحاج ( ٣٢٣٩).

مانـــای وشـــەكان// فَسَأَلَهُ عَنْ اللُّقَطَة: پرسیاری حوكمی شتی دۆزراوەی لێكرد لەشەرعدا. عَرِّفْها: بۆخەڵكی باس بكە. عِفاصَها: ئەوەی پێی ئەپێچرێت.وِكائَها: ئەوەی پێی ئەبەسترێتەوە. الضّالَّة: ئاژەڵی ونبوو.بەجگە لەئاژەڵیش كەونبوو ئەوترێت(لُقْطَة). سِقاؤُها:

ناوسکی،ملی.حِذاؤها: خوففەکەی پێی. فَهوَ ضالَّ مالَمْ يُعَرِّفْها: گومڕایە ئەگەر نەیناسێنی. چونکە ئەبێت دۆزراوە بناسێنرێت.گەر بەبێ ناسینی هەڵیگرێت،ئەوە گومڕایە. فَشَأْنُكَ بِهَا: ئارەزوی خۆتە ئەیپارێزیت یا سودی لێ وەرئەگریت.

سەرباسەکان//

باسی یەکەم/ لەبارەی حوکمی هەڵگرتنەوەی شتی دۆزراوەدا ،چەند رایەك هەیە:

یەکەم: هەڵگرتنەوەی باشترە،بەڕای ابو حنیفەوشافعی.چونکە لەسەر موسڵمان فەرزە ماڵی براکەی بپارێزێ.

دووەم: هەڵنەگرتنەوەی باشترە،بەڕای مالك واحمد،چونکە:

أ.فەرمودەی: ونبوی موسڵمان ئاگر ئەیسوتێنێ.[1] احمد وإبن ماجةوطحاوي ئەیگێڕنەوە لە عبدالله بن الشخير.

ب.چونکە بژاردن وقەرزداری بەدواوەیە.

سێیەم: هەڵگرتنەوەی فەرزە،بەڕای هەندێك زانا. فەرمودەی (إعْرِفْ عفاصَها )،وا لێك ئەدەنەوە کە: بۆ کەسێکە پێش ئەوەی بەخەڵکی بناسێنێت،بە نیازە سودی لێوەرگرێت.

باسی دووەم/ لەبارەی سودی پێناسکردنەکەی بۆ خەڵکی،چەند رایەك هەیە:

١.تا تێکەڵ بەماڵی خۆی نەبێت.

٢.تا داواکردنەوەی زانراوبێت.

٣.ڕاستگۆی ودرۆزنی داواکەری ئەزانرێت.

٤.کەسێك وەك خۆی وەسفی کرد بۆی ئەگێڕدرێتەوە.

---

[1] ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ حَرَقُ النَّارِ . المعجم الكبير للطبراني - من اسمه عبد الله من اسمه عصمة - عصمة بن مالك الخطمي، حديث : ١٤٣٣٤

**باسی سێیەم/** لەدوای وەسفکردنی،کەسێك هات ووەسفی زیاتری کرد ،قسەکەی وەرئەگیرێت،وپێویستە بۆی بگێردرێتەوە،بە ڕای احمد ومالك،بە بەڵگەی:

١.فەرمودەی باسلێکراو: مَنْ آوىَ ضَالَّةً.

٢.لە ڕیوایەتی بوخاریدا هاتوە: فَإنْ جَاءَ أَحَدٌ يُخْبِرُكَ بِهَا، بِعَدَدِهَا وَوِعَائِها وَوِكائِها فَاعْطِها إِيّاهُ.

دەستەواژەی: أعْطِهَا إِيّاهُ، لە فەرمودەکەدا باسنەکراوە،لە دوای فەرمودەی: فَإنْ جَاءَ صَاحِبُهَا،بۆی دائەنرێت،بۆیە باسنەکراوە چونکە لە ماناکەوە دەرئەکەوێت.

مالکی مەزهەبەکان،باسکردنی سیفەتی پارەو ژمارەکەی،بەمەرج دائەنێن،چونکە لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتوە.وە ئەڵێن: ئەگەر ژمارەکەشی نەزانی بەڵام کیسەکەی زانی،قەیناکا و زەرەری نیە.بەڵام ئەگەر یەکێك لەنیشانەکانی کیسەکەی زانی وئەویتری نەزانی،وتراوە: نایدرێتەوە تا هەردوو نیشانەکە نەزانێت،وە وتراوە: دوای ماوەیەك چاوەڕوانی پاشان ئەیدرێتەوە.

**باسی چوارەم/** لەدوای ئەوەی وەسفی تەواوی کیسەو دەمی کیسەکەی کرد،ئایا بێ سوێند خواردن ،ئەیدرێتەوە،یان پێویستە سوێندیش بخوات؟ دوو ڕا هەیە:

١.بێ سوێند خواردن ئەیدرێتەوە،بە بەڵگەی: ڕوکەشی فەرمودەکان،إبن حجریش زیادەی فَاعْطِها إِيّاهُ ی بە صەحیح داناوە.

٢.بە بێ سوێندخواردن نایدرێتەوە،بە بەڵگەی فەرمودەی: بەڵگە هێنانەوە لەسەر داواکارەو سوێندخواردنیش لەسەر داوالێکراوە.[1]

---

[1] البَيِّنَةُ عَلى الُمدَّعِي وَاليَمِينُ عَلى مَنْ أَنْكَرَ. الدارقطني - كتاب الحدود والديات وغيره، حديث ٢٧٩٣ :

بەڵگەش تەنها شایەتیدان نیە،بەڵکو هەر شتێك حەقی پێ ڕون بێتەوە ئەوە بەڵگەیە،لەوانەش: وەسفی دەمی تورەکەی و تورەکەکەی.

وەڵام دراوەتەوە،کەپێویستە ئیش بە فەرمودە صەحیحەکە بکرێت **فَاعْطِهَا إِيَّاهُ**،کەواتە کە وەسفی کرد پێویستە بۆی بگێڕدرێتەوە.

**باسی پێنجەم/** پێویستە ماڵی دۆزراوو، تەنها تا ساڵێك بناسێنرێت،بێ نرخ بێت یا بەنرخ،بە بەڵگەی:

١.فەرمانکردن لە فەرمودەکەدا،کە فەرز ئەگەیەنێت.

٢.پێغەمبەری خوا ئەو کەسەی بە گومڕا ناوبردوە کە پێناسەی ناکات.

**باسی شەشەم/** لەبارەی ناساندنی دوای ساڵێك،دوو ڕا هەیە:

١.واجب نیە،بە ڕای جمهور،لەکتێبی البَحْرْدا ئەڵێت: کۆدەنگی زانایانی لەسەرە،بە بەڵگەی: ڕوکەشی فەرمودەکە.

٢.واجبە،ئەوەش ڕایەکە لە عمرەوە ئەگێڕنەوە.وەڵامی ئەم ڕایە دراوەتەوە کە بەڵگە لای ڕای یەکەمە.

**باسی حەوتەم/** ناساندنەکەی لە شوێنی کۆبونەوەی خەڵکیدا ئەبێت،وەك بازاڕو بەردەرکی مزگەوتەکان وشوێنی کۆبونەوەکان،ئەڵێت: کێ پارەیەکی لێ ونبوە (بۆ نمونە)،بەڵام سیفەتەکەی باس ناکات.

**باسی هەشتەم/** ئایا بۆی هەیە ماڵە دۆزراوەکە بکاتە موڵکی خۆی؟ دوو ڕا هەیە:

١.بۆی نیە بیکاتە موڵکی خۆی،بە بەڵگەی :

ا.فەرمودەی موسلیم: ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً ،فَإِنْ لَمْ يَجِيءْ صاحِبُها فَهِيَ وَدِيعَةٌ عِنْدَكَ.

ب.لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە: تا ساڵێك بانگەوازی بۆ بکە،ئەگەر خاوەنەکەی نەزانرا،بۆ خۆت خەرجی بکە،با ئەمانەت بێت لات،ئەگەر ڕۆژێك خاوەنەکەی هاتەوە،بیدەرەوە.[1]

---

[1] :ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً،فَإِنْ لَمْ تُعْرَفْ فَاسْتَنْفِقْهَا،وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ،فَإِنْ جاءَ طالِبُها يَوْماً مِنَ الدَّهْرِ فَأَدِّهَا إِلَيْهِ.مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

٢.دروستە هەڵسوکەوت بەماڵەکەوە بکات،بۆ خۆی دەوڵەمەند بێت یا هەژار،یا بیکاتە خێر،بە بەڵگەی فەرمودەی: (وَإِلَّا فَشَأْنُكَ بِهَا)،لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا.

**باسی نۆیەم/** دەربارەی حوکمی دۆزراوە دوای ساڵێك،دوو ڕا هەیە:

١.ئەبێتە موڵکی خۆی،بەڕای عمرو إبن عمرو إبن مسعود ومالك و الثوري والأوزاعي والشافعي،ئەوەش لای صنعانی نزیکترین ڕایە لە ڕاستیەوە،چونکە پێغەمبەری خوا مۆڵەتی داوە لێی سەرف بکرێت،بەڵام فرمانی نەکردوە کە بکرێتە خێر.

٢.تەنها بۆی هەیە بیکاتە خێر.نابێت بۆ خۆی بەکاری بهێنێت،بەڕای علی وإبن عباس وکۆمەڵێك لەشوێن کەوتوان وأبو حەنیفە.

**باسی دەیەم/** ئەگەر دوای ساڵێك فەوتا،بۆ قەرەبوکردنەوەی،چەند ڕایەك هەیە:

١.ئەگەر ماڵەکەی خوارد،بەرپرسیارە بەرامبەری،خۆ ئەگەر مابوو پێویستە بیگێڕێتەوە،ئەگەر نا نرخەکەی ئەداتەوە،ئەمەش ڕای جمهورەو صەنعانیش بە پەسەندی داناوە،بە بەڵگەی:

ا.فەرمودە پێشوەکەی موسلیم : وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ،کە بەڵگەی ئەوەیە پێویستە قەرەبوبکرێتەوە.

ب.لەدوای ئەوەی کە مۆڵەتی لێ سەرفکردنی ئەدات،پێغەمبەری خوا فەرمان ئەکات بە گەڕانەوەی بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر ڕۆژێك پەیدا بوو،ئەمەش واتە بەرپرسیارە بەرامبەری.

٢.ئەگەر ماڵەکەی خوارد،قەرەبوی ناکاتەوە کە خاوەنەکەی پەیدا بوەوە.چونکە بوەتە ماڵی خۆی.بەڕای أهل الظاهر وکە ڕابیسي.

صەنعانی ئەڵێت: نازانم دەربارەی فەرمودەکەی موسلیم چی ئەڵێن؟ کە بەڵگەیە لەسەر پێویستی قەرەبوکردنەوەی.

**باسی یازدەهەم/** زانایان یەکڕان لەسەر ئەوەی ئەگەر مەڕێك لەشوێنێکی دور لەئاوەدانی دۆزرایەوە،بۆی هەیە بیخوات،چونکە پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت: بۆتۆیە،یا بۆ براکەتە،یا بۆ گورگە.واتە ئەگەری لەناوچونی هەیە،جا یا تۆ ئەیبەیت یا کەسێکی تر.

**باسی دوازدەهەم/** فەرمودەکە هاندانی تێدایە بۆ هەڵگرتنەوەی مەڕی ونبوو.

**باسی سیانزەهەم/** مەبەست لە فەرمودەی: أَنْ تَأْخُذهَا أَوْ أَخُوكَ، لەوە فراوانترە کە خاوەنەکەی یا هەر کەسێکی تر بیبات،مەبەستیش لە گورگ،هەموو دڕندەیەکە کە مەڕ بخوات.

**باسی چواردەهەم/** دەربارەی قەرەبوکردنەوەی ئەو مەڕەی کە خوراوە بۆ خاوەنەکەی،دوو ڕا هەیە:

١.پێویستە نرخەکەی بداتەوە بە خاوەنەکەی،بەڕای جمهور.

٢.قەرەبوی ناکاتەوە ،بە ڕای مالك،بە بەڵگەی ئەوەی کە هەڵگرەوەی مەڕەکەو گورگی وەك یەك داناوە،گورگ ئەگەر مەڕی خوارد،قەرەبو ناداتەوە،کەواتە کەسێکیش هەڵیبگرێتەوەو بیخوات بە هەمان شێوە.

وەڵام دراوەتەوە کە پیتی لام (لَكَ) بۆ موڵکداری نیە،چونکە گورگ نابێتە خاوەندار.

**باسی پانزەهەم/** زانایان کۆدەنگن لەوەدا ئەگەر پێش ئەوەی بخورێت خاوەنەکەی پەیدا بوو،بۆی ئەگێڕدرێتەوە.

**باسی شانزەهەم/** دەربارەی وشتری ونبوو،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: هەڵناگیرێتەوە،بەڵکو وازی لێ ئەهێنرێت تا بلەوەڕێت،وئاوبخواتەوە،تا خاوەنەکەی پەیدا ئەبێت،چونکە پێغەمبەری خوا ئەو حوکمەی بۆ داناوە.

وە پێغەمبەری خوا ئاگاداری کردوینەتەوە کە: وشتر پێویستی بە کەس نیە پارێزگاری بکات،چونکە توانای بەرگەگرتنی تینوێتی هەیە،وە بێ

ماندوبون ئاو ئەخواتەوە،لەبەر درێژی ملی وتوانای ڕۆشتنی،بۆیە پێویستی بە کەس نیە هەڵیبگرێتەوە،بەپێچەوانەی مەڕەوە.

حیکمەتیش لە ڕێگریکردنی هەڵگرتنەوەیدا ئەوەیە کە: لەو شوێنەدا بمێنێتەوە کە ونبوە،زوتر خاوەنەکەی ئەیدۆزێتەوە،وەك لەوەی لای خەڵکی پارێزراو بێت.

دوەم: باشتر وایە هەڵبگیرێتەوە،بەڕای حەنەفی مەزهەبەکان و ئەوانەی هاوڕای ئەوانن.

بەشى سێيەم :

# كاروبارى كەسێتى وسزاكان

# الأحوال الشخصية

# والجنايات

**الحَديثُ ٩٩// عَنْ إبنِ عَبّاس رَضِيَ اللّهُ عَنهُمَا قَالَ:قَالَ رسولُ الله صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلحِقوا الفَرائِضَ بِأَهلِها،فَمَا بَقِيَ فَلِأولى رَجُل ذَكَر..**

**بەشەكان بگەیەنن بە خاوەنەكانی،ئەوەی مایەوە بۆ یەكەم نێرینەیە.**

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە//** صـحيح البخـاري ،كتـاب الفـرائض ،بـاب مـيراث الولـد مـن أبيـه وأمـه ( ٦٣٦٢) .. صـحيح مـسلم ،كتـاب الفـرائض ،بـاب ألحقوا الفرائض بأهلها (٣١١٣).

**مانـــــای وشـــــەكان//** الفَـرائِض كـۆی الفَريـضَة يە،واتـە: بـڕی دیاریكراوو،وشەكە تایبەت كراوە بە میرات بردن.

**سەرباسەكان//**

**باســی یەكـــەم/** سـودی وەسـف كردنـی پیـاو بـە نێرینـە لەفەرمودەكـەدا،بۆ دوپات كردنەوەیە.

**باســـی دووەم/** بـڕە دیاریكراوەكـان لەقورئانـدا شەشـن: نیوە،چـواریەك ،هەشتیەك، دوو لە سەر سێ ،سێیەك،شەشیەك.

**باســی سـێیەم/** مانـای (مِنْ أَهْلِهَا)،كەسێك بـە دەقـی قورئـان مـافی هەیـە لـە میراتدا.

**باســـی چـــوارەم/** أَوْلَـى: إسمــي تفـضيلە لـە الـوَلِيّ وەرگـیراوە، واتـە نزیك،واتەی دەستەواژەكەش: نزیكترین پیاوە لەمردوو.

لە بارەی مانای ( أَولَى رَجُل)،چەند ڕایەك هەیە:

أ.خطابي ئەڵێت: نزیكترین پیاوێك كە عصبە (پشت) بێت.

ب.إبـن بطـال ئـەڵێت: ئـەو پیاوانـەی كـە عـصبەن،لە دوای خـاوەن بـڕە دیاریكراوەكان،گـەر تیایانـدا بـوو لـە هـەمویان نـزیكتر بـوو لـە مردوەكە،ئـەو مـافی میراتەكـەی هەیـە نـەك دورەكە،ئەگـەر لـەنزیكیان لەمردوەكـە وەك یـەك بون،میراتیەكە بەش ئەكەن.

ج.وتراوە: مەبەستی پورە لە گەڵ مامدا،و کچی برایە لەگەڵ کوڕی خوشك،و کچی مامە لە گەڵ کوڕی مام.

براو خوشکی دایك و باوکی یا لە باوکەوە،عصبەنین،بەڵکو بە دەقی ئایەت بەشیان هەیە: ﴿وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ {النساء:١٧٦}.واتە: ئەگەر چەند براو خوشکێك بوون،ئەوە برا دوو ئەوەندەی خوشکی ئەدرێتێ.

<u>باسی پێنجەم/</u> نزیکترین عصبە کوڕە،پاشان کوڕەکانیان و بەرە وژوور،پاشان باوك،دوای ئەو باپیر(باوکی باوك) و سەروتر.....................

<u>باسی شەشەم/</u> فەرمودەکە باسی کاتێك ئەکات کە عَصَبَة لەپیاوان هەبێت. ئەگەر نەبوو ،پاشماوەی میراتەکە ئەدرێتە ئەو ئافرەتانەی بڕیان بۆ دیاری نەکراوە،بە بەڵگەی:

فەرمودەی إبن مسعود لەبارەی کچێك و کوڕێك وخوشکێك: پێغەمبەری خوا نیوەی داوە بە کچەکە،بۆ تەواوکردنی دوو لەسەر سێیەکە شەش یەکی داوە بە کچی کوڕەکە،ئەوەی ماوەتەوە بۆ خوشکەکە.[1] بخاری گێراویەتەوە.

ئەمەش کۆدەنگیەکە لەوەی خوشکان لەگەڵ کچاندا عصبەن.

---

[1] حَديثُ إبنِ مَسعود رَضيَ اللهُ عَنهُ في بنت وبِنْتِ إبْنٍ وَأختٍ،قَضى النبيُّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ لِلإبْنَةِ النِصْفُ،وَلِإبْنَةِ الإبْنِ السُدُسُ،تَكمَلَةَ الثُلُثَيْنِ،وَما بَقيَ للأخْتِ. صحيح البخاري - كتاب الفرائض، باب ميراث ابنة الابن مع بنت - حديث : ٦٣٦٦

**الحَديث ١٠٠// عَنْ أُسامَةَ بـن زَيـد رَضيَ اللّـهُ عَنْهُمـا،أنّ النبِـيَّ صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ قَالَ: لَايَرِثُ الُمسْلِمُ الكافِرَ،وَلَا الكافِرُ الُمسْلِمَ..**

**موسـڵمان نابێتـه میراتگـری بێباوەڕو،بێبـاوەڕیش نابێتـه میراتگـری موسڵمان.**

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـه/** صـحيح البخاري،كتـاب الفـرائض، بـاب لا يـرث المـسلم الكـافر ولا الكـافر المـسلم – ( ٦٣٩٤) . صـحيح مـسلم ،كتـاب الفرائض ( ٣١١٢).

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکــەم/** وشـەی (المُـسْلِم) لەسـەرەتای فەرمودەکـەدا فاعله،(الكَافِرْ) يش مَفْعولُ بِهِ،بەڵام لەکۆتایی فەرمودەکە بەپێچەوانەیە.

**باســی دووەم/** لـه بـارەی میراتگردنـی موسـڵمان لـەبێباوەڕو ئـەویش لـه موسڵمان،دوو ڕاهەیە:

یەکەم: هیچ یەکێکیان میراتی ئەویتر نابەن،بەڕای جمهور،بەڵگەشیان:

أ.فەرمودەی باسلێکراو.

ب.فـەرمودەی عبـدالله بـن عمـر کـه ئـەڵێت: پێغەمبـەری خـوا فەرمویـەتی: دوومیللەتی جیا میراتی یەکتر نابەن.[1] أحمد وچوارەکە گێڕاویانەتەوە.

دووەم: موسـڵمان میراتگـری بێباوەڕە،بـەڵام بەپێـچەوانەوە نابێت،ئەمـەش ڕای موعـازو موعاویـەو مـسروق وسـعيد بـن المـسيب وإبراهیمـی نەخـەعی وإسحاق وإمامیەو ناصر،بە بەڵگەی:

أ.موعـاز گـوێی لـه پێغەمبـەر بـوە فەرمویـەتی: ئیـسلام زیادئـەکات وکـەم ناکات.[1] ابوداود گێڕاویەتەوەو،حاکم یش بە صحیحی داناوە.

---

[1] لَا يَتَوارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ. سنن الترمذي الجامع الصحيح - الذبائح ،أبواب الفرائض عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب لا يتوارث أهل ملتين، حديث : ٢٠٨٥

ب.دووبــرا یــەكێكیان موســڵمان ئــەویتریش جوو،باوكیــان بەجولەكــەیی مــرد، كــوڕە جولەكەكــە هــەموو میراتەكــەی برد،كەهاتنــە لای موعــاز بــۆ دادوەری كـــردن كاتێــك موســـڵمانەكە شـــكاتی كرد،موعـــاز بەشـــی موسڵمانەكەشیدا.[٢] مسدد گێڕاویەتەوە.

ج.إبــن ابــی شــیبە لــە عبــدالله بــن مغفــل ئەیگێڕێتەوە،كــە وتویــەتی: لەقــەزاوەتی موعاویــەم باشــتر نــەبینیوە،میرات لــەخاوەن كتێبەئاسمانیــەكان ئەبــەین وئــەوان لێمان نابەن،حەڵاڵە ژنیان لێبخوازین،وبۆیان نیە لێمان بخوازن.[٣]

وەڵام دراوەتەوە كە:

ا.فەرمودەكەی بوخاری وموسلیم دەقە لەمیرات نەبردنیان.(هیچ كامیان).

ب.لەفەرمودەكــەی موعــازدا تایبەتمەنــدێتی میراتبردنــی موســڵمانی تیــا نیە،تــەنها بــاس لــە باشــێتی دیــنی ئیــسلام ئــەكات بەســەر دینــەكانی تــردا،وە لە زیادبوندایەو كەم نابێت.

باسی سێیەم/ لەبارەی میراتی هەڵگەڕاوەوە،چەند ڕایەك هەیە:

یەكەم: میراتبەرە موسڵمانەكانی میراتی ئەبەن،بەڕای هادی وأبویوسف ومحمد.

دووەم: میراتەكەی بۆ بیت الماله.بەڕای شافیعی.

سـێیەم: ئەومالــەی پــێش پەشــیمان بونــەوە دەســتی كــەوتوە بــۆ میراتبــەرە موســڵمانەكانێتی،ئەوەش دوای هەڵگەڕانــەوە دەســـتی كــەوتبێت،بۆ بیـــت المالە،ئەمەش ڕای ابو حنیفەیە.

---

[١] الإسلامُ يَزيدُ وَلا يَنْقُصُ. سنن أبي داود - كتاب الفرائض ، باب هل يرث المسلم الكافر ؟ - حديث : ٢٥٣٩

[٢] إختَصَمَ إلى معاذ أخوانِ مُسلِمٌ ويَهوديٌ،ماتَ أبوهُما يَهودِياً،فَحازَ إبنه اليهودي ميراثَهُ،فَنازعهُ المُسلِمُ،فَوَرثَهُ معاذ.

[٣] ما رَأَيْتُ قَضاءاً أَحْسَنَ مِنْ قَضاءِ معاوية،نَرِثُ أهلَ الكتاب،وَلا يَرِثونَنا،كَما يَحِلُّ لَنا النِّكاحُ مِنهُمْ،وَلا يَحِلُّ لَهُمْ مِنّا. مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الفرائض، من كان يورث المسلم الكافر - حديث : ٢٠٨١٦

**الحَدِيثُ ١٠١// عَنْ المِقْدام بـنِ مَعْدِيكَرِب رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: الخالُ وارِثُ مَنْ لا وارِثَ لَهُ..**

خاڵ میراتگری کەسێکە کە میراتگری تری نەبێت.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** أحمـد وأبـوداود ونـسائي وابـن ماجـة. ابوزرعـه ی رازی بەحـسنی دانـاوه و،حـاكم وابـن حبـان بەصـحيحی دانـاوه. سـنن الترمـذي الجـامع الـصحيح - الـذبائح أبـواب الفـرائض عـن رسـول الله صـلى الله عليـه وسلم - باب ما جاء في ميراث الخال حديث : ٢٠٨١[1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** خاڵ بە خزمان دائەنرێت.

**باسی دووەم/** لەبارەی میرات بردنی خزمانەوە دوو ڕا هەیە:

یەکـەم: مـیرات ئەبەن،کەسـێك دوای خـۆی تـەنها خوشـکی دایـك وخوشـکی بـاوك جێبهێڵێت،لەسـێ بـەش دوبەشـی بـۆ خوشـکی بـاوك وبەشـێکیش بـۆ خوشـکی دایك،ئەمـەڕای زۆرێـك لـەزانایانی ئـالی بـەیت وعەلی وابن مسعود وأبي الدرداء.....بەبەڵگەی:

١.فەرمودەی باسلێکراو. وەڵامیان دراوەتەوەکە:

أ.فەرمودەکـە تـەنها باسـی خـاڵ ئـەکات نـەك خـەڵکی تر،ئایەتەکـەش بـەکورتی باسیکردوە،مانای أولي الأرحام، تیایدا لەماناکەی لای زانایانی فیقە.

ب.فـەرمودەی باسـکراویش قـسەی لەسـەرە.بـەڵام: فەرمودەکـە هەنـدێك زانـا بـە صـحیحیان دانـاوە هەنـدێکی تـریش بەحـسن،بەکۆی هـەمویان دەتوانرێ ئیشی پێبکرێت گەر بەتەنهاش ئیشی پێ نەکرێت.

٢.گـشتگیری ئایـەتی﴿وَأُوْلُـواْ الأَرْحَـامِ بَعْـضُهُمْ أَوْلَـى بِـبَعْضٍ فِـي كِتَـابِ اللّـهِ إِنَّ اللّـهَ بِكُـلِّ شَـيْءٍ عَلِـيمٌ ﴾{الأنفـال:٧٥} .واتـە: خزمـەکان بەیـەکتری لـە

---

[1] قال الألباني في الإرواء: إسناده حسن ( ٦/١٣٨ ).

پێشترن لە کتێبی خوادا،خوای گەورە بە هەموو شتێك زانایە.گشتگیری ئایەتی﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ ﴾{النساء:٧}.واتە: پیاوان بەشیان هەیە لەو ماڵەی باوك ودایك و خزمانیان بۆیان جێهێشتون،وە ئافرەتانیش بەشیان هەیە لەو ماڵەی باوك ودایك و خزمانیان بۆیان جێهێشتون.

وشەکانی: الرِّجال،النِّساء، الأَقرَبين، ئەیانگرێتەوە،کەسێکیش بڵێت ئەم ئایەتە تایبەت کراوە پێویستە بەڵگە بهێنێت.

بەلام وتراوە کە ئەگەر لەگشتگیری ئایەتەکاندا هەیە.

دووەم: میرات نابەن: بەڕای زید بن ثابت وزوهری ومکحول والقاسم بن إبراهيم امام یەحیاو مالیکی و شافیعی زانایانی حجازە.بەبەڵگەی:

١.پشکەکان تەنها بەقورئان یا سوننەتێکی ڕاست یا کۆدەنگی زانایانەوە جێگیر ئەبێت.ئەمانەش لێرەدا بەدیناکرێت.

٢.چەند فەرمودەیەك باسی میراتنەبردنی پور لەڕێی دایك وباوکەوە ئەکەن،هەرچەند قسەیان لەسەرە ،بەڵام پاڵپشتە بەوبناغەیەی کە میراتبردن نیە بەبێ بونی بەڵگە لەوانەی باسکران.

**باسی سێهەم/** ئەوانەی پێیان وایە خزمان میرات نابەن ئەڵێن:

کەسێك هیچ میراتگرێکی نەبێت،ئەگەر بَيْتُ المَال رێکخرابوو،بۆ ئەوە.ئەگەر لەدەستی پێشەوایەکی دادگەردابو کە لە خاوەن مافەکاندا صەرفی ئەکات،یا لەوڵاتدا دادوەرێك هەبوو کە مەرجی دادوەری تیابوو وەڕێی پێدرابوو ماڵی خەڵکی هەڵسوڕێنێت،ئەوماڵە میراتیەی ئەدرێتی،تا لە بەرژەوەندیەکاندا بەگەڕی بخات.

الحديث ١٠٢// عَنْ جابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسولِ اللهِ صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قالَ: إذا إِسْتَهَلَّ المَوْلودُ وَرِثَ.

ئەگەر منداڵ هاتە دنیاوە میراتی ئەبات.

گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە// سـنن ابـی داود ،کتـاب الفـرائض ،بـاب في المولـود يستهل ثم يموت ( ٢٥٤٦ ).. وە إبن حبانيش بەصحيحی داناوە.[1]

سەرباسەکان//

باسی یەکەم/ لەمانای (الإِسْتِهْلال)،داچەند ڕایەك هەیە:

یەکـەم: فەرمودەیـەکی لاواز گێڕدراوەتـەوە دەربـارەی ماناکـەی:(الإِسْـتِهْلالُ العطَاس) إِسْتِهْلالْ واتە پژمین. بزار گێڕاویەتەوە.[2]

دوەم: إِبْـنُ الأثِيـر ئـەڵێت: گریـانی منداڵـە کـاتی لەدایکبونی،چـونکە بەڵگەو نیشانەی ژیانیەتی.

باسی دوەم/ لەبارەی چۆنیەتی زانینی ژیانی مناڵەکە، دوو ڕایە هەیە:

یەکەم: دەنگ یا جوڵە،بەڕای علی والكرخي وزفر و شافعي.

دوەم: هاوارکردن،بـەڕای إبـن عبـاس وجـابر وشـريح ونخعـي ومالـك وخەڵکی مەدینە.

باسـی سـێیەم/ فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: ئەگـەر منـداڵ بە زینـدوی بوو،پاشان مـرد،وەك خـەڵکی تـر تەماشـا ئـەکرێت: مـیرات ئـەبات و خزمـەکانی میراتـی لـێ ئەبەن،هـەمان حوکمـەکانی وەك شـۆردن وکفنکـردن و نوێـژکردن لەسـەری و،لـە کاتی کوشتنیدا تۆڵە یا خوێنبایی پێویست ئەبێت.

---

[1] صححه الألباني في صحيح أبي داود من حديث أبي هريرة ( ٢٩٢٠ ).

[2] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الديات الاستهلال التي تجب به ؟ الدية - حديث : ٢٧٤٦٨

**باسی چوارەم/** دەربارەی ژمارەی ئەو ئافرەتە متمانەپێکراوانەی هەواڵی ژیانی مناڵەکە ڕائەگەیەنن ،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: تەنها یەك ئافرەت بەسە،بەڕای هادەویە.

دوەم: پێویستە دوو ئافرەتی متمانەپێکراو بن،بە ڕای هادی ومالك.

سێیەم:پێویستە چوار بن،بە ڕای شافعی.

ئەم جیاوازی ڕایەش لە هەموو ئەوانەیە کە تایبەتن بە ئافرەتانەوە.

**باسی پێنجەم/** فەرمودەکە ئەوە ئەگەیەنێت کە: ئەگەر مناڵەکە نیشانەی ژیانی تیا نەبوو، بە زیندوو دانانرێت و هیچ کام لەو حوکمانەی سەرەوە نایگرێتەوە.

**الحَديثُ ١٠٣// عَنْ عَمرو بنِ شعيب عنْ أبيهِ عَنْ جَدِّهِ، قالَ: قالَ رَسُولُ الله صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ : لَيْسَ لِلقَاتِلِ مِنَ المِيْراثِ شَيْءٌ.**

بکوژ هیچ شتێك لەمیراتی کوژراوەکە نابات.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** السنن الكبرى للنسائي ،كتاب الفرائض، توريث القاتل (٦١٧٧). سنن الدارقطني ، كتاب الفرائض والسير وغير ذلك،(٣٦٣٢).[1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی میرات بردنی بکوژ،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: میرات نابات،کوشتنی ئەنقەست بێت یا بەهەڵە،بە ڕای شافعی وابوحنیفە و هاوەڵانی و زۆربەی زانایان.

وە ئەڵێن: نە لە خوێنباییەکە،نە لە سامانی کوژراوەکە میراتی نابات،بە بەڵگەی:

١.فەرمودەی باسلێکراو.چەند پاڵپشتێکیشی هەیە بە هەمویانەوە،ئیشیان پێ ئەکرێت.

---

[1] قال الألباني في الإرواء: صحيح لغيره.(١٦٧١).

ب.بەیهەقی لەخلاسەوە ئەیگێڕێتەوە:پیاوێك بەردێكی هەڵداو بەر دایكی خۆی كەوت وپێی مرد،ویستی میراتیەكەی دایكی ببات،براكانی وتیان: مافت لەمیراتەكەدا نیە.كە كێشەكەیان بەرزكردەوە بۆلای عەلی،پێی وت: لەمیراتیەكەیدا تەنها بەردەكە مافی تۆ بوە.خوێنی دایكی لێسەندو هیچیشی لەمیراتەكە نەداپێی.[1]

ج.هەروەها بەیهەقی لە جابر كوڕی زەید ئەیگێڕێتەوە،كە وتویەتی: هەر پیاوێك،پیاوێك یا ئافرەتێك لەوانەی كە میراتیان لێئەبات،بەئەنقەست یا بە هەڵە بكوژێت،میراتەكەی بەر ناكەوێت.هەر ئافرەتێكیش،پیاوێك یا ئافرەتێك بكوژێت،بە ئەنقەست یا بە هەڵە،میراتەكەیانی بەر ناكەوێت.[2]

ئەگەر كوشتنەكە بە ئەنقەست بوو،تۆڵەی لێ ئەكرێتەوە،مەگەر میراتبەرەكانی لێی خۆشبن. خۆ ئەگەر لێشی خۆشبن،بەشە میراتی نە لە خوێنەكە نە لە میراتیەكەی بەر ناكەوێت.ئەمەش قەزاوەتی عومەری كوڕی خەتاب وشورەیح وزۆری تر لە دادوەرانی موسڵمان.

دوەم: ئەگەر كوشتنەكە بە هەڵە بوو،لەماڵەكە میراتی ئەبات ،نەك لە خوێنەكە،بە ڕای هادەویە ومالك ونەخەعی.

وەڵامی ئەم ڕایە ئەدرێتەوە كە: هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەو جیاكاریە نیە،بەڵكو بە فەرمودەكانی پێشوتر وەڵام ئەدرێتەوە.

---

[1] أن رجُلاً رَمى رَجُلاً بحَجَرٍ فَأصابَ أمَّهُ،فماتتْ منْ ذلكَ،فأرادَ نصيبَهَ منْ ميراثِها،فقالَ لهُ إخوته:لا حَقَّ لكَ،فارْتَفَعُوا إلى عَليّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ،فقالَ لهَ عليٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: حَقكَ مِنْ ميراثِها الحَجَرُ،فأغرَمَهُ الدِّيةَ،ولَمْ يُعْطِه مِنْ ميراثِها شيئاً. السنن الكبرى للبيهقي - كتاب الفرائض، باب لا يرث القاتل - حديث : ١١٤٥١.

[2] أيما رَجُل قَتَلَ رجُلاً أوْ إمراةً عَمْداً أوْ خَطَأً مِمَّنْ يَرِثُ ،فلا ميراثَ لهُ منْهُما،وأيما إمْرَأةٍ قَتَلَتْ رَجُلاً أو إمْرَأةً عَمْداً أوْ خَطَأً،فَلا ميراثَ لهُ منهما. السنن الكبرى للبيهقي - كتاب الفرائض، باب لا يرث القاتل - حديث : ١١٤٥٢

الحديث ١٠٤// عَنْ عَمرو بن شُعَيب عَنْ أبيهِ عَنْ جَدِّهِ عَن النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أُودِعَ وَدِيعَةً فَلَيْسَ عَلَيهِ ضَمانٌ.

کەسێك شتێکی لادانرا،کە تیاچوو بەرپرسیار نیە لێی.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە/ إبن ماجه،كتاب الصدقات ،باب الوديعة (٢٣٩٨).[1]

لە ڕوایەتێکی دارَقُطني دا هاتوە: لَيْسَ على المُستَعيرِ غَيرِ المُغِلِ ضَمانٌ،وَلا عَلى المُستَوْدِعِ غيرِ المُغِلِّ ضَمانٌ. سنن الدارقطني - كتاب البيوع، حديث : ٢٥٩٤

سەرباسەکان//

باسی یەکەم/ وَدِيعَة: ئەو ماڵەیە کە خاوەنەکەی یا کەسێك لەبری ئەو،لای کەسێکی تر دایئەنێت،بە مەبەستی پاراستنی.

وەرگرتنی ئەو ماڵەش دوو حوکمی هەیە:

١.سوننەتە: ئەگەر لە دەستپاکی خۆی دڵنیا بوو،بە بەڵگەی ئایەتی:﴿وَتَعاوَنوا عَلى البِرِّ وَالتَّقْوى﴾ {المائدة:٢}.

وە فەرمودەی: خوا لە یارمەتی بەندەکەیدایە ما دام ئەو لەیارمەتی براکەیدا بێت.[2] موسلیم گێڕاویەتەوە.

٢.فەرزە: کاتێك کەسی تر لەو گونجاوتر نەبوو،ترسی ئەوەشی هەبوو ئەگەر وەری نەگرێت،ماڵەکە لەناو ئەچێت.

باسی دوەم/ دەربارەی ماڵی خواستراو، دوو ڕاهەیە:

---

[1] حسنه الألباني في الإرواء (١٥٤٧).

[2] واللهُ في عونِ العبدِ ما دامَ العَبْدُ في عَوْنِ أخيه. صحيح مسلم - كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار،باب فضل الاجتماع على تلاوة القرآن وعلى الذكر - حديث : ٤٩٧٣

یەکـــەم: بەئەمانـــەت دائەنرێت،واتـــە ئـــەو کەســـەی لای دانراوە،قـــەرەبوی ماڵەکـــە ناکاتـــەوە کـــە لـــە ناوچـــو،مەگەر بـــە ئەنقەســـت زەرەری پـــێ گەیاندبێت،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.چـــەند وتەیـــەك لـــە أبوبـــەکرو عـــەلی وإبـــن مـــسعود وجابرەوە،هەیە.هەندێکیان قسەی لەسەرە.

ج.کۆدەنگی زانایان لەو بارەیەوە،وەك لە کتێبی البحردا هاتوە.

دوەم: ئەگـــەر قەرەبوکردنـــەوە بـــە مـــەرج دانرا،ئـــەوە لـــە ئەســـتۆیدایە،ئەم رایەش لە حەسەنی بەصری ئەگێڕنەوە.

وەڵـــام دراوەتـــەوە کـــە: لـــە گـــەڵ دەســـتدرێژی کردنـــی بـــە ئەنقەســـتدا ،قـــەرەبوی لەســـەرە. چـــونکە بـــەو دەســـتدریژیکردنە ئەبێتـــە ناپاك،کەســـی ناپـــاکیش لـــە ئەســـتۆیدایە،وەك پێغەمبـــەر ئەفـــەرموێت: وَلا عَلـــى المُـــسْتَوْدِعِ غَيْر المُغِلِّ ضَمانٌ.

المُغِـــلّ واتـــە ناپاك،،واتـــە ئەگـــەر دەســـتدرێژی کـــردە ســـەر ماڵەکـــەو نەیپاراست،ئەوە قەرەبوی لە سەرە،چونکە جۆرێکە لە ناپاکی.

<u>**باسی سێیەم/**</u> وَديعَة دانان،بە دوو شێوە ئەبێت:

١.بـــە زمان،بڵێـــت: ئـــەم ماڵـــەم لای تـــۆ دانـــا ،بیپـــارێزە بـــۆم.یـــا هـــەر وشـــەیەکی تر ئەو مانایە ببەخشێت.

٢.بـــە بـــێ دەربـــڕینیش ئـــەبێت،وەك ئـــەوەی لـــە دوکانەکەیـــدا شـــتێك دابنێت،ئـــەویش ئاگـــادار بێـــت،وە ڕێگـــری لێنـــەکات،یا لـــە مزگەوتـــدا بێت،بـــەلأم لـــە نوێژکردنـــدا نـــەبێت.بـــەلأم ئەگـــەر نوێـــژی ئەکرد،ئـــەوە نیـــشانەی ڕەزامەندی نیە،چونکە لەو کاتەدا ناتوانێت ڕای خۆی دەرببڕێت.

( ١٠٥ ) عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ مَسْعُود رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ الله( صَلّىَ اللهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ ): يا مَعشرَ الشَّبابِ مَنْ إسْتَطاعَ مِنْكُم الباءةَ فَليَتَزَوّجْ، فإنَّهُ أغَضُّ لِلبَصَر،وأحْصَنُ لِلفَرْجِ،وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيهِ بِالصَّوْمِ فإنّه لَهُ وجَاءٌ..

ئەی کۆمەڵی گەنجان،هەر کەسێکتان توانای هاوسەرگرتنی هەبوو،با بیهێنێت،چونکە زیاتر چاو ئەگرێتەوەو داوێن ئەپارێزێت. کەسێکیش توانای نەبوو،با بەڕۆژوو بێت چونکە قەڵغانە بۆی.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري،كتاب النكاح،باب قول النبي من إستطاع منكم الباءة (٥٠٦٦). وصحيح مسلم ، النكاح،(٣٤٦٤).

**مانـــای وشـــەکان//** النِّكـاحْ،لەزمانەوانیـدا: تێهەڵکێشکردن وچونەناویەك. لەشەرعیشدا: گرێبەستێکە،جوتبونی پێ حەڵاڵ ئەبێت.

مَعْشَر: کۆمەڵێك کە لە سیفەتێکدا هاوبەش بن. الشَّباب: گەنجان.لەبنەڕەتدا واتە جوڵەو چالاکی.چەند ڕایەك هەیە بۆ دیاریکردنی تەمەنی لاو. تاکو شانزە ساڵی حَدَثْ پێگەشتوە،تا سی ساڵی شَابْ گەنجە،تا چل ساڵی كَهْلْ كاملْ، سەرو چل ساڵیش شَيْخْ واتە پیر.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکـەم/** فەرمودەکە ڕوی لە گەنجانە،چونکە ئەوان شەهوەتیان بەرامبەر ئافرەتان هەیە.

**باسی دومم/** دەربارەی مەبەست لەوشەی (البَاءَة ) ،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: الجِمَاعْ،واتەجوتبون.ئەم ڕایەش دروسترینیانە،مانای فەرمودەکەش ئەوەیە: کەسێك توانای جوتبونی لەگەڵ ئافرەتاندا هەبێت،لە بەر ئەوەی توانای ماڵی بۆ هاوسەرگیری هەیە،با ژن بهێنێت،کەسێکیش توانای جوتبونی نەبێت،لەبەر ئەوەی توانای ماڵی ژنهێنانی نیە،با بەڕۆژو بێت،تاکو ئارەزوەکەی دامرکێت.

دوەم: پێویستیەکانی ژنهێنان،واتە: کەسێك پێویسیەکانی ژنهێنانی هەیە،با ژن بهێنێت،کەسێکیش نیەتی با بەڕۆژو بێت.

**باسی سێیەم/** فەرمودەی: (فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)،واتە: چۆن الوجاء ئارەزوەکەی دائەمرکێنێتەوە، ڕۆژوش هەمان کاریگەری هەیە.

دەربارەی مانای الوجَاءْ یش، دوو ڕا هەیە:

١.دەرهێنانی هەردوو گونە،وەك لەڕیوایەتی إبن حباندا هاتوە.

٢.خەساندن.

**باسی چوارەم/** فەرمودەی: فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ،هاندانە بۆ بەڕۆژوبون.

لە بەر ئەم هۆکارانەیە ڕۆژو بوەتە قەڵغان بۆ خاوەنەکەی:

١.بە کەمکردنەوەی خواردن وخواردنەوە،دڵ ودەرون لە ئارەزوو ئەگەڕێتەوە.

٢.خوای گەورە نهێنیەکی لە ڕۆژودا داناوە،لە کاتێکدا تەنها وازهێنان لەخواردن وخواردنەوە بێ بەڕۆژوبون،ئەو کاریگەریەی نیە.

٣.لە بەڕۆژوبوندا ئاگاداری خوایی تیایە،کەسێکیش خوا بکاتە ئاگادار بەسەر خۆیەوە،لە گوناهەکان دور ئەکەوێتەوە.

**باسی پێنجەم/** خَطّابي فەرمودەی: فَعَلَيْهِ بِالصَّوم،ئەکاتە بەڵگەی ئەوەی کە: بەکارهێنانی داودەرمان بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزوەکان دروستە.بەڵام پێویستە دەرمانێك بێت ئارەزوەکە بنبڕ نەکات،تەنها هێواشی بکاتەوە،چونکە:

١.لەوانەیە لە دواڕۆژدا توانای ژنهێنانی بۆ دروست بێت،بەڵکو خوای گەورە پەیمانی دەوڵەمەند بونی بەو کەسە داوە، کە داوێنی پاك ڕائەگرێت.

٢.کۆدەنگن لەوەدا کە: خۆخەساندن و گون دەرهێنان دروست نیە،بەکارهێنانی ئەم دەرمانەش بۆ بنبڕکردنی،وەك ئەوانە.

**باسی شەشەم/** دەربارەی جۆری فەرمان کردن بە ژنهێنان لەفەرمودەکەدا،ئەم ڕایانە هەیە:

١.بۆ کەسێك توانای هەبێت،ئەو فەرمانە بۆ واجب بونە،ئەمەش ڕای داود وإبن حزم و ڕیوایەتێکی احمد وکۆمەڵێك لەسەلەف،بە بەڵگەی: ڕوکەشی فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.فەرمانەکە بۆ ندب خۆبەخشیە.ئەمەش ڕای جمهورە،بە بەڵگەی ئایەتی:﴿فَوَاحِدَةً أَوْمامَلَكَتْ أَيمانُكُمْ﴾{النساء: ٣}.

ئەم ئایەتە سەرپشکی کردوین لەنێوان ژنهێنان و کەنیزەك دا.بەکۆدەنگی زانایان ڕابواردن لە گەڵ کەنیزەکدا واجب نیە،کەواتە ژنهێنانیش واجب نیە،چونکە لەنێوان کردارێکی واجب و ناواجب دا سەرپشك ناکرێت.

بانگەشەی کۆدەنگی زانایانیش بەدی نەهاتوە،چونکە داود وإبن حزم ڕای جیاوازیان هەیە.

إبن دقیق العيد ئەڵێت: هەندێك شەرعزان ژنهێنان ئەکەن بەم بەشانەوە:

یەکەم: واجبە،بۆ کەسێك ترسی کەوتنە ناو گوناهی هەبێت، و توانای ژنهێنانی هەبێت،بەڵام توانای کەنیزەك کرینی نەبێت،قرطبی ش ئەڵێت: واجبە لە سەر کەسێك بەو ژنهێنانە نەبێت، ناتوانێت واز لە زینا بهێنێت.

دوەم: سوننەتە بۆ کەسێك توانای منداڵ خستنەوەی لەو ژنهێنانە هەبێت،با ئارەزوشی بۆ ژنهێنان نەبێت،بە بەڵگەی:

١.فەرمودەی: لەناو میللەتاندا شانازی بەزۆریتانەوە ئەکەم.[1]

٢.ڕوکەشی فەرمودەکان کە هاندان وفەرمانکردن بە ژنهێنان ی تێدایە.

سێیەم: حەرامە،بۆ کەسێك زیان بە ئافرەتەکە بگەیەنێت لە جوتبون لەگەڵیداو لە بەخێوکردنیدا.با ئەو کەسە توانای ژنهێنانی هەبێت وحەزیشی لێبکات.

چوارەم: مەکروهە باش نیە،بۆ کەسێك زەرەر بەژنەکە ناگەیەنێت،بەڵام خۆشی ئارەزوی لەژنهێنان نیە.

پێنجەم: موباحە،ئەگەر ئەو هۆکارو ڕێگریانەی سەرەوە نەبون.

---

[1] فَإِنّي مُكَاثِرٌ بِكُم الأمَمَ .

**باسی حەوتەم/** فەرمودەکە هاندانی تێدایە بۆ دەستخستنی شتێك چاو ڕابگرێت و دامێن بپارێزێت.

**باسی هەشتەم/** فەرمودەکە ئەوەی تیایە کە: بۆ ژنهێنان زۆر لەخۆ ناکرێت (وەك قەرزکردن بۆی).

**باسی نۆیەم/** عێراقی فەرمودەکە ئەکاتە بەڵگەی ئەوەی کە:

ئەنجامدانی خواپەرستیەك،تێکەڵ بە مەبەستێك بێت،دروستە،و وەك ریاء نیە.

بەڵام باشترە بڵێین: ئەگەر ئەو مەبەستەش خواپەرستی بوو،وەك خواپەرستیەکە خۆی،قەیناکە.چونکە بە بەڕۆژو بون، دامێن ئەپارێزرێت وچاو ڕائەگیرێت.

خۆ ئەگەر مەبەستەکە مباح بوو،وەك ئەوەی نوێژ بکات تا دوربکەوێتەوە لە قسەکردن لە گەڵ کەسێکی ئامادەبودا،ئەوە ئەتوانرێت بەوەی پێشوو بشوبهێنرێت،وە یان بوترێت: ئەو قیاسە نایگرێتەوە. بەڵام ئەگەر نوێژی کرد بۆ بەشداری نەکردن لە قسەی خراپ وغەیبەت کردن،ئەوە مەبەستێکی باشە.

(١٠٦) عنْ أَنَسِ بنِ مالكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قالَ: جاءَ ثلاثةُ رَهْطٍ إلى بُيوتِ أزْواجِ النَّبِيِّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَسْأَلُونَ عَنْ عِبادَتِه، فَلَمّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: أَيْنَ نَحْنُ مِنْ رَسُولِ الله، قَدْ غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِه وَما تَأَخَّرَ؟ فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَمّا أَنَا فَإِنّي أُصَلّي اللّيْلَ أَبَداً. وَقَالَ الآخَرُ: وَأَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلا أُفْطِرُ. وَقالَ آخرُ: وَأَنَا أَعْتَزِلُ النِّساءَ وَلا أَتَزَوَّجُ. فَجَاءَ رَسُولُ الله (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: أَنْتُمْ قُلْتُمْ كَذا وكَذا؟ أَما وَاللهِ إنّي لَأَخْشاكُمْ لله وَأَتْقاكُمْ لَهُ، وَلَكِنّي أُصَلّي وَأَنَامُ، وَأَصُومُ وَأُفطِرُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّساءَ. فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنّتي فَلَيْسَ مِنّي.

سـێ كۆمـەڵ هـاتن بـۆ ماڵـەكانی پێغەمبـەر،بۆ پرسـیاركردن دەربـارەی خواپەرستیەكەی. كەپێیان وترا،وەك ئەوەی بەكەمی بزانن.بەڵام وتیان: ئێمە لەكوێ و پێغەمبەری خوا لەكوێ.خوا لەگوناهی لەوە پێش وداهاتوی خۆشبوە؟ یەكێكیان وتی: من هەموو شەو شەونوێژ ئەكەم.ئەویتر وتی: منیش ساڵەكە بەرۆژوو ئەبم ونایشكێنم،ئەویتریش وتی: منیش لەئافرەتان دورئەكەومەوەو ژن ناهێنم.پێغەمبەری خوا هاتەوەو فەرموی: ئێوەبون ئاواو ئاواتان وتوە؟ من لەهەموتان لە خواترس ترم و بە تەقواترم،بەڵام نوێژیش ئەكەم وئەشخەوم،بە رۆژو ئەبم وئەشیشكێنم، وە ژنیش ئەهێنم. كەسێك پشت لەرێبازی من بكات لە من نیە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** ،صحيح البخاري - كتاب النكاح باب الترغيب في النكاح - حديث : ٤٧٧٧ . صحيح مسلم - كتاب النكاح باب استحباب النكاح لمن تاقت نفسه إليه - حديث : ٢٥٦٦

**مانای وشەكان//** سُنَّتي: رێبازی من. لَيْسَ مِنّي: لەسەر رێبازی پاكی من نیە.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** فەرمودەكە بەڵگەی ئەوەیە كە: خواپەرستی رێپێدراو،میانەڕەویە تیایدا،نـەك قوڵبونـەوەو زەرەر بـەخۆ گەیانـدن و،وازهێنـان لـە حەڵاڵـەكان

هەموی.وە ئەم شەریعەتە لە سەر میانەڕەوی و ئاسانکاری بیناکراوە.خوای گەورە ئەفەرموێت:﴿يُرِيدُ اللهُ بِكُمْ اليُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُم العُسْرَ﴾ {البَقَرَة:١٨٥}.

**باسی دوەم/** دەربارەی بەکار هێنانی خواردن وپۆشاکی حەلاڵ،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: دروستە،بەڕای **طبري**،بە بەڵگەی فەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: دروست نیە،بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنيَا﴾ {الأَحْقَاف:٢٠}.

**قازي عياض ئەڵێت:** ئەم ئایەتە دەربارەی بێباوەڕانە.

ڕای دروست ئەوەیە کە: مامناوەند بێت لە بەکارهێنانیدا،ئەویش بە:

زیادە ڕەوی نەکردن لە بەکارهێنانی حەڵاڵەکاندا.چونکە زیادەڕەوی تیایدا، سەرئەکێشێت بۆ تَرَف وبَطَرْ،لەوانەشە بکەوێتە شتە گوماناویەکانەوە،کەسێك لەسەر خۆشگوزەرانی ڕابێت،ئەگەر دەستی نەکەوێت،ئارام ناگرێت و لەوانەیە بکەوێتە حەرامەوە.

ئەگەر هەندێك جاریش ڕێگری نەکرێت لەو بەکارهێنانەدا،بەرەو زۆرلەخۆکردن و دەرچون لە سوننەت ی ئەبات کە ڕێگری لێکراوە بە ئایەتی:﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾.{الأعراف:٧} .چونکە:

١.پێغەمبەری خوا هەردوو ڕێگاگەی گرتوەتە بەر.

٢.توندڕەوی لە پەرستشەکاندا،سەرئەکێشێت بۆ بێتاقەت بون لەو پەرستشە و،وازهێنانی تەواوەتی لێی.

تەنها کردنی فەرزەکانیش (بەبێکردنی سوننەتەکان)،وەك نمونەیەك، سەرئەکێشێت بۆ چالاك نەبون لە ئەنجامدانی فەرزەکاندا.باشترین ڕێگاش مامناوەندیە تیایدا.

**باسی سێیەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: پێویستە لەسەری بۆ ئەوەی بتوانێت بەڕۆژو بێت،هەندێك جار بەڕۆژو نەبێت (ڕۆژوی سوننەت)،وە بخەوێت،تا بتوانێت شەو نوێژ بکات،وە ژن بهێنێت،تا داوێن وچاوی خۆی بپارێزێت.

**(١٠٧) عَنْ أَنَس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُنَا بِالبَاءَةِ، وَيَنْهَى عَنِ التَّبَتُّلِ نَهْياً شَدِيداً، وَيَقولُ: تَزَوَّجوا الوَدودَ الوَلودَ، فَإِنِّي مُكاثِرٌ بِكُم الأُمَمَ يَوْمَ القِيامَةِ...**

پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ ئەکردین بڕژێوی خێزانداری پەیدابکەین و،بەتوندی ڕێگری ئەکردین لە خۆخەساندن، وە ئەیفەرموو: ئافرەتێك بێنن منداڵی زۆری ببێت وخۆی خۆشەویست بكات.چونكە من لەناو میللەتاندا بەوە شانازیتان پێوەئەكەم.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** مسند احمد بن حنبل - ومن مسند بني هاشم مسند انس بن مالك رضي الله تعالى عنه - حديث : ١٢٣٦١ ..إبن حبان یش بە صحیحی داناوە.[1]

**مانای وشەكان//** التَّبَتُّلْ: واز هێنان لە ئافرەتان و ژن نەهێنان،بە مەبەستی خۆیەكلایكردنەوە بۆ خواپەرستی.مجاهد یش بە إخلاص لێكی ئەداتەوە. الوَلُودْ: ئافرەتێكە زۆر منداڵی ببێت.ئەوەش بە ئافرەتە خزمەكانی دەرئەكەوێت،كە منداڵیان زۆرە یان نا. الوَدُودْ: خۆشەویستە،بەهۆی زۆری سیفاتی چاكە تیایداو،ئەخلاقی جوان و،لای مێردەكەی خۆی خۆشەویست ئەكات. المُكَاثَرَةُ: شانازی پێوە كردن.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** فەرمودەكە بەڵگەیە لەسەر: ڕەوا بونی هاوسەرگرتن و،ئەو كەسەش كە ئەخوازرێت،توانای منداڵبونی زۆری هەبێت.

**باسی دوەم/** فەرمودەكە بەڵگەی ئەوەیە كە: لە قیامەتدا شانازی كردن هەیە.واتە: هەر پێغەمبەرێك ئوممەتەكەی زۆرتر بێت،پاداشتی زۆرترە،چونكە وەك پاداشتی هەموو ئەو كەسانەی هەیە كە شوێنی كەوتون.

[1] صححه الألباني في الإرواء (١٧٨٤).

(١٠٨) عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ.

ئـافرەت لەبەرسـێ هۆكـار ئـەخوازرێت:بـۆ سـامانەكەی،وەخزمەكانی، وەجوانیەكەی، وە دینداریەكەی.با خاوەن دینەكەت دەستكەوێت، تا لەهەژاریدا دەست نەكەیت بەخۆڵدا.

گێـڕەرەوەی فەرمودەكـە// حـەوت كەسـەكە،لەڕێگەی ابـو هـورەیرەوە. صـحیح البخاري - كتاب النكاح باب الأكفاء في الدين - حديث : ٤٨٠٢

سەرباسەكان//

باسـی یەكـەم/ فەرمودەكـە هـەواڵی ئـەوەمان ئـەداتێ كـە: ئـەوەی وا لـەپیاوان ئەكات،ژن بهێنن،یەكێكە لەم چوار خاڵە.بەڵام بۆ هەڵبـژاردن (لەزۆربەی كاتدا) خاوەن دین ئەخەنە دواوە،پێغەمبەری خواش فەرمانیان پێ ئەكات،ئەگەر خاوەن دینیان چنگ كەوت،لەكیسی خۆیانی مەدەن.

باسی دوەم/ به چەند فەرمودەیەك ڕێگری كراوە لـە ژنهێنـان لـە بـەر هـەر هۆیـەك بێت،جگە لە دینداریەكەی.لەو فەرمودانەش:

أ.ئافرەتان لەبەر جوانیان مەهێنن،چونكە لەوانەیە جوانیەكەیان نەمێنێت،لەبەر سـامانیش مەیانهێنن،چـونكە لەوانەیـە لەسـنور دەربـچن،لەبەر دینەكـەیان بیانهێنن.كەنیزەكێكی ڕەشپێستی كەڕی دیندار باشترە.[١]

ب.دەربـارەی سـیفەتی باشـترین ئـافرەت،ابوهورەیرە ئەیگێڕێتـەوە كـە: بەپێغەمبـەری خـوا وتـرا: باشترین ئافرەت كامەیە؟ فـەرموی: ئەوەیـە بەبینینی

[١] أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجه وَالبَزَّار وَالبَيْهَقي مِنْ حَدِيثِ عَبْدِالله بنِ عَمْرو مَرفوعاً:لَا تَنْكِحُوا النِّسَاءَ لِحُسْنِهِنَّ،فَلَعَلَّهُ يُرْدِيهِنَّ،وَلَا لِمَالِهِنَ فَلَعَلَّهُ يُطْغِيهِنَّ،وَانْكِحُوهُنَّ لِلدِّينِ.وَلَأَمَةٌ خَرْقَاءُ ذَاتُ دِينٍ أَفْضَلُ. سنن ابن ماجه - كتاب النكاح باب تزويج ذات الدين - حديث : ١٨٥٥

دڵخۆشت ئەكات،و كە فەرمانت پێكرد بە قسەت ئەكات،لەوەی پەیوەندی بەخۆی وسامانەكەیەوە هەیە،بەپێچەوانەی ڕای هاوسەرەكەیەوە ناجوڵێتەوە.[1]

**باسی سێیەم/** دەربارەی مانای حەسەب ، چەند ڕایەك هەیە:

١.شانازی كردنە بە باوك وخزمانەوە،لە حساب وژماردنەوە هاتوە،چونكە كاتێك شانازیان بكردایە،چاكەی خۆیان وباوك وخزمەكانیان ئەژمارد،كەسێكیش چاكەكانی لەوی تر زیاتر بوایە،شانازیەكە بۆ ئەو ئەبوو.

٢.بریتیە لە كرداری چاكە.

٣.ماڵ وسامانە،وەك لە فەرمودەدا هاتوە:حەسەب ماڵەو كەرەم یش تەقوایە.[2]

بەڵام لە فەرمودەكەدا بە مانای ماڵ نایەت،چونكە ماڵ باسكراوە تیایدا،كەواتە مانای یەكەم مەبەستە.

**باسی چوارەم/** لە فەرمودەی (وَجَمَالِهَا) ئەوە وەرئەگیرێت كە: خواستنی ئافرەتی جوان شتێكی باشە،جوانی سیفاتیش هەمان حوكمی هەیە.

**باسی پێنجەم/** فەرمودەكە بەڵگەی ئەوەیە كە: هاوڕێی كردنی كەسی دیندار لە هەموو كاروبارێكدا،شتێكی داواكراوەو باشە،چونكە هاوڕێی كەسی دیندار لە ئاكارو بەرەكەت و ڕێو شوێنیان سودمەند ئەبێت،بە تایبەتی ئافرەت لەهەموو كەس زیاتر شایانی ئەوە كە دینداریەكەی لەبەرچاو بگیرێت،چونكە لەگەڵیدا ئەخەوێت ودایكی منداڵەكانیەتی وپارێزەری خۆی وسامان و خانوەكەیەتی.

**باسی شەشەم/** فەرمودەی (تَرِبَتْ يَدَاكَ)،واتە: لە هەژاریدا دەستت بە خۆڵەوە بلكێت.دەربارەی ماناكەشی چەند لێكدانەوەیەك هەیە:

---

[1] أَخْرَجَ النَّسَائِي عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ:قِيلَ يَا رَسولَ اللهِ،أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟ قَالَ:الَّتِي تَسُرُّهُ إِنْ نَظَرَ،وَتُطِيعُهُ إِنْ أَمَرَ،وَلَا تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ. السنن الصغرى - كتاب النكاح أي النساء خير - حديث : ٣١٩٦

[2] حَدِيثُ سَمُرَةَ مَرْفوعاً:الحَسَبُ الْمَالُ وَالكَرَمُ التَّقْوَى.أَخْرَجَهُ أَحْمَد وَالتِّرمِذي وَصَحَّحَهُ هُوَ وَالحَاكِمُ. سنن الترمذي الجامع الصحيح - الذبائح أبواب تفسير القرآن عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب : ومن سورة الحجرات حديث : ٣٢٧٧

أ.هەواڵدانێکـە بـە مانـای دوعاکردن،بـەڵام دوعاکردنەکـە مەبەسـت نیە،واتـە وشەیەك خەڵکی لە قسەی ڕۆژانەیاندا بیّ مەبەست بەکاری ئەهێنن.

ب.مەرجێکی شاراوەی تێدایە،واتە: ئەگەر وا نەکەیت،دەستت بە خۆڵا ئەچێت لە هەژاریدا. ئەمەش ڕای إبن العەرەبیە و بەڕایەکی دروستیشی داناوە.

(١٠٩) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ،أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : كَـانَ إِذَا رَفَّـا إِنْسَاناً إِذَا تَزَوَّجَ،قَالَ: بَارَكَ اللهُ لَكَ،وَبَارَكَ عَلَيْكَ،وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ...

ئەگەر پێغەمبەری خوا دوعای خۆشگوزەرانی بۆ کەسێك بکردایە کە ئەو کەسە ژنی بهێنایە،ئەیفەرموو: خوای گەورە،بەرەکەتت بۆ بنێریّ و بە سەرتا بڕژێنیّ و لە سەرچاکە کۆتان بکاتەوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** أحمد،چوارکەسەکە،ترمذي وإبن خزيمة وإبـن حبـان بە صـحيحيان داناوە. سنن أبي داود - كتاب النكاح باب ما يقال للمتزوج - حديث : ١٨٢٢ [1]

**مانای وشەکان//** رَفَّا: لەگەڵ یەك گونجان وچاك هەڵسوکەوت لەگەڵیدا.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** مەبەست لە فەرمودەکە ئەوەیە: هەر کاتێك پێغەمبەری خوا دوعـای بۆ کەسێك بکردایە کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بگونجایە،هەڵسوکەوتی چاکی لە گەڵدا هەبێت،ئەیفەرموو: بَارَكَ اللهُ لَكَ..بە بەڵگەی:

أ.پیاوێك لە بەنی تمیم ئەڵێت: ئێمە لە نەفامیدا ئەمانوت:بەخۆشگوزەرانی و منداڵەوە بێت،بەڵام پێغەمبەری خوا فێری کردین کە بڵێین:..... [2]

---

[1] قَالَ الألباني في آداب الزفاف: قوي بمجموع طرقه ص(١٠٤).

[2] أَخْرَجَ بَقِيُّ بنُ مُخَلَّدٍ عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ قَالَ:كُنَّا نَقُولُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ:بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِينِ،فَعَلَّمَنَا رَسُولُ اللهِ فَقَالَ: قُولُوا :....

ب.فەرمودەی جابر: کە پێغەمبەری خوا پێی وتوە: ژنت هێناوە؟ وتویەتی: بەڵێ.پێغەمبەریش فەرمویەتی: بارك الله لك.[1]

<u>باسی دوەم/</u> پاڕانەوە بۆ ئەو کەسەی ژنی هێناوە،سوننەتە.بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکەو زۆر فەرمودەی تریش کە پشتگیری ئەکەن.

<u>باسی سێیەم/</u> ئەو کەسەش کە ژن ئەهێنێت،سوننەتە ئەم دوعایە بکات کە لەم فەرمودەیەدا باسکراوە:

هەر کەسێکتان ئافرەتێکی هێنا یا خزمەتکارێك یا ئاژەڵێکی کڕی،با پێشەسەری بگرێت و بڵێت: خوایە داوای خێری ئەمەو ئەو خەیرەی کەبۆی دروست کراوەت لێ ئەکەم، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە خراپەکەی و ئەو خراپانەی بۆی دروست کراوە.[2]

---

[1] أخرجَ بَقِيُّ بنُ مُخَلَّدَ عَنْ جَابِرٍ:أَنَّهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ :أَتَزَوَّجْتَ؟قَالَ:نَعَمْ.قَالَ:بَارَكَ اللهُ فِيكَ.وَزَادَ الدَّارِمِي :وَبَارَكَ عَلَيْكَ.

[2] حَدِيثُ عَمْرِو بن شُعَيْب عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:إذَا أَفَادَ أَحَدُكُمْ إمْرَأَةً أَوْ خَادِماً أَوْ دَابَّةً،فَلْيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِهَا، وَلْيَقُلْ:اللَّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ.رَوَاهُ أَبُودَاوُد وَالنَّسَائِي وَابْنُ مَاجَةَ. سنن أبي داود - كتاب النكاح باب في جامع النكاح - حديث : ١٨٥٨

**(١١٠) ١.عنْ جابِر رَضيَ اللهُ عَنْهُ قالَ: قالَ رَسُولُ الله (صَلَىَ اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ): إذا خَطَبَ أَحَدُكُمْ المَرْأَةَ،فَإنْ إسْتَطَاعَ أنْ يَنْظُرَ ما يَدْعُو إلَى نكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ.قالَ جابِر: فَخَطَبْتُ جارِيَةً فَكُنْتُ أَتَخَبأُ لَهَا،حَتَى رَأيْتُ منْهَا ما يَدْعُو إلَى نكَاحِهَا،فَفَعَلْتُ..**

ئەگەر کەسێك لەئێوە ئافرەتێکی خواست،ئەگەر توانی ئەوەندە سەیری بکات تا هانی بدات کە بیخوازێت،با سەیری بکات.جابر ئەڵێت: منیش کیژۆڵەیەکم خواست،وە خۆم بۆ مەڵاس ئەدا،تا ئەوەم لیْ بینی کە هانم بدات بۆ خوازبێنی کردنی،پاشان خوازبێنیم کرد.

**٢.عَنِ المُغيرَة رَضيَ اللَهُ عَنْهُ: أنَهُ قالَ لَهُ النَبِيُ (صَلَىَ اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ) وَقَدْ خَطَبَ إمْرَأَةً: أُنْظُرْ إلَيْهَا فَإنَهُ أحْرَى أنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا..**

کاتێك موغەیرە ئافرەتێك ئەخوازێت،پێغەمبەری خوا پێی ئەڵێت:سەیری بکە،چونکە مایەی بەردەوام بونتانە لەگەڵ یەکتریدا.

**٣.عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللَهُ عَنْهُ أنَ النَبِيَ (صَلَىَ اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ) قالَ لِرَجُلٍ تَزَوَجَ إمْرَأَةً: أنَظَرْتَ إلَيْهَا؟ قالَ: لَا. قالَ: إذْهَبْ فَانْظُرْ إلَيْهَا..**

پێغەمبەری خوا بە پیاوێك ئەڵێت،کاتێك ئەیەوێت ئافرەتێك بخوازێت: سەیرت کردوە؟ ئەلیت: نەخێر.ئەفەرموێت: برۆ سەیری بکە.

<u>**گێرەرەوەی فەرمودەکە//**</u> ١.أحمد وأبوداود،حاكمیش بە صحيحی داناوە . سنن أبي داود - كتاب النكاح

باب في الرجل ينظر إلى المرأة وهو يريد تزويجها - حديث : ١٧٩٦. [1] ٢.ترمذي ونسائي. سنن الترمذي الجامع الصحيح - أبواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أبواب النكاح عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب ما جاء

---

[1] البانيش بە حسن ی داناوە.الإرْوَاءْ ١٧٩١.

في النظر إلى المخطوبة حديث : ١٠٤٣. ٣. صحيح مسلم - كتاب النكاح باب ندب النظر إلى وجه المرأة وكفيها لمن يريد تزوجها - حديث : ٢٦٣٠

**ماناى وشەكان//** يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا: گونجاندن لەنێوانتان دروست ئەبێت.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** بناغە وایە كە: سەیركردنی پیاوی بێگانەو بۆ ئافرەتی بێگانەو بە پێچەوانەوە حەرامە،مەگەر بەڵگەیەك حەڵاڵی بكات،وەك ڕەوابونی سەیر كردنی پیاو بۆ ئەو ئافرەتەی ئەچێتە خوازبێنی.

**باسی دوەم/** سوننەتە پێشتر تەماشای ئەو ئافرەتە بكرێت كە خوازبێنی ئەكرێت،بە ڕای كۆمەڵی زانایان،بە بەڵگەی: فەرمودە پێشوەكان.

**باسی سێیەم/** دەربارەی ئەو برەی كە دروستە لە لاشەی ئافرەتەكە تەماشا بكرێت،چەند ڕایەك هەیە:

یەكەم: تەنها سەیری دەم وچاوو هەردوو لەپی دەستی ئەكرێت،ئەمەش ڕای زۆرینەیە،چونكە: بەدەم وچاودا جوانی وناشیرینی دەرئەكەوێت و،بە ناو لەپیشدا،نەرم وشلی پێست وپێچەوانەكەی دەرئەكەوێت.

دوەم: سەیری ئەو شوێنانە ئەكرێت كە گۆشتی پێوەیە،بەڕای ئەوزاعی.

سێیەم: سەیری هەموو لاشەی ئەكرێت،بە ڕای داود.

چوارەم: سەیری ئەو شوێنە ئەكرێت كە مەبەست لە بینینەكەی پێ دێتەدی،ئەمەش ڕای صەنعانیە،بە بەڵگەی:

أ.ڕەهایی لە فەرمودەكەدا.

ب.تێگەشتنی هاوەڵان بۆ ئەم باسە بەو شێوەیە بوە: كاتێك علی،أم كلثوم ی كچی نارد بۆ لای عمر تا سەیری بكات،ئەویش سەیری قاچی كرد.[1]

---

[1] رَوَى عَبْدُالرَّزَّاقُ وَسَعِيدُ بنُ مَنْصُورٍ: أَنَّ عُمَرَ كَشَفَ عَنْ سَاقِ أُمِّ كُلْثُوم بِنْتِ عَلِي لَمَّا بَعَثَ بِهَا عَلِيٌّ إِلَيْهِ لِيَنْظُرَهَا.

باسی چـوارەم/ مـەرج نیـە ئافرەتەکە بەو بینینـە ڕازی بێت،بەڵکو پیاوەکە بۆی هەیە سەیری بکات بێ ئەوەی ئافرەتەکە ئاگادار بێت،بە بەڵگەی سەیرکردنەکەی جابر.

باسـی پێنجـەم/ هاوەڵـەکانی شـافعی ئـەڵێن: پێویـستە سـەیرکردنەکەی پـێش خوازبێنی بێت،تـا ئەگـەر بـە دڵـی نەبوو،بـەبێ ئـازاردانی دڵـی ئافرەتەکـە وازی لێبهێنێت،بەڵام ئەگەر دوای خوازبێنیەکە بێت،ئافرەتەکە ئازاری پێئەگات.

باسـی شەشـەم/ ئەگـەر خـۆی بـۆی نـەکرا سـەیری بکات،چاك وایـە ئـافرەتێکی متمانەپێکراو بنێرێت،تا سەیری بکات وسیفاتەکانی پێ بڵێت.بە بەڵگەی:

انس ئەیگێڕێتەوە کە: پێغەمبەری خوا أم سولەیم ئەنێرێت بۆ لای ئافرەتێك،وە پێی ئەڵێت: سـەیری پشتە ملـی بکـەو بۆنی لا شانەکانیشی بکە.لەڕیوایـەتێکی تردا هاتوە: بۆنی دانەکانی ئەملاولای دەمی بکە.ئەمەش بۆ تاقیکردنەوەی بۆنی دەمی ئافرەتەکەیە.[1]

باسی حەوتـەم/ هـەمان حوکم کە بۆ پیاو هەیە،لەسـەیر کردنـی ئافرەتدا،کەبۆ خوازبێنی ئەچێت.بۆ ئافرەتیش هەیە تا سـەیری ئـەو پیاوەکە بکات کە دێتـە خوازبێنی،چـونکە ئـەویش وەك پیاوەکـە شـتی بەدڵـە. هەرچـەندە فـەرمودە لـەم بارەوە نەهاتوە.

---

[1] رَوَى أَنَسُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ أُمَّ سُلَيْمٍ إِلَى اِمْرَأَةٍ فَقَالَ:اُنْظُرِي إِلَى عُرْقُوبِهَا وَشُمِّي مَعَاطِفَهَا.أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ وَالطَّبَرَانِي وَالْحَاكِمُ وَالْبَيْهَقِي وَفِيهِ كَلَامٌ.وَفِي رِوَايَةٍ: شُمِّي عَوَارِضَهَا. مسند أحمد بن حنبل - ومن مسند بني هاشم مسند أنس بن مالك رضي الله تعالى عنه - حديث : ١٣١٦٩

**( ١١١ ) عنْ سَهْلِ بنِ سَعْد السَّاعدي رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: جَاءَتْ إمْرَأَةٌ إلَى رَسُولِ الله ( صَلّىَ اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ الله، جِئْتُ أَهَبُ لَكَ نَفْسي، فَنَظَرَ إلَيْهَا رَسولُ الله، فَصَعَّدَ النَّظَرَ فيهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأطَأ رَسُولُ الله رَأسَهُ، فَلَمَا رَأتْ المَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فيهَا شَيْئاً جَلَسَتْ. فَقَامَ رَجُلٌ منَ الصَّحَابَة فَقَالَتْ: يَا رَسولَ الله إنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوّجْنيهَا. قَالَ: هَلْ عنْدَكَ منْ شَيْءٍ؟ قَالَ: لاَ وَالله يَارَسُولَ الله. قَالَ: إذْهَبْ إلى أَهْلكَ، فَانْظُرْ هَلْ تَجدُ شَيْئاً؟ فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ: لا وَالله مَا وَجَدْتُ شَيْئاً. فَقَالَ رَسولُ الله: أنْظُرْ وَلَوْ خَاتَماً منْ حَديد، فَذَهَبَ ثُمَّ رَجعَ فَقَالَ: لَا وَالله وَلاَ خَاتَماً منْ حَديد، وَلَكنْ هَذَا إزَاري. قَالَ: -أيْ سَهْل- مَالَهُ رداءٌ فَلَها نصْفُهُ، فَقَالَ رَسولُ الله: مَا تَصْنَعُ بِإزَارِكَ إنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا منْهُ شَيْءٌ، وَإنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ منْهُ شَيْءٌ، فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى طَالَ مَجْلسُهُ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ الله مُوَلّياً فَأمَرَ به فَدُعيَ به، فَلَمَا جَاءَ، قَالَ: مَاذَا مَعَكَ منَ القُرآنِ؟ قَالَ: مَعيَ سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُكَذا، عَدَّدَهَا، فَقَالَ: تَقْرَؤهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: إذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ منَ القُرآنِ.....**

ئافرەتێـك هاتـە لای پێغەمبـەرو، وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خوا، هـاتوم خۆمـت پێشکەش بکەم. پێغەمبەری خواش سەیری کرد: سەیری لای سەروو لای ژێروی ئافرەتەکەی کرد، پاشان پێغەمبەری خوا سەری داخست. کاتێك ئافرەتەکە بینی پێغەمبـەری خـوا هـیچ بڕیـارێکی دەربـارەی نەدا، دانیشت. پیاوێـك لـە هاوەڵـان هەسـتاو وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خوا، ئەگـەر تـۆ پێویـستت پێـی نیـە، لێمی مارەبکە. ئـەویش فـەرموی: هـیچ شتێکت هەیە؟ وتـی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبـەری خــوا. فــەرموی: بــچۆرەوە ماڵــەوە بزانــە هــیچ شــك ئەبــەیت؟ کــە ڕۆشــت وگەڕایەوە، وتی: بەخوا هیچم دەستنەکەوت. پێغەمبەری خواش فەرموی: سـەیر بکـە بزانـە مـستیلەیەکی ئاسنیـشت نیـە؟ ڕۆشــت وپاشــان گەڕایــەوە، وتی: نەبەخوا، مـستیلەی ئاسنیـشم دەسـتنەکەوت، بەڵام ئەمـە کراسـەکەمە. سـەهل (کـە فەرمودەکە ئەگێڕێتـەوە) ئـەڵێت: هـەموو ماڵەکـەی ئـەو کراسـە بـوە وویـستویەتی نیوەی بداتـە ژنەکـە. پێغەمبـەری خـواش فـەرموی: چـی لـە کراسـەکەت ئەکـەیت ؟ ئەگـەر تـۆ لەبـەری بکـەیت، ئـەو هیـچی نیـە لەبـەری بکـات. ئەگـەر ئـەویش لەبـەری

بكات،تۆ هیچت نیە لەبەری بکەیت.پیاوەکە دانیشت وزۆریش دانیشت وئینجا هەستا.کە پێغەمبەری خوا بینی پشتی هەڵکردوەو ڕۆشتوە، فەرمانی دا کە بانگی بکەن.کاتێك هات فەرموی: چیت لە قورئان لەبەرە؟ ئەویش وتی: فڵان سورەت وفڵان سورەت.چەند سورەتێکی ژمارد.فەرموی: بەتەواوی لەبەرتە؟ وتی: بەڵێ. فەرموی: بڕۆ ئافرەتەکەت ئەدەمێ بەرامبەر ئەو قورئانەی کەلە بەرتە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب النكاح باب تزويج المعسر – حديث : ٤٧٩٩ . صحيح مسلم –كتاب النكاح باب الصداق – حديث : ٢٦٣٢ ..

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دروستە ئافرەت خۆ نیشانی کەسێکی چاك وباش بدات،تا بیخوازێت.بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باسی دوەم/** سەیر کردنی ئافرەتەکە تایبەت نیە بەو کەسەی ئافرەتەکە ئەخوازێت،بەڵکو بۆ هەموو کەسێکە کە ئەچێتەخوازبێنی،سەیرکردنی پێغەمبەری خواش بۆ ئافرەتەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: پێغەمبەری خوا ویستویەتی بیخوازێت،کاتێك ئافرەتەکە خۆی نیشانی داوە،بەڵام دیارە کە بە دڵی نەبوە بۆیە پشتی تێکردوە.

**باسی سێیەم/** ئیمام سەرپەرشتی ئەو ئافرەتە ئەکات کە کەسی نزیکی نیە،ئەگەر ئافرەتەکە مۆڵەت بداتە ئیمام.بەڵام لە هەندێك ڕیوایەتی فەرمودەکەدا هاتوە کە: ئافرەتەکە کاروباری خۆی داوەتە دەست پێغەمبەری خوا،واتە کردویەتی بە وەکیل وبریکار.

**باسی چوارەم/** دەربارەی پرسیار کردنی ئیمام لە ئافرەتەکە (تا بزانێت سەرپەرشتیاری ماوە یان نا)،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: ئیمام گرێبەستەکە ئەکات،بێئەوەی پرسیار بکات دەربارەی ئەوەی،سەرپەرشتیارەکەی ماوە یان نا؟ ئامادەیە یان نا ؟ ئافرەتەکە شوی

کردوه یان نا؟ ئەمەش ڕای کۆمەڵێك زانایە وەك خطابي ئەیگێڕێتەوە. چونکە سەیری ڕوکەشی ئەکرێت.

دوەم: ئەو کەسەی بێگانە بێت بەو شوێنە،سوێند ئەدرێت.بەڕای هادویە.

**باسی پێنجەم/** بەخشین بە وتەو دەربڕین نەبێت،دانامەزرێت.

**باسی شەشەم/** لە هاوسەرگیریدا پێویستە مارەیی هەبێت،بە بەڵگەی فەرمودە باسلێکراوەکەو زۆر فەرمودەی تریش.

**باسی حەوتەم/** دەربارەی بڕی مارەییەکە چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: دروستە مارەیی شتێکی کەمیش بێت وژن وپیاو یا ئەو کەسەی گرێبەستەکە ئەکات پێی ڕازی بێت ونرخێکی هەبێت.واتە: هەر شتێك بگونجێت بکرێتە نرخ بۆ کاڵایەك،ئەوە دروستە بشکرێتە مارەیی.

قازي عیاض کۆدەنگی زانایان لەو بارەوە ئەگێڕێتەوە کە دروست نیە مارەیی شتێك بێت کە نرخی نەبێت،وە هاوسەرگیریشی پێ ڕەوا نابێت.

بەڵگەی ئەم ڕایەش فەرمودەی(وَلَوْ خاتَماً مِنْ حَديدٍ)ە،کە ئەوپەڕی بڕی کەمیە.

ئەمەش بەلای صەنعانیەوە دروسترین ڕایە: کەواتە مارەیی هەر شتێ بێت نرخی هەبێت،با کەمیش بێت.

دوەم: هەرشتێك بێت با دەنکە جۆیەکیش بێت دروستە بکرێتە مارەیی.بەڕای إبن حزم،بە بەڵگەی فەرمودەی: هل تجد شیئا؟

وەڵامی ئەم ڕایە بەم شێوەیە دراوەتەوە:

ا.فەرمودەی وَلَوْ خاتَماً مِنْ حَديدٍ ،ئەو پەڕی نیشاندانی کەمی بڕەکەیەتی،مستیلەی ئاسنیش نرخی لە دەنکە جۆ زیاترە.

ب.فەرمودەی: مَنْ إستَطاعَ مِنْكُم الباءَةَ..وە : مَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ..بەڵگەی ئەوەیە کە: مارەیی لەتوانای هەموو کەسێکدا نیە،بەڵام پەیدا کردنی دەنکە جۆ لەتوانای هەموو کەسێکدایە.

ج.هەردوو ئایەتی:﴿وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ طَوْلاً﴾{النساء:٢٥}..و﴿أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ.﴾{النساء:٢٤}.بەڵگەی ئەوەیە کە: لە مارەییدا نرخ و بەها بەرچاو ئەگیرێت.

د.ئافرەتەکە بە مارەییەك ڕازی نابێت،ئەگەر ماڵ نەبێت وشێوەیەکی نەبێت،کە ئەمەش لەتوانای هەموو کەسێکدا نیە.

ه.چەند فەرمودەیەك هەیە ئەوە ئەگەیەنێت کە:

١.کەمترین مارەیی ٥٠ درهەمە،کە ڕای سعید بن جوبەیرە.

٢.کەمترینی ٤٠ درهەمە،ڕای إبراهیم النخعی لەسەرە.

٣.کەمترینی ١٠ درهەمە،بەڕای عترەو حەنەفیە.

٤. کەمترین مارەیی ٥ درهەمە،بەڕای إبن شبرمە.

٥.کەمترینی چارەکە دینارێکە،بەڕای پێشەوا مالك.

بەڵام وەڵامی ئەم فەرمودانە دراوەتەوە کە باسی کەمترین مارەیی ئەکەن،بەم شێوەیە:

١.هیچ کام لەم فەرمودانە ڕاست نین،وەك إبن حجر ئەڵێت.

٢.ئەم فەرمودانە هەروەها ئایەتەکانیش باس لە زۆربەی حالەتەکان ئەکەن،کە مارەیی بەو شێوەیە بوە.

**باسی هەشتەم/** پێویستە مارەیی لە گرێبەستدا باسبکرێت،چونکە باسکردنەکە ناکۆکی ناهێڵێت و بۆ ئافرەتەکەش بە سودترە.خۆ ئەگەر گرێبەست کرا بێ باسکردنی مارەیی،گرێبەستەکە تەواوە و،مارەیی هاوشێوە جێگیر ئەبێت،ئەگەر ئافرەتەکە گوازرایەوە.

**باسی نۆیەم/** چاك وایە دانی مارەییەکە پێش بخرێت.

**باسی دەیەم/** سوێند خواردن دروستە،با ئەو کەسە سوێندیش نەدرێت.

**باسی یازدەهەم/** سوێند خواردن دروستە لە سەر شتێك کە گومانت هەیە لێی،بە بەڵگەی:

لەدوای ئەوەی هاوەڵەکە سوێند ئەخوات،پێغەمبەری خوا پێی ئەڵێت: بچۆرە ماڵەوە بزانە هیچ شك ئەبەیت؟ ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە سوێند خواردنەکەی لەسەر گومان بوە،ئەگەر وانەبوایە ڕۆشتنەکەی بۆ ماڵەوە هیچ سودی نەئەبوو.

**باسی دوازدەهەم/** دروست نیه بۆ موسڵمان شتێك له دەست خۆی بدات كه زۆری پێویسته: وەك پۆشاكیك كه عەورەتی پیێ داپۆشێت،یا خواردنێك كه لەبرسێتی یا تینوێتی ڕزگاری ئەكات،به بەڵگەی ئەوەی كه: پێغەمبەری خوا هۆی ڕێگری كردنی له دابەشكردنی پۆشاكەكەی بۆ هاوەڵەكه باس ئەكات: ئەگەر ئەو لەبەری بکات تۆ هیچت پێوه نابێت.

**باسی سیازدەهەم/** كەسێك بڵێت من هەژارم،تاقی ئەكرێتەوە.سوێندیشی لێ وەرناگیرێت تا نیشانەی هەژاریەكەی دەرنەكەوێت.بە بەڵگەی ئەوەی كە پێغەمبەری خوا لە سەرەتاوە كە وتی نیمە،باوەڕی پیێ نەكرد،هەتاكو نیشانەی هەژاریەكەی بینی .

**باسی چواردەهەم/** دەربارەی وتنی كۆمەڵێك اذكار كە بە خطبة العقد ناسراوە،دوو ڕا هەیە:

یەكەم: واجب نیه وسوننەتە،بەڕای جمهور،بە بەڵگەی:

أ.لە هیچ كام لە ڕیواتەكانی فەرمودەكەدا باسنەكراوە.

ب.فەرمودەی إسماعیل بن إبراهیم كە لە پیاوێك لە بنی سلیمەوە ئەیگێڕێتەوە: خوازبێنی امامەی كچی عبدالمطلب م لە پێغەمبەری خوا كرد،ئەویش داییێم بیێ ئەوەی خطبة الحاجة بخوێنێت.[1]

دوەم: واجبە،بەڕای ظاهرية،بەڵام بە فەرمودە باسلێكراوەكە وەڵامیان دراوەتەوە.

**باسی پازدەهەم/** دەربارەی كردنی سود پێگەیاندن بە مارەیی،دوو ڕا هەیە:

یەكەم: دروستە بكرێتە مارەیی،بەڕای شافعی وإسحاق وحەسەن بن صالح وهەندێك لە مالكیەكان وهادەویەكان،بە بەڵگەی:

أ.شوبهاندنی بە فێركردن،كە دروستە بكرێتە مارەیی.فێركردنیش سودپێگەیاندنه.

---

[1] خطبت إلى النبى صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أمامة بنت عبدالمطلب،فانكحني من غير أن يتشهد. سنن أبي داود - كتاب النكاح باب في خطبة النكاح - حديث : ١٨٢٢

ب.بەسەرهاتی موساو شوعەیب.

ج.فەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: دروست نیە،بەڕای حەنەفی و هەندێك لە مالکیەکان.

فەرمودە باسلێکراوەکەش وا لێك ئەدەنەوە کە مارەکردن بێ مارەیی ،لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەری خوا بوە.**طحاوي** وابهری ئەڵێن: ئەمە تایبەت بوە بەو پیاوەوە،چونکە پێغەمبەری خوا دروست بوە بۆی ئەو ئافرەتە بخوازێت کە خۆی پێ ئەبەخشێت،کەواتە دروستیشە هەر ئافرەتێك بدات بەشوو بێ مارەیی.بە بەڵگەی فەرمودەی ابونعمان الأزدي:پێغەمبەری خوا ئافرەتێکی بەشودا بەرامبەر سورەتێك قورئان.پاشان فەرموی: دوای تۆ بۆ کەس نابێتە مارەیی.[1]

وەڵامی ئەم رایە دراوەتەوە کە: ئەمە پێچەوانەی ئەصل و بنەمایە لە هاوسەرگیریدا،وە فەرمودەکەش مورسەلە وناکرێتە بەڵگە،وە هەندێك لە راویەکانی ناناسرێن.

<u>**باسی شازدەهەم/**</u> فەرمودەی بما معك من القران،دوو مانا ئەگەیەنێت،وەك قازی عیاض ئەڵێت،ئەویش:

یەکەم: چەندێك لە قورئانی لەبەرە فێری ئافرەتەکەی بکات،ئەمەش ئەبێتە مارەیی بۆی،بە بەڵگەی: لە هەندێك ڕیواتی صحیحی فەرمودەکەدا هاتوە: هەندێك لە قورئانی فێربکە،[2] لەریواتی تریش بەدیاریکردنی دە ئایەت هاتوە.

ئەمەش ڕای دروستە.

دوەم: لەبەرئەوەی پیاوەکە هەندێك قورئانی لەبەر بوە،بۆ ڕێزگرتن لێی،پێغەمبەری خوا بێ مارەیی ئافرەتەکەی داوەتێ.پیتی باء بۆ تعليلە.بە بەڵگەی: چیرۆکی ام سلیم لەگەل ابو سلیم: کاتێك ئەیخوازێت، ام سلیم ئەڵێت :

---

[1] زوج رسول الله صَلَىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ إمرأة على سورة من القرآن ثم قال:لا يكون لأحد بعدك مهرا. سنن سعيد بن منصور - كتاب الوصايا باب تزويج الجارية الصغيرة - حديث : ٦١٨

[2] فعلمها من القرآن.

سوێند بەخوا،کەسی وەك تۆ رەت ناکرێتەوە،بەڵام تۆ بێ باوەڕیت و من موسڵمانم،بۆم نیە شوت پێ بکەم. ئەگەر موسڵمان بیت ، ئەوە مارەییەکەم.جگە لەوە هیچی ترت لێ داوا ناکەم. ئەویش موسڵمان بوو،موسڵمان بونەکەشی بوە مارەیی.[1]

ئەم ڕوداوەش ڕای دوەم بەهێز ئەکات.

**باسی حەڤدەهەم/** دەربارەی ئەو وشانەی گرێبەستەکەی پێ دائەمەزرێت،ڕای جیاواز هەیە،چونکە فەرمودەکە بە چەند ڕیواتێك گێڕاوەتەوە: بەڕیواتی ( **تمليك** ) خاوەندارێتی،و( **تزويج** ) هاوسەرگرتن،و( **إمكان** ) ڕێپێدان،هاتوە.

إبن دقيق العيد ئەڵێت:

چیرۆکەکە یەك چیرۆکە ،وەپێغەمبەری خواش یەك وشەی لەوانە فەرموە،کەواتە بۆ زانینی ئەو وشەیە پەنا ئەبەینە بەر ترجيح. بۆ ئەمەش دوو ڕا هەیە:

١.بەوشەی زواج هاوسەرگیری گرێبەستەکە دائەمەزرێت: لە دارقطني گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: ڕیوایەتی قد زوجتكها ،دروسترە،وە ئەوانەی ئەیگێڕنەوە ژمارەیان زۆرترەو لەبەرکردنیان باشترە. إبن حجريش دوای ئەوەی زۆر لەسەر ئەم وشانە ئەدوێت لە فتح الباری دا،ئەڵێت: ڕیوایەتی تزويج وإنكاح بەهێزترە.بەڵام وتەی إبن التين کە ئەڵێت: ڕیوایەتی زوجتكها لای زانایانی فەرمودە دروسترەو روایەتی ملكتكها هەڵەیە تیایدا،إبن حجر دەربارەی ئەم وتەیە ئەڵێت: ئەوە زیادەڕۆییەکە لە إبن التين ەوە.بغوی ئەڵێت: ئەوەی دیارە کە بە وتەی زوجنيها بوە وەك وەڵامێك بۆ قسەی هاوەڵەکە کە وتویەتی زوجنيها،چونکە لە گرێبەستەکاندا ئەو وشەیە بەکار ئەهێنرێت،وە کەم جاریش جیاوازی ڕا هەیە لە نێوان خاوەن گرێبەستەکاندا.

---

[1] قصة أم سليم مع أبو سليم:أنه خطبها فقالت:والله ما مثلك يرد،ولكنك كافر وأنا مسلمة،ولا يحل لي أن يتزوجك.فإن تسلم فذلك مهرك،ولا أسالك غيره.فأسلم فكان ذلك مهرها.أخرجه النسائي وصححه عن إبن عباس،وترجم له النسائي( باب التزويج على الاسلام )،وترجم حديث سهل هذا بقوله :( باب التزويج على سورة البقرة ).

٢.گرێبەستەکە بە هەر وتەیەك دائەمەزرێت کەئەو مانایە بگەیەنێت،ئەگەر مارەیی لەگەڵدا باسکرا،یا مەبەست لێی هاوسەرگیری بوو،وەك تملیك خاوەندارێتی ،وهاوشێوەکانی..ئەمەش ڕای هادویەو حەنەفیە وڕای دیاری مالکیەکان.

**باسی هەژدەهەم/** گرێبەستی هاوسەرگیری بە وتەکانی خواستن وبەکرێدان ووەسیەت کردن ،دانامەزرێت، ودروست نیە.

**(١١٢) عَنْ عامرِ بنِ عَبْدِالله بنِ الزُبَيْر عَنْ أبيه أنّ رَسُولَ الله (صَلّىَ اللهُ عَلَيْه وَسَلّمَ) قَالَ: أعلِنُوا النِّكَاحَ..**

هاوسەرگیری ڕابگەیەنن.(ئاشکرای بکەن)

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد.ترمذي،حاکمیش بەصحیحی داناوە ،مسند أحمد بن حنبل - مسند المدنيين

حديث عبد الله بن الزبير بن العوام - حديث : ١٥٨٠٧.[1]

هەروەها ترمذي لە عائشەوە ئەیگێریتەوە،بە پلەی حسن غريب: ئەم هاوسەرگیریە ڕابگەیەنن و، با لە مزگەوتدا بێت، ودەف لێ بدەن تیایدا ،وبا ئەوەی بۆ ئەیکرێت،دەعوەتی خەڵك بکات بۆ خواردن ئەگەر بەسەربڕینی مەڕێکیش بێت،هەرکەسێك لەئێوە ئافرەتێکی خواست،وە سەری بۆیە کردبوو،با بە ئافرەتەکە بڵێت وهەڵی نەخەڵەتێنێت.[2]

---

[1] البانی لە آداب الزفاف لا ١١١ بە حسن ی داناوە.

[2] اخرج الترمذي من حديث عائشة وقال حسن غريب:أعلنوا هذا النكاح واجعله في المساجد واضربوا عليه بالدفوف وليولم أحدكم ولو بشاة.فإذا خطب أحدكم المراة وقد خضب بالسواد فليعلمها لا يغرها. سنن الترمذي الجامع الصحيح - أبواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أبواب النكاح عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب ما جاء في إعلان النكاح حديث : ١٠٤٥

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکـەم/** فەرموده باسلێکراوەکان فەرمانکردنی تێدایە بە ئاشکراکردنی گرێبەستەکە،ئەوەش پێچەوانەی شاردنەوەیەتی.

**باسـی دوەم/** لـە فـەرموده باسـلێکراوەکاندا،بەڵگەی حـەڵاڵی دەفلێـدانی تێدایە،چونکە زیاتر ئاشکراکردنەکەی تیا بەدی ئەکرێت.

**باسـی سـێیەم/** ڕوکەشـی فەرمانکردنەکـە بـۆ واجـب بونە،هەرچـەندە هـیچ زانایـەکیش وای نەوتوە،کەواتـە بـۆ سـوننەتە. بەڵام بـە مـەرجێك: ڕەچـاوی ئـەو شێوازە بکرێت کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا بوە کە شتی حەرامی تێکەڵ نەبوە،وەك: گۆرانی وتنی ئافرەت بە دەنگێکی ناسك بە شیعرێك کە بە سەر بەژن وباڵاو ڕومەتدا هەڵبدات.

ئەو شێوازەش کە خـەڵکی دوای ئـەو سـەردەمە دایان هێناوە،لـە شـەرعدا نـەهاتوە،گومان نیـە کـە لـەم سـەردەمانەدا لـە گـەڵ دەف لێدانەکـەدا حـەرامیش تێکـەڵ ئەکرێت،کەواتـە بەتێکـەڵ کردنەکـە حەرامـە نـەك دەفلێدانەکە خۆی.

**(١١٣) عَنْ أَبي بردَة بن أبي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ..** هاوسەرگیری بێ سەرپەرشتیار نابێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد،چوارکەسەکە.إبن المديني و ترمذي وإبن حبان بە صحيحيان داناوە. مسند احمد بن حنبل - أول مسند الكوفيين حديث أبي موسى الأشعري - حديث : ١٩٢٦٤.[1]

**ماناى وشـەکان//** الولي: نزیکترین کەس لە ئافرەتەکە لە خزمانی باوکی نەك خزمە دورەکانی.

---

[1] البانى لە الإرواء دا بە صحيحى داناوە. ١٨٣٩.

**سەرباسەكان//**

**باســــى يەكــــــەم/** دەربــارەى بەمــەرجگرتنى بــونى سەرپەرشــتيار لــە گرێبەستەكەدا،چەند رايەك هەيە:

يەكـەم: هاوسـەرگيرى بىٚ سەرپەرشـتيار دروسـت نيـە،ئافرەت بـۆى نيـە خـۆى بەشـو بـدات.ئەمـەش راى عمـر وعلـى وإبـن عبـاس وإبـن مـسعود وأبـو هريـرەو عائشەيە.وە راى جمهوريشە،بە بەڵگەى:

أ.فەرمودە باسلێكراوەكە،چونكە بناغە لە رێگرى كردندا بۆ دروستنەبونە نەك بۆ تەواو نەبون.

ب.فەرمودەى ابو هريرە: ئافرەت ئافرەت بە شـونادات وخۆشـى بە شـو نـادات.[1] رێگريكردنيش بەڵگەى تێكچونە كە واتاى پوچەڵبونى گرێبەستەكەيە.

دوەم: بــۆ ئافرەتێــك كــە كەســوكارى هــەبێت وكەســايەتى هــەبێت،بونى سەرپەرشـتيار مەرجە،بـەڵام ئافرەتێك لـەو ئاسـتەدا نەبوو،مـەرج نيـە ودروسـتە خۆى بدات بە شوو.ئەمەش راى مالكە.

وەڵامى دراوەتەوە كە: بەڵگەكان ئەو جياكاريەيان تێدا نيە.

ســێيەم: بــونى سەرپەرشــتيار مــەرج نيە،بــەراى حەنەفيەكان،بەبەڵگــەى: شوبهاندنى بە كرين وفرۆشتنەوە،كە بۆى هەيە خۆى ئەنجامى بدات.

وەڵامى دراوەتەوە كە: شوبهاندنێكى بىٚ بنەمايە،چونكە بەرامبەر بونى دەقێكى شەرعيە.

چـوارەم: بـۆ كـچ سەرپەرشـتيار مەرجە،بـەراى ظاهريـة،بەبەڵگـەى فـەرمودەى: بێوەژن بۆ كاروبارى خـۆى لە پێشترە لـە خـەڵكى تـر[2].وەڵاميـان دراوەتـەوە كـە:

---

[1] لا تزوج المرأة المرأة،ولا تزوج المرأة نفسها.رواه إبن ماجه والدارقطني ورجاله ثقات. سنن ابن ماجه - كتاب النكاح
باب لا نكاح إلا بولي - حديث : ١٨٧٨

[2] الثيب أولى بنفسها.

مەبەســـت لـــە فەرمودەکـــە وەرگـــرتنی ڕەزامەندیـــەتی،تا لەگـــەڵ فـــەرمودە باسلێکراوەکەدا یە کبخرێت.

پێنجەم: بۆ ئافرەت هەیە خۆی بە شو بدات ئەگەر سەرپەرشتیارەکەی لاری نەبوو،ئەمەش ڕای ابو ثورە،بە بەڵگەی تێگەشتنمان بۆ فەرمودەی عائشە کە ئەڵێت:پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: هەر ئافرەتێك بێ پرسی سەرپەرشتیارەکەی خۆی بدات بە شوو،هاوسەرگیریەکەی پوچەڵە.ئەگەر بگوازرێتەوە،بەهۆی جیماع کردن لە گەڵیدا،مارەییەکەی بۆ حەڵاڵ ئەبێت. ئەگەر لەوبارەیەوە ناکۆکیش هەبوو،ئـــەوە پێـــشەوای موســـڵمانان سەرپەرشـــتیاری ئـــەو ئافرەتەیـــە کـــە سەرپەرشتیاری نەبێت.[1] فەرمودەی بێ پرسی سەرپەرشتیارەکەی، ئەوەی لێ ئەخوێندرێتـەوە کـە: ئەگـەر سەرپەرشـتیارەکەی مۆڵـەتی بدات،دروسـتە خـۆی گرێبەستەکە بۆ خۆی ئەنجام بدات.بەڵام وەڵام دراوەتەوە کە: ئەم تێگەشتنە پێچەوانەی دەقە.

<u>باسی دوەم/</u> ئەگەر سەرپەرشتیار نەبوو،یان هەبوو بەڵام لەکار خرابوو،یا دیار نەبوو،کاروباری ئافرەتەکە ئەدرێتە دەستی کار بەدەستی ئەو شوێنە،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەکەی پێشووی عائشە: ئەگەر لەوبارەیەوە ناکۆکیش هەبوو، ئەوە پێشەوای موسـڵمانان سەرپەرشـتیاری ئـەو ئافرەتەیـە کـە سەرپەرشـتیاری نەبێت.مەبەست لە وشەی الإشتجار واتە: ڕێگریکردن لە سەرپەرشتیارەکان بۆ ئەنجامدانی کارەکەیان، واتە لە کارخستن.

ب.فەرمودەی إبن عباس: هاوسەرگیری بێ سەرپەرشتیار نابێت ،وسوڵتان یش سەرپەرشتیاری کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێت.[2]

---

[1] أيما إمرأة نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل.فإن دخل بها فلها المهر بما إستحل من فرجها،فإن إشتجروا فالسلطان ولي من لا ولي له. أخرجه الأربعة إلا النسائي،وصححه أبو عوانة وابن حبان والحاكم. أبواب النكاح عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب حديث : ١٠٥٧

[2] أخرجه الطبراني مرفوعا عن إبن عباس: لا نكاح إلا بولي،والسلطان ولي من لا ولي له.وإن كان فيه حجاج بن أرطاة فقد اخرجه سفيان في جامعه.

**(١١٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَا تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ. قَالُوا: يَارَسُولَ اللهِ،وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ.**

**بێوەژن بەشو نادرێت تا ڕای وەرنەگیرێت،کچیش بەشونادرێت تا پرسی پێ نەکرێت،وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا،پرس پێکردنی چۆنە؟ فەرموی: کاتێك بێدەنگ بێت.**

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** صحيح البخاري - كتاب النكاح باب لا ينكح الأب وغيره البكر والثيب إلا برضاها - حديث : ٤٨٤٤. صحيح مسلم - كتاب النكاح باب استئذان الثيب في النكاح بالنطق - حديث : ٢٦٢١.

**مانای وشەکان//** لا تنكح: بە جەزم و رە فع خوێنداوەتەوە. الأيم: ئەو ئافرەتەی لە مێردەکەی جیا بوەتەوە بە تەڵاق یا مردن. تستأمر: داوای فەرمان کردنی لێ ئەکرێت. البكر: مەبەستی کچێکە باڵغ بوبێت،چونکە ئەگەر باڵغ نەبوبێت نازانێت پرس کردن چیە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** وشەی پرسکردنی بۆ کچ و،ڕێگەدانی بۆ بێوەژن بەکارهێناوە،وەك ئاماژەیەك بۆ جیاوازی نێوان هەردوو وشەکە.

**باسی دوەم/** دوپاتکردنەوە لە سەر ڕا وەرگرتنی بێوەژن،سەرپەرشتیاریش پێویستە بەڕاشکاوی مۆڵەتی لێوەرگرێت وبەقسە،بۆ ئەنجامدانی گرێبەستەکە.مەبەستیش لێی: ڕەزامەندی وەرگرتنیەتی، ئەوەش مانای ئەوەیە کە لە سەرپەرشتیارەکە لە پێشترە بۆ ماڧی خۆی.

**باسی سێیەم/** پرسکردن بە کچ بە قسەو بەبێدەنگیش ئەبێت،بەپێچەوانەی ڕاوەرگرتن بۆ بێوەژن کە تەنها بە قسە ئەبێت.

**باسی چوارەم/** بۆیە بێدەنگی لە کچ وەرئەگیرێت،چونکە شەرم ئەکات بەڕاشکاوی ڕازی بونی بڵێت. بە بەڵگەی فەرمودەی عائشە کە ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا کچ شەرم ئەکات،فەرموی: بێدەنگیەکەی ڕازیبونیەتی.[1]

**باسی پێنجەم/** زانایان دەربارەی رازی بونی ئافرەتەکە چەند ڕایەکیان هەیە:

یەکەم: إبن المنذر ئەڵێت: باش وایە پێی بوترێت کە بێدەنگیەکەی مانای ڕازیبونە.

دوەم: إبن شعبان ئەڵێت: سێ جار پێی ئەوترێت: ئەگەر ڕازیت بێدەنگ بە،ئەگەر پێت ناخۆشە،قسەبکە.

ئەگەر قسەی نەکرد بەڵام گریا لەو کاتەدا،ئەوە چەند ڕایەك دەربارەی ئەو حاڵەتە هەیە:

أ.لەو کاتەدا بێدەنگیەکەی بەڕازیبون دانانرێت.

ب.گریانەکەی کاریگەر نابیت بۆ ڕێگریکردن،مەگەر هاوارکردن ولەو بابەتەی لە گەڵ بێت.

ج.سەیری فرمیسکەکەی ئەکرێت،ئەگەر گەرم بوو واتە ناڕازیە،ئەگەر ساردیش بوو واتە ڕازیبونە.

سێیەم: سەیری نیشانە ئەکرێت تا بزانرێت ڕازیبونە یان نا؟ ئەمەش ڕای دروستە وەك صەنعانی باسی کردوە.

[1] أخرج الشيخان أن عائشة قالت: يا رسول الله إن البكر تستحي،قال:رضاها صماتها. صحيح البخاري - كتاب الحيل
باب في النكاح - حديث : ٦٥٨٧

**( ١١٥ ) عَنْ نَافِعٍ عَنْ إِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ( صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) عَنِ الشِّغَارِ. وَالشِّغَارُ: أَنْ يُزَوِّجَ إِبْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الآخَرُ إِبْنَتَهُ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ..**
**پێغەمبەری خوا ڕێگری کردوە لەژن بەژن،کەبریتیە لەوەی: کەسێك کچەکەی بدات بەکەسێکی تر،بەمەرجێك ئەویش کچەکەی خۆی بداتێ ومارەییان لەنێواندا نەبێت.**

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب النكاح باب الشغار - حديث : ٤٨٢٣. صحيح مسلم - كتاب النكاح باب تحريم نكاح الشغار وبطلانه - حديث : ٢٦١٥

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی خاوەنی ئەو لێکدانەوەیەی سەرەوە چەند ڕایەك هەیە:
یەکەم: شافعی ئەڵێت: نازانم ئەم لێکدانەوەیە هی پێغەمبەری خوایە،یا إبن عمر،یا نافع،یا مالك؟
دوەم: خطيب ئەڵێت: وتەی پێغەمبەری خوا نیە،بەڵکو وتەی مالکەو تێکەڵ بوە بە دەقە مرفوعەکەوە.إبن المهدی وقعنبی ش ئەوە ڕون ئەکەنەوە،بەڵگەش بۆ ئەوە وتەی مالك خۆیەتی وەك دارقطني لەڕێگەی خالد بن مخلد ئەیگێڕێتەوە،کە مالك وتویەتی: بیستومە کە شغار ئەوەیە کە.......
سێیەم:بخاری لە کتاب الحیل دا بە ڕاشکاوی ئەڵێت کە لێکدانەوەی شغار هی نافعە.

**باسی دوەم/** قرطبي ئەڵێت: لێکدانەوەکە بەو شێوەیە ڕاستە،و لەگەڵ زمانی عەرەبیشدا ئەگونجێت. ئەگەر وتەی پێغەمەری خوا بێت،ئەوە باشە،ئەگەر وتەی هاوەڵانیش بێت،هەر وەرگیراوەو دروستە،چونکە ئەو بە وتەکە زاناترەو بە بارودۆخەکەش شارەزاترە.

**باسی سێیەم/** ژن بە ژن دوو شێوەی هەیە:

یەکـەم: وەك لـە فەرمودەکـەدا باسـکراوە،کە بریتیـە لـەوەی: هـیچ کـام لـە گرێبەستەکە مارەییان تیا نەبێت.

دوەم: هـەر یـەکێك لـە سەرپەرشتیارەکە بەمـەرج دابنێت کـە بەرامبەرەکەی ئەو ئافرەتەی بداتیّ کە سەرپەرشتی ئەکات.

**باسی چوارەم/** دەربارەی حوکمی ژن بەژن ،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: هاوسـەرگیریەکی پوچـەڵە،بەڕای هادویـە وشـافعی ومالـك وجمهـور،إبـن المنذریش لە اوزاعیەوە ئەیگێڕنەوە،بە بەڵگەی: ئـەو ڕێگریـەی لـە فەرمودەکـەدا هاتوە.ڕێگریش واتای پوچبون ئەگەیەنێت.

دوەم : ڕەوایە،بـەڵام ئـەو مەرجانـەی تیـا باسـکراوە پوچـەڵەو،مارەی واجـب ئەبێت.ئەمەش ڕای حەنەفیە و زوهری ومکحول وثوري وليث وإسحاق وابي ثور وڕیوایـەتیکی احمد،بە بەڵگەی: گشتگیری ئایـەتی ﴿فانكحوا ما طاب لكم من النـساء﴾{النـساء:٣}.بـەڵام وەڵـام دراوەتـەوە کـە: ئایەتەکـە گـشتگیرەو بـە ڕێگریکردنی فەرمودەکە تایبەت کراوە.

**باسی پێنجەم/** صەنعانی ئەڵێت: زانایان قسەی زۆریان هەیە دەربارەی هۆکاری ڕێگریەکە،هەموشـیان بـیّ بەڵگـەن.بـەڵام لـە فـەرمودەی: مارەییـان لەنێوانـدا نیە،دەرئەکەوێت کە ئەوە هۆکارەکەیەتی.

( ١١٦ ) عَنْ إبْنِ عَبّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا : أَنَّ جَارِيَةً بِكْراً أَتَتْ النَّبِيَّ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ ، فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللهِ..

كچێك هاتەلای پێغەمبەرو باسیکرد کەباوکی بەزۆر داویەتی بەشوو،پێغەمبەری خواش ماف هەڵبژاردنی دایەوە دەست خۆی.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە// احمد،ابوداود،إبن ماجه. سنن أبي داود - كتاب النكاح باب في البكر يزوجها أبوها ولا يستأمرها - حديث : ١٨٠٧[1]

سەرباسەکان//

دەربارەی زۆرکردنی باوك لەکچەکە باڵغەکەی بۆ شوکردن، دوو ڕا هەیە:

یەکەم: حەرامە زۆری لێبکرێت،خۆ ئەگەر بێ پرس مارەکرا، گرێبەستەکە دروست نیە،بەڕای هادویەو حەنەفیە وأوزاعی وثوري وعترە،ترمذیش لە زۆربەی زانایانی ئەیگێڕێتەوە،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.فەرمودەی موسلیم: کچ باوکی پرسی پێ ئەکات (بۆ بەشودانی)[2] . بەیهەقی ئەڵێت: وشەی باوك لە فەرمودەکەدا زیادەیە.بەڵام إبن حجر وەڵامی ئەداتەوە کە: کەسێکی عادل زیادەکەی گێڕشاوەتەوە،کەواتە کاری پێئەکرێت.

ج. فەرمودەی پێشوتر: کچ بەشونادرێت تا پرسی پێ نەکرێت.ئەگەر حەرام بێت لە سەر باوك بە زۆر بە شوی بدات،ئەوە بۆ سەرپەرشتیارەکانی تریش هەر حەرامە.

دوەم: دروستە باوك زۆر لە کچە باڵغەکەی بکات بۆ شوکردن،بەڕای شافعی وإسحاق ومالك ولیث وإبن ابی لیلی،بە بەڵگەی:

---

[1] البانی بە صحیحی داناوە.صحيح أبي داود ٢٠٩٦.

[2] والبكر يستأذنها أبوها. صحيح مسلم - كتاب النكاح باب استئذان الثيب في النكاح بالنطق - حديث : ٢٦٢٤

١.تێگەشتنی فەرمودەی: بێوەژن بۆ کاروباری خۆی لەپێشترە.ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە کچ بە پێچەوانەیەو، سەرپەرشتیار بۆ کاروباری کچەکە لەپێشترە لە کچەکە خۆی.وەڵام دراوەتەوە کە:

ا.ئەمە تێگەشتنەو بەرەنگاری دەقی ڕاشکاو ناوەستێت.

ب.ئەگەر بە گشتی ئەم زۆرکردنە وەربگیرێت،سەرپەرشتیاری جگە لە باوکیش ئەگرێتەوەو،تایبەت نیە بەباوکەوە.

٢. فەرمودەکەی إبن عباس وا لێك ئەدرێتەوە کە باوکی کچەکەی داوە بە کەسێك کەهاوشانی نیە،ئەمەش وتەی بەیهەقیە بۆ بەهێزکردنی ڕای شافعی.إبن حجر ئەڵێت: وەڵامی بیهقی پشتی پێ ئەبەسترێت،چونکە ڕوداوێکە ڕویداوە،بەڵام ناتوانرێت گشتگیر بکرێت.

بەڵام صەنعانی ئەڵێت: قسەی ئەم دوو پێشەوایە،بەرگریکردنە لە ڕاو مەزهەبی شافعی،لە بەر ئەم هۆیانە:

ا.لێکدانەوەی بەیهەقی بێ بەڵگەیە،ئەگەر بەو شێوەیە بوایە ،ئافرەتەکە باسی ئەکرد،بەڵکو تەنها وتویەتی: باوکی بەشویداوەو ئەمیش ناڕازیە.کەواتە هۆکارەکە ناڕازیبونە،بۆیە سەرپشك کراوە،هەر ئەو هۆکارەش باسکراوە.وەك ئەوە وایە کە پێغەمبەری خوا پێی بڵێت: ئەگەر ناڕازیت،تۆ سەرپشکیت لە هاوسەرگیریەکەدا.

ب. وتەکەی إبن حجر کە ئەڵێت: ڕوداوێکە وتایبەتە،ڕاست نیە،چونکە حوکمەکە گشتیە لەبەر گشتی هۆکارەکەی،بۆیە هەر کاتێك ناڕازیبون هەبوو،حوکمەکەش هەیە.

عائشە ئەیگێڕێتەوە کە: کچێك هاتوە بۆ لای و وتویەتی: باوکم منی داوە بە برازاکەی خۆی تا پلەی پێ بەرزبکاتەوە،منیش ڕازی نیم،عائشەش ئەڵێت: دانیشە تا پێغەمبەری خوا دێتەوە،کاتێك پێغەمبەری خوا دێتەوە، عائشە بۆی ئەگێڕێتەوە،پێغەمبەریش ئەنێرێت بە دوای باوکی کچەکەداو بانگی ئەکات،و کچەکە سەر پشك ئەکات،کچەکەش ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا،بە ئیشەکەی

باوكم ڕازیم،بەڵام ویستم بە ئافرەتان ڕابگەیەنم كە باوكانیان لەو بارەیەوە مافیان نیە.[1] و ادیارە كە كچ بوە،لەوانەشە هەمان كچ بوبێت كە لە فەرمودەكەی إبن عباس دا باسكراوە،باوكیشی داویەتی بە كەسێكی نەشیاو.ئەگەر بێوەژنیش بێت،بەڕاشكاوی ئەڵێت كە مەبەستی ئەوەیە بە ئافرەتان ڕابگەیەنێت كە باوكیان مافی زۆرلێكردنیان نیە.وشەی ئافرەت النساء بێوەژن وكچ یش ئەگرێتەوە،ئافرەتەكەش ئەو قسەیەی لای پێغەمبەری خوا كردوە،ئەویش پێی ڕازی بوە.مەبەستیش لە نەبونی مافی باوك لەوبارەدا،واتە مافی زۆرلێكردنیان نیە،بەڵام گشتگیر ناكرێت(بەڵكو مافی شتی تری هەیە).

٣.إبن عمرو قاسم وسالم ،كچیان بەشو ئەداو پرسیان پێ نەئەكردن. إبن حجر ئەڵێت: ئەمەش دژ بە گێڕانەوە زیادەكەی كەسی متمانەپێكراو ناوەستێت.

(١١٧) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلَا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا..

لەنێوان ئافرەت وپور) خوشكی باوك( هەروەها لە(خوشكی دایك) كۆناكرێتەوە. (هاوسەری یەك پیاو نابن لەیەك كاتدا).

<u>گێڕەرەوەی فەرمودەكە//</u> صحيح البخاري – كتاب النكاح باب لا تنكح المرأة على عمتها – حديث : ٤٨٢١.

صحيح مسلم – كتاب النكاح باب تحريم الجمع بين المرأة وعمتها أو خالتها في النكاح – حديث : ٢٥٩٣.

---

[1] أخرج النسائي عن عائشة:أن فتاة دخلت عليها،فقالت:إن أبي زوجني من إبن أخيه يرفع بي خسيسته،وأنا كارهة.فقالت:إجلسي حتى يأتي رسول الله،فجاء رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فاخبرته،فأرسل إلى أبيها فدعاه فجعل الأمر إليها.فقالت:يارسول الله،قد أجزت ما صنع أبي،ولكن أردت أن أعلم النساء أن ليس للآباء من الأمر شيء. السنن الصغرى - كتاب النكاح البكر يزوجها أبوها وهي كارهة - حديث : ٣٢٢٤

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** دەربارەی كۆكرنەوەی پورو خوشكەزا یا برازا،لای پیاوێك،دوو ڕا هەیە:

یەكەم: حەرامە پێكەوە كۆبكرێنەوە.شافعی ئەڵێت: ئەمە قسەی هەموو زاناو موفتیەكە كە پێی گەشتبم، هەروەها ترمذي ش هەمان قسەی هەیە،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێكراوەكە،كە مانای تەواوی ڕێگری تیایە.

ب.كۆدەنگی زانایان لەوبارەیەوە،وەك إبن عبدالبر وإبن حزم و قرطبي ونووي وإبن المنذر باسیان كردوە.

دوەم: كۆكردنەوەیان دروستە،بەڕای كۆمەڵێك لە خوارج وشیعەو عثمان البتي،بەبەڵگەی:

١.گشتگیری ئایەتی:﴿وأحل لكم ما وراء ذلكم﴾ النساء:٢٤.

وەڵام دراوەتەوە كە: ئایەتە گشتگیرەو فەرمودە باسلێكراوەكە تایبەتی كردوە.

٢.ئەو ڕێگریەی لە فەرمودە باسلێكراوەكەدا هەیە تەنها بۆ كەراهەتە،بە بەڵگەی: باسكردنی هۆكارەكە لە فەرمودەی إبن عباس دا: ئەگەر ئێوە وابكەن ئەی ئافرەتان،سیلەی ڕەحم ئەپچڕێنن. إبن حبان ئەیگێڕێتەوە بەو شێوەیەی كە بۆ ئافرەتان بێت،إبن عدی ئەیگێڕێتەوە كە بۆ پیاوانە.مەبەستیش لێی ئەوەیە كە: ئەگەر پیاو هەردوو ژنەكەی كۆكردەوە،ژنەكان وەك خزمیان لێدێت،ئەویش بەهۆی ئەو ناكۆكیەی ئەكەوێتە نێوان دوو ژنەكەوە،ئەبێتە هۆكاری پچڕاندنی سیلەی ڕەحم.

خاوەنی ئەم ڕایە ئەڵێن: بێگومان تەنها ترسان لەوەی ببێتە هۆكاری پچڕاندنی سیلەی ڕەحم،بەتەنها نابێتە هۆی حەرامبون،ئەگەرنا كۆكردنەوەی دوو ئامۆزاو یا پورزا پێكەوە هەمان حوكمی هەیە،چونكە هەمان هۆكار لێرەشدا هەیە.

وەڵام دراوەتەوە كە:پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، لەتاوانە گەورەكانە.وهەرهۆكاریش سەر بكێشێت بۆ پچڕاندنی، ئەویش حەرامە،بەكۆدەنگی زانایان.

**باسی دووەم/** ئەگەر بوترێت: ئەبوایە حەنەفیەکان کۆکرنەوەی ئەو ئافرەتانەیان بە ڕەوا دابنایە،چونکە لە بنەماکانیان،پێشخستنی گشتی ئایەتە بەسەر فەرمودەی آحاد.بەڵام خاوەنی کتێبی الهدایە وەڵامیان ئەداتەوە کە: فەرمودە باسلێکراوەکە مشهورە،ئەویش حوکمی دەقی بنەبڕ وقطعي هەیە،بەتایبەت کە لێرەدا کۆدەنگی هەیە،گوێ بەوانەش نادرێت کە ڕای پێچەوانەیان هەیە.

**( ١١٨ ) عَنْ سَلَمَةَ بْنَ الأكْوَعِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ:رَخَّصَ رَسُولُ اللهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) عَامَ أَوْطَاسٍ فِي الْمُتْعَةِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ثُمَّ نَهَى عَنْهَا..**

پێغەمبەری خوا لە ساڵی أوطاس دا، تا سێ ڕۆژ مۆڵەتی داین هاوسەرگیری بۆ ماوەیەك بکەین،پاشان ڕێگری لێکردین..

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** صحيح مسلم - كتاب النكاح باب نكاح المتعة - حديث : ٢٥٧٨.

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** نكاح المتعة وەك لـە کتێبەکانی إمامیەدا باسکراوە،بریتیە لـە: هاوسـەرگیرییەك بـۆ کـاتێکی دیـار یـا نادیار،درێـژترین ماوەشـی بـۆ ٤٥ ڕۆژە.هاوسـەرگیریەکەش کۆتـایی پـی دێـت بـە: ئەگـەر ئافرەتەکـە عـادەی نەبوو،ماوەکـەی تـەواو بێـت.ئەگـەر عـادەی هـەبوو،تا دوو جار خـوێن بیـنێن.وە ئەگەر مێردەکەی بمرێت،تا چوار مـانگ و دە ڕۆژە.دوای ئـەوە هاوسـەرگیریەکە کۆتایی پێ دێت.

حوکمی ئەم هاوسەرگیریەش:

١.ئـەم خاڵانـەی خـوارەوە نایگرێتـەوە: مـارەیی نیـە مەگـەر بەمـەرجی دانابێت،بژێوی بـۆ نیـە،میرات لـەنێوانیان نیە،عیـدە ناگرێت،مەگەر مێردەکـەی بمرێت،منداڵەکانی ئەو هاوسەرگیریە نادرێتە پاڵ پیاوەکە، مەگەر مەرجی پێش وەخت هەبێت.

ب.بەم هاوسەرگیریە،مصاهرة حەرام ئەبێت.

باسی دوەم/ موسڵمانان ،چ ئەوانەی بە حەرامی دائەنێن ،و ئەوانەش بە حەڵاڵی دائەنێن،یەکدەنگن لەوەدا کە لەسەرەتادا لەبەر پێویستی زۆر و نەبونی هاوسەر،پێغەمبەری خوا مۆڵەتی داوە بەم هاوسەرگیریە،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراودکەو زۆر فەرمودەی تریش.

باتی سێیەم/ دەربارەی مانەوەی ئەو مۆڵەتە یان نا،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: مۆڵەتەکە نەماوە،کەواتە بۆ هەتا هەتایە حەرامە.ئەمەش ڕای جمهوری سلف وخلف وزیدیەو إسماعیلیە لە شیعەکان،بە بەڵگەی :

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.فەرمودەی علی: پێغەمبەری خوا لە ساڵی خەیبەردا ڕێگری لە موتعە کردوە.[1]

ج.هاوەڵە گەورەکان نەمانی مۆڵەتەکە ئەگێڕنەوە.

بوخاری ئەڵێت: علی لە پێغەمبەری خواوە ڕونی کردوەتەوە کە مۆڵەتەکە نەماوە.

إبن ماجەش لە عمرەوە ئەیگێڕێتەوە بە إسنادێکی دروست،کاتێك خوتبەی داوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا تا سێ ڕۆژ مۆڵەتی دابوین بۆ متعە،وپاشان حەرامی کرد،سوێند بەخوا هەر کەس بزانم موتعەی کردوە،وهاوسەرداریشە،بەردبارانی ئەکەم.[2]

إبن عمریش ئەڵێت: پێغەمبەری خوا ڕێگری لێکردین،ئەو کاتەش ئەمان کرد زیناکەر نەبوین.[3]

---

[1] نهى رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عن المتعة عام خيبر.متفق عليه. صحيح البخاري - كتاب الذبائح والصيد باب لحوم الحمر الإنسية - حديث : ٥٢١٠

[2] أخرج إبن ماجة عن عمر بإسناد صحيح عن عمر أنه خطب فقال:ان رسول الله أذن لنا في المتعة ثلاثا ثم حرمها،والله لا أعلم أحدا تمتع وهو محصن إلا رجمته بالحجارة. سنن ابن ماجه - كتاب النكاح باب النهي عن نكاح المتعة - حديث : ١٩٥٩

[3] قال إبن عمر:نهانا عنها رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وما كنا مسافحين.إسناده قوي. المعجم الأوسط للطبراني - باب العين

د.کۆمەڵێك لە هاوەڵان لەسەرەتاوە پێیان وابوو مۆڵەتەکە ماوە،بەڵام دوایی پەشیمان بونەوە،وەك لێیان ئەگێردرێتەوە،وەفتوای نەمانی مۆڵەتەکەیان داوە.لەوانەش: إبن عباس: مانەوەی مۆڵەتەکەی لێ ئەگێرنەوە،پاشان پەشیمان بویەوەو،گەڕاوەتەوە بۆ حەرامبونی ئەم هاوسەرگیریە.

ھ.بیهقی لە جعفر بن محمد ئەیگێڕێتەوە،کاتێك پرسیاری دەربارەی موتعە لێکراوە،وتویەتی: ئەوە زینایە.[1]

و.حەرامبونی موتعە وەك کۆدەنگیەکی لێهاتوە،مەگەر لای هەندێك لە شیعە.

لە کتێبی نهایە المجتهد یش هاتوە: هەواڵەکان بەشێوەی متواتر تحریم ی ئەکەن،بەڵام جیاوازیەکەیان لەکاتی حەرامبونەکەیە.

دوەم: مەزهەبی دوازدە إمامی پێیان وایە که مۆڵەتەکە ماوەو،بەبەڵگەی:

ا.مۆڵەتەکە لا نەبراوە.وەڵامیان دراوەتەوە کە: کۆدەنگیەك هەیە بەشێوەی متواتر بۆ حەرامبون و نەمانی مۆڵەتەکە.

ب.ئەڵێن حەڵاڵبونەکەی قطعیةو وبێگومانە(چونکە ڕای هەموانی لەسەرە)،بەڵام حەرامبونەکەی گومانایە. وەڵامیان دراوەتەوە کە: ئەمە ڕاست نیە،چونکە ئەوانەی حەڵاڵبونەکە ئەگێڕنەوە،هەر ئەوانەش نەمانی مۆڵەتەکە ئەگێڕنەوە. کەواتە یا لە هەردو حاڵەتەدا بێگومانن،یا لە هەردوکیاندا گوماناوین.

<u>**باسی چوارەم/**</u> جمهوری زانایان لە سلف وخلف،ڕایان لە سەر حەرامبونیەتی وەك لەپێشدا باسکرا،بەڵام دەربارەی ئەو کاتەی کە حەرامکراوە چەند ڕایەکیان هەیە:

١.لە خەیبەردا بوە.. ٢.لە عمرة القضاء دا بوە..٣.لەساڵی ڕزگارکردنی مەککەدابوە.. ٤.لەساڵی اوطاس دا بوە...٥.لەجەنگی تەبوکدا بوە...٦.لە حەجی ماڵ ئاوایی دا بوە.

ئەوەی ئەڵێت: ڕای دروست ئەوەیە کە: حەرامبون وحەڵاڵبونی دوو جار ڕویداوە: پێش خەیبەر حەڵاڵ بوە ولەو شەڕەدا حەرام کراوە،پاشان لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا کە ساڵی اوطاسە ،ڕێی پێ دراوە،پاشان بۆ هەتا هەتایە حەرام کراوە.

---

باب الهاء - ذكر من اسمه : هاشم حديث : ٩٤٦٩

[1] نقل البيهقي عن جعفر بن محمد: أنه سئل عن المتعة، فقال:هى الزنا.

(١١٩) ١.عَنْ إِبْنِ عُمَر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): العَرَبُ بَعْضُهُمْ أَكْفَاءُ بَعْضٍ،وَالمَوالي بَعْضُهُمْ أَكْفَاءُ بَعْضٍ،إلّا حَائِكاً أَوْ حَجّاماً..

عەرەب هەندێك هاوتای هەندێكیانن،غەیرە عەرەبیش بەهەمان شێوە،جگە لە بەرگدرو وەكەڵەشاخ گر.(هاوشانی خەڵكی ترنین).

٢ عن فاطمة بنت قيس رضي الله عنها أن النبي صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قال لها: أنكحي اسامة.

فاتمەی كچی قەیس : پێغەمبەری خودا پێی ئەڵێت: شو بكە بە ئوسامەی كوڕی زەید.

٣. عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ أن النَّبِيّ (صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قال: يا بني بياضة أنكحوا أباهند، وانكحوا إليه،وكان حجاما.

ئەی بني بياضة،كچ بدەن بە ابو هندو لێشی بخوازن،لەكاتێكدا–ابوهند– كەڵەشاخی ئەگرتەوە.

٤.عن أبي حاتم المزني رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله (صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): إذا أتاكم من ترضون دينه وخلقه فانكحوه،إلا تفعلوه تكن فتنة في الأرض وفساد كبير،قالوا: يارسول الله،وإن كان فيه؟ قال: إذا أتاكم من ترضون دينه وخلقه فانكحوه،ثلاث مرات..

ئەگەر كەسێك هاتە خوازبێنی ،لەدین و ئەخلاقی ڕازیبون كچی بدەنێ،ئەگەر وانەكەن،لەسەر زەویدا ئاژاوە دروست ئەبێت.وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا،ئەگەرشتی تریشی هەبوو ؟ سێ جار فەرموی: ئەگەر كەسێك هاتەپێشەوە،لەدین و ئەخلاقی ڕازی بون كچی بدەنێ.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**

١.حاکم.[1] السنن الصغير للبيهقي - كتاب النكاح باب اعتبار الكفاءة - حديث : ٢١٨٧١.

٢. صحيح مسلم - كتاب الطلاق باب المطلقة ثلاثا لا نفقة لها - حديث : ٢٧٨٧

٣.ابوداود وحاکم بەإسنادێکی باش. سنن أبي داود ،كتاب النكاح باب في الأكفاء - حديث : ٢١٨١١ ترمذي وه وتويەتی: حسن غريب.

٤. سنن الترمذي الجامع الصحيح - ابواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم ابواب النكاح عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب ما جاء إذا جاءكم من ترضون دينه فزوجوه حديث : ١٠٤١

**سەرباسەکان//**

زانایان دەربارەی ئەو هاوشانیەتیەی لە شەرعدا بە هەند وەرئەگیرێت،چەند ڕایەکیان هەیە:

یەکەم: هاوشانیەتی لە دیندایە نەك لە خزم و کەس وکار.ئەمەش ڕای عمرو إبن مسعود وإبن سيرين وعمر بن عبدالعزيزو زيد بن علی ومالك، وە ڕایەکی ناصرە،بوخاری وصەنعانیش پشتگیری لی ئەکەن،بە بەڵگەی:

١.ئایەتی:﴿إن أكرمكم عند الله اتقاكم﴾ {الحجرات:١٣} .بەڕێزترینتان لای خوا، تەقوادارترینتانە.

٢.ئایەتی:﴿هو الذي خلق من الماء بشرا﴾{الفرقان:٥٤} .خوای گەورە ئەوەیە کە لە ئاو مرۆڤی دروست کردوە. ئەمەش بەڵگەی یەکسانبونی مرۆڤەکانە.

٣.فەرمودەی: هەموتان نەوەی ئادەمن،وئادەمیش لە گڵە.[3]

---

[1] فەرمودەیەکی هەڵبەستراوە.الإرواء ١٨٦٩.

[2] البانی بە حسنی داناوە.صحيح أبي داود ٢١٠٢ .

[3] كلكم من آدم وآدم من تراب.أخرجه إبن سعد من حديث أبي هريرة.

٤.فەرمودەی: خەڵکی وەکو دانەکانی شانە وان،بەتەقوا نەبێت،کەس لە کەس چاکتر نیە.[١]

٥.فەرمودەی: ئافرەتی دیندار بهێنە یا لە هەژاریدا دەست بە خۆڵا نەکەیت.[٢]

٦.پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا خوتبەی داو فەرموی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خۆبەزل زانینی سەردەمی نەفامێتی لەناوتانا نەهێشت. ئەی خەڵکینە،خەڵکی هەمو دوو جۆرن: باوەڕدارێك تەقوای هەبێت،لای خوای گەورە بەڕێزە.وەبێ باوەڕێکی بەدبەخت،کەلای خوای گەرە سوکە،پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: إن أكرمكم..پاشان فەرموی: هەر کەس بیەوێت بەڕێزترین کەس بێت، با تەقواداربێت.[٣]

ئەبینین پێغەمبەری خوا لاکردنەوە بەلای خزمایەتی وشانازی کردن پێوەی ، بە خۆ بەزلزانینی سەردەمی نەفامی دانـاوە.کەواتە چۆن موسڵمان ئەیکاتە پێوەر،وحوکمی شەرعی لە سەر بینا ئەکات.

٧.فەرمودەی: چوار شت لە سەردەمی نەفامیەوەن کە خەڵکی وازی لێناهێنن،لەناویاندا شانازی کردن بە خزمانەوەی باسکرد. [٤] لەفەرمودەکاندا زۆر زەمی شانازی کردن پێوەی کراوە.

---

[١] الناس كأسنان المشط لا فضل لعربي على عجمي إلا بالتقوى.أخرجه إبن لال. مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار حديث رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم - حديث : ٢٢٨٦٤

[٢] فعليك بذات الدين تربت يداك. صحيح البخاري - كتاب النكاح باب الأكفاء في الدين - حديث : ٤٨٠٢

[٣] خطب النبى صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يوم فتح مكة فقال:الحمد لله الذي أذهب عنكم عبية الجاهلية وتكبرها،يا أيها الناس إنما الناس رجلان:مؤمن تقي كريم على الله،وفاجر شقي هين على الله،ثم قرأ الآية...وقال صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:من سره أن يكون أكرم الناس فليتق الله. سنن أبي داود - كتاب الأدب أبواب النوم - باب في التفاخر بالأحساب حديث : ٤٤٧٣

[٤] أربع من أمور الجاهلية لا يتركها الناس،ثم ذكر منها الفخر بالناس.أخرجه إبن جرير من حديث إبن عباس.

٨. فەرمودەی چوارەم کە أبو حاتم المزنی ئەیگێڕێتەوە،و بەڵگەی ئەوەیە کە دینداری و بە ئەخلاقی پێوەری هاوشانیەتیە.

٩.پێغەمبەری خوا فاتمەی کچی قیس کە قورەیشیەو لەتیرەی فهرەو خوشکی چحاك بن قیسە،وە لەو ئافرەتانەیە کە لەسەرەتادا کۆچیان کردوە بۆ مەدینەو ،خاوەن جوانی و ڕێزە،ئەیدات بە أسامە کوڕی زەید،کە خۆی وباوکی کۆیلە بون وئازاد کرابون.ئەم ئافرەتە دوای ئەوەی مێردەکەی أبوعەمر کوری حفص بن المغیرە تەڵاقی ئەدا وعیددەی تەواو ئەبێت،دێت بۆ لای پێغەمبەرو پێی ئەڵێت کە معاویەی کوری أبو سفیان و ابو جەهم هاتونەتە خوازبێنی،پێغەمبەری خواش ئەفەرموێت: ابو جەهم بەردەوام گۆچانەکەی بەدەستەوەیە (کەسێکی توڕەیە)،وە معاویەش،هەژارەو ماڵی نیە،شوو بە أسامەی کوری زەید بکە.[1]

کەواتە پێغەمبەری خوا أسامە ئەخاتە پێش ئەوانەوە کە نەسەبدا لەو باشترن.

صەنعانی ئەڵێت: نەمبیستوە پێغەمبەری خوا داوای لە هیچ یەکێك لە کەس وکاری ئافرەتەکە بکات،کە واز لە مافی خۆیان بهێنن.

١.پێغەمبەری خوا فەرمان بە بني بیاضة ئەدات کە ژن بدەن بە أبو هندی کەڵەشاخگر (ئەو کەسەی کەڵەشاخی بۆ پێغەمبەری خوا گرت)،وەك لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا باسکراوە،وە پێی فەرموو: ئەویش یەکێکە لە موسڵمانان[2].پێغەمبەری خوا ئەو هۆکارە باس ئەکات کە یەکسانی ئەخوازێت،ئەویش یەکسان بونیانە لە وەسفی موسڵمانێتیدا.

---

[1] تزويج النبى صَلَىَ اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ أسامة بن زيد المولى أبن المولى من فاطمة بنت قيس القرشية الفهرية ،أخت الضحاك بن قيس وهي من المهاجرات الأوائل،ذات فضل وجمال،جاءت إلى رسول الله بعد أن طلقها أبو عمرو بن حفص بن المغيرة بعد إنقضاء عدتها منه،فاخبرته أن معاوية بن أبي سفيان وأبا جهم خطباها،فقال رسول الله:أما أبو جهم فلا يضع عصاه عن عاتقه،وأما معاوية فصعلوك لا مال له،أنكحي أسامة بن زيد.

[2] إنما هو أمرؤ من المسلمين.

١١.بیلال هالەی کچی عەوف ی خوشکی عبدالرحمان کوری عەوف ئەخوازێت.[١]
١٢.ابو حوزەیفە برازاکەی خۆی بەناوی هند کچی عتبە کوری رەبیعە ئەداتە سالم کوری معقل،کە کۆیلەی ئافرەتێکی ئەنصاری بوو.[٢]
١٣.عمري كوري خطاب حەفصەی کچی ئەدات بە سەلمانی فارسی.[٣]
صەنعانی ئەڵێت: لەم بوارەدا شتی سەیر لای خەڵکی هەیە،بێ ئەوەی بەڵگەیان هەبێت،تەنها خۆ بەزل زانین نەبێت،لا إلە إلا الله،چەندەها ئافرەتی باوەڕدار شویان نەکردوە بەهۆی خۆبەزل زانینی سەرپەرشتیارەکانیانەوە.خوایە پەنا ئەگرین بەتۆ لە مەرجێك بە هۆی ئارەزوەوە بێت،وخۆبەگەورە زانینیش پەرەی پێبدات.چەندەها ئافرەت لەسەر مەزهەبی فاطمي بون لە یەمەن لە شوکردن بێبەش کران، تەنها لەبەر ئەوەی هەندێك لە زانایانی مەزهەبەکە وتویانە: حەرامە ئافرەتی فاطمي شوبکات،بە نا فاطمي،بەبێ ئەوەی بەڵگەشیان هەبێت،ئەمەش مەزهەبی پێشەوا هادی نیە،بەڵکو خۆی کچی داوە بە طبریەکان.ئەم ڕایەش دوای خۆی دروست بوو لەسەردەمی پێشەوا احمد بن سلیمان،سەرکردەکانیش دوای خۆی هاتنە سەر ئەم ڕایە،وە ئەیانوت: ئافرەتانمان حەرامە لە سەر فاتمیەکان مەگەر هاوشانی خۆیان بن.ئەم هەموو ڕایانە بێ زانیاری وبێ بەڵگە وتراوە،بەڵکو پێچەوانەی ئەم قسەیە لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوادا هەیە.
دوەم: هاوشانیەتی لەنەسەبدا هەیە،بەڕای جمهور.بەڵام ئەمانیش ڕای جیاوازیان هەیە لەو بارەیەوە:

---

[١] تزوج بلال بهالة بنت عوف،أخت عبدالرحمن بن عوف.كما في الدارقطني.
[٢] إنكاح أبي حذيفة من سالم بن معقل،وهو مولى إمرأة من الأنصار،بإبنة أخيه هند بنت الوليد بن عتبة بن ربيعة.كما في البخاري والنسائي وأبوداود.
[٣] عرض عمر بن الخطاب إبنته حفصة على سلمان الفارسي.

أ. قریش لەناو خۆیاندا وەك یەكن.عەرەبیش هەروەها لەناو خۆیاندا. بەڵام هیچ كەسێكی عەرەبی هاوشانی قورەیشی نیە،وە نا عەرەبیش نابێتە هاوشانی كەسێكی عەرەب،ئەمەش ڕای ابوحەنیفەیەو،ڕایەكی شافعیەكانە.

ب.بەنو هاشم عبدالمطلب پێش خەڵكی ترن،جگە لەوان هەموو خەلك وەك یەكن.ئەمەش لای شافعیەكان ڕای دروستە.هەتا ثوري واحمد لە ڕیوایەتێكی دا ئەڵێن: ئەگەر كۆیلەیەكی ئازادكراو كچێكی عەرەبی هێنا، هاوسەرگیریەكە هەڵئەوەشێتەوە.

جیاوازی ڕای زانایان دەربارەی دانانی نەسەب بەپێوەری هاوتایبون،لەم فەرمودانەوە سەرچاوەی گرتوە:

أ.فەرمودەی إبن عمر: عەرەب هەندێك هاوتای هەندێكیانن،غەیرە عەرەبیش بەهەمان شێوە،جگە لە بەرگدرو وەكەڵەشاخ گر.(هاوشانی خەڵكی ترنین). فەرمودە باسلێكراوەكە.

ب.فەرمودەی إبن عمر: عەرەب هەندێكیان هاوتای هەندێكیانن،تیرە بەتیرەو،گەڕەك بە گەڕەك،وپیاو بەپیاو،مەگەر بەرگدروو كەڵەشاخكر نەبێت.[1]

ج.فەرمودەی: قورەیش پێش بخەن و،پێشیان مەكەون.[2]

فەرمودەی معاز بە مەرفوعی: عەرەب هەندێك هاوتای هەندێكیانن،غەیرە عەرەبیش بەهەمان شێوە.[3]

وەڵامی ئەم فەرمودانە دراوەتەوە كە: فەرمودەی لاوازن وبەرامبەری فەرمودە صەحیحەكانی پێشوتر ناوەستیت.

شافعی ئەڵێت: دەربارەی بەهەند وەرگرتنی نەسەب لە هاوتاییدا فەرمودەی صحیح نیە.

---

[1] حديث إبن عمر:العرب بعضهم أكفاء بعض،قبيلة لقبيلة،وحي لحي،ورجل لرجل،إلا حائك أو حجام.رواه الحاكم.

[2] قدموا قريشا ولا تقدموها. السنن الصغير للبيهقي - كتاب الصلاة باب صفة الأئمة في الصلاة - حديث : ٣٧٧

[3] العرب بعضهم أكفاء بعض،والموالي بعضهم أكفاء بعض.أخرجه البزار لكن بإسناد ضعيف.

خطـابيش ئـەڵێت: هاوتـايى لاى زۆربـەى زانايـان لـە چـوار شـتدا بـە هەنـد وەرئەگيرێت:

ديـن وئازادبون ونەسـەب وپيشە.هەنـدێكيش بـێ عـەيبى ش لەلاشـەدا ئەكەنـە پێوانـە.هەنـدێكيش دەوڵەمەنديـشى بـۆ دائەنێن،بەبەڵگـەى فـەرمودەى: حەسـەب ماڵ وسامانەو ڕێزگرتنيش تەقواو لە خواترسانە.[1]

(١٢٠) عن حكيم بن معاوية عن أبيه قال: قلت: يارسول الله(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ما حق زوج أحدنا عليه؟ قال: تطعمه إذا أكلت،وتكسوها إذا إكتسيت،ولا تضرب الوجه،ولا تقبح،ولا تهجر إلا في البيت.

وتم: ئەى پێغەمبـەرى خـوا مـاف هاوسـەرەكانمان لەسـەرمان چيـە؟ فـەرموى: نـان خوارنەكـەى وەك نـان خـواردنى خـۆت بێـت،بۆخۆت پۆشـاكت كـرد بۆئـەويش بكەيت،لـەدەم و چـاوى مەدە،قـسەى ناشـرينى پـێ مەڵێ،تـەنها لەماڵەكـەدا لێـى جيابەرەوە لە كاتى خەوتندا..

**گێـڕەرەوەى فەرمودەكـە//** احمد،نـسائى،أبوداود،إبـن ماجـه.إبـن حبـان وحـاكم بەصـحيحيان دانـاوە. سـنن أبـي داود - كتـاب النكـاح بـاب في حـق المـرأة علـى زوجها - حديث : ١٨٤٣[2]

**سەرباسەكان//**

**باسى يەكـەم/** لەسـەر مێـرد پێويستە بـژێوى وپۆشـاكى خێزانەكـەى دەستەبەر بكات. بەبەڵگەى: فەرمودە باسلێكراوەكە.

**باسى دوەم/** بژێويەكەش بە پێى توانايە،زياد لە تواناى مێرد واجب نيە. چونكە فەرمودەكە ئەڵێت: إذا اكلت.لەم فەرمودەيەشدا وردەكارى هەيە،ئەويش ئەوەيە

[1] الحسب المال والكرم التقوى. المستدرك على الصحيحين للحاكم - كتاب النكاح حديث : ٢٦٢٠

[2] البانى ئەليت:حسن صحيح.الإرواء ٢٠٣٣.

هەر کاتێك پارەی بژێویەکەی پەیدا کرد، پێویستە تەنها بۆ خۆی بەکاری نەهێنێت.لەوانەشە ئەمە بۆ کاتێك بێت کە لە خۆی زیاد بێت،چونکە فەرمودەکە ئەڵێت: إبدأ بنفسك،بۆ پۆشاکیش هەمان حوکمە.

**باسی سێیەم/** ئایا لەبژێویدا بارودۆخی پیاوەکە ئەکرێتە پێوەر،یا ژنەکە؟ دوو ڕا هەیە:

یەکەم:پێوەر لێرەدا بارودۆخی پیاوەکەیە نەك ژنەکە،بەڕای عیترەو شافعیەو هەندیك حەنەفی،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئایەتی:﴿ولينفق ذو سعة من سعته﴾{الطلاق:٧}.واتە: با هەر کەسێك بە پێی توانای خۆی پارە سەرف بکات.

دوەم:پێوەرەکە بارودۆخی ژنەکەیە،بەڕای زۆربەی حەنەفیەکان ومالك،بە بەڵگەی:

فەرمودەی عائشە کە: هند ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا،أبو سفیان پیاوێکی چروکەو،ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆم ومناڵەکانم بکات،مەگەر بێ ئاگاداری ئەو لێی ببەم،ئەویش فەرموی: ئەوەندەی لێ ببە،بەشی خۆت ومناڵەکانت بکات،بێ زیادەڕۆیی.[1]

وەڵامی دراوەتەوە کە: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردوە بە ئەندازەی پێویستی خۆی بیبات،وزیادەڕۆیی تیا نەکات.

**باسی چوارەم/** لێدان بۆ تەمبێ کردن،دروستە،بەبەڵگەی:

أ.ئایەتی: ﴿فعظوهن واهجروهن في المضاجع واضربوهن﴾{النساء:٣٤}.واتە: ئامۆژگاریان بکەن و لەسەر جێگادا لێیان جیاببنەوە ولێیان بدەن.

ب.فەرمودە باسلێکراوەکە.

[1] حديث عائشة:أن هندا قالت قالت:يارسول الله،إن أبا سفيان رجل شحيح،وليس يعطيني ما يكفيني وولدي إلا ما أخذت منه وهو لا يعلم،فقال:خذي ما يكفيك وولدك بالمعروف.رواه الجماعة ،إلا الترمذي.

بەڵام ڕێگری کراوە لە لێدانی دەم وچاو،خێزانی بێت یا منداڵ یا هەر کەسێکی تر،بەبەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

ئەگەر تەنها هەڕەشە بەکاربهێنێت بێ لێدان،ئەوە باشترە.عائشە ئەڵێت:پێغەمبەری خوا هەرگیز لە ئافرەت ولە خزمەتکاری خۆی نەداوە.[1]

**باسی پێنجەم/** مەبەستی لە فەرمودەی لا تقبح ئەوەیە کە: قسەیەکی پێ نەڵێت کە پێی ناخۆش بێت،وەك ئەوەی بڵێت: خوا ناشرینت بکات وچەندەها قسەی سوکی تر.

**باسی شەشەم/** دەربارەی جیابونەوەی لە کاتی خەوتندا، دوو ڕیوایەت هەیە:

یەکەم: لە فەرمودەکەی موعاویەدا هاتوە: ولا تهجر إلا في البيت.کەمەست لێی: لە جێگادا لێی جیا ئەبێتەوە،بۆ تەمبێ کردنی،وەك لە ئایەتەکەدا هاتوە:﴿واهجروهن في المضاجع﴾{النساء ٣٤} .کەواتە بۆی نیە بۆ خانویەکی تر بگوازێتەوە،یا ئافرەتەکەی بۆ بنێرێت.

دوەم: لە بوخاریدا هاتوە کە:پێغەمبەری خوا لە خێزانەکانی جیابوەوە بۆ خەوتن وچوو بۆ ژورێکی تر.[2]

بوخاری ئەڵێت: ئەم فەرمودەیە لەوەی معاویە صەحیح ترە.لەبەرئەوە:کرداری پێغەمبەر ئەوە ئەگەیەنێت کە دروستە لێیان جیا ببێتەوە،با لەناوماڵەکەشدا نەبێت،فەرمودەکەی موعاویەش،بەڵگەی ئەوەیە کە جیابونەوە تەنها لە ناو ماڵەکەدایە.کەواتە مفهومی حەصر لە فەرمودەکەی موعاویەدا بێ مانایە.

**باسی حەوتەم/** دەربارەی لێکدانەوی وشەی الهجر،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: لەلایان نەمێنێتەوە،بەڕای جمهور،وەك ڕوکەشی ئایەتەکە ئەیگەیەنێت،ئەمەش لە هجران واتە دورکەوتنەوە هاتوە.

---

[1] قالت عائشة :ما ضرب رسول الله صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إمرأة له ولا خادما قط. السنن الكبرى للنسائي - كتاب عشرة النساء
ضرب الرجل زوجته - حديث : ٨٨٨١.

[2] أن رسول الله صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هجر نساءه في غير بيوتهن،وخرج إلى مشربة له. صحيح البخاري - كتاب الصوم باب قول النبي صلى الله عليه وسلم : " إذا رأيتم - حديث : ١٨٢٥

دوەم: لەگەڵیدا ئەخەوێت،بەڵام پشتی تی ئەکات.

سێیەم: جیماعی لە گەڵدا ناکات.

چوارەم: جیماعی لە گەڵ ئەکات بەبێ قسە.

پێنجەم: قسەکردن لە گەڵیدا بە ڕەقی.

شەشەم: ئافرەتەکە لە ماڵەوە ئەهێڵێتەوە،لەوشەی هجارقوة هاتوە،واتە ئەو پەتەی ئەسپی پێ ئەبەسترێتەوە.ئەمەش ڕای طبریة،وبەڵگەشی بۆ ئەهێنێتەوە.بەڵام إبن العربی بەڕایەکی لاوازی دائەنێت.

**( ١٢١ ) ١.عن إبن عمر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا أن النَّبِيَّ ( صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ ): عن الواصلة والمستوصلة والواشمة والمستوشمة..** پێغەمبەر( **صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ** ) نەفرەتی کردوە لەوانەی قژی خەڵکی بۆخۆیان بەکاردێنن وئەوەش بۆیان ئەکات،ئەوەی خاڵ ئەکوتێ وئەوەش بۆی ئەکات.

**٢.عن إبن مسعود رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ أنه قال: لعن الله الواشمات والمستوشمات والمتنمصات والمتفلجات للحسن المغيرات خلق الله تعالى،وقال: مالي لا ألعن من لعن رسول الله..**

خوا نەفرەتی کردوە لەوانەی خاڵ ئەکوتن وبۆیان ئەکوترێت،دەم وچاوهەڵگرو ئەوەی بۆی ئەکات،دان تیژکەرو،ئەو کەسەی دروستکراوەکانی خودا ئەگۆڕێت،ابن مسعود وتی: چۆن نەفرەت لەوە ناکەم کەپێغەمبەری خوا نەفرەتی لێکردوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**

صحيح البخاري - كتاب اللباس باب الموصولة - حديث : ٥٦٠٢ . صحيح مسلم - كتاب اللباس والزينة باب تحريم فعل الواصلة والمستوصلة والواشمة والمستوشمة والنامصة والمتنمصة والمتفلجات والمغيرات - حديث : ٤٠٥٩.

. بوخاری وموسلیم لەگێڕانەوەیدا یەکڕان.

**ماناى وشەكان//** الواصلة: ئەو ئافرەتە يە كە قژی خەڵكی تر ئەلكێنێت بە قژی خۆيەوە،تا قژی زۆر دەربكەوێت،بۆ خۆی بكات يا بۆ ئافرەتی تر. المستوصلة: ئەو ئافرەتەيە كە داوا ئەكات ئەو كردارەی سەرەوەی بۆ بكرێت.موصولة شی پیّ ئەوترێت.الواشمة: خاڵ كوتين،دەرزيەك يا شتێكی تيژ ئەكرێت بە شوێنێكی جەستەدا هەتا خوێنی لێدێت،پاشان ئەو شوێنە كلی لی ئەدرێت تا ڕەنگی سەوز ئەبێت.المستوشمة: ئەو كەسەی داوا ئەكات خاڵی بۆ بكوتن. النامصة: ئەو ئافرەتەيە موی جەستە هەڵئەكەنێت ولای ئەبات،بۆ خۆی يا بۆ ئافرەتی تر.المتنمصة؛ ئەو ئافرەتەی داوا لە خەڵكی تر ئەكات موی دەموچاوی بۆ هەڵكەنن.المتفلجة: ئەو ئافرەتەيە كە نێوان دانەكانی شاش ئەكات.

**سەرباسەكان//**

**باسی يەكەم/** ئەو چوار خاڵەی لە فەرمودەكەدا باسكراون،حەرامن،وە لە تاوانە گەورەكانن،چونكە بەر لەعنەت ئەكەون،لەعنەتيش بۆ كردنی تاوانێكی گەورەيە.

**باسی دووەم/** دەربارەی لكاندنی قژەوە،دوو ڕا هەيە:

يەكەم: لكاندنی قژ بۆ لكاندنی بەهەموو شێوەيەك حەرامە،موی كەسێكی مەحرەم بێت يا نامەحرەم، قژی مرۆڤ بێت يا موی ئاژەل،ئافرەتەكە جوان بێت يان نا،شوی كردبێت يان نا،ئەمەش ڕای جمهورە،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێكراوەكە.

ب.فەرمودەی جابر:پێغەمبەری خوا بەتوندی ڕێگری كردوە لەو ئافرەتەی قژی بە شتێكی ترەوە ئەلكێنێت.[1]

ج.فەرمودەی معاويە كە وتويەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بو فەرموی: هەر ئافرەتێك قژی تێكەڵ بكات بە قژی خەڵكی ترەوە،ئەوە درۆ ئەكات،وفێڵ ئەكات.[2]

---

[1] زجر رسول الله صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ المرأة أن تصل شعرها بشيء.اخرجه مسلم.

[2] حديث معاوية قال:سمعت رسول الله صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال:أيما إمرأة أدخلت في شعرها من شعر غيرها،فإنما تدخله زورا.رواه أحمد.

دوەم: شافعیەکان ئەڵێن:

١.ئەگەر قژی مرۆڤێك بێت ئەوە حەرامە بەکۆدەنگی،موی ئافرەت بێت یا پیاوو،مەحرەم بێت یا مێردی بێت یا نامەحرەم . لەبەر ئەم بەڵگانە:

أ.گشتگیری بەڵگەکان.

ب.چونکە حەرامە سود لە موو هەموو ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ وەربگیرێت، لەبەر ڕێزگرتنی.

٢.بەڵام ئەگەر مویەکی پاك بوو،وە هی مرۆڤ نەبوو: ئەگەر ئافرەتەکە مێردی نەبوو،یا کەنیزەك نەبوو،ئەوەش حەرامە.خۆ ئەگەر هەیبوو: سێ ڕا هەیە،دروسترینیان ئەوەیە: ئەگەر مۆڵەتی لێیان وەرگرت دروستە.

وەڵامیان دراوەتەوە کە: ئەم زیاد باسکردنە بێ بەڵگەیە.

سێیەم: هادویە ئەڵێن: بەموی کەسێکی مەحرەم دروستە.وەڵام دراوەتەوە کە:

أ.حەرامبونی ڕەهایی لکاندنەکە،حەرامبونیش بۆ لکاندنی قژی نامەحرەمیش ئەگەیەنێت.

ب.گشتگیری هەردوو فەرمودەپێشوەکەی جابر ومعاویە.

<u>باسی سێیەم/</u> خاڵ کوتین وداواکردنی حەرامە،بەبەڵگەی فەرمودە باسلێکراوەکە.لەهەندێك فەرمودەشدا هۆکاری حەرامبونەکە باسکراوە کە بریتیە لە گۆڕینی دروستکراوی خوا.

<u>باسی چوارەم/</u> ئەگەر بوترێت: خۆ خەنە دان لە دەست وپەنجەو هەروەها شتی تریش،گۆڕینی دروستکراوی خوایە،ئەی بۆ حەڵاڵە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە:

أ.پێغەمبەری خوا فەرمانی کردوە بە گۆڕینی سپێتی پەنجەی ئافرەت، ئەویش بە خەنە لەدەست دانی،وەك لە چیرۆکی هند دا هاتوە.

ب.ئەم خەنەیە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا هەبوە.

ج.خەنە بە کۆدەنگی زانایان تایبەتمەند کراوە.

<u>باسی پێنجەم/</u> دەربارەی بەکارهێنانی ئاوریشم وقژی دەستکرد بۆ قژ،وەك قازی عیاض ئەڵێت،زانایان چەند ڕایەکیان هەیە:

یەکەم: دروست نیە،بەهەر شتێك بێت،ئاوریشم بێت یا خوری بێت یا پەڕۆیەك بێت،ئەمەش ڕای مالك وطبري و زۆر زانای ترە،بەبەڵگەی فەرمودە پێشوەکەی جابر.

دوەم: ئەگەر بە خوری یا پەڕۆ بێت،ڕێپێدراوە،ڕێگریەکەش تەنها بۆ موە،ئەمەش ڕای لیث بن سعدە.

سێیەم: دروستە بە هەموو شتێك بێت.ئەمەش ڕای عائشەیە.وەڵامی دراوەتەوە کە: ڕای وا لە عائشەوە ڕاست نیە.

**باسی شەشەم/** لکاندنی تاڵی ئاوریشمی ڕەنگاورەنگ وهاوشێوەی ئەو،کە لە قژ ئەچێت،ئەوە قەدەغە نیە. چونکە لکاندن و وەصل نیەو، بۆ ئەو مەبەستەش نیە کە قژی بۆ بەکاردیت. بەڵکو تەنها بۆ خۆ جوانکردنە،ئەمەش وتەی قازی عیاضە.مەبەستیشی ئەوەیە : کە ئەمە خەڵەتاندنی مێردەکەی تێدایە،بەڵام ئەگەر ڕەنگی لە ڕەنگی قژەکە جیاواز بوو،ئەوە خەڵەتاندنی تیا نیە.

**باسی حەوتەم/** وتراوە: چۆن زیادکردنی موی سەر حەرامە،هەروەها تاشینیشی بە بێ پێویستی حەرامە.

**باسی هەشتەم/** ئیشی ئەو کەسە حەرامە کە مو بۆ ئافرەت لا ئەبات.ئەوەوی و غەیری ئەویش ئەڵێن: ئەگەر ئافرەت ڕیش یا سمێڵی دەرکرد،لابردنی حەرام نیە،بەڵکو باشە.

**باسی نۆیەم/** فەرمودەی والمتفلجات،ئەوەیە کە ئافرەتی بە تەمەن بۆ خۆ بچوك نیشاندان و جوانی دانەکان،هەڵئەستێت بە تیژکردن وشاش کردنیان،تاوە دەربکەوێت کە تەمەنی کەمە،چونکە کچی کەم تەمەنە کە نێوانی دانەکانی زۆرە،ئەم کردارە ئەکات.

نەوەوی ئەڵێت: ئەم کردارە وشر یشی پێ ئەوترێت. ئەم کردارەش حەرامە بۆ بکەرو ئەوەش بۆی ئەکرێت.

**(١٢٢) ١.عن إبن عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: قال رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إذا دعي أحدكم إلى وليمة فلياتها.. كەسێك لەئێوە بۆخواردن بانگ كرا با بچێت.**

**٢.عن إبن عمر مرفوعا: إذا دعا أحدكم أخاه فليجب،عرسا كان أو نحوه..گەر** یەکێکتان براکەی بۆ نان خواردن بانگی کرد،زەماوەند بوو یاشتی تر،بابچێت.

**گێڕەرەوەی فەرموودەکە//** ١. صحيح البخاري - كتاب النكاح باب حق إجابة الوليمة والدعوة - حديث: ٤٨٧٩.

صحيح مسلم - كتاب النكاح باب الأمر بإجابة الداعي إلى دعوة - حديث: ٢٦٥٣

٢. صحيح مسلم - كتاب النكاح باب الأمر بإجابة الداعي إلى دعوة - حديث: ٢٦٥٦

**مانــای وشــەکان/** وليمــة: هــەموو خواردنێکـە بـۆ بۆنەیـەکی خۆشـی دروسـت بکرێت،وليمة العرس ئەو خواردنەیە کاتی گواستنەوەی بوك ومارەبڕین دروست ئەکرێت.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەنێوان دوو ڕیواتەکەدا هیچ دژایەتیەك نیە،هەرچەندە یەك کەس ئەیانگێڕێتەوە:

یەکەمیان: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی : وەڵام دانەوەی وليمة واجبە.دوەمیشیان بەڵگەی ئەوەیە کە : هەموو دەعوەتێك واجبە وەڵام بدرێتەوە.

**باسی دوەم/** دەربارەی حوکمی چون بۆ دەعوەتی وليمة،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: ڕۆشتن بۆ خواردنی وليمە لە هەموو کاتێکدا واجبە،بەرای ظاهرية و هەندێك لە شافعیەکان،إبن عبدالبريش لە عبيدالله بن الحسن العنبری ئەیگێڕێتەوە،إبن حزم یش ئەڵێت: ڕای هاوەڵان وشوێنکەوتوانە،بە بەڵگەی:

أ.ڕوکەشی فەرمان کردن لە فەرمودە باسلێکراوەکە دا،بێ ئەوەی لە حوکمی واجب بون لای ببات.

ب.ئەو کەسەی نەچێت بە گوناهبار ناوبراوە،لە فەرمودەی أبو هريرەدا کە لە پێغەمبەرەوە ئەیگێڕێتەوە،کە فەرمویەتی: خراپترین خواردن وەلیمەیەکە،کە

کەسێك ئەیەوێت بچێت،ڕێگری لێ ئەکرێت،وە ئەوەش نایەوێت بچێت،بانگ ئەکرێت بۆی. کەسێکیش وەڵامی دەعوەتەکە نەداتەوە،لە خواو پێغەمبەرەکەی یاخی بوە.[١]

دوەم: جیاوازی هەیە لەنێوان خواردن دروست کردن بۆ هاوسەرگیری و بۆ بۆنەی تر.

دەربارەی حوکمی چون بۆ نانخواردنی زەماوەند دوو ڕا هەیە:

یەکەم: واجبە،إبن عبدالبرو عیاض و نەوەوی ،کۆدەنگی زانایان ئەگێڕنەوە.ئەوانیش لێرەدا دوو ڕایان هەیە:

١.ئەڵێن فەرزی عەینە لەسەر هەموو کەسێك،بەڕای جمهوری شافعیەکان وحەنبەلیەکان.هەروەها پێشەوا مالکیش.

٢.فەرزی کفایەیە،بەڕای هەندێك لە شافعی و حەنبەلیەکان.

دوەم: مستحبە،بەڕای هەندێك شافعی و حەنبەلی و،هەروەها مەزهەبی مالکیشە.

دەربارەی چون بۆ خواردنی بۆنەی تر جگە لە زەماوەند،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: واجبە،ئەوەش ڕای ئەوانەیە کە ئەڵێن : وەڵام دانەوەی هەموو دەعوەتێك واجبە،بەڵگەکانیشیان لە پێشتردا باسکرا.

دوەم: واجب نیە،بە ڕای مالکیەکان وحەنبەلیەکان وحەنەفیەکان وجمهوری شافعیەکان،لە کتێبی البحر یشدا ئەڵێت: کۆدەنگی زانایانی عترە لەسەر ئەوەیە کە وەڵامدانەوەی هەموو دەعوەتێك واجب نیە.

<u>**باسی سێیەم/**</u> مەرجی واجب بونی ئەوەیە کە : بانگ کەرەکە داواکراوو ئازادو پێگەشتوو(رشید) بێت.وەك إبن حجر لە فتح الباری دا باسی کردوە.

---

[١] شر الطعام الوليمة، يمنعها من ياتيها،ويدعى إليها من يأباها،ومن لم يجب الدعوة فقد عصا الله ورسوله. صحيح مسلم - كتاب النكاح باب الأمر بإجابة الداعي إلى دعوة - حديث : ٢٦٦٢

**باسی چوارەم/** لەسەر ڕای ئەوانەی بە واجبی دائەنێن،إبن دقيق العيد لە کتێبی شرح الإلمام دا ئەڵێت: ئەتوانريت وەڵامی دەعوەتەکە نەدرێتەوە ئەگەر ئەم هۆکارانە هەبوو:

أ.لە خواردنەکە بە گومان بوو.

ب.تەنها دەوڵەمەندەکانی بانگ کردبوو.

ج.بەچونی کەسێك ئازاری پێ بگات،یا ناگونجێت لە گەڵيا دابنيشێت،يا لەترسدا بانگ کرابێت،يا بۆ تەماع بانگ کرابێت،يا بۆ ئەوەی يارمەتی خراپەی بدات بانگ کرابێت.

د.لە شوێنی نان خواردنەکەدا خراپەيەك هەبێت،وەك ئارەق يا سەماکردن يا ڕاخەری ئاوريشم يا ديوارەکە وێنەو شتی حەرامی تيا هەڵواسرابێت.

هـ.مۆڵەتی نەچون لە خاوەن دەعوەتەکە بخوازێت،ئەويش مۆڵەتی بدات.

ئەم هۆکارانە بۆ نەچونی دەعوەتەکە لای ئەوانەيە کە ئەڵێن واجبە،هەروەها ئەوانەش کە بە سوننەتی دائەنێن.ئەمەش لە شەريعەت وئەو ڕوداوانەوە وەرگيراوە کە بەسەر هاوەڵاندا هاتوە.

پوختەکەی ئەوەيە: دەعوەت پێويستە وەڵام بدرێتەوە،بەڵام بونی خراپە تيايدا ڕێگری وەڵامدانەوەکەيە،ئەگەر ڕێگری وپێويست بون دژ بە يەك بون،حوکمەکە بۆ ڕێگريەکەيە.

**(١٢٣) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قال رسول الله(صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): إذا دعي أحدكم فليجب، فإن كان صائما فليصل، وإن كان مفطرا فليطعم..**

**گەر کەسێکتان بۆ نانخواردن بانگ کرا،با بچێت،گەر بە ڕۆژو بوو، با نوێژبکات (بپاڕێتەوە)،بەڕۆژوش نەبو با نان بخوات..**

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح مسلم – كتاب النكاح باب الأمر بإجابة الداعي إلى دعوة – حديث : ٢٦٦٢

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** پێویستە لەسەر ئەو کەسەی بەڕۆژوەو دەعوەت ئەکرێت،ئامادەبێت،بیانوو نەهێنێتەوە بە بەڕۆژوبون،خۆ ئەگەر خاوەن دەعوەتەکە بەهۆی ڕۆژوەکەیەوە مۆڵەتی دا،ئەوە باشە،ئەگینا ئەبێت ئامادە بێت.

**باسی دوەم/** دەربارەی مەبەست لە وشەی فَلْيُصَلِّ،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: بپاڕێتەوە بۆ خاوەن دەعوەتەکە بەلێخۆشبون و بەرەکەت ڕژان بەسەریدا،بەڕای جمهور،لەبەر ئەوەی:

١.لەڕیوایەتی هشام بن حسان هاتوە: نوێژکردنەکە پاڕانەوەیە.[1]

٢.لەڕیوایەتی إبن عمر هاتوە: ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو با نان بخوا،ئەگەر بەڕۆژوش بوو،با بپاڕێتەوە.[2]

دوەم: نوێژ بکات،تا خێری نوێژکردنی دەست بکەوێت وخاوەن خواردنەکەو ئامادەبوانیش بەرەکەتیان بە سەردا بڕژێت. وەڵامیان دراوەتەوە بە فەرمودەی: نویژکردن لەکاتی ئامادەبونی خواردندا دروست نیە.[1]

---

[1] في رِوَايَةِ هِشَامِ بنِ حسان :الصَّلَاةُ الدُّعَاءُ. سنن أبي داود – كتاب الصوم باب في الصائم يدعى إلى وليمة – حديث : ٢١١٧

[2] رِوَايَةِ ابْنِ عُمَرَ عَنْ نَافِعٍ :فَإِنْ كَانَ مُفطِراً فَلْيطعم،وَإِنْ كَانَ صَائِماً فَلْيَدْعُ.أَخْرَجَهُ أَبودَاود.

**باسی سێیەم/** دەربارەی جۆری ڕۆژوگرتنەکە بەم شێوەیە لێی دواون:

ئەگەر ڕۆژوەکە فەرز بوو،بێگومان بۆی نیە بیشکێنێت.بەڵام ئەگەر سوننەت بوو،دوو ڕا هەیە دەربارەی:

یەکەمیان: ئەگەر بەلای خاوەن خواردنەکەوە ناڕەحەت بوو کە ئەم بەڕۆژوو بێت،ئەوە چاك وایە بیشکێنێت،ئەگەر نا بەڕۆژو بونەکەی باشترە،بەڕای زۆربەی شافعیەکان وهەندێك زانای حەنبەلی.

دوەمیان: باشترە بیشکێنێت،ڕویانی باسیکردوە بە ڕەهایی،واتە لە هەموو کاتێکدا وا باشە بیشکێنێت.

**باسی چوارەم/** دەربارەی حوکمی نانخواردنی کەسی بانگکراوو،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: واجب نیە لەسەری نە بۆ زەماوەند نە بۆ هیچ بۆنەیەکی تر،لە خواردنەکە بخوات،ئەمەش لای شافعیەکان ڕای دروستە.

فەرمان کردنەکەش لە فەرمودەکەدا فَلْيطعم بۆ سوننەتە،چونکە نیشانەیەك هەیە کە لە وجوبەوە بۆ سوننەت لای ئەبات،ئەویش فەرمودەی: ئەگەر ئارەزوی لێبوو نان بخوات،ئەگەر ئارەزوشی لێبوو نان نەخوات[٢]. سەرپشك کردنیشی واتای واجب نەبونی نانخواردن ئەگەیەنێت.

دوەم: نانخواردن واجبە. نەوەوی بە ڕای دروستی دائەنێت،وە أهل الظاهریش بە پەسەندی دائەنێن،بەبەڵگەی ڕوکەشی فەرمان کردنەکە فَلْيطعم،لە فەرمودەکەدا.خواردنی پارویەك کەمترینە،لەوە زیاتر واجب نیە.

---

[١] لَا صَلَاةَ بِحَضْرَةِ طَعَامٍ.

[٢] حَدِيثُ جَابِرٍ: إِنْ شَاءَ طَعِمَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ.أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

(١٢٤) عَنْ عُمَر بن أَبِي سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا غُلَامُ، سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ..

پێغەمبەرى خوا پێى وتم: ئەى منداڵ،ناوى خوا بێنەو بە دەستى ڕاستت بخۆو لەبەر دەمى خۆتەوە.

گێڕەرەوەى فەرمودەكە// صحيح البخاري - كتاب الأطعمة باب التسمية على الطعام والأكل باليمين - حديث : ٥٠٦٦. صحيح مسلم - كتاب الأشربة باب آداب الطعام والشراب وأحكامهما - حديث : ٣٨٦٠.

سەرباسەكان//

باسى يەكەم/ دەربارەى حوكمى وتنى بسم الله بۆ نان خواردن،دوو ڕا هەيە:

يەكەم: واجبە،ئەمەش يەكێكە لە ڕاكانى هاوەڵانى احمد،لەبەر ئەوەى:

ا.فەرمان كردن لە فەرمودەكەدا(ناوى خوا بهێنە).وە فەرمودەكانى تریش كە بەربەستيان نيە،و كۆدەنگى زانايانيش ڕێگە بە سەرپێچى كردن نادات،ولە ڕوكەشەكەى لاى نابات.

ب.كەسێك بسم الله نەكات شەيتانى لە خواردن وخواردنەوەكەدا بەشدار كردوە.

دوەم: شتێكى باشە(مُستَحَبْ)،ئەمەبۆ خواردن،هەمان حوكميش بۆ خواردنەوە هەيە.

باسى دوەم/ چاك وايە بە دەنگى بەرز بسم الله بڵێت،تاكو خەڵكى تريش بيبيستێت،بۆ ئەوەى ئاگاداريان كاتەوە.

باسى سێيەم/ ئەگەر لە سەرەتادا بسم الله ى نەكرد،بيرى چوبوو،يا بە ئەنقەست،يا لە كاتى خواردنەكەدا بڵێت: بەناوى خوا لە سەرەتاو كۆتاييدا.بە بەڵگەى فەرمودەى: هەر كەسێكتان نانى خوارد،با ناوى خوا بهێنێت،ئەگەر بيرى چوو لە سەرەتادا بيڵێت،با لە كاتى نانخواردنەكەدا بڵێت: بەناوى خوا لە سەرەتاو كۆتاييدا.[1]

[1] إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُر اسْمَ اللهِ،فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اللهَ فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ:بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ. حَدِيثُ أَبِي دَاود وَالتِّرمِذي وَغَيْرِهِمَا. وَقَالَ التِّرمِذي:حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**باسی چوارەم/** پێویستە هەموو ئامادەبوان بسم الله بکەن، بەڵام ئەگەر یەکێکیان بسم الله ی کرد،سوننەتەکە جێبەجێ بوە،ئەمەش ڕای شافعیە،بە بەڵگەی:
پێغەمبەری خوا پێی ڕاگەیاندوین کە: شەیتان ئەو خواردنە بە حەڵاڵ دائەنێت کە ناوی خوای لە سەر نەهێنرابێت.[1] کەواتە ئەگەر یەك کەس لە ئامادەبوان بسم الله ی کرد،واتە لەسەر خواردنەکە بسم الله کراوە.
**باسی پێنجەم/** پێویستە بە دەستی ڕاست نان بخورێت،بە بەڵگەی:
أ.فەرمان کردن پێی لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا (بەدەستی ڕاستت بخۆ).
ب.پێغەمبەری خوا پێی ڕاگەیاندوین کە شەیتان بە دەستی چەپی ئەخوات وئەخواتەوە.[2] کردنی کرداری شەیتانیش لە سەر مرۆڤ حەرامە.
ج.پیاوێك لای پێغەمبەری خوا بە دەستی چەپ نانی خوارد،پێغەمبەری خواش فەرموی: بە دەستی ڕاستت بخۆ. وتی: ناتوانم.فەرموی: ئیتر نەتوانیت. پیاوەکەش لە بەر خۆ بەزلزانین بە دەستی ڕاست نەیئەخوارد. بۆیە نەیتوانی دەستی بۆ ناو دەمی بەرز بکاتەوە.[3]
پێغەمبەری خواش دوعا لەکەسێك ناکات،مەگەر تەرکی واجبێکی کردبێت.ئەگەری ئەوەش هەیە کە لەبەر خۆبەزلزانینی دوعای لێ کردبێت،لەوانەشە بۆ هەردوو هۆکارەکە بێت.
**باسی شەشەم/** پێویستە مرۆڤ لە گەڵ دانیشتوانیدا بەڕێز بێت،کردارێك نەکات کە پێیان ناخۆش بێت،خراپ هەڵسوکەوت کردن بێت یا بێ ڕێزی،بەبەڵگەی: لەبەردەم خۆتەوە بخۆ.کە لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا هاتوە.
**باسی حەوتەم/** دەربارەی جۆری خواردنەکە ،چەند ڕایەك هەیە:

---

[1] إنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ الَّذِي لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ.
[2] أَخْبَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :أَنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ،وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ.
[3] أَنَّ رَجُلاً أَكَلَ عِنْدَ الرَّسولِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشِمَالِهِ فَقَالَ:كُلْ بِيَمِينِكَ.فَقَالَ:لَا أَسْتَطِيعُ.قَالَ:لَا اِسْتَطَعْتَ.مَا مَنَعَهُ إِلَّا الكِبْرُ،فَمَا رَفَعَهَا إِلَى فِيهِ.أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

١.ئـەبێت تـەنها لـە بـەردەمی خۆیـەوە بخوات،خواردنەكـە تێوشـە بێت،یـا شـلە،یا هاوشـێوەیان،كە مـرۆڤ قێـز ئەكاتـەوە لـەو خواردنـە بخـوات كـە خـەڵكی تـر دەسـتی تێخستوە.بەبەڵگەی: لەبەردەم خۆتەوە بخۆ،كە لە فەرمودە باسلێكراوەكەدا هاتوە.

٢.دروستە لە هـەموو لایەكی خواردنەكەوە بخورێت،میوە بێت یا خواردنێكی هاوشێوەی بێت،ئەگەر خواردنەكە جۆراجۆر بوو،یا هیچ خواردنێكی لەبەر دەستدا نەبوو.بەبەڵگەی:

ا.عكراش كوڕی ذؤیب ئەڵێت: خواردنێكی پڕ گۆشتیان بۆ هێنـاین بەشێوەی تریت،منیش دەسـتم بـۆ هـەموو لایـەكی قاپەكـە دریـژ ئەكرد،پێغەمبـەری خـوایش لای خۆیـەوە ئەیخوارد،پاشان بە دەستی چەپی دەستی ڕاستمی گرت وفەرموی: ئەی عكراش،لەیەك لاوە بخۆ،چونكە یەك خواردنە.پاشان قاپێك خورمای جۆراو جۆریان بۆ هێنـاین،منیش تـەنها لـە بـەردەمی خۆمـەوە ئەمخوارد،پێغەمبـەری خـوایش لەهـەموو لایەكیـەوە ئەیخوارد،پاشان فەرموی: ئەی عكراش،لەكوێوە ئارەزوت لێیە بخۆ،چونكە یەك جۆر نیە.[1]

فەرمودەی انس: بەرگدرویەك پێغەمبەری خوای بۆ خواردنێك بانگ كـرد كـەبۆی دروسـت كردبـوو،منیش لـە گەڵیـدا چـوم، نـانی جـۆو شـۆربایەكیان هێنـا كـە كولەكەو گۆشتی وشك بوی تیابوو،بینیم پێغەمبەری خوا لـەملا ولای قاپەكەوە ئەخوات،منیش لەو ڕۆژەوە تا ئێستاش شلەی كولەكە ئەخۆم.ئەنەس ئەڵێت: كە ئەوەم بینی،خواردنەكەم ئەخستە بەردەستی و خۆم نەمئەخوارد.[2]

ج.چـونكە ئەگـەر خواردنەكـە جـۆراو جـۆر بـوو،وە میـوە بوو،كـەس بێـزی لێناكاتەوە،وەك ئەوەی پێشوو.

---

[1] أخْرَجَ التِّرْمذي وَغَيْرُهُ منْ حَديث عكْراش بن ذُؤَيب قَالَ:أتينَا بجَفْنَة كَثيرَة الثَّريد وَالوَدْر،فَخَبَطتُ بِيَدَيّ في نَواحيها،وَأكَلَ رَسُولُ الله منْ بَيْن يَدَيْه،فَقَبَضَ بيَده اليُسْرَى عَلَى يَدي اليُمْنَى،ثُمَّ قَالَ:يَا عكْراش،كُلْ منْ مَوْضع واحد،فَإنَّهُ طَعَامٌ واحدٌ.ثُمَّ أتينا بطَبَق فيه ألْوانُ التَّمْر،فَجَعَلْتُ آكُلُ منْ بَيْن يَدي،وَجَالَتْ يَدُ رَسول الله في الطَّبَق،فَقَالَ:يا عكراش،كُلْ منْ حَيْثُ شئْتَ،فَإنَّهُ غَيْر لَوْن واحد.

[2] أخرج البخاري ومسلم من حديث أنس:أن خياطا دعا النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ لطعام صنعه،قال:فذهبت مع النبي فقرب خبز شعير ومرقا فيه دباء وقديد.فرأيت النبي يتبع الدباء من حوالي القصعة أي جوانبها،فلم أزل أتتبع الدباء من يومئذ.قال أنس:فلما رأيت ذلك جعلت ألقيه إليه ولا أطعمه.

(١٢٥) عَنْ عائشَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله يقْسمُ بَيْنَ نسَائه وَيَعْدلُ، وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ هَذَا قَسْمي فيمَا أَملكُ، فَلَا تَلُمْني فيمَا تَمْلكُ وَلَا أَملكُ..

پێغەمبەری خوا لەنێوان خێزانەکانیدا بەدادپەروەرانە دابەشی ئەکرد (مانەوە لایان وشتی تریش). وە ئەیفەرموو: خوایە ئەم دابەشکردنە لەدەسەڵاتی مندایە،لەشتێکدا لێم مەگرە کە لەدەسەڵاتی تۆیە هی من نیە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** چوارکەسەکە.حاکم وإبن حبان بە صحیحیان داناوە. **سنن** أبي داود – كتاب النكاح باب في القسم بين النساء – حديث : ١٨٣٥[1]

**ماناى وشەکان//** فیما أملك،مانەوە لای هەریەکێکیان لە سەرەی خۆیاندا. فیما تملك ولا أملك،ترمذي ئەڵێت: خۆشەویستیە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دابەشکردنی شەو مانەوە لای خێزانەکان ، لەسەر پێغەمبەری خوا فەرز نەبوە،بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿ترجي من تشاء منهن وتؤي إليك من تشاء﴾{الأحزاب:٥١}.واتە: بەئارەزوی خۆتە واز لەکامیان بهێنیت،یا بیهێڵیتەوە.ئایەتەکەش باسی خێزانەکانی پێغەمبەر ئەکات.

هەندێك لە مفسرین ی قورئان واصطخري و مهدي لە کتێبی البحردا ئەڵێن: خوای گەورە ڕێی بە پێغەمبەر داوە کە یەکسان نەبێت لە گەڵ خێزانەکانیدا،هەتا بۆی هەبوە ئەوەیان کەسەرەی مانەوەی بوە لای نەمێنێتەوەو دوای بخات،وە ئەوەش سەرەی نیە لە گەڵیدا بیت.ئەمەش لە تایبەتمەندیەکانی بوە.

ئەگەر وابێت کە یەکسانی لەنێوان خێزانەکانیدا واجب نیە لەسەری،کەواتە کەلەگەڵیان یەکسان بوبێت،ئەوە نیشانەی جوانی هەڵسوکەوت و ئەخلاق و،ڕاگرتنی دڵی خێزانەکانیەتی.

---

[1] البانی بە لاوازی داناوە.الإرواء ٢٠١٨.

**باسی دوەم/** خۆشەویستی لەناو دڵایەو لەتوانای مرۆڤدا نیە،بەڵکو لەتوانای خوای گەورەدایە،بە بەڵگەی:

ا.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئایەتی:﴿لَوْ أَنْفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ،وَلَكِنَّ اللهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾{الأنفال:٦٣}.واتە: ئەگەر هەموو شتەکانی سەر زەوی ببەخشیت تا دڵیان ڕابگریت،ناتوانیت،بەڵکو خوای گەورە دڵیان بۆ لای تۆ ڕائەکێشێت.

ج.ئایەتی: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ يَحُولُ بَيْنَ المَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾{الأنفال:٢٤}.واتە: بزانن خوای گەورە بەربەست دائەنێت لە نێوان مرۆڤ ودڵیدا.

**( ١٢٦ ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى أَحَدِهِمَا دُونَ الأُخْرَى جَاءَ يَوْمَ القِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ..**

کەسێك دووخێزانی هەبێت وبەلای یەکێکیان دابشکێنێت،لە قیامەتدا بەشان خواری دەرئەکەوێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد،چوارکەسەکە.سەنەدەکەش صحیحە. سنن أبي داود – كتاب النكاح باب في القسم بين النساء – حديث : ١٨٣٤[1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەسەر پیاو پێویستە لەگەڵ هاوسەرەکانیدا یەکسان بێت،وحەرامە لەسەری بەلای یەکێکیان زیاتر دابشکێنێت.ئەمەش ڕای زۆربەی پێشەواکانە،بە بەڵگەی: ا.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئایەتی: ﴿فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ المَيْلِ﴾{النِّسَاءْ:٢٩}. واتە: با مەیلتان بەتەواوی نەچێت بەلای یەکێکیاندا. مەبەستیش لێرەدا یەکسانیە لە ژێر جێگەیی وبژێوی دا،نەك خۆشویستنی دڵ.چونکە ئەمەیان وەك زانراوە،لەتوانای مرۆڤدا نیە.

---

[1] البانی بە صحیح ی داناوە.الإرواء ٢٠١٧.

**باسی دوەم/** تێگەشتنی ئایەتی:﴿كُلَّ المَيْلِ﴾..ئەوە ئەگەیەنیت کە: مەیلی کەم بەلای یەکێکیاندا دروستە.بەڵام وەڵام دراوەتەوە کە: ڕەهایی فەرمودەکە ئەوە ڕەت ئەکاتەوە،ئەگەری ئەوەش هەیە کە فەرمودەکە بە مەفهومی ئایەتەکە بەسترابێتەوە.

**( ١٢٧ ) عَنْ إبْنِ عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): أَبْغَضُ الحَلَالِ إِلَى اللهِ الطَّلَاقُ...**

**بێزراوترینی حەڵاڵەکان لای خوا، جیابونەوەی نێوان هاوسەرەکانە.**

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** ابوداود وإبن ماجه.حاکمیش بە صحیحی داناوە. سنن أبي داود – كتاب الطلاق أبواب تفريع أبواب الطلاق – باب في كراهية الطلاق حديث : ١٨٧٦[1]

**ماناى وشەكان//** الطَّلَاقُ: لە زمانەوانیدا واتە: بەردان و وازلێهێنان.لەشەرعیشدا واتە: لاچونی گرێبەستی هاوسەرێتی.

إمام الحرمين ئەڵێت: ئەمە وشەیەکە پێش ئیسلام هەبوەو ئیسلامیش هێشتویەتەوە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لە حەڵاڵکراوەکانیشدا،شتی بێزراوی تێدایە بەلای خوای گەورەوە.زانایان نمونەی بۆ ئەهێننەوە بە: نوێژکردنی فەرز لە غەیری مزگەوتدا بە بێ هۆ،وە تەڵاق دان.

**باسی دوەم/** تەڵاقدان بێزراوترینی حەڵاڵەکانە لای خوای گەورە،واتە: لە ئەنجامدانیدا نەپاداشتی تێدایە، نە نزیك بونەوە لە خوای گەورە،کەواتە پێویستە تا بتوانرێت خۆی لێ بەدور بگیرێت.بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

[1] ضعفه الألباني في الإرواء ( ٢٠٤٠ ).

باســی ســێیەم/ هەنـدێك لـە زانایـان تـەڵاق دابـەش ئەکـەن بـۆ پێـنج حوکمەکـە (واجب،مندوب،حرام،مکروه،مباح): حەرام بریتیـە لـە تـەڵاقی بدعی (پێـچەوانەی سوننەت).مەکروهیش: ئەو تەڵاقەیە بە بێ هۆ ئەنجام ئەدرێت، کە ئەمـەیان لـە فەرمودەکەدا مەبەستە،کە بێزراوە وە حەڵاڵیشە.

(١٢٨) عَنْ إبْنِ عَبّاس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قَالَ: طَلّقَ أبورُكَانَة أمّ رُكَانَة، فَقَالَ النّبِيُّ (صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): رَاجِعْ إمْرَأتَكَ. فَقَالَ: إنّي طَلّقْتُهَا ثَلَاثاً. قَالَ: قَدْ عَلِمْتُ، رَاجِعْهَا..

ابـو رکانـە ام رکانـەی تەڵاقدا،پێغەمبـەر (صَـلّىَ اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) فـەرموی: خێزانەکەت بهێنەوە.وتی: من سێ جار تـەڵاقم داوە،فەرموی: ئـەزانم (سـێ جار تەلاقت داوە)،بیهێنەوە.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە// ابي داود - کتاب الطلاق ابواب تفريع ابواب الطلاق - باب نسخ المراجعة بعد التطليقات الثلاث حديث : ١٨٩٠

سەرباسەکان//

باسی یەکەم/ فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: کەسێك بە لـەفزی هـەتا هـەتایی خێزانەکەی تـەڵاق بدات،مەبەسـتی کـەوتنی تـەنها یـەك تـەڵاق بێت،یـەك تـەڵاق ئەکـەوێت.ئەگـەر مەبەستیشی کەوتنی هەر سێ تەڵاقەکە بێت،ئەوا هەرسێکی ئەکەوێت.

باسی دوەم/ فەرمودەی: سوێند بەخوا تەنها ویستومە یەك تەڵاقی بدەم[1]،بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: کەسـێك خێزانەکـەی بە لـەفزی هـەتا هـەتایی تـەڵاق بـدات وپاشـان بڵێت: مەبەستم تەنها یەك تەڵاق بوە،بە بێ سوێند خواردن لێی وەرناگیرێت.

باسی سێیەم/ دەربارەی وتـنی هـەر سـێ تـەڵاق پێکەوە،لەیـەك شـوێندا . چەند رایەك هەیە:

---

[1] روى أبو داود :أن أبا ركانة طلق إمرأته سهيمة البتة،فقال:والله ما أردت إلا واحدة،فردها النبى صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ..

رای یەکەم: هیچ تەڵاقێکی ناکەوێت،بە ڕای هەندێك لە إمامیەکان وإبن علیە و هشام بن حکم و هەندێك لە زاهریەکان چونکە ئەم شێوەیە تەڵاقێکی بیدعەیە.

ڕای دوەم: هەر سێ تەڵاقەکەی ئەکەوێت،بەڕای عمرو إبن عباس وعائشەو ڕوایەتێکی علی و پێشەوایانی هەر چوار مەزهەبەکەو،جمهوری سەلەف وخەلەف وناصرو إمام یەحیاو هەندێك لە شیعەی أمامی،بەبەڵگەی:

١.ئەو ئایەتانەی باسی تەڵاق ئەکەن،جیاوازیان نەکردوە لەوەی یەك تەڵاق بێت یان سیان. ئایەتەکانیش بریتین لە ﴿الطلاق مرتان فإمساك بمعروف أو تسريح بإحسان﴾{البقرة:٢٢٩}.﴿فإن طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجا غيره﴾{البقرة:٢٣٠}.﴿لا جناح عليكم إن طلقتم النساء﴾{البقرة:٢٣٦}.بەڵام وەڵامیان دراوەتەوە کە: ئەم ئایەتانە بەڕەهایی باسیان کردوە،لەوانەیە بەسترابێتەوە بەو فەرمودانەی کە تەنها یەك تەڵاق ئەخەن.

٢.لە صەحیحەین دا هاتوە: عوەیمری عەجلانی لەبەردەم پێغەمبەری خوادا سێ بە سێ خێزانەکەی تەڵاق دا،ئەویش ڕێگری لێ نەکرد.[١] ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە : دروستە بە لەفزی سێ بەسێ بوترێت،کە وتراش،هەر سێ تەڵاقەکە ئەکەوێت.

وەڵامدراوەتەوە کە: ئەم بڕیاردانەی پێغەمبەری خوا مانای ڕەوایەتی ناگەیەنێت،وە ئەوەش ناگەیەنێت کە هەر سێ تەڵاقەکە کەوتوە،چونکە ڕێگریەکە لەتەڵاقدانێکە کە هاوسەرگیریەك لابات کە مەبەست لیێ مانەوەی هەتا هەتایی بوە،ئەو کەسەش لعان ئەکات: تەڵاق ئەخوات و وائەزانیت دوای ئەوە بۆی هەیە ئافرەتەکە بهێڵێتەوە،نازانێت کە بە لعانەکە جیابونەوەی هەتا هەتایی ڕوئەدات،جیابونەکەش بە لعانەکە خۆی بێت،یا بە بڕیاری دادوەر بێت،کەواتە فەرمودەکە بەڵگە نیە.

---

[١] ما في الصحيحين:أن عويمرا العجلاني طلق أمرأته ثلاثا بحضرته صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ولم ينكر عليه.

٣.فـەرمودەی فاتمـەی کـچی قـەیس کـە: مێردەکـەی سـێ بـە سـێ تـەڵاقی داوە،کاتێـك هەواڵەکـەیان دا بـە پێغەمبـەری خـوا فـەرموی: مـاف نەفەقـەی نیـە وعیددە گرتنی لەسەرە.[1]

وەڵـامی دراوەتـەوە کـە: لـە فەرمودەکـەدا بـە ڕاشـکاوی بـاس ناکـات کـە سـێ تەڵاقەکەی لەیەك شوێندا وتبێت.کەواتە ناکرێتە بەڵگە.

بەڵام خاوەنی ئەم ڕایە ئەڵێن: کاتێك پێغەمبەری خوا نەیپرسیوە لە یەك شوێندا وتویەتی یا لە چەند شوێنێك؟ کەواتە هیچ جیاوازی نیە.

بـەم شـێوەیەش وەڵـامی ئـەم قـسەیە ئەدرێتـەوە کـە: لەبـەر ئـەوە پرسـیاری لێنەکردوە،چـونکە لـەو سـەردەمەدا زۆربـەی کـات پێکـەوە سـێ تەڵاقەکـەیان نەوتوە.صەنعانی ئەڵێت: کە ئەڵێین لە زۆربەی کاتدا،بۆ ئەوەیە کە نەوترێت لـەو سەردەمەشدا پێکەوە وتراوە،بەڵێ سێ بەسێ کە وتراوە،بەڵام بە دەگمەن.

٤. فـەرمودەی عائشە: پیاوێـك خێزانەکـەی سـێ بەسـێ تەڵاقدا،ئـەویش شـوی کردەوە،بەڵام ئەویش تەڵاقی دا،پرسیار کرا لە پێغەمبەری خـوا: ئایا بۆ مێردی یەکـەم حەڵاڵـە ؟ فـەرموی: نەخێر،هـەتا مێـردی دوەمـیش وەك یەکـەم لـە گەڵیـدا ڕانەبوێرێت.[2] ئەم فەرمودەیەش وەك بەڵگەکانی پێشوو وەڵامدراوەتەوە.

٥.چـەند فەرمودەیـەکی تـریش هەیـە لـەو بارەیـەوە کـە لـە پێغەمبـەری خـواوە ئەگێڕدرێتەوە.

وەڵامی ئەمەش دراوەتەوە کە: ئەم فەرمودانە لاوازن و ناکرێنە بەڵگە.

٦.فەتوای هاوەڵان لەو بارەیەوە.

وەڵامیان دراوەتەوە کە: ڕای تاکە کەس بەڵگە نیە.

---

[1] مافي الصحيحين المتفق عليه من حديث فاطمة بنت قيس:أن زوجها طلقها ثلاثا،فلما أخبر رسول الله بذلك قال:ليس لها النفقة وعليها العدة.

[2] ما أخرجه البخاري من حديث عائشة:أن رجلا طلق إمرأته ثلاثا فتزوجت،فطلق الآخر،فسئل رسول الله:أ تحل للأول؟قال:لا،حتى يذوق عسيلتها.

ڕای سێیەم: تەنها یەك تەڵاقی ئەکەوێت،ئەم ڕایەش لە علي وإبن عباس وإبن مسعود وعبدالرحمان بن عوف وزبیرو عه مر بن دینارو طاوس وعەتاو ناصرو ڕوایەتێك لە زید بن علی وهادی وقاسم و صادق وباقر،وە إبن تەیمیەو إبن القیم ی قوتابیشی پشتگیری ئەم ڕایەیان کردوە،بە بەڵگەی:

١.فەرمودەی إبن عباس: تەڵاقدان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا و ابوبەکرو دوساڵی خەلافەتی عومەردا،سێ تەڵاقەکە یەك تەڵاق ئەکەوت،پاشان عمر وتی: خەڵکی لە شتێکدا پەلەیان کرد لە کاتێکدا شەرع شێنەیی و پەلە نەکردنی بۆ داناون تیایدا.ئەگەر ئێمەش بەسەریاندا بسەپێنین،پاشان سێ بەسێ ی بە کەوتنی سێ تەڵاقەکە دانا.[1]

٢.فەرمودە باسلێکراوەکە.کە هەردوو فەرمودەکە بە ڕاشکاوی باسی لێوە ئەکەن.ئەڵێن: بەڵگەی ڕاکانی تر،بەهێز نین،ڕای یەکەم ودوەم وەڵامدرایەوە،ڕاکانی تریش وەڵام ئەدرێتەوە.

ڕای چوارەم: جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو ئافرەتەی گوازراوەتەوە لەگەڵ ئەوەی نەگوازراوەتەوە،ئەگەر گوازرابوەوە،سێ تەڵاقەکە ئەکەوێت،ئەگەریش نەگوازرابۆوە،تەنها یەك تەڵاقی کەوتوە،ئەمەش ڕای هەندێك لە هاوەڵانی إبن عباس وإسحاق بن راهویە. بەڵگەشیان:

١.لەڕیوایەتی ابوداودا هاتوە: نەتزانیوە هەر کاتێك پیاوێك خێزانەکەی سێ بەسێ تەڵاق بدایە پێش گواستنەوەی،لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا یەك تەڵاقی ئەکەوت؟.[2]

---

[1] حديث إبن عباس قال:كان الطلاق على عهد رسول الله صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وأبي بكر وسنتين من خلافة عمر طلاق الثلاث واحدة.فقال عمر بن الخطاب:إن الناس قد إستعجلوا في أمر كان لهم فيه أناة،فلو أمضيناه عليهم،فأمضاه عليهم.رواه مسلم.

[2] وقع في رواية أبي داود:أما علمت أن الرجل كان إذا طلق إمرأته ثلاثا قبل أن يدخل بها جعلوها واحدة على عهد رسول الله..

٢.بەشـوبهاندن(قیـاس): ئەگـەر بڵێـت تـۆ تـەڵاق دراوی،خێزانەکـەی لـێ جیائەبێتەوە،ئەگەر وشەکە دوبارە بکاتەوە،دوبارەکردنەوەکە بێ سودە،چونکە تەڵاقەکەی کەوتوە.

وەڵامدراوەتەوە کە: ئەمە بۆ ئافرەتی گوازراوەو ناگوازراوە وەك یەکە،مەفهومی فەرمودەکـەی ابـوداودیش بەرامبـەری گـشتگیری فـەرمودەکانی إبـن عبـاس ناوەستێت.

__باسی چوارەم/__ ڕوکەشی فەرمودەکان ئەوە ئەگەیەنێت: جیاوازی نیە بڵێت: تۆ سێ بەسێ تەڵاقدراوی،یا سێ جار وشەی تەڵاق بڵێت.لەو کتێبانەی کە لە لقەکانی فقه دواون،چەندین ڕای جیاواز ئەهێنێتەوە دەربارەی جیاوازی ئەم دوو حاڵەتە،ڕاکانیش بێ بەڵگەی ئاشکران.

__باسـی پێنجـەم/__ لێکەڵـەرەوانی بابەتـە لاوەکیـەکان، زۆر لـەم بابەتـە دواون،وە شوێنکەوتوانی هەرچوار مەزهەبەکە یەکڕان لەکەوتنی سێ تەڵاقەکە،چونکە عمر بڕیاری لە سەرداوە. وە زۆریش توندبون لەگەڵ ئەوانەدا کە ڕای پێچەوانەیان هـەبوە. ئـەم بابەتـەش بوەتـە نیـشانە بـۆ ناسـینەوەی رافـضة و ڕا پێـچەوانەکان،بەهۆی فتـوادانیش پێـی،إبن تیمیـە سـزادراوەو،إبن القـیم ی قوتابیشی بۆ هۆی ئەوەی فتوای نەکەوتنی هەر سێ تەڵاقەکەی داوە،لەسەر وشتریك سوڕاندویانەتەوە،دیارە ئەمەش تەنها دەمارگیری توندە لە بابەتێکی لاوەکیدا،کـە سـەلەف وخەلـەف ڕای جیاوازیـان هـەبوە تیایـدا. بۆیـە نابێـت بەرپەرچی ئەو کەسە بدرێتەوە کە یەکێك لەو ڕایانەی هەیە.لێرەشدا کەسی بەوریژدان و تەقوادار لە کەسی تر جیائەکرێتەوە.

**(١٢٩) ١.عَنْ أبي هريرة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ثلاث جدهن جد وهزلهن جد: النكاح والطلاق والرجعة..**

سێ كردار هەن،جددی بون تیایاندا،جددیە،بەگاڵتە وتنیشیان هەر جددیەتە: ژنهێنان وتەڵاقدان و ژنگێڕانەوە دوای تەڵاقدانی یەكەمی.

**٢.وللحارث بن أسامة من حديث عبادة بن الصامت يرفعه: لا يجوز اللعب في ثلاث: الطلاق والنكاح والعتاق،فمن قالهن فقد وجبن..**

سێ كردار،گاڵتە كردن تیایاندا دروست نیە: تەڵاقدان وژنهێنان وبەندە ئازادكردن،كەسێكیش بیانڵێت،بەرپرسیارە بەرامبەریان.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//**

١.چواركەسەكە جگە لە نسائی،حاكمیش بە صحیحی داناوە. سنن ابي داود - كتاب الطلاق ابواب تفريع أبواب الطلاق - باب في الطلاق على الهزل حديث : ١٨٨٨[1]

٢ . مسند الحارث - كتاب النكاح باب ثلاث لعبهن جد - حديث : ٤٩٥ سەنەدەكەی لاوازەو منقطعة.

**سەرباسەكان//**

دەربارەی كەوتنی تەڵاقی كەسێك كە بە گاڵتەوە ئەیڵێت،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەكەم: تەڵاقەكەی كەوتوەو ئەگەر وتەكەی بە ڕاشكاوی بوو پێویست بە نیەت ناكات،ئەمەش ڕای هادویەو حەنەفیە وشافعیە،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكان.

ڕای دوەم: تەڵاقەكەی ناكەوێت،وپێویست بەنیەت ئەكات بۆ كەوتنەكەی، ئەمەش ڕای أحمد ومالك وناصرو صادق وباقرە،بە بەڵگەی:

أ.گشتگیری فەرمودەی: سزاو پاداشتی كردارەكانی مرۆڤ بە نیەتەوە بەستراون.[2]

---

[1] البانی بە صحیحی داناوە الإرواء ١٨٢٦

[2] إنما الأعمال بالنيات.

وەڵامداوەتەوە کە: ئەم فەرمودەیە گشتگیرەو بە فەرمودەکانی تر تایبەت ئەکرێت.

ب.ئایەتی: ﴿وإن عزموا الطلاق﴾ البقرة:٢٢٧.بەڵگەی ئەوەیە کە: سوربون لەسەر شتێك بە هەند وەرئەگیرێت،کەسی گاڵتەچیش سوربونی نیە ومەبەستی نیە.

وەڵامداوەتەوە کە: لەسەرەتاوە ئەم ئایەتە ناکرێتە بەڵگە،چونکە دەربارەی کۆیلەی ئازادکراو هاتوە.

(١٣٠) عَنْ إِبْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا ،عَنْ النَّبِيِّ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) قَالَ: إِنَّ اللهَ تَعَالَى وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الخَطَأَ وَالنِّسيانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ..

خوای گەورە گوناهی بەهەڵەو لە کاتی لەبیرچونەوەو زۆرلێکردنی،لەسەریان لابردوە.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//** إبن ماجە،حاکم.ئەوەوی بە حەسەنی داناوە. سنن ابن ماجه - كتاب الطلاق باب طلاق المكره والناسي - حديث : ٢٠٣٩[1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** سزادانی قیامەت لە ئوممەتی موسڵمان چاوپۆشی لێکراوە،ئەگەر کردارەکانیان بە هۆی هەڵە یان لەبیرچونەوە یا زۆرلێکردنەوە بوو،بە بەڵگەی فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باسی دوەم/** دەربارەی بیناکردنی حوکمی کاریگەری شەرعی لەسەر کرداری هەڵەو بیرچونەوەو زۆرلێکردنەوە،جیاوازی ڕا هەیە،لەوانەش:

١.جیاوازیان دەربارەی کەوتنی تەڵاقی کەسێك کە بیری چوبێتەوە،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ناکەوێت،بەڕای جمهورو عطا،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: وەك بە ئەنقەست وایە،مەگەر لەپێشدا بە مەرج گیرابێت،بەڕای حەسەن،وەك إبن ابی شیبە لێی ئەگێڕێتەوە.

[1] البانی ئەلیت:صحیحە.الإرواء ٨٢.

٢.دەربارەی تەڵاقی کەسێك بە هەڵە چو بێت،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ناکەوێت،بەڕای جمهور، بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: ئەکەوێت،بەڕای حەنەفیەکان.

٣.دەربارەی تەڵاقی زۆرلێکراو،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ناکەوێت،بەڕای جمهور،بە بەڵگەی:

ا.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئایەتی:﴿إلا من أكره وقلبه مطمئن بالإيمان﴾{النحل:١٠٦}. عەتا ئەڵێت: هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن لە تەڵاقدان گەورەترە.شافعی ئەڵێت: بەڵگەکە لەوەدایە کە کاتێك خوای گەورە ئەو کەسەی بە کافر دانەناوە کە بەزۆر کوفری پێکرابێت،وە بڕیارەکانی کافری لەسەر لابردوە،هەروەها بۆ کەمتر لە کوفریش ئەگەر بەزۆر پێی کرا،هەمان بڕیارە.چونکە گەر کرداری گەورە لێپرسینەوەی نەبێت و لابرێت، لێ نەپرسینەوەو لابردن بۆ لەو کرداری لەو بچوکتر لەپێشترە.

ڕای دوەم: تەڵاقەکە کەوتوە،بەڕای نەخەعی و حەنەفی مەزهەبەکان.

(١٣١) عَنْ عائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا،عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنْ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ،وَعَنْ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ،وَعَنْ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ أَوْ يُفِيقَ..

قەڵەمی گوناه لەسەرسێ کەس لائەبرێت (بەگوناه نانوسرێت): خەوتوو تا لە خەو هەڵئەستێت،وە منداڵ تاگەورە ئەبێت، وە شێت تا چاك ئەبێتەوە یا بەهۆش دێتەوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد،چوارکەسەکە جگە لە ترمذي،حاكم بە صحیحی داناوە. سنن أبي داود – كتاب الحدود

باب في المجنون يسرق أو يصيب حدا – حديث : ٣٨٤٣[1]

---

[1] البانی بە حسن صحيح ی داناوە،الارواء ٢٩٧

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** رفع القلم واتە: گوناهەکە لە سەرەتاوە نانوسرێت،نەك بنوسرێت و پاشان بکوژێتەوە.

مەبەستیش لێی واتە: لێی ناگیرێت نەك چاکەی بۆ نانوسرێت،کەواتە ئەگەر منداڵێکی عاقڵ موسڵمان بوو،لێی وەرئەگیرێت: وەك گێردراوەتەوە کە: ئەو منداڵە جولەکەیەی خزمەتی پێغەمبەری خوای ئەکرد،پێغەمبەری خوا داوای موسڵمانبونی لێکرد،کە موسڵمان بوو،فەرموی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری کرد.[1]

هەروەها ڕیوایەت هەیە کە: ئافرەتێك منداڵەکەی بۆ لای پێغەمبەری خوا بەرز ئەکاتەوە وئەڵێت: ئەم منداڵە پاداشتی حەجکردنی بۆ ئەنوسرێت؟ ئەفەرموێت: بەڵێ،تۆیش پاداشتی خۆتت هەیە.[2] لەم بارەیەوە فەرمودەی تر زۆرە.

**باسی دوەم/** زانایان کۆدەنگن لەوەدا کە: کەسێك خەوێکی قوڵی لێ کەوتبێت،هیچ داوایەکی لێ ناکرێت،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.نیەتی لە کردارەکاندا نیە کەلەو کاتەدا ئەیکات. کەواتە هیچ حوکمێك ڕوبەڕوی نابێتەوە.

**باسی سێیەم/** زانایان لەوەدا کۆدەنگن کە : منداڵێك عەقڵی بەشتدا نەشکێت،هیچ داوایەکی شەرعی نایگرێتەوە.بەڵام دەربارەی ئەو منداڵەی عەقلی پێدا ئەشکێت،ڕای جیاواز هەیە. فەرمودە باسلێکراوەکەش ئەڵێت: تا ئەو کاتەی گەورە ئەبێت،گوناهی لە سەر نانوسرێت.دەربارەی کاتی گەورە بونەکەشی چەند ڕایەك هەیە:

---

[1] ثبت في غلام اليهودي الذي كان يخدم النبى،فعرض عليه النبى صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الإسلام ،فأسلم،فقال:الحمد لله الذي أنقذه من النار.

[2] أن إمرأة رفعت إليه صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صبيا،فقالت:ألهذا حج؟ فقال:نعم ولك أجر. صحيح مسلم - كتاب الحج باب صحة حج الصبي وأجر من حج به - حديث : ٢٤٥٣

یەکەم: گەورە ئەو کەسەیە کە ئەتوانێت بەڕۆژو بێت وکاتی پێنج نوێژەکان بزانێت.بەڕای احمد.

دوەم: کەسێکە بگاتە تەمەنی دوازدە ساڵی.

سێیەم: ئەو کەسەیە باڵغ بوبێت.باڵغ بونیش بەمانە ئەبێت:

١.بۆ کوڕ خەوبینین لەگەڵ هاتنەوەی ئاوی شەهوەتدا.بۆ کچیش لای هادەویە هەمان قسەیە.

٢.بگاتە تەمەنی پازدە ساڵی، ولەتەمەنی نۆ ساڵیدا موی عەورەتی دەربکەوێت بەڕای هادویە.

٣.هەروەها مەنی هاتنەوە بە ئارەزوەوە لەکاتی بەخەبەربوندا.

<u>باسی چوارەم/</u> مەبەست لە شێت ئەو کەسەیە کە عەقڵی لە دەست دابێت،سەرخۆش ومنداڵ وشێتیش ئەگرێتەوە.

شێتیش چونکە مەبەستی لە کردارەکانیدا نیە،نەبە چاك نە بە خراپ وەسف ناکرێت.ئەو کردارانەش کە ئەیکات،لەشەرعدا هیچ حوکمێکی نیەو بەهەند وەرناگیرێت.

<u>باسی پێنجەم/</u> دەربارەی تەڵاق کەوتنی کەسی سەرخۆش ، دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ناکەوێت،بەڕای عوسمان وجابرو زید وعمر بن عبدالعزیز وکۆمەڵێك لە سەلەف واحمد بن حنبل وأهل الظاهر،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئایەتی: ﴿ولا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى،حتى تعلموا ما تقولون﴾{النساء:٤٣}.واتە: لەکاتی نوێژکردندا سەرخۆش مەبن،هەتا بزانن چی ئەڵێن.ئایەتەکە قسەی سەرخۆشی بە هەند وەر نەگرتوە،چونکە نازانێت چی ئەڵێت.

ج.سەرخۆش داواکاری لەسەر نیە،چونکە زاناکان لەوەدا کۆدەنگن کە : مەرجی داوالێکردن بونی عەقڵە،کەسێکیش عەقڵی نەبێت ، داوای لێناکرێت.

ڕاى دوەم: تەڵاقەکەى ئەکەوێت،بەڕاى على وإبن عباس وکۆمەڵێك لە هاوەڵان وهادى وأبوحەنیفەو شافعى ومالك، بەڵگەکانیشیان ئەمانەن:

ا.ئایەتى﴿لا تقربوا الصلاة وانتم سکارى﴾{النساء:٤٣} .ڕێگریان لىٚ ئەکات کەلەکاتى سەرخۆشیدا نزیکى نوێژ بکەون،ڕێگریەکەش واتە: لەکاتى سەرخۆشیدا داوایان لێکراوە.داوالێکراویش کردارەکانى دروستە.

وەڵامیان دراوەتەوە کە: ئایەتەکە لە کاتى بەئاگاییاندا قسەیان لەگەڵ ئەکات،پێش ئەوەى سەرخۆش بن ڕێیان لێئەگرێت. ڕێگریەکەش ئەوەیە کە: ئەو کاتەى ئاگایان لە خۆیان نیە،نزیکى نوێژ نەکەون.کەواتە بەڵگەى ڕاى یەکەمە.

ب.کەوتنى تەڵاقەکە وەك سزا دانێکە بۆى.

وەڵام دراوەتەوە کە: سزادانى سەرخۆش بە تەڵاقکەوتنى وجیابونەوەى لە خێزانەکەى،پێویستى بەبەڵگەیە،چونکە شەرع بۆ سزادانى تەنها لێدانى بەدار داناوە.

ج.کەوتنى تەڵاقەکە لە بوارى بەستنەوەى ئەحکامە بە هۆکارەکانیەوە،سەرخۆشیش کاریگەرى نیە لێرەدا.

وەڵامدراوەتەوە کە: کەوتنى تەڵاق تەنها بە وتنى وشەى تەڵاقەکە،جێى قسە لەسەرکردنە،احمد وبەتتى ئەڵێن: سەرخۆش هیچ گرێبەست ومامەڵەیەك نایگرێتەوە کە لەو کاتەدا ئەیکات.پاشان کەوتنى تەڵاق تەنها بە وتنەکەى،وا ئەگەیەنێت کە تەڵاقى شێت وکەسێك خەوى لىٚ کەوتبێت وسەرخۆشێك بە سەرخۆشیەکەى تاوانبار نەبێت،وە منداڵ، ئەمانە بە قسەى ئەوان بێت،تەڵاقەکەیان کەوتوە.

د. هاوەڵان سەرخۆشیان وەك کەسى بە ئاگا ئەژمارکردوە،لە قسەکانیدا،وتویانە: ئەگەر خواردیەوە سەرخۆش ئەبێت،کە سەر خۆش بوو قسە تێکەڵ ئەکات،کە قسەشى تێکەڵ کرد، بوختان ئەکات. سزاى بوختان کەریش

هەشتا دارە.[1] بەم وتەیەی إبن حەزم وەڵام ئەدرێتەوە: ئەمە قسەیەكی درۆیە وپوچەو دژ بە یەكە،چونكە سزا لەسەر كەسێك دائەنێت كە وڕێنە ئەكات،لەكاتێكدا ئەو كەسە هیچ سزایەكی نیە.

ﻫ.فەرمودەی:پەشیمان بونەوە لە تەڵاقدان نیە.[2] وەڵامداوەتەوە كە: ئەمە فەرمودەیەكی ڕاست نیە،ئەگەر صەحیحیش بێت،واتە: تەڵاقی ئەو كەسەی داوالێكراوە و عاقڵە،نەك ئەوەی عەقڵی نیە.

**(١٣٢) عَنْ إِبْنِ مَسْعُود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّل لَهُ..**

**پێغەمبەری خوا نەفرەتی كردوە لەوانەی مارە بەجاش ئەكەن،ئەوەی ئەیكات وئەوەش بۆی ئەكرێت.**

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** احمد،نسائی،ترمذي وە بە صەحیحی داناوە. سنن الترمذي الجامع الصحيح - أبواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أبواب النكاح عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب ما جاء في المحل والمحلل له حديث : ١٠٧٤[3]

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** بۆ حەڵاڵكردن(مارەبەجاش) بەهەموو شێوەكانی حەرامە،بەبەڵگەی:

---

[1] إذا شرب سكر،وإذا سكر هذى،فإذا هذى إفترى،وحد المفتري ثمانون. السنن الكبرى للنسائي - كتاب الحد في الخمر ذكر اختلاف ألفاظ الناقلين لخبر قتادة عن أنس - حديث : ٥١٤٣

[2] أخرج سعيد بن منصور عن النبى صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أنه قال:لا قيلولة في الطلاق. سنن سعيد بن منصور - كتاب الطلاق
باب ما جاء في طلاق المكره - حديث : ١٠٨٤

[3] صححه الألباني في صحيح الترمذي (١١٢٠).

فەرمودە باسلێکراوەکە،چونکە لەعنەت لەسەر کردنی کردارێکی حەرامە،هەموو حەرام کراوێکیش ڕێگری لێکراوە،ڕێگری کردنیش واتە پوچەڵبوونی گرێبەستەکەیە.لەعنەتەکەش هەرچەندە بۆ بکەرەکەیە،بەڵام بەستراوەتەوە بە وەسفێك کە ئەگونجێت ئەو وەسفە هۆکاری حوکمە بێت.ترمذي ئەڵێت: فەرمودە باسلێکراوەکە صەحیح وحەسەنە،لای زانایانیش ئیش پێکراوە وەك: عمر وعوسمان و عبدالله بن عمرە،هەروەها ڕای زانایانی تابعینیشە.

**باسی دوەم/** زانایان چەند شێوازێکی ئەم گرێبەستەیان باسکردوە،لەوانە:

یەکەم: لە گرێبەستەکەدا بوترێت: ئەگەر من ئافرەتەکەم بۆت حەڵاڵ کرد نابێت بیهێنێت،ئەمەش وەکو هاوسەرگیری متعە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

دوەم: لە گرێبەستەکەدا بوترێت: ئەگەر بۆم حەڵاڵ کردی،ئەبێت تەڵاقی بدەی.

سێیەم: لەکاتی گرێبەستەکەدا مەرجەکە بەشاراوەیی بێت،واتە ڕێبکەون لەسەر تەحلیلەکە،وە مەبەستیان نەبێت کە هاوسەرگیریەکە بەردەوام بێت.

**باسی سێیەم/** لە گشتگیری لەعنەتەکەدا وا دەرئەکەوێت کە: گرێبەستەکە بە هەموو شێوەکانی پوچەڵە،لەبارەی هەندێکیانەوە ڕای جیاواز هەیە،هەرچەندە بەڵگەشیان نیە،کەواتە ئیشی پێ ناکرێت.

**باسی چوارەم/** إبن حزم ئەڵێت:

فەرمودەکە بەگشتگیری هەموو بۆ حەڵاڵکردنێك ناگرێتەوە،چونکە ئەگەر وابوایە ،ئەو کەسەی شت ئەبەخشێت،وە شت ئەفرۆشێت وە ئافرەت بەشو ئەدات،ئەمانە هەموو ئەگرێتەوە.کەواتە تەنها هەندێك محلل ئەگرێتەوە،کە ئەویش کەسێکە: بێ بەڵگە شت بۆ خەڵکی تر حەڵاڵ ئەکات،وا دیارە بۆ ئەو کەسەیە لە سەرەتای گرێبەستەکەوە ئەو مەرجە دائەنێت،چونکە جیاوازی ڕا نیە لای زانایان کە : ئەگەر مێردەکە نەیەوێت بۆ پیاوی یەکەمی حەڵاڵ بکات،بەڵام ئافرەتەکە ئەو مەبەستەی هەبێت،ئەوە پیاوەکە لەعنەتەکە نایگرێتەوە،ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بەمەرج گرتنەکە لێرەدا ئەخوێنرێتەوە.

**(١٣٣) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا قَالَتْ: طَلَّقَ رَجُلٌ إمْرَأَتَهُ ثَلَاثاً، فَتَزَوَّجَهَا رَجُلٌ، ثُمَّ طَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَأَرَادَ زَوْجُهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: لَا، حَتَّى يَذُوقَ الآخَرُ مِنْ عُسَيْلَتِهَا مَا ذَاقَ الأَوَّلُ...**

پیاوێك سێ بەسێ ژنەكەی تەڵاقدا،پاشان پیاوێك هێنای،بەڵام پێش ئەوەی بچێتە لای،تەڵاقی دا.مێردەكەی ویستی بیهێنێتەوە،بۆیە پرسیاری لەو بارەیەوە لە پێغەمبەری خوا كرد،ئەویش فەرموی: نابێت،هەتا مێردی دوەمیش وەك مێردی یەكەم لە گەڵیدا رابوێرێت.

__گێرەرەوەی فەرمودەكە//__ صحيح البخاري - كتاب الطلاق باب من قال لامرأته : انت علي حرام - حديث : ٤٩٦٦ .صحيح مسلم - كتاب النكاح باب لا تحل المطلقة ثلاثا لمطلقها حتى تنكح زوجا غيره - حديث : ٢٦٦٨

__سەرباسەكان//__

__باسی یەكەم/__ دەربارەی مانای ذوق العسيلة ، چەند رایەك هەیە:

یەكەم: هاتنەوەی شەهوەت،بەرای حەسەنی بەسری.

دوەم: جیماع كردن،واتە: ونبونی زەكەری پیاو لە فەرجی ئافرەتەكەدا،ئەوەندەش بەسە كە سزای پێ واجب ئەبێت (بۆ كەسێك زینا بكات)،وە مارەیی پێ واجب ئەبێت (بۆ ژن ومێرد).ئەمەش رای جمهورە.

ئەزهەری ئەڵێت: رای راست ئەوەیە كە : بە مانای لەزەتی جیماعەكە دێت.ابو عوبەید ئەڵێت: هەر شتێك لەزەتی هەبێت،عەرەب بە هەنگوین ناوی ئەبات. فەرمودەكەش مانا هەڵ ئەگرێت.

__باسی دوەم/__ كەی ئافرەتەكە بۆ مێردی یەكەمی حەڵاڵ ئەبێت؟ دوو را هەیە:

یەكەم: بۆی حەلال نابێت تا مێردەكەی لەگەڵیدا رانەبوێرێت (وەك لە باسی یەكەمدا باس كرا)،ئەمەش رای جمهورە،بەبەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكە.

دوەم: بە گرێبەستێکی صەحیح بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵ ئەبێت (ئەبێت دوای ئەو گرێبەستە تەڵاقی بدات و عیددە تەواو بێت)،ئەمەش ڕای سعيد بن المسيب،إبن المنذر ئەڵێت: تەنها خوارج لە گەڵیدا هاوڕان.هەروەها ئەم ڕایەش لە سعيد بن جبير ئەگێڕدرێتەوە،هەرچەندە لە کتێبێکدا باسی نەکردوە،بەڵام أبو جعفر النحاس لە کتێبی معاني القرآن وعبدالوهاب المالكي لە شرح الرسالة دا ئەیدەنە پاڵی.هەروەها إبن الجوزی هەمان ڕای سعيد بن المسيب ئەداتە پاڵ داود. بەڵگەشیان ڕوکەشی ئایەتی:﴿حتى تنكح زوجا غيره﴾{البقرة:٢٣٠}.واتە: بۆی حەڵاڵ نابێت تا شوو بە کەسێکی تر نەکات.وادیارە سعيد بن المسيب ئەم فەرمودەیەی پێ نەگەشتوە،وەك إبن المنذر ئەڵێت.

**(١٣٤) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) قَالَ: لَا تُحِدُّ إمْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ،إلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً،وَلَا تَلْبِسُ ثَوْباً مَصْبُوغاً إلَّا ثَوْبَ عصْبٍ، وَلَا تَكْتَحِلُ وَلَا تَمَسُّ طِيباً إلَّا إذَا طَهُرَتْ نُبْذَةً مِنْ قُسْطٍ أَوْأَظْفَارٍ..**

هیچ ئافرەتێك لەسێ ڕۆژ زیاتر بۆی نیە تازیەبار بێت،تەنها بۆ مێردەکەی ،تاکو چوارمانگ ودەڕۆژ،لەوکاتەدا جلی ڕەنگاوڕەنگ لەبەرناکات جگە لە پەڕۆی خۆبەستنەوە نەبێت،وە کل لەچاو ناکات وخۆی بۆنخۆش ناکات مەگەر بە کەمێك لە بۆنی **قسط یان أظفار** (دوو جۆر بۆن بون لەو سەردەمەدا)..

<u>**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**</u> صحيح البخاري ،كتاب الطلاق باب تلبس الحادة ثياب العصب - حديث : ٥٠٣٣. صحيح مسلم كتاب الطلاق باب وجوب الإحداد في عدة الوفاة - حديث : ٢٨١٧

<u>**ماناى وشەكان//**</u> لا تحد: بەدوو شێوە ئەخوێندرێتەوە:پیتی دال مضموم بێت ئەگەر لا نافيە بێت،وە دال مجزوم بێت ، ئەگەر لا ناهيە بێت. عصب: جۆرە کراسێکی یەمانیە. نبذة: بەشێك. قسط: جۆرێکە لە عەتر. اظفار: جۆرێکە لە بخور.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دروستە بۆ ئافرەت بۆ مردنی باوکی یا کەسێکی تری،سێ رۆژ لە پرسەدا بێت،وە بۆ مێردەکەشی تا چوار مانگ ودە رۆژ،لەوە زیاتر حەرامە پرسە بگرێت،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

بەڵام ابو داود فەرمودەیەك ئەگێڕێتەوە کە:پێغەمبەری خوا مۆڵەتی داوە بە ئافرەت تا حەوت ڕۆژ بۆ باوکی لەپرسەدا بێت،بۆ کەسانی تریش تا سێ رۆژ.[1]

ئەگەر ئەم فەرمودەیە ڕاست بێت،باوك تایبەت ئەکات و ڕێگریەکەی فەرمودەکەی تر نایگرێتەوە.بەڵام ئەم فەرمودەیە مرسلە وتوانای تایبەتمەندکردنی نیە.

**باسی دوەم/** دەربارەی پرسەگرتنی ئافرەتێك کە منداڵ بێت،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: واجب نیە لەسەری پرسە بۆ مێردەکەی بگرێت، وە ئەگەر زیاتر لە سێ ڕۆژیش پرسەی بۆ خەڵکی تر گرت،ڕێی لێ ناگیرێت،ئەمەش ڕای حەنەفیەو هادیە،بە بەڵگەی فەرمودەی: إمرأة لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا،کە مەفهومەکەی ئافرەتی منداڵ ناگرێتەوە.

ڕای دوەم: واجبە لەسەری بەڕای جمهور،چونکە:

أ.وشەی إمرأة ئەمیش ئەگرێتەوە،کە باسی ئافرەتی گەورەش کراوە،مەبەستی زۆربەی حاڵەتەکانە.لەسەر سەرپەرشتیارەکەشی واجبە ڕێگری لێبکات لە خۆ جوان کردن و عەتر لە خۆدان.

ب.عیددە چۆن واجبە لەسەر ئافرەتی گەورە،بەهەمان شێوەش ئافرەتی نابالغیش لەسەریەتی،لەو کاتەدا حەڵاڵ نیە بۆ کەس خوازبێنی بکات.

**باسی سێیەم/** دەربارەی واجب بونی پرسە گرتن لەسەری،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: واجبە،بەڕای زۆربەی زانایان،بەبەڵگەی:

---

[1] أخرج أبو داود في المراسيل عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده:أن النبى صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رخص للمرأة أن تحد على أبيها سبعة أيام،وعلى من سواه ثلاثة أيام. مراسيل أبي داود - باب ما جاء في الجنائز حديث : ٣٨٤

أ.فەرمودەی أم سلمە کە ئەڵێت: کاتێك أبو سلمە مرد،پێغەمبەری خوا هات بۆ لام،منیش کلم لە هەردوو چاوم دابوو،پێغەمبەری خوا فەرموی: کل دەم وچاو جوان ئەکات،بەشەو نەبێت بەکاری مەهێنە،بەڕۆژیش لایبە،قژت بە بۆنخۆشکەر دامەهێنە وخەنەش بەکارمەهێنە،چونکە بۆیەیە.وتم: بەچی قژدا بهێنم؟ فەرموی: بە سیدر.[1]

ب.أم سلمە ئەڵێت:پێغەمبەری خوا فەرموی: ئەو ئافرەتەی مێردەکەی بمرێت،نابێت پۆشاکی ڕەنگاو ڕنگ لە بەر بکات و ،خشڵ بەکار بێنن،و خەنە لە پرچی بدات، وە کل بە کار بێنێت [2]

ڕای دوەم: دوای سێ ڕۆژ پرسەگرتن دروست نیە: ئەو ئافرەتەی سێ بە سێ تەڵاق بدرێت،وە ئەوەش مێردەکەی بمرێت،بۆیان هەیە کل بکەنە چاویان وقژدابێنن وخۆیان بۆنخۆش بکەن وملوانکە لە مل بکەن وپێڵاو لەپی بکەن وبۆیە بکەن،بەئارەزوی خۆیان. ئەمەش ڕای حەسەن وشەعبیە،بەبەڵگەی: فەرمودەی أسماء کچی عەمیس کە ئەڵێت:

لە سێیەم ڕۆژی شەهیدبونی جەعفەری کوڕی أبو گالب دا پێغەمبەری خوا هاتە لام و فەرموی: لە ئەمڕۆوە ئیتر پرسە مەگرە.[3] ئەم فەرمودەیەش نەسخی فەرمودەکەی أم سەلەمەیە،چونکە دوای ئەو وتراوە،أم سلمە دوای مردنی

---

[1] حديث أم سلمة أنها قالت :دخل علي رسول الله حين توفي أبو سلمة ،وقد جعلت على عيني صبرا. فقال رسول الله :إنه يشب الوجه ،فلا تجعليه إلا بالليل،وانزعيه بالنهار،ولا تمتشطي بالطيب ولا بالحناء فإنه خضاب.قلت: بأي شيء أمتشط؟ قال: بالسدر. رواه أبو داود والنسائي وإسناده حسن.

[2] عن أم سلمة قالت: أن رسول الله صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال:المتوفى عنها زوجها لا تلبس المعصفر من الثياب ولا الممشقة ولا الحلي ولا تختضب ولا تكتحل.أخرجه أحمد وأبوداود والنسائي.

[3] دخل علي رسول الله صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اليوم الثالث من قتل جعفر بن أبي طالب فقال:لا تحدي بعد يومك.أخرجه أحمد وصححه إبن حبان.

مێردەکەی، فەرمانی پێدراوە پرسە بگرێت. مردنی أبو سلمەش پێش شەهیدبونی جەعفەر بوە.

جمهوری زانایان بە حەوت خاڵ وەڵامی فەرمودەکەی أسماء ئەدەنەوە،کە هەمویان تکلف ولەمانا دەرکردنیەتی، پێویست بە گێڕانەوەی ناکات.

**باسی چوارەم/** ئافرەتێک تەڵاق درا،ومێردەکەی مرد،پرسەگرتنی لەسەر نیە،بەبەڵگەی فەرمودەی: علی میت.

ئەگەر تەڵاقەکە رجعی بوو(یەك جار تەڵاق دابوو)،ئەوە کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.هەروەها لەوەشدا یەکدەنگن کە ئەگەر ئافرەتەکە پێش گواستنەوەی تەڵاق درا ومێردەکەی مرد،پرسە ناگرێت،وەك لە فتح الباری دا هاتوە.بەڵام ئەگەر تەڵاقەکە بائن بوو (بۆ دوەم جار یا سێیەم جار تەڵاقدرابوو)،ئەوە دوو ڕا هەیە دەربارەی:

ڕای یەکەم:پرسە گرتن واجب نیە لە سەری،بەڕای جمهور وهادی وشافعی ومالك وڕوایەتێکی أحمد،صەنعانی ئەڵێت: ئەم ڕایە بەڵگەیان بەهێزترە،بەڵگەکانیش:

أ.ڕوکەشی فەرمودەی علی میت.

ب.پرسە گرتن دانراوە بۆ دورخستنەوەی هەر هۆکارێك کە جماعی بەدوادا بێت،ئەمەیان بۆ ئافرەتێك مێردەکەی مردبێت ڕاستە،چونکە تازە ناگەڕێتەوە لای مێردەکەی.بەڵام ئافرەتێك دوو جار تەڵاقدرابێت،ئەگونجێت بە گرێبەستێکی تازە بچێتەوە لای مێردەکەی،ئەگەر سێ بەسێ تەڵاق نەدرابێت.

ڕای دوەم:پرسەگرتن واجبە لەسەری،بەڕای عەلی وزید بن عەلی وأبو حەنیفەو هاوەڵانی و أبو ثور و هەندێك لە زانایانی مالکی وثوري،چونکە:

أ.وەکو ئەو ئافرەتەیە کەمێردەکەی مردبێت،هەردوکیان پێویستە عیددە بگرن،هەرچەندە هۆکاری عیددە گرتنەکەیان جیاوازە.

ب.عیددە گرتن هاوسەرگیری لەو کاتەدا حەرام ئەکات،کەواتە هەر هۆکارێکیش بۆ هاوسەرگیری بێت،حەرامە.

**باسی پێنجەم/** سودی دانانی ماوەی چوارمانگ ودە ڕۆژ بۆ پرسە گرتنەکە،ئەوەیە: منداڵ لەدوای تێپەڕبونی ١٢٠ ڕۆژ لاشەی تەواو دروست ئەبێت ، ورۆحی بەبەردا ئەکرێت. کە لە چوار مانگەکە چەند ڕۆژێکی زیاترە،ئەویش تا إحتیاط هەبێت لە ماوەکەدا.

**باسی شەشەم/** ژمارە دە بە مؤنثي باسکراوە واتە دە شەو،بەڵام بە ڕۆژەکانیەوە. کەواتە تا ماوەکە تەواو نەبێت ونەچێتە شەوی یازدەهەم،پرسە ناشکێنێت.

**باسی حەوتەم/** جمهور یەکدەنگن لەوەدا کە: ئافرەتی ماتەمگێر بۆی نیە جلی بریقەدارو ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر بکات،بەبەڵگەی فەرمودەی: ثوبا مصبوغا لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا،وە لەبەر ئەوەی ئەم پۆشاکە بۆ خۆجوانکرنە،ئەو ئافرەتەش ڕێگری لێکراوە خۆی جوان بکات.هەمان حوکمیش بۆ پۆشاکی خۆبەستنەوەیە ئەگەر بۆ جوانی بوو. واتە ئەویش حەرامە لێی.

ئەم زانایانە ئەڵێن: فەرمودە باسلێکراوەکە تایبەت کراوە بە مانایەك کە لە گەڵ ڕێگریەکەدا بگونجێت.مالك وشافعی پۆشاکی ڕەنگ ڕەش لەم حوکمە دەرئەکەن،چونکە بۆ جوانی نیە،بەڵکو پۆشاکی ماتەمینیە.

**باسی هەشتەم/** دەربارەی لەبەرکردنی جلی ئاوریشم لەو کاتەدا،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: بەهیچ شێوەیەك بۆی نیە،ڕەنگ کرابێت یان نا،ئەمەش ڕای دروستە لای شافعیەکان،چونکە ئاوریشم بۆ خۆجوانکردنی ئافرەتان حەڵاڵ کراوە،کەسێکیش لە پرسەدا بێت،نابێت بەکاری بهێنێت.

ڕای دوەم: ئەگەر ئاوریشمەکە ڕەنگ نەکرابوو،دروستە بۆی لەبەری بکات بە ئارەزوی خۆی،سپی بێت یا زەرد یا هەر ڕەنگێکی تر کە ڕەنگی خۆی بێت. ئەمەش ڕای إبن حزمە،بە بەڵگەی فەرمودەی: ثوبا مصبوغا،لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا.

وەڵامیان دراوەتەوە کە: ئەمە جمودو قەتیس کردنی دەقی فەرمودەی أم عطية یە.

**باسی نۆیەم/** دەربارەی حوکمی کل بەکارهێنان ،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ئەگەر هەردوو چاویشی نەمێنێت،بۆی نیە کل بەکار بهێنێت،نە بەشەو نە بەڕۆژ.ئەمەش ڕای إبن حزمە،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.فەرمودەی أم سلمە: ئافرەتێك مێردەکەی مرد،ترسان چاوی شتێکی لێبێت،کاتێك هاتن بۆ لای پێغەمبەرو داوای مۆڵەتی کل بەکارهێنانیان کرد بۆی،مۆڵەتی نەدا،بەڵکو دوو یا سێ جار فەرموی: نابێت.[1]

ڕای دوەم: تەنها بۆ چارەسەر دروستە بەکار بهێندرێت،ئەبێت لە جۆری إثمد بیت،ئەمەش ڕای جمهور ومالك وأحمد وابو حەنیفەو هاوەڵانیەتی،بەبەڵگەی:

فەرمودەی أم سلمە کە دەربارەی کلی الجلاء هاتوە: کاتێك ئافرەتێك مێردەکەی مردوە وچاوی دێشێت،بەدوای أم سلمەدا ئەنێرێت،پاشان پرسیاری کلی الجلا و ی لێ ئەکات،أم سلمە ئەڵێت: کلی تێمەکە مەگەر ناچار بیت،کە بەکارت هێنا ، بە شەو کل بکەو بەڕۆژ بیسرەوە،پاشان أم سلمە وتی: کاتێك أبو سلمە مرد،پێغەمبەری خوا هات بۆ لام،منیش کلم لە هەردوو چاوم دابوو،پێغەمبەری خوا فەرموی: کل دەم وچاو جوان ئەکات،بەشەو نەبێت بەکاری مەهێنە،بەڕۆژیش لایبە..[2]

صەنعانی ئەڵێت: شاراوە نیە کە فتوای أم سلمە قیاسی کل بوە بە صبر،قیاسیش لە گەڵ بونی دەقێکی جێگیر وڕێگریەك کە چەندەها فەرمودەی لەسەر هاتوە،ئیشی پێناکرێت لای ئەوانەی پێیان وایە پرسەگرتنەکە واجبە.

ڕای سێیەم: ئەگەر کلەکە بۆنی خۆشیشی تیابێت هەر دروستە،ئەمەش ڕای کۆمەڵێکە.وادیارە ڕێگریەکەیان بۆ تنزیە داناوە نەك بۆ تحریم.

---

[1] حديث أم سلمة :أن إمرأة توفي عنها زوجها،فخافوا على عينها فاتوا النبى صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فاستاذنوه في الكحل،فما أذن فيه بل قال:لا،مرتين أو ثلاثا. متفق عليه.

[2] لما سالتها إمرأة أن زوجها توفي وكانت تشتكي عينها فارسلت إلى أم سلمة فسالتها عن كحل الجلاء،فقالت أم سلمة:لا يكتحل منه إلا من أمر لابد منه يشتد عليك،فتكتحلين بالليل،وتمسحينه بالنهار،ثم قالت أم سلمة:دخل علي رسول الله حين توفي أبوسلمة.... الحديث أخرجه أبو داود.

**(١٣٥) عَنْ عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قالَتْ: قالَ رَسُولُ اللهِ (صَلّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): لَا تُحَرِّمُ المَصَّةُ وَالمَصَّتَانِ....** یەك ژەم ودو ژەم شیرخواردن، پێی حەرام نابێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح مسلم - كتاب الرضاع باب في المصة والمصتين - حديث : ٢٧٠٦

**ماناى وشـەكان//** المصة: وەرگرتنی شتێکی کەم، یا خواردنەوە بە شێوەیەکی هێمنانە.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی ژمارەی ئەو شیردانانەی پێی حەرام ئەبێت، چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەکـەم: بـە سـێ جـارو بـەرەو ژور حـەرام ئەبێت، ئەمـەش ڕای داود وشوێنکەوتوانی و هەندێك لە زانایانە، بەبەڵگەی:

أ. مەفهومی فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب. مـەفهومی فەرمودەیـەکی تـری موسـلیم: یـەك جـارو دووجـار شـیردان حـەرام نابێـت.[1] مـەفهومی ئـەم دوو فەرمودەیە ئەوە ئەگەیـەنێت کە: لەسێ جار زیاتر پێی حەرام ئەبێت.

وەڵامدراوەتەوە کە: ڕاشکاوی دەقەکان، پێش ئەم مەفهومەیە.

ڕای دوەم: شـیردان کـەم بێـت یـا زۆر، پێـی حـەرام ئـەبێت. ئاسـتی شـیردانەکەش ئەوەندەیە کە: بگاتە نـاو قـورگی منداڵەکەوە. هەنـدێك زانایـان ئـەڵێن: کـۆدەنگی زانایـــان لەوەدایـــە کـــە بـــەو ئەندازەیـــەی ڕۆژوەکـــەی پێئەشکێت، شیردانیشی پـێ حـەرام ئـەبێت. ئەمـەش ڕای علی وإبـن عبـاس وإبـن عمر وثوري وعتره وزيد بن أوس وسعيد بن المسيب وأوزاعیە، هەروەها مەزهـەبی هادویەو حەنەفیەو مالك وڕوایەتیکی أحمدە، بەبەڵگەی:

---

[1] لا تحرم الإملاجة والإملاجتان. صحيح مسلم - كتاب الرضاع باب في المصة والمصتين - حديث : ٢٧٠٧

خوای گەورە حەرامبونی بەشیردانەوە بەستوەتەوە،هەرکاتێك شیردان هەبوو حەرامبونەکەش هەیە،لەبەر ئەو فەرمودەیەی لە گەڵ ئایەتەکەدا گونجاوە: چی بەهۆی نەسەبەوە حەرام بێت،بەهۆی شیردانیشەوە حەرام ئەبێت.[١]

وە فەرمودەی عقبة بن الحارث: ئەم پیاوە أم یەحیای کچی أبو إهاب ی هێناوە،ئافرەتێك دێت وئەڵێت: شیرم بە هەردوکتان داوە. کاتێك پرسیار لە پێغەمبەری خوا ئەکات،ئەفەرموێت: چۆن پێکەوەن وپێتان وتراوە کە شیرتان پێکەوە خواردوە؟پاشان عقبە لێی جیابوەوە وئەویش شوی بە پیاوێکی تر کرد.[٢]

پێغەمبەری خواپرسیاری دەربارەی ژمارەی شیردانەکان لێ نەکرد.

وەڵام دراوەتەوە کە: لێرەدا بەکورتی باسکراوە،بەڵام لەشوێنی تردا باسی ژمارەی شیردانەکان کراوە،کەواتە نابێت بوترێت: بەدرێژی باسی نەکراوە.

ڕای سێیەم:پێنج جارشیردان پێی حەرام نابێت.ئەمەش ڕایەکی تری علی وإبن مسعود وعبدالله بن زبیرو عائشە وعەتاو سعید بن جبیرو شافعی وڕوایەتێك لە احمد وإسحاق،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی عائشە: لەو ئایەتانەی کە دابەزیون ئەوەبوە کە دە شیردانی ئاشکرا حەرام ئەبێت پێی،پاشان ئەم حوکمە لابرا بۆ پێنج جار شیردانی ئاشکرا.کاتێك پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد،ئەو ئایەتە لەقورئاندا هەبوو.[٣]

---

[١] يحدم من الرضاع ما يحرم من النسب.متفق عليه.

[٢] حديث عقبة بن الحارث:أنه تزوج أم يحيا بنت أبي إهاب،فجاءت إمرأة فقالت:قد أرضعتكما،فسأل النبي صلى الله عليه وسلم فقال:كيف وقد قيل،ففارقها عقبة فنكحت زوجا غيره. صحيح البخاري - كتاب العلم باب الرحلة في المسألة النازلة - حديث : ٨٨.

[٣] حديث عائشة رضي الله عنها: كان فيما أنزل من القرآن عشر رضعات معلومات يحرمن،ثم نسخن بخمس معلومات،فتوفي رسول الله صلى الله عليه وسلم وهو فيما يقرأ من القرآن. صحيح مسلم - كتاب الرضاع باب التحريم بخمس رضعات - حديث : ٢٧١٢

ئەم فەرمودەش وورد باسی پێنج جارەکەی کردوە.ئەگەر عائشە ئەمە بە قورئان بگێڕێتەوە،بەڵام حوکمی فەرمودەی آحادي هەیە،لە ئیش پێکردنیدا،وەك لە أصول الفقه دا باسکراوە.

ب.فەرمودەی عائشە: سهلە کچی سهیل هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سالم ی بەندەی ابو حوزەیفە لەماڵەوە لەگەڵمان ئەژی،وەك پیاوانی تر بالغ بە، پێغەمبەری خواش فەرموی: شیری پێبدە،حەرام ئەبیت لێی. لەڕیوایەتی تردا:پێنج جار شیری پێبدە[1]. ئەم فەرمودەش ورد باسی پێنج جار ئەکات،هەرچەندە کرداری هاوەڵانیشە،بەڵام بەڵگەی ئەوەیە کە لایان بڕیار بوە کە: لە پێنج جار شیردان کەمتر پێی حەرام نابێت.

**باسی دوەم/** شیردان بریتیە لەوەی: هەرکاتێك منداڵ مەمکی دایکی گرت و لێی مژی،پاشان بە ئارەزوی خۆی بێ ئەوەی ڕوداوێکی تری بەسەردا بێت،واز لە مەمکەکە بهێنێت،ئەوە بریتیە لە یەك جار شیرخواردن.بڕینی شیرخواردنەکەش وەك ئەوەی کە هەناسە بدات یا پشویەکی کورت بدات یا بە شتیکی ترەوە سەر قاڵ بێت،پاشان دوای کەمێکی تر بگەڕێتەوە بۆ شیرخواردنەکە،گەڕانەوەکەیشی هەر بە یەکجار شیردان ئەژمێردرێت.وەك چۆن ئەگەر نان خوارنەکەی بڕی و پاش ماوەیەکی کەم گەڕایەوە سەری،بەیەك ژەم خواردن دائەنرێت.

ئەمەش مەزهەبی شافعیە دەربارەی یەکجار شیرخواردن،کە لە گەڵ ماناکەشیدا ئەگونجێت.

صەنعانی ئەڵێت: ئەگەر پێنج جار بەو شێوەیە شیری خوارد ،ئینجا پێی حەرام ئەبێت.

**باسی سێیەم/** شیرخواردن تا تەمەنی چەند ساڵی،پێی حەرام ئەبێت؟ چەند ڕایەك هەیە دەربارەی:

---

[1] حديث عائشة قالت:جاءت سهلة بنت سهيل فقالت: يارسول الله،أن سالما مولى أبي حذيفة معنا في بيتنا،وقد بلغ ما يبلغ الرجال.فقال: أرضعيه تحرمي عليه.رواه مسلم.وفي سنن أبي داود:فأرضعيه خمس رضعات.

ڕای یەکەم: جمهوری هاوەڵان وشوێنکەوتوان وزانایان ڕایان وایە کە: ئەو شیرخواردنە پێی حەرام ئەبێت کە لە منداڵیدا بێت.بەڵام ڕایان لەوەدا جیاوازە تا چەند ساڵی بێت: تا دوو ساڵ،دوو ساڵ ونیو،سێ ساڵی....

ڕای دوەم: ئەگەر شیرخۆرەکە تەمەنیشی گەورە بوو،هەر پێی حەرام ئەبێت،ئەمەش ڕای عائشە و إبن حەزم و داود وعەتاو لیث،بە بەڵگەی: فەرمودە پێشوەکەی سهل.

وەڵامدراوەتەوە کە: ئەم حوکمە تایبەتە بە سالمەوە،حوکمەکە بۆ کەسی تر نابێت.أم سلمە ئەیگێڕێتەوە: خێزانەکانی تری پێغەمبەری خوا نەیان ئەهێشت کەس بەو شێوە شیرخواردنە تێکەڵیان بێت . بە عائشەیان ئەوت:

وا ئەبینین ئەم حوکمە تەنها مۆڵەتێك بوە پێغەمبەری خوا داویەتی بە سالم،هیچ کەس بەو شیردانە نایەتە لامان و نامانبینێت.[1]

ڕای سێیەم: شیردان لە منداڵیدا بە هەند وەرئەگیرێت،مەگەر بۆ پێویستی بێت،وەك ئەوەی کەسێکی باڵغ کە بەناچاری هەر تێکەڵ بە ئافرەتێك ئەبێت،ناکرێت ڕێی لێبگیرێت،وەك ڕوداوی سالم وخێزانەکەی ابو حوزەیفە. ئەو کەسە ئەتوانرێت (لە تەمەنێکی گەورەدا) شیری پێ بدرێت.

ئەمەش ڕای إبن تەیمیە یە،شەوکانیش بە ڕایەکی دروستی داناوە،صەنعانی ئەڵێت: ئەمە باشترین کۆکردنەوەی نێوان فەرمودەکەی خێزانەکەی ئەبو حوزەیفەو ئەو فەرمودانەیە کە لە گەڵیدا ناگونجێن.

---

[1] روى أحمد ومسلم والنسائي وإبن ماجة عن أم سلمة أنها قالت:أبى سائر أزواج النبي ص أن يدخلن عليهن أحدا بتلك الرضاعة،وقلن لعائشة:مانرى هذا إلا رخصة أرخصها رسول الله لسالم خاصة،فما هو بداخل علينا أحد بتلك الرضاعة ولا رائينا.

**( ١٣٦ ) عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرو رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا : أَنَّ إمْرَأَةً قَالَتْ : يارَسُولَ الله، إنَّ ابْنِي هَذَا كَانَتْ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً، وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً، وَحِجْرِي لَهُ حِواءً، وَإنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي، وَأَرادَ أَنْ يَنْزِعَهُ مِنِّي. فَقالَ رَسُولُ الله( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي..**

ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم کوڕەم، سکم بۆی بوە بەدەفرێك بۆی، مەمکم بوە بەدۆلکە ئاوکیش بۆی، باوەشم بوە بە کۆکەرەوە بۆی. واباوکی لێم جیابوەتەوە، ئەیەوێت لێم بستێنێت، پێغەمبەری خوا فەرموی: تۆ لەپێشتری بەمنداڵەکە، ئەگەر شو نەکەیتەوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد وابوداود، حاکم یش بە صحیحی داناوە. سنن أبي داود – كتاب الطلاق أبواب تفريع أبواب الطلاق – باب من أحق بالولد حديث : ١٩٥١ [١]

**ماناى وشەکان//** الحضانة: پاراستن وپەروەردەکردن وچاودێریکردنی کەسێکە کە خۆی ناتوانێت (خۆی بپارێزێت و چاودێری خۆی بکات)، لە هەموو شتێك کە لەناوی ئەبات ، یا زەرەری پێ ئەگەیەنێت. وعاء: دەفر، قاپ. سقاء: پێستی بەرخ ئەگەر بۆ ئاو هێنان یا بۆ شیر بەکار بێت. حجر: باوەشی مرۆڤە. حواء: ئەو شوێنەیە کە شتێك ئەگرێتە خۆی وە کۆی ئەکاتەوە.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لەکاتێکدا پیاو ویستی منداڵ لەدایکەکە بستێنێت، ئەوە دایکەکە لە پێشترە بە بە خێوکردنی منداڵەکە. بە بەڵگەی:

أ. لە دوای ئەوەی ئافرەتەکە ئەو سیفاتانەی باسکرد کە هۆکارە بۆ ئەوەی ماڤی بەخێوکردنی مناڵەکەی بدرێتێ، پێغەمبەری خواش ئەو حوکمەی بۆ دەرکرد، وەك لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا هاتوە.

ب. أبوبەکرو عومەر بەو شێوەیە قەزاوەتیان کردوە.

---

[١] البانيش پلەی حەسەنی داوەتی. الإرواء ٢١٨٧.

ج.وتەی إبن عباس: بۆنی وجێگاوو گەرمیەکەی بۆ منالەکە،لەتۆ باشترە،تاگەورە ئەبێت وخۆی هەڵتان ئەبژێرێت[1].

**باسی دوەم/** فەرمودەکە ئاگادارکردنەوەی تیایە بۆ ئەو مانایەی کە حوکمەکەی بۆ دانراوە،وە هۆکارو ماناکان بۆ بڕیارەکان بە هەند وەئەگیرێت،فیترەتی پاکی مرۆڤیش ئەوە ئەخوازێت.

**باسی سێیەم/** ئایا دوای شو کردنەوەی ئافرەت ماف بەخێوکردنی منداڵەکەی ئەمێنێت ؟ دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ئەو مافەی نامێنێت،بەڕای جمهور لە مالکی وشافعیەکان وحەنەفیەکان وعیترە.

إبن المنذر ئەڵێت: هەمو زانایان کەمن ئاگادار بم،لەو ڕایەدا کۆدەنگن،بەبەڵگەی: فەرموده باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: مافەکەی هەر ئەمێنێت،بەڕای عوسمان.حەسەن وإبن حزم یش هەمان ڕایان هەیە،بەبەڵگەی:

أ.أنس کوری مالك لای دایکی مایەوە،هەرچەندە (دایکی) شوی کردبۆوە،أم سەلەمەیش کەشوی بە پێغەمبەری خوا کرد،کوڕەکەی لای مایەوە،کچەکەی حەمزەش لای پوری (خوشکی دایکی) مایەوە،هەرچەندە(پورەکەی) شوی کردبوو.[2]

وەڵامی ئەدرێتەوە کە: ئەگەر ناکۆکی هەبوو دەربارەی منداڵەکە،ئەوە لای ئافرەتەکە نامێنێتەوە،بەڵام ئەگەر کەس داوای منداڵەکەی نەکردەوە،ئەوە گومان نیە کە ئافرەت ئەگەر شویش بکاتەوە،بۆی هەیە منداڵەکەی لابێت.

لەو چیرۆکانەی سەرەوەشدا باس نەکراوە کە ناکۆکی دەربارەی دروست بوبێت،کەواتە بەڵگە نیە بۆ ئەم دەعوایە.

---

[1] ريحها وفراشها وحرها خير له منك،حتى يشب ويختار لنفسه.أخرجه عبدالرزاق في قصة. مصنف عبد الرزاق الصنعاني - كتاب الطلاق باب : أي الأبوين أحق بالولد - حديث : ١٢١٩٣

[2] أن أنس بن مالك كان عند والدته وهي مزوجة،وأم سلمة تزوجت بالنبي ص وبقي ولدها في كفالتها.وإبنة حمزة قضى بها النبي ص لخالتها،وهي مزوجة.متفق عليه.

ب.فەرمودەکە باسلێکراوەکە جێی قسەیە،عەمرو بن شعیب لە باوکی ئەویش لە باوکیەوە ئەیگێرێتەوە بێ ئەوەی بیبینێت. واتە: شعیب فەرمودەی لە باوکی خۆی نەبیستوە.

وەڵامدراوەتەوە کە: فەرمودەی عەمر لای هەموو زانایان وەرگیراوە،وە ئیشیشی پێئەکە.لەوانە:بوخاری وأحمەد وإبن المدینی وحمیدی وإسحاق بن راهویە و زۆری تریش،کەواتە گوێ نادرێت بە تانەدان لێی.

**( ١٣٧ ) ١.عَنْ إِبْنِ مَسْعُود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): لَا يَحِلُّ دَمُ إِمْرِيءٍ مُسْلِمٍ،يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ،إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ،وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ..**

کوشتنی هیچ موسڵمانێك کە شایەتی بدات جگە لە الله کەس شایانی پەرستن نیەو منیش پێغەمبەری خوام، دروست نیە بەسێ شێوە نەبێت: خاوەن هاوسەری زیناکار، و کەسێك بەرامبەر کەسێکیتر ئەکوژرێتەوە،وە کەسێکیش وازی لەدینەکەی هێنابێت ولەکۆمەڵی موسڵمان جیا بوبێتەوە.

**٢.عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا،عَنْ رَسُولِ اللهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) قَالَ: لَا يَحِلُّ قَتْلُ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثِ خِصَالٍ: زَانٍ مُحْصَنٍ فَيُرْجَمُ،وَرَجُلٍ يَقْتُلُ مُسْلِماً مُتَعَمِّداً فَيُقْتَلُ،وَرَجُلٍ يَخْرُجُ مِنَ الإِسْلَامِ فَيُحَارِبُ اللهَ وَرَسُولَهُ فَيُقْتَلُ أَوْ يُصْلَبُ أَوْ يُنْفَى مِنَ الأَرْضِ..**

کوشتنی موسڵمان حەڵاڵ نیە،بە سێ سیفەت نەبێت: زیناکەرێکی هاوسەردار کەبەردباران ئەکرێت،وە کەسێك بەئەنقەست موسڵمانێك بکوژێت ئەکوژرێتەوە،وەکەسێك لەئیسلام پاشگەزبێتەوە ودژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەویش ئەکوژرێت، یا هەڵئەواسرێت ، یا شاربەدەرئەکرێت.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//**

١. صحیح مسلم – کتاب القسامة والمحاربین والقصاص والدیات

باب ما یباح به دم المسلم – حدیث : ٣٢٦١

٢.ابوداودو نسائی،حاكميش به صحيحي داناوة. سنن أبي داود - كتاب الحدود باب الحكم فيمن ارتد - حديث : ١٣٨١٠

سەرباسەكان//

باسی یەكەم/ خوێن ڕشتنی موسڵمان حەڵاڵ نیە،بە ئەنجامدانی یەكێك لەم سێ خاڵە نەبێت:

١.زیناكەری هاوسەردار،بەردباران ئەكرێت.

٢.كوشتن بەرامبەر كوشتن.واتە تۆڵە سەندنەوە بەمەرجەكانیەوە.

٣.پاشگەزبونەوە لەئیسلام بەهەر شێوەیەك بێت،ئەگەر نەگەڕایەوە بۆ ئیسلام،ئەكوژرێت.

فەرمودەی: المُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ، هەموو كەسێك ئەگرێتەوە كەلە كۆمەڵی موسڵمان دەرچوبێت،بیدعەچی بێت یاباغی . وەك خەواریج ئەگەر شەڕیان كردوو ئاژاوەیان نایەوە.

باسی دوەم/ ڕەخنە گیراوە لەوەی لەهەر دوو فەرمودەكەدا تەنها سێ كەس ئەكوژرێن،لەكاتێكدا،كوشتنی كەسێك دروستە كە هێرش ئەكاتە سەر مرۆڤ، لە هیچ كام لە فەرمودەكاندا باس نەكراوە.

وەلأم/ ا.ئەچێتە ژێر خاڵی المُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ.

ب.یان ئەوانەی سەرەوە بە مەبەست و ئەنقەست ئەكوژرێن،بەلأم ئەوەی تر بۆ بەرگریكردن لەخۆ ئەكوژرێن.

باسی سێیەم/ كەسی بێباوەڕ لە سەرەتاوە،بۆ باوەڕهێنان ناكوژرێت،بەڵكو بۆ خۆلادان لە خراپەی، بە بەڵگەی فەرمودە باسلێكراوەكە.

باسی چوارەم/ فەرمودەی: فَيُحَارِبُ اللهَ وَرَسُولَهُ، دوای فەرمودەی: يَخْرُجُ مِنَ الإِسْلَامِ ، ڕونكردنەوەی حوكمی كەسێكی تایبەتەكە وحوكمی تایبەت بەخۆی

---

[١] البانیش به صحیحی داناوه.صحیح أبی داود(٤٣٥٣).

هەیە،ئـەویش مُحَـارِبْ چەتەیە،حوکمەکەشـی: کوشـتن یـا لەسـێدارەدان یـا شاربەدەرکردنە.

کەواتە فەرمودەی دوەم لەیەکەم تایبەتیترە.

**باسی پێنجـەم/** ڕوکەشی فەرمودەی: فَیُقْتَل أَوْ یُصلَب أَوْ یُنْفَى مِنَ الأَرْضِ. وە ئایـە تـي﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذينَ يُحَارِبُونَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْديهم وَأَرْجُلهم مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوا مِنَ الأَرْضِ﴾ {المائِدَة: ٣٣}. ئەوە ئەگەیەنێت: کە فەرمانڕەوا سەرپشکە لە بەجێگەیاندنی ئەو سزایانەدا بەسەر هەر چەتەیەکدا،موسڵمان بێت یا بێباوەڕبێت.ئایەتەکەش واتە: سزای ئەو کەسانەی لە دژی خواو پێغەمبەرەکەی ئەجەنگن ولەسەر زەویدا ئاژاوە و خراپە ئەکەن ئەوەیە کە: بکوژرێن یان بەدارابکرێن یا هەردوو دەست وقاچیان لە دواوە ببڕدرێت،یان شاربەدەر بکرێن.

**باسی شەشەم/** دەربارەی مانای النَّفْيُ چەند ڕایەك هەیە:

١.دەستبەسەرکردن،بەڕای ئەبو حەنیفە.

٢.شاربەدەرکردن،لەم شار بۆئەو شار،ڕاو ئەنرێت،بەڕای شافعی.

٣.دەرکردنی تەنها لەشارەکەی خۆیدا.

**( ١٣٨ ) عَنْ عُمَر بن الخَطَّاب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) يَقُولُ: لَا يُقَادُ الوَالِدُ بِالوَلَد..**

باوك لەتۆڵەی کوشتنی کوڕەکەیدا ، ناکوژرێتەوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد،ترمذي،إبن ماجه.إبن الجارود وبیهقی به صحیحیان داناوە. سنن الترمذي الجامع الصحيح - أبواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أبواب الديات عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب ما جاء في الرجل يقتل ابنه يقاد منه أم لا حديث : ١٣٥٧[1]

---

[1] البانی به صحیحی داناوە،الإرواء ٢٢١٤.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی کوشتنی باوك بەرامبەر بە کوشتنی کوڕەکەیدا،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: بەهیچ شێوەیەك ناکوژرێت.شافعی ئەڵێت: (لەژمارەیەکی زۆر لەو زانایانەی پێیان گەشتوم،لێم بیستون کە: باوك لە تۆڵەی کوڕدا ناکوژرێتەوە.منیش هەمان ڕام هەیە).ئەمەش ڕای جەماوەری هاوەڵان وکەسانی تری وەك هادویەو حەنەفیەو شافعیەو أحمد وإسحاق.بە بەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.عمر لە کێشەی مدلجی دا بەو شێوەیە بڕیاری دا،وە خوێنباییەکەی خستە ئەستۆی باوکەکەو لە میراتی کوڕەکەی بە شی نەدا،وە وتی: بکوژ میراتی بۆ نیە.کەواتە نە لە خوێنبای و نە لە میراتەکە هیچی بەر ناکەوێت بە کۆی دەنگی زانایان.

٣.چونکە باوك هۆکاری هاتنە دنیای کوڕەکەیە،بۆیە کوڕەکە نابێتە هۆی لە دنیا دەرچونی باوکەکە.

ڕای دوەم: ئەکوژرێت.پاشان خاوەنی ئەم ڕایەش ئەبن بە دوو بەشەوە:

یەکەم: لەهەموو حاڵەتێکدا ئەکوژرێتەوە،ئەمەش ڕای بەتتیە،بەبەڵگەی: گشتگیری ئایەتی:﴿النفس بالنفس﴾{المائدة:٤٥}.وا دیارە ئەو زانایە فەرمودەکەی بەلاوە صەحیح نەبوە.

وەڵامی دراوەتەوە کە: ئایەتەکە بە فەرمودەکە تایبەت کراوە.

دوەم: ئەگەر کوڕەکەی دابە زەویدا وسەری بڕی،تۆڵەی لێ ئەسەندرێتەوە.پێشەوا مالیك خاوەنی ئەم ڕایە ئەڵێت: چونکە ئەم شێوەیە تەنها کوشتنی بە ئەنقەستی لێ ئەخوێندرێتەوە،وە ئەوەی دیارە لە بەکارهێنانی ئامێری بریندارکەر لەکوشتندا،بە ئەنقەستە. ئەنقەست بونیش کردارێکی شاراوەیە بە نیشانەی دیار نەبێت،دەرناکەوێت.

بەڵام ئەگەر کوشتنەکەی بەو شێوەیە نەبوو،کە ئەگەری کوشتنی تیا نەبوو،بەڵکوو بۆ تەمبێ کردن بوو،هەرچەند بۆ خەڵکی تر بە ئەنقەست دائەنرێت،بەڵام بۆ باوك بە ئەنقەست دانانرێت.

باوکیش لەم حاڵەتەدا جیاکراتەوە،چونکە بەزەیی بۆ کورەکەی هەیە،وە مافی تەمبێ کردنیشی هەیە،بۆیە ئەنقەست بون لە کوشتنەکەی دورئەخرێتەوە.

وەڵامدراوەتەوە کە: ئەمە رای خۆیەتی.ئەگەر دەقی شەرعیش هەبوو،هیچ رایەك بەرامبەری ناوەستێت.

**باسی دووەم/** باپیر و دایك ،وەك باوك وان،لەبارەی نەکوشتنەوەیان لە تۆڵەی کوشتنی منداڵدا.

**(١٣٩) عَنْ أَنَس بنِ مالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : أَنَّ جارِيَةً وُجِدَ رَأسُهَا قَدْ رُضَّ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَسَأَلُوهَا: مَنْ صَنَعَ بِكِ هَذا؟ فُلانٌ فُلانٌ، حَتَّى ذَكَرُوا يَهُودِيًا فَأَوْمَأتْ بِرَأسِهَا، فَأُخِذَ اليَهودِيُّ فَأَقَرَّ. فَأَمَرَ رَسُولُ الله ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) أَنْ يُرَضَّ رَأسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ..**

کیژۆڵەیەك دۆزرایەوە کە سەری لەنێوان دووبەرددا کوترابوو،لێیان پرسی: کێ وای لێکردوی؟ فلان وفلان،هەتا ناوی جولەکەیەکیان برد،ئەویش سەری راوەشاند،جولەکەکەیان گرت،ئەویش دانی بەتاوانەکەیدانا،پێغەمبەری خواش فەرمانی کرد سەری جولەکەکە لەنێوان دووبەرددا بکوترێتەوە.

**گێڕەرەوەی فەرموودەکە//** صحيح البخاري – كتاب الخصومات باب ما يذكر في الإشخاص والخصومة بين المسلم واليهود – حديث : ٢٣٠٤. صحيح مسلم – كتاب القسامة والمحاربين والقصاص والديات باب ثبوت القصاص في القتل بالحجر وغيره من المحددات – حديث : ٣٢٥٣

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی تۆڵەکردنەوە بەرامبەر کوشتن بەشتی قورس،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: پێویستە بکوژرێتەوە،بەڕای هادویە و شافعی ومالك ومحمد بن الحسن،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.ئەو هۆکارەی کوشتنەوەکەی بۆ دانراوە لێرەدا،دیارەو بەهێزیشە،کە بریتیە لە: ڕێگریکردن لە خوێنڕشتن.

ج.کوشتن بە شتی قورس وەك کوشتن بە ئامێری تیژ،مرۆڤی پێ ئەکوژرێت.

ڕای دوەم: لە کوشتنی وەهادا،کوشتنەوە واجب نیە،بەڕای أبو حەنیفەو شەعبی ونەخەعی و حەسەنی بەسری، بەبەڵگەی فەرمودەی:

هەموو کوشتنێك بە هەڵە دائەنرێت جگە لە کوشتن بە شمشێر،لە کوشتنی هەڵەشدا خوێنبایی واجب ئەبێت. لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتوە: هەموو کوشتنێك جگە لە ئاسن هەڵەیەو،هەموو هەڵەیەکیش خوێنبایی هەیە.[1]

وەڵامیدراوەتەوە کە: لە سەنەدی فەرمودەکەدا،علی جابر الجعفی وقیس بن الربیع هەیە،کە بەهەند وەرناگیرێن،وەفەرمودەکە ڕوبەڕوی فەرمودەکەی انس ناوەستێت.

بەڵام حەنەفیەکانیش لە وەڵامی فەرمودەکەی انس دا ئەڵێن:

أ.لە کوترانەکەدا(جۆری کوشتنی کچەکە) برینداری وخوێن ڕشتنی تیا بوە.

ب.ڕەوشتی جولەکەکە ئەوەبوە کە منداڵ بکوژێت،کەواتە لەو کەسانە دائەنرێت کە ئاژاوە ئەنێنەوە.

وەڵامیان دراوەتەوە کە: ئەم لێکدانەوەیە،زۆر لە خۆکردنە بۆ مانا دەرهێنان.تَكَلُّفْ.

<u>باسی دوەم/</u> دەربارەی تۆڵە سەندنەوە بەرامبەر کوشتنێك کەبە ئامێرێك ئەنجامدرابێت، لە زۆربەی کاتدا خەڵکی پێ نەکوژرێت،وەك: گۆچان و قامچی و شەپازلە،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: کوشتنەوە واجب ئەبێت تیایدا،بەڕای هادویەو لیث ومالك.

---

[1] أَخرَجَ البَيْهَقي عَنْ النُعْمَان بن بَشِير مَرفوعاً:كُلُ شَيْءٍ خَطَأٌ إِلاَ السَّيف،وَلِكُلِ خَطَأٍ إِرشٌ. وَفي لَفظ:كُلُ شَيْءٍ سِوَى الحَدِيدَةِ خَطَأٌ، وَلِكُلِ خَطَأٍ إِرشٌ.

ڕای دوەم: تۆڵە سەندنەوەی تیا نیە،وە کوشتنەکەش بە هاوشێوەی ئەنقەست دائەنرێت،کە ئەبێت سەد وشتر بدات،لەناویاندا،چل وشتری خلفة کە بەچکە لەسکیاندا بێت. ئەمەش ڕای شافعی وابو حەنیفە وجەماوەی زانایانە لە هاوەڵان وشوێنکەوتوان وئەوانەی دوای ئەوانیش هاتون.بەبەڵگەی:

فەرمودەی عبدالله بن عەمر،کە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: ئاگاداربن،لەکوشتنی هەڵەی هاوشێوەی بە ئەنقەستدا کە بە قامچی ودار ئەنجام ئەدرێت، سەد وشتر ئەدرێت،لەناویاندا چل وشتر کە بەچکە لەسکیاندا بێت [١].

صەنعانی ئەڵێت: ئەگەر فەرمودەکە ڕاست بێت،بابەتەکە ڕون ئەبێتەوە. ئەگەر نا بناغە وایە کە : لە کوشتندا سەیری ئامێری کوشتنەکە نەکرێت،بەڵکو هەر شتێك خوێنی پێ بڕژێت،کوشتنەوەی تیا واجبە.

**<u>باسی سێیەم/</u>** دەربارەی کوشتنەوەی پیاوو بەرامبەر ئافرەت،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ناکوژرێتەوە،بەڵکو تەنها خوێنبایی ئەدات،بەڕای حەسەنی بەسری وعمر بن عبدالعزیز وعیکریمە وعەتا ومالك وڕایەکی شافعی،بەبەڵگەی ئایەتی:﴿وَالْـأُنثَى بِالْـأُنثَى﴾{البقرة:١٧٨} .واتە: ئافرەت بەرامبەر ئافرەت ئەکوژرێتەوە.

ودڵامدراوەتەوە کە:

أ.لە نوسینەکەی عەمر بن حەزمدا کە لای هەموو موسڵمانان ئیشی پێکراوە هاتوە کە:پیاو بەرامبەر ئافرەت ئەکوژرێتەوە.ئەمەش لە مەفهومی ئایەتەکە بەهێزترە.

ب.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: ئەکوژرێتەوە،ئەمانیش دابەش ئەبن بۆ دوو ڕا:

---

[١] حَدِيثُ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو:أَنَّ رَسُولَ اللهِ قَالَ:أَلَا وَأَنَّ فِي قَتْلِ الْخَطَأِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَاكَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا مِئَةٌ مِنَ الْإِبِلِ،فِيهَا أَرْبَعُونَ،فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا.أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ وَأَهْلُ السُّنَنِ إِلَّا التِّرْمِذِيَّ. سنن أبي داود - كتاب الديات باب في دية الخطإ شبه العمد - حديث : ٣٩٩٤

یەکەم: بەهەموو شێوەیەك ئەکوژرێتەوە،ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە،إبن المنذر یش کۆدەنگی زانایان لەو بارەیەوە باس ئەکات. بە بەڵگەی:

أ. فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب. نوسینەکەی عەمر بن حەزم.

دوەم: پیاو بەرامبەر ئافرەت ئەکوژرێتەوە،بەڵام میراتگرەکانی نیوەی خوێنەکەی ئەدەن،ئەمەش ڕای هادەویە،چونکە لە خوێنباییدا لەگەڵ پیاو جیاوازن.وە خوای گەورەش ئەفەرموێت:﴿وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾{الْمَائِدَة:٤٥}. واتە: بریندار بونیش تۆڵەسەندنەوەی هەیە.

وەڵامدراوەتەوە کە: جیاوازی لە خوێندا مانای جیاوازی لە نەفسدا ناگەیەنێت،ئەوەتا کۆیلەیەك ئەگەر نرخی هەزار بێت،بەرامبەر کۆیلەیەك ئەکوژرێتەوە کە نرخی بیست بێت،لێرەشدا وەك یەکی لە تۆڵەسەندنەوەکەدا هەیە،چونکە مەبەست لە یەکسانی لە برینەکەدا وەك لەئایەتەکەدا هاتوە ئەوەیە کە: ئەو کەسەی ماف خوراوە لە برینەکەی خۆی زیاتر تێنەپەڕێنێت.

<u>باسی چوارەم/</u> دەربارەی ئەو ئامێرەی کوشتنەوەکەی پێ ئەنجام ئەدرێت،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: کوشتنەوەکە بەهەمان ئەو ئامێرە ئەبێت کە کوشتنەکەی پێ ئەنجامدراوە،بەڕای جمهور،بەبەڵگەی:

أ.ئایەتی:﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَاعُوقِبْتُمْ بِهِ﴾{النَّحْل:١٢٦}.واتە: ئەگەر تۆڵەتان کردەوە با وەك ئەوە بێت کە لێتان کراوە.

ب.ئایەتی:﴿فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾{البَقَرَة:١٩٤}.واتە: بەقەد ئەوەی لێتان دراوە دەستدرێژی بکەنەسەر.

ج.فەرمودەی براو بن عازب: کەسێك کەسێکی تری کردە نیشانە،ئێمەش لە بەرامبەردا ئەیکەینە نیشانەی تیرەکانمان.وە کەسێك کەسێك بسوتێنێت،ئەیسوتێنینەوە،وەکەسێك کەسێکی تر بخنکێنێت،ئێمەش ئەیخنکێنینەوە.[1]

---

[1] حَدِيثُ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ عَنْهُ صلى الله عليه وسلم:مَنْ غَرَّضَ غَرَّضْنَاهُ،وَمَنْ حَرَّقَ حَرَّقْنَاهُ،وَمَنْ غَرَّقَ غَرَّقْنَاهُ.أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِيُّ.

کوشتنەوە بەهەمان ئامێر،بۆ ئامێرێکە بەکارهێنانی حەڵاڵ بێت،خۆ ئەگەر حەرام بێت،وەك سیحر کردن یا عارەق،ئەوە نابێت پێی بکوژرێتەوە.

ڕای دوەم: کوشتنەوە تەنها بە شمشێر ئەبێت،بەڕای هادویە وکوفیەکان وابوحەنیفەو هاوەڵانی،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودەی: کوشتنەوە بە شمشێر نەبێت نابێت.[١] وەڵامدراوەتەوەد کە: فەرمودەکە لاوازە.إبن عدی ئەڵێت: هەموو ڕێگاکانی ئەم فەرمودەیە لاوازە.

ب.لەشەریعەتدا ڕێگری کراوە لە ئەتککردنی مردوو،پێغەمبەری خوا ئەفەرمویت: ئەگەر کەسێکتان کوشت،بە جوانی بیکوژن[٢] .چاك کوشتنیش تەنها بەوە ئەبێت کە بە شمشێر بکوژرێت ولەملی بدرێت.

وەڵامدراوەتەوەکە: ئەم فەرمودەیە بە فەرمودەکەی تر تایبەت کراوە.

<u>باسی پێنجەم/</u> یەکجار دانپیانان بە تاوانەکەدا بەسە،بە بەڵگەی: لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا هاتوە: دانی بە تاوانەکەدا نا،هیچ بەڵگەیەك نیە کە بیسەلمێنێت دانپیانانەکەی دوبارە کردبێتەوە.

---

[١] حَدِيثُ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم أَنَّهُ قَالَ:لَا قَوَدَ إلا بِالسَّيْفِ.أَخْرَجَهُ الْبَزَّارُ وَابْنُ عَدِيٍّ

[٢] إذا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ. صحيح مسلم - كتاب الصيد والذبائح وما يؤكل من الحيوان باب الأمر بإحسان الذبح والقتل - حديث : ٣٧٠٩

(١٤٠) عَنْ إبْنِ عُمَر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قُتِلَ غُلامٌ غِيلَة،فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ: لَوْ إِشْتَرَكَ فِيهِ أَهْلُ صَنْعَاء لَقَتَلْتُهُمْ بِهِ..

منداڵێك بەفێڵ كوژرا،عمر وتی: گەر هەموو خەڵكی صنعاء لەكوشتنیا بەشدار بونایە،هەمویانم لەبری ئەكوشتەوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەكە//** صحيح البخاري،الديات(٦٨٩٦). .

**سەرباسەكان//**

دەربارەی كوشتنەوەی كۆمەڵێك بەرامبەر كوشتنیان بۆ یەك كەس،چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەكەم: كۆمەڵەكە هەمویان ئەكوژرێنەوە،با بەڕاستەوخۆش نەیان كوشتبێت.ئەمەش ڕای جمهوری زانایانە وعمر وعەلیش،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلیكراوەكە.

ب.بخاری لە عەلیەوە ئەیگێڕێتەوە كە: دوو پیاو شایەتیان دا لەسەر پیاوێك كە دزیكردوە،عەلیش دەستی تۆمەتبارەكەی بری،پاشان دوانەكە كەسێكی تریان هیناو ، وتیان ئەمە بوە دزی كردوەو ئێمە لەیەكەمدا بەهەڵەچوین. ئەویش شایەتیەكانی لەسەر كەسی دوەم وەرنەگرتن و،خوێنی یەكەمیشی لێسەندن.وە فەرموی: ئەگەر بمزانیایە بەئەنقەست واتان كردوە،دەستی ئێوەم ئەبڕی.[1]

لەتۆڵەكردنەوەشدا نەفس و ئەندامەكانی لەش وەك یەكن.

ڕای دوەم: میراتگرەكان یەكێك لە بكوژەكان هەڵئەبژێرن تا بكوژرێتەوە،بەڕای ناصرو شافعی و ڕوایەتێكیش لەمالیكەوە.لەڕیواتێكی مالیكدا هاتوە كە:

---

[1] أخرج البخاري عن علي في رجلين شهدا على رجل بالسرقة،فقطعه علي ،ثم أتياه بآخر،فقال:هذا الذي سرق وأخطانا على الأول.فلم يجز شهادتهما على الآخر،وأغرمهما دية الأول وقال:لو أعلم أنكما تعمدتما لقطعتكما.

تیروپشك لەنێوانیاندا ئەکرێت،ئەو کەسەی بۆی دەرچوو،ئەکوژرێتەوە. ئەوانی تریش بەشی خۆیان خوێنباییان لێ ئەسەنرێت،بە بەڵگەی:

هاوشانی لێرەدا بەهەند وەرئەگیرێت،کۆمەڵێکیش بەرامبەر یەك کەس ناکوژرێنەوە،وەك چۆن کەسی ئازاد بەرامبەر کۆیلە ناکوژرێت.

وەڵامی دراوەتەوە کە: بۆ ئەوە ناکوژرێنەوە کە هیچ کەسیان لەکوژراوەکە زیاترە،بەڵکو هۆکاری کوشتنەوەیان ئەوەیە کە هەمویان بکوژن (قاتل).

ڕای سێیەم: تۆڵەیان لێناکرێتەوە،بەڵکو خوێنباییان لەسەرە،بە ڕای ڕەبیع و داود،صەنعانیش بەڕایەکی دروستی داناوە،بە بەڵگەی:

أ.خوای گەورە کوشتنەوەی بەبڕیار داناوە بۆیان،کە ئەبێت وەك یەکی تیا ببێت،بەڵام لێرەدا وەك یەکی نیە.

ب.هۆی کوشتنەوە ئەو کردارەیە کە خوێنی مرۆڤەکەی پێی ئەڕێژرێت،بەڵام ئەگەر بەهۆی هەمویانەوە خوێنەکەی ڕژا،ئەوە هیچ کامیان بە بکوژ دانانرێن.

ج.ئەگەر بوترێت: هەر یەکێك لەوانە بە بکوژ دائەنرێت،کۆمەڵێك هۆکار لەیەك کاتدا بەسەر کردارێکدا دێن،کە ئەمەش لای جمهوری زانایان نابێت.

د.نازانرێت بە کرداری کامیان گیانی دەرچوە،هەمویان یا هەندێکیان. ئەگەر بڵێین: هەر کەسێکیان بەتەنها تاوانەکەی ئەنجامدا،ناگونجێت بڵێین بە کرداری هەمویان مردوە. لێرەشدا باسی ئەوەش نیە کە کامیان دەسپێشخەر بون.چونکە ئەمەش بەهەند وەرناگیرێت.

ﻫ.بڕیارەکەی عومەر بڕیارێکی یەکێکە لە هاوەڵان،بۆیە نابێتە بەڵگە.

و.بانگەشەی کۆدەنگی لێرەدا ڕاست نیە.

خوێنباییەکە لەسەر کێ پێویستە؟ دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: بەهەمویان یەك خوێنبایی ئەدەن،لەنێوانیاندا دابەش ئەکرێت،چونکە خوێنبایی بری خوێنی کوژراوەکەیە.

ڕای دوەم: ئەبێت هەر یەکێکیان خوێنبایی خۆی بدات،بەڵام خاوەنی ئەم ڕایە پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانە.

(١٤١) عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الخُزَاعِي رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ بَعْدَ مَقَالَتِي هَذا، فَأَهْلُهُ بَيْنَ خِيرَتَيْنِ، إِمَّا أَنْ يَأْخُذوا العَقْلَ أَوْ يَقْتُلُوا..

کەسێك لە دوای ئەم وتەیەی من بکوژرێت،کەسوکارەکەی دو ڕێگەیان لەبەردەمدایە: یا خوێنەکەی وەربگرن،یا داوای تۆڵە بکەنەوە.

**گێڕانەوەی فەرمودەکە//** أبوداود،نسائی. السنن الكبرى للنسائي كتاب القسامة هل يؤخذ من قاتل العمد الدية إذا عفا ولي المقتول عن - حديث : ٦٧٧٥[1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** سەرپەرشتیاری کوژراوەکە سەرپشکە لە هەڵبژاردنی یەکێك لەم چوار خاڵە:

١.بێ بەرامبەر لێی خۆشبێت. ٢.بەرامبەر بڕێك پارە لێی خۆشبێت. ٣.داوای تۆڵەسەندنەوە بکات. زانایان ناکۆك نین دەربارەی سەرپشك بونی لەنێوان ئەم سێ خاڵەدا. ٤.ڕێکەوتن بەرامبەر پارەیەك لە خوێنبایی زیاتر بێت،لێرەشدا دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: دروستە،ئەمەش دیارترین ڕای حەنبەلیەکانە.

ڕای دوەم: لە پارەی خوێنبایی زیاتر بۆی نیە وەربگرێت،ئەم ڕایەش بەڵگەی بەهیزترە.ئەگەر پارەکەی هەڵبژارد،مافی تۆڵەسەندنەوەی نامێنێت ، وبۆیشی نیە دوای ئەوە داوای بکات.ئەمەش ڕای شافعی وڕوایەتێکی مالکە.

**باسی دوەم/** بەرامبەر کوشتنی بە ئەنقەست،چی واجب ئەبێت؟ دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: تەنها کوشتنەوە واجبە و،بۆی نیە بەرامبەر وەرگرتنی خوێنبایی لێی خۆشبێت،مەگەر بکوژەکە خۆی ڕازی بێت. بکوژەکەش بۆ پارەکە زۆری

---

[1] البانی بە صحیحی داناوە،الارواء ٢٢٢٠.

لێناكرێت. ئەمەش ڕای زيد بن علی وأبو حەنيفەو مالك وشافعی لە ڕایەكيداو ناصر و طبري، بەبەلگەی:

أ.ئايەتی: ﴿كتب عليكم القصاص﴾{البقرة:١٧٨}.واتە: مافی كوشتنەوە لەسەرتان فەرز كراوە.ئەوەتا باسی خوێنبايی نەكراوە لێرەدا.

ب.فەرمودەی: لەقورئاندا كوشتنەوە هەيە،[1]

ج.فەرمودەی إبن عباس: كەسێك بەئەنقەست كەسێكی تری كوشت،تۆڵەی لێ ئەكرێتەوە.[2]

ڕای دوەم: بە كوشتنی بەئەنقەست يەكێك لەم دوانە واجب ئەبێت: كوشتنەوە يا خوێنبايی. ئەمەش ڕای هادويەو أحمد وڕايەكی شافعی و أبوحامدە،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێكراوەكە.

ب.فەرمودەی: هەركەسێك كەسێكی لێكوژرا،لەنێوان دوو هەڵبژاردندايە: ياكوشتنەوەی بكوژ،يا خوێنبايی وەرگرتن.[3]

وەڵامداوەتەوە كە: مەبەست لە فەرمودەكە ئەوەيە كە: كەسوكاری كوژراوەكە سەرپشكە لەو دوو هەڵبژاردنەدا،ئەگەر بكوژەكە ڕازی بوو خوێنبايی بدات. بەم لێكدانەوەيەش هەردوو فەرمودەكە يەك ئەخرێت.

صەنعانی ئەڵێت: ئەگەر لەئايەتەكەو هەندێك فەرمودەدا باسی هەندێك واجبات كرابێت،ئەوە ناگەيەنێت كە تەنها ئەوانە واجبن،هی تر واجب نين كەلەفەرمودەی تردا باسكراون. أحمد وأبوداود لە أبوشريح الخزاعی ئەگێڕنەوە كە وتويەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوابوو فەرموی: كەسێك كوژرا يا بريندار كرا، كەس و كارەكەی لەنێوان سێ هەڵبژاردندايە: يا تۆڵە ئەكاتەوە،يا خوێنبايی

---

[1] كتاب الله القصاص.

[2] ومن قتل عمدا فهو قود.أخرجه أبوداود والنسائي وإبن ماجه بإسناد قوي.

[3] من قتل له قتيل فهو بخير النظرين:إما أن يقيد وإما ان يدي.أخرجه أحمد والشيخان وغيرهم.

وەرئەگرێت،یا لێی خۆش ئەبێ. ئەگەر ویستی لەوانە زیاتر بکات،لەدەستی بدەن (ڕێگری لێبکەن).ئەگەر ڕازی بوو بە یەکێك لەو خاڵانەی سەرەوە،پاشان دەستدرێژی کرد،ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە.[1]

**( ١٤٢ ) عَنْ إبْنِ مَسْعود رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) قَالَ: دِيَةُ الخَطَأ أخْمَاساً: عِشْرونَ حقة،وَعِشْرونَ جذعة،وَعِشْرونَ بَنَاتَ مخاض،وَعِشْرونَ بَنَاتَ لَبون،وَعِشْرونَ بَني لَبُون.**

خوێنبایی کوشتنی هەڵە،پێنج بەشە: بیست وشتری سێ ساڵ و،بیستی چوارساڵ ،وبیستی یەك ساڵ و،بیستی دووساڵی مێینەو،بیستی دووساڵی نێرینە.

__گێڕەرەوەی فەرمودەکە//__ سنن الدارقطني - كتاب الحدود والديات وغيره حديث : ٢٩٣٥.[2]

__مانای وشەکان//__ حقة: وشترێکە سێ ساڵی تەواو کردبێت وپێی نابێتە چوارەم ساڵیەوە.بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە کاتی ئەوەی هاتوە بۆ سواربون بەکاربێت. جذعة: چوارساڵی تەواو کردبێت وپێی نابێتە پێنجەمەوە. مخاض: یەك ساڵی تەواو کردبێت ولەکۆتایی دوەم ساڵیدا بێت. بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە ، چونکە دایکەکەی کاتی ئاوسبونی هاتوە. لبون: دوەم ساڵی تەواو کردبێت وپێی نابێتە سێیەم ساڵیەوە.بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە دایکی شیری تێدایە.

---

[1] أخرج أحمد وأبوداود عن أبي شريح الخزاعي قال:سمعت رسول الله يقول:من أصيب بدم أو خبل،والخبل الجراح،فهو بالخيار بين إحدى ثلاث:إما أن يقتص أو يأخذ العقل أو يعفو،فإن أراد الرابعة فخذوا على يديه،فإن قبل من ذلك شيئا ثم عدا بعد ذلك فإن له النار.

[2] ألباني بة لاوازي داناوة.الاحاديث الضعيفة ٤٠٢٠.

**(١٤٣) عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده رفعه إلى النَّبيّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): الدِّيَةُ ثلاثونَ جذعة وثلاثون حقة وأربعون خلفة في بطونها أولادها..**

**خوێنبایی كوژراو: سی وشتری چوارساڵ و،سی وشتری سی ساڵ و،چل وشتری خنفه كه بەچكه له سكیاندا بێت.**

**گێڕەرەوەی فەرموودەكە//** ابوداود،ترمذي. سنن الترمذي الجامع الصحيح - أبواب الجنائز عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أبواب الديات عن رسول الله صلى الله عليه وسلم - باب ما جاء في الدية كم هي من الإبل حديث : ١٣٤٥[1]

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** زانایان یەكدەنگن لەوەدا كه خوێنبایی كوشتنی به هەڵە سەد وشتره،به بەڵگەی فەرموده باسلێكراوەكەو فەرمودەی تریش.

**باسی دوەم/** دەربارەی چۆنیەتی خوێنباییەكە،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەكەم: تؤخذ اخماسا،بەڕای إبن مسعودو زوهری و لیث وثوري و حەنەفیەو شافعی ومالك،بە بەڵگەی: فەرموده باسلێكراوەكە.ئەڵێن:پێنجەمیان وشتری دووساڵیە.بەبەڵگەی فەرموده باسلێكراوەكە.

بەڵام ابوحەنیفە ئەڵێت:پێنجەم بەشیان وشتری یەك ساڵیە،بەبەڵگەی گێڕانەوەیەكی چواركەسەكە: كەلەبری بیست وشتری دوساڵی بیستی یەك ساڵی باسكردوە.

ڕای دوەم: ئەكرێت بەچوار بەشەوە،واته وشتری دوو ساڵی تیا نیە.ئەمەش ڕای هادی ومؤید بالله وأبوطالب و شەعبی وحەسەنی بەسریە،بەبەڵگەی فەرمودەی:

---

[1] ألباني به حسن صحيح ي داناوة.صحيح إبن ماجة.٢١٤٦.

خوێنبـايى مـرۆڤ بيست وپێنج وشترى چوارسالْ و،بيست وپێنجى سىْ سالْ و،بيست وپێنجى دوو سالْى مێينەو،بيست وپێنجى يەك سالْى مێينە.[1]
شەوكانى ئەڵێت: ئەم فەرمودەيەم بە مەرفوعى لە هيچ كتێبێكى فەرمودەدا نەبينيوە.

**باسى سێيەم/** خوێنبايى كوشتنى بە ئەنقەست وهاوشێوەى ئەنقەست،وەك خوێنبايى كوشتنى بەهەڵەيە،ئەمەش ڕاى مالك وشافعيە.

**باسى چوارەم:** دەربارەى لەسەر قورسكردنى (تغليظ) خوێنبايیەكە،وتراوە: لەعومەرو عوسمانەوە گێڕدراوەتەوە كە : كەسێك لە حەرەمى مەككەدا كەسێك بكوژێت: خوێنبايیەكەى سەد وشترو هەروەها سێيەكى خوێنبايیەكى ترى لێ ئەسەنرێت.

**(١٤٤) عن إبن عمررَضِيَ اللّهُ عَنهُمَا عن النَبِىّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: إنّ أعتَى النّاسِ عَلَى اللهِ ثَلاثَةٌ: مَنْ قَتَلَ في حَرَمِ اللهِ، أوْقَتَلَ غَيْرَ قَاتِلِه، أوْ قَتَلَ لِذَحْلِ الجَاهِلِيَةِ..**
كەلەڕەقترين (بەدبەختترين) كەس لاى خوا سىْ كەسە: كەسێك لەماڵى خوادا خەڵك بكوژێت،ياجگە لەبكوژەكە كەسێكى تر بكوژێتەوە،يان لەتۆڵەى خوێنى نەفاميدا بكوژێتەوە.

**گێڕەرەوەى فەرمودەكە//** إبن حبان وبة صحيحي داناوة. صحيح ابن حبان - كتاب الحظر والإباحة كتاب الرهن - ذكر نفي القصاص في القتل حديث : ٦٠٨٢[2]

**مانـاى وشـەكان//** اعتـى: لـەخۆبايیترين وخـۆ بـەزلزانترين،ذحل: تۆڵەكردنـەوە وداواكردنـى خوێنبـايى بەرامبـەر كوشـتن يـا برينداريـەك بەرامبـەرى كـرا بێت،هەروەها بە ماناى دوژمنايەتيش دێت.

---

[1] حديث السائب بن زيد عن النبي ص قال: دية الإنسان:خمس وعشرون جذعة وخمس وعشرون حقة وخمس وعشرون بنات لبون،وخمس وعشرون بنات مخاض.ذكره الأمير حسين في الشفاء،وأخرجه أبوداود موقوفا على علي وابن مسعود.

[2] ئەلبانى لە موارد الظمآن ئەڵێت: حسن صحيح (١٦٩٩).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** ئەم سێ کەسە لە خەڵکی تر کەللە ڕەقترن وخۆبەزلزانترن،بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.فەرمودەی ئەبوشورەیحی خوزاعی کە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: لەخۆباییترین کەس ئەوەیە کە: کەسێکی تر جگە لەبکوژەکە بکوژێتەوە،یا خوێنی کەسێك لە موسڵمان داوابکات کە لە پێش ئیسلامدا کوژرابێت،یا شتێکی نەبینیبێت بڵێت بینیومە.[1]

**باسی دوەم/** یەکەمی ئەو سیانەی لە فەرمودەکەدا هاتوە، کەسێکە لە کەعبەدا خەڵك بکوژێت،تاوانەکەی زیاترە لە کەسێك کە لە غەیری کەعبەدا خەڵك بکوژێت.لەپێش ئیسلامیشدا کەسێك بکوژی کوڕەکەی لە حەرەمدا ببینیایە،بەلایدا نەئەچوو. هەروەها دوای هاتنی ئیسلامیش وابوو. إمام أحمد لە عمرەوە ئەیگێڕێتەوە: ئەگەر بکوژی خەتابی باوکمی تیا ببینم،دەستکاری ناکەم تا لێی دێتە دەرەوە،[2] لە إبن عباسیشەوە هەمان شت ئەگێڕدرێتەوە.

جمهوری هاوەڵان وشوێنکەوتوان وحەنەفیە وعیترە وزانایانی عیراق وأحمد وزانایانی فەرمودە،لەسەر ئەو ڕایەن کە : حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەس لەحەرەمدا خوێن بڕێژێت،یا سزای تیا جێبەجێ بکات،هەتا تاوانبارەکە لەوێ دەرئەچێت.

**باسی سێیەم/** ڕوکەشی فەرمودەکە هەردوو حەرەمی مەککەو مەدینە ئەگرێتەوە.بەڵام فەرمودەکە لە ڕزگارکردنی مەککەدا وتراوە دەربارەی کەسێك کە لە مزدەلیفە کوژراوە.بەڵام هۆکاری فەرمودەکە فەرمودەکەی پێ تایبەت ناکرێت،مەگەر بوترێت: ئیزافەکە عەهدیەو مەعهودەکە حەرەمی مەککەیە.

---

[1] حديث أبي شريح الخزاعي:أنه صلى الله عليه وسلم قال:أعتى الناس من قتل غير قاتله،أو طلب بدم في الجاهلية من أهل الإسلام،أو بصر عينه بما لم تبصر.أخرجه البيهقي.

[2] روى الامام أحمد عن عمر أنه قال:لو وجدت فيه قاتل الخطاب ما مسسته حتى يخرج منه.

**باسی چوارەم/** شافعی وای بۆ ئەچێت کە قورسکردنی خوێنباییەکە لەسەر ئەم کەسانەی خوارەوەیە:

١.کەسێك بەهەڵە لە حەرەمدا کەسێك بکوژێت.

٢.کەسێك خزمێکی هاوپشتی خۆی بکوژێت.

٣.یا لە مانگەکانی حەرامدا بکوژێت.چونکە:

أ.هاوەڵان لەم کاتانەدا سزای توندیان سەپاندوە.

ب.إبن مسعود وتویەتی: هیچ کەسێك ئەگەر نیازی خراپەی هەبوو، لەسەری نانوسرێت ئەگەر نەیکات،تەنها کەسێك نەبێت دوای ئەوەی لە بیت الحرام دا کەسێك بکوژێت،نیازی هەر خراپەیەکی هەبێت،خوای گەورە سزایەکی بەئازاری ئەدات.[1]

**باسی پێنجەم/** دوەمین کەسی فەرمودەکە: کەسێکە جگەلە بکوژەکەی خۆی کەسێکی تر بکوژێتەوە. ئەو کەسەش: خوێنبایی لای کەسێکە،ئەویش کەسێك ئەکوژێتەوە کەخوێنەکەی لانیە،بەشداری کوشتنەکە بوبێت یان نا.

**باسی شەشەم/** سێیەمین کەسی فەرمودەکە : کەسێکە بۆ خوێنێکی پێش هاتنی ئیسلام خەڵك بکوژێتەوە.

[1] أخرج السدي عن مرة عن إبن مسعود قال:ما من رجل يهم بسيئة فتكتب عليه إلا أن رجلا لو هم بعد أن يقتل رجلا بالبيت الحرام إلا أذاقه الله تعالى من عذاب أليم.وقد رفعه في رواية.

**( ١٤٥ ) عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده رفعه، قال: مَنْ تَطَبَّبَ وَلَمْ يَكُنْ بِالطِّبِّ مَعْرُوفاً، فَأَصابَ نَفْساً فَمَا دُونَهَا فَهُوَ ضَامِنٌ.**

کەسێك چارەسەری خەڵکی بکات وشارەزای بوارەکە نەبێت، ئەگەر کەسێکی کوشت یائەندامێکی لەشی پەکخست،بەرپرسیارە بەرامبەری. .

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** دارقطني،حاكم بة صحيحي داناوة. سنن الدارقطني كتاب في الأقضية والأحكام وغير ذلك كتاب عمر رضي الله عنه إلى أبي موسى الأشعري – حديث : ٣٩٣٨[١]

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** متطبب کەسێکە شارەزایی لە چارەسەرکرنی خەڵکدا نەبێت،وماموٚستایەکی ناسراویشی نەبێت لێوەی فێر بوبێت.پزیشکی شارەزاش ئەوەیە کە: لەسەردەستی کەسێکی ناسراودا فێربوەو،لەتوانای و لێزانینی ڕائەبینرێت.

**باســـی دوەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: کەسێك بەزۆر خۆی بکاتە پزیـــشك،هەر زەرەرێـــك بدات،نـــەفس بێـــت یـــا کەمتر،بـــەهۆکار بیت،یـــا بەڕاستەوخۆ،بەئەنقەست بێت یا بە هەڵە: قەرەبوکردنەوەی لەسەرە.

هەندێك ئەڵێن: کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەو ڕایەیە.

إبن القيم لە کتێبی الهدى النبوى دا ئەڵێت:پزیشکی شارەزا کەسێکە لەچارەسەرکردندا پەیرەوی بیست خاڵ ئەکات.پزیشکی نەزانیش کەسێکە ئەگەر چارەسەری خەڵکی کرد،یا خەڵکی فێر کرد کە هیچ زانستێکیشی نیە،بەنەزانینەکەی کەسێك لەناو ئەبا. بەخۆبردنە پێشەوە و بەنەزانین ، کاروبارەکان ئەنجام ئەدا،بەوەش فێڵ لە نەخۆشەکە ئەکات،کەواتە قەرەبوی لەسەر پێویستە.

---

[١] البانى بە حسنى داناوە.الاحاديث الصحيحة.٦٣٥

ئەمەش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.

خەتابی ئەڵێت: ڕایەکی جیاواز نابینم لەوەدا کە کەسێك خەڵکی چارەسەر بکات،ئەگەر زیادەڕۆیی کردو زەرەری دا،نەخۆشەکە زەرەری پێگەشت،قەرەبوی لەسەرە.کەسێکیش بە متعدی دائەنرێت کە بێ زانین و بێ شارەزایی، ئیش بکات. ئەگەر بەهۆی چارەسەری ئەوەوە زەرەر گەیشت،قەرەبوی لەسەرە،بەڵام تۆڵەی لێناکرێتەوە. چونکە هەر لەخۆوە بێ پرسی نەخۆشەکە چارەسەری نەکردوە. خوێنباییەکەشی بەڕای زۆربەی زانایان، لەسەر کەس وکاری پزیشکەکەیە.

**باسی سێیەم/** لە کتێبی نهایة المجتهد دا هاتوە: ئەگەر پزیشکی نەشارەزا زەرەری گەیاند: لێدان وزیندانی وخوێنبایی لەسەرە،هەندێکیش ئەڵێن: لەسەر کەس وکارەکەیەتی.

**باسی چوارەم/** هەڵەکردنی پزیشکی بەتوانا،یا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆیە،یا لە کاتی چارەسەردایە:

ئەگەر بەڕاستەوخۆبوو: بەرپرسیارە بەرامبەری ئەگەر بەئەنقەست بێت. بەڵام ئەگەر بە هەڵە بێت،ئەوە خوێنەکەی لە سەر کەس وکارەکەیەتی.

بەڵام ئەگەربەسرایەت بوو،بەکۆدەنگی زانایان بەرپرسیار نیە،چونکە لە شەرعدا مۆڵەتدراوە،وە نەخۆشەکەش مۆڵەتی داوە بۆ چارەسەری. هەموو کردارێکی تریش کە مۆڵەتدرابێت،بکەرەکەی زیادەڕۆیی تیا نەکردبێت،وەك سزاکان ئەگەر سزادراوەکە زیانی پێگەیشت،یا بڕینەوەی ئەندامێکی لەش لەتۆڵەدا،لای جمهور قەرەبوی لەسەرنیە. بەڵام لای ابو حەنیفە،ئەگەر زیانی بەدواوە بوو،قەرەبو ئەکرێتەوە.

بەڵام شافعی جیاوازی ئەکات لەنێوان کردارێك لەشەرعدا دیاریکرابێت وەك سزاکان،وە کردارێك کە سزاکەی دیاری نەکرابێت وەك تەمبێ کردن.لەیەکەمیاندا قەرەبوی نیە،بەڵام لە دوەمدا قەرەبوو ئەکرێتەوە،چونکە سزاکەی بۆ بۆچونی تایبەتی دادوەر ئەگەڕێتەوە،کەواتە ئەگەری دەستدرێژی تیایدا هەیە.

(١٤٦) عن إبن عمر رَضِيَ اللّهُ عَنهُمَا قال: قال رسول الله (صَلَى اللهُ عَلَيه وَسَلَمَ): مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاحَ فَلَيْسَ مِنَّا..

کەسێك چەکمان بەرامبەر هەڵبگرێت،لەئێمە نیە.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە// صحيح البخاري - كتاب الديات باب قول الله تعالى: ومن أحياها - حديث: ٦٤٩٣. صحيح مسلم - كتاب الإيمان باب قول النبي صلى الله عليه وسلم: " من حمل - حديث: ١٦٨

ماناى وشەکان// البغي: واتە ستەمکردن ولادان لە حەق. حمل علينا السلاح: ئەو کەسەی بە ناڕەوا چەك لە دژمان هەڵبگرێت.

سەرباسەکان//

باسی یەکەم/ هەڵگرتنی چەك ، دوو مانای هەیە:

أ.شەڕمان لە گەڵ ئەکات،چونکە هەڵگرتنی شمشێر بۆ خەڵك کوشتنە.

ب.ئەیەوێت شەڕمان لە گەڵ بکات،بەبەڵگەی فەرمودەی: علينا.

باسی دوەم/ فەرمودەی ليس منا،واتە: لەسەر ڕێباز وهیدایەتی ئێمە نیە،چونکە ڕێبازی پێغەمبەری خوا سەرخستنی موسڵمان و شەڕکردنە لە پێناویدا،نەك ترساندن وشەڕکردن لە گەڵیدا. ئەمەش بۆ کەسێکە شەڕکردنەکە بە حەڵاڵ نەزانێت. ئەگەر بە حەڵاڵی بزانێت،بە بێ هۆ شەڕ لە گەڵ موسڵمان بکات،ئەوە بێباوەڕ ئەبێت بە دەقێکی شەرعی بڕاوە قطعي.

باسی سێیەم/ فەرمودەکە بەڵگەی حەرامبونی شەڕکردنە لە گەڵ موسڵمان و بە توندیش باسکراوە.

باسی چوارەم/ شەڕکردن لە گەڵ بغاة وهەڵگەڕاوەکان دا کە موسڵمانن،ناچێتە ناو حوکمی ئەم فەرمودەیەوە.

**(١٤٧) عن إبن عمر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قال: قال رسول الله(صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): هل تدري يا إبن أم عبد،كيف حكم الله فيمن بغى من هذه الأمة؟ قال: الله ورسوله أعلم.قال: لا يجهز على جريحها،ولا يقتل أسيرها،ولا يطلب هاربها،ولا يقسم فيئها..**

ئايا ئەزانيت ئەى إبن أم عبد حوكمى خوا بەرامبەر ئەوانە چيە كەلەم ميللەتە هەڵئەگەڕێنەوە؟ وتى: خواو پێغەمبەرەكەى زاناترن. فەرموى: برينداريان ناكوژرێت،و ديليان ناكوژرێت،و ڕاكردويان ڕاونانرێت، وماڵيشيان دابەش ناكرێت.

__گێڕەرەوەى فەرمودەكە//__ بزار،حاكم وبەصحيحى داناوە.المستدرك على الصحيحين ١٥٥/٢

__ماناى وشەكان//__ إبن أم عبد: عبدالله كوڕى مسعودە،بەو شێوەيە ناسراوە. لايجهز على جريحها: كەسێك برينداربێت ناكوژرێت.

__سەرباسەكان//__

__باسى يەكەم/__ دەربارەى شەڕكردن لە گەڵ هەڵگەڕاوەكاندا، دوو ڕا هەيە:

ڕاى يەكەم: ئەگەر لە سەركەوتن دڵنيابوون،فەرزە شەڕيان لە گەڵ بكرێت. ئەمەش ڕاى هادەويە،بەبەڵگەى: فەرمانكردن لە ئايەتەكەدا:﴿فقاتلوا التي تبغي﴾{الحجرات:٩} .واتە: لەگەڵ ئەوەياندا بجەنگن كە لەسنور دەرئەچێت.

ڕاى دوەم: دروستە شەڕيان لە گەڵ بكرێت،بەبەڵگەى:

أ.ئايەتەكەى پێشوو.

ب.كۆدەنگى زانايان لەبارەيەوە.

__باسى دوەم/__ لەكتێبى البحردا لە مەزهەبى عيترە ئەگێڕێتەوە كە وتويانە: شەڕ دژى هەڵگەراوەكان لە شەڕى دژى بێباوەڕان باشترە،چونكە لە هەڵگەراوەكانەوە زەرەرى زۆر بە موسڵمانان ئەگات.

**باسی سێیەم/** پێش شەڕکردن،پێویستە بانگ بکرێن بۆ پەشیمان بونەوە و،چەند جارێکیش لێیان دوبارە بکرێتەوە.بەبەڵگەی:

عەلی کوری أبو طالب لەگەڵ خەواریجدا بەو شێوە هەڵسوکەوتی کرد : کاتێك لێـی جیابونـەوە،إبن عباسـی بۆناردن،ئـەویش وتـو وێـژی لەگـەڵ کردن،تـا چوارهەزاریان گەڕانەوە،کە هەشت هـەزار بـون.چـوارەکەی تریان،نەگەڕانـەوەو، سوریش بـون لـە جیابونەوەکـەیان. ئـەویش نـاردی بـۆ لایـان کـە: لـەکویٚ بـن بـە ئارەزوی خۆتانە،نێوانی هەردولامان تا ئەو کاتەیە کە: هـیچ خـوێنێکی ناهـەق نەڕێـژن،وە ڕێگـا بەکـەس نەگرن،وەسـتەم لەکـەس نەکـەن. ئـەوانیش عبـدالله بـن خبـاب ی هـاوەڵی پێغەمبـەریان شـەهید کـرد،وە سـکی کەنیزەکەکـەیان دڕی کـە دوگیـانیش بوو،کۆرپـەی نـاو سـکیان دەرهێنـا.کاتێـك ڕوداوەکـە بـە عـەلی گەشتەوە،بۆی نوسین: بکوژی عبدالله کوری خەبابمان بۆ بنێرن.وتیان: هەمومان کوشتومانە،لەپاشان مۆڵەتی دا شەڕیان لەگەڵدا بکرێت.[1]

**باسی چوارەم/** بریندارەکانیان لەشەڕەکەدا،ناکوژرێن. بەبەڵگەی:

١.فەرمودەی: لایجهز علی جریحها لەفەرمودە باسلێکراوەکەدا.

٢.عـەلی لـە جـەنگی جەمەلـدا بـە هاوەڵـانی ئـەڵێت: ئەگـەر بەسـەریاندا سـەرکەوتن،دوای کەسێك مەکـەون کـە لـە جەنگەکـە ڕائـەکات،وە بریـندارەکانیان مـەکوژن،وە هـەر ئـامێرێکی جـەنگیان هەیـە، دەسـتی بەسـەردا بگـرن ، وجگـە لـەوە شـتومەکی تـر بـۆ میراتگـری کوژراوەکانە.[2] بەڵام بەیهەقی ئەڵێت: ئەم ڕیوایەتە منقطعە.

---

[1] لما فارقوه أرسل إليهم إبن عباس فناظرهم،فرجع منهم أربعة آلاف،وكانوا ثمانية آلاف،وبقي أربعة أبوا أن يرجعوا،وأصروا على فراقه.فارسل إليهم :كونوا حيث شئتم،وبيننا وبينكم :أن لا تسفكوا دما حراما،ولا تقطعوا سبيلا ولا تظلموا أحدا.فقتلوا عبدالله بن خباب صاحب رسول الله ثم بقروا بطن سريته،وهي حبلى،وأخرجوا ما في بطنها،فبلغ عليا فكتب إليهم:أفيدونا بقاتل عبدالله بن خباب.فقالوا:كلنا قتله.فاذن حينئذ في قتالهم.وهي روايات ساقها إبن حجر في فتح الباري.

[2] اخرج البيهقي:أن عليا قال لأصحابه يوم الجمل:إذا ظهرتم على القوم فلا تطلبوا مدبرا،ولا تجهزوا على جريح،وانظروا ما حضرت به الحرب من آلته فاقبضوه،وما سوى ذلك فلورثته.

ڕای دروست ئەوەیە کە: پێشەوا عەلی هیچ شتومەکێکی نەبردو ،کوژراوەکەشی لە چەك وشت ومەکەکەی دانەڕنی.

**باسی پێنجەم/** دیلەکانیان ناکوژرێت،بە بەڵگەی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.بۆیە شەڕیان لەگەڵدا ئەکرێت تاڕێگریان بکات لە شەڕکردنیان لە گەڵ موسڵمانان.

**باسی شەشەم/** واز لە ڕاکردوەکانیان ئەهێنرێت،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باسی حەوتەم/** ئەو کەسەی لەوان ڕائەکات بەڵام ئەچێت بۆ لای کۆمەڵێکی تر،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: دوای ناکەوێت،بەڕای شافعی. بەبەلگەی:

١.ڕوکەشی فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.وتەکەی پێشوی پێشەوا عەلی.

٣.چونکە مەبە ست لە شەڕکردن لەگەڵیان بۆ لادانیانە لەشەڕ،بەشکاندنیان ئەو مەبەستە دێتە دی.

ڕای دوەم: ئەکوژرێت،بەڕای حەنەفیەو هادەویە. بەبەڵگەی ئەوەی کە متمانەی نیە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ شەڕکردن. بە فەرمودە باسلێکراوەکەو وتەکەی عەلی وەڵامی دراوەتەوە.

**باسی هەشتەم/** دەربارەی دابەشکردنی سامانەکەیان، دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ماڵەکەیان بەتاڵان نابرێت ودابەش ناکرێت،هەرچەند لە گەڵ خۆشیان بیهێنن بۆ دار الحرب،بەرای حەنەفیە وشافعیەو محمدی ناسراو بە النفس الزکیە. بە بەڵگەی:

١.فەرمودەی: ولا يقسم فيئها لەفەرمودە باسلێکراوەکەدا.

٢.فەرمودەی: ماڵی هیچ موسڵمانێك بۆ كەس حەڵاڵ نیە بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت.[١]

٣.جعفر كوڕی محمد لە باوكیەوە ئەیگێڕێتەوە كە: عەلی تاڵانی نەبردوە.[٢]

٤.جعفر كوڕی محمد لەباوكیەوە ئەیگێڕێتەوە كە: عەلی لە جەنگی بەسرەدا،هیچ لەشتومەكەكەیانی نەبرد.[٣]

٤.أبو أمامە ئەڵێت: لە جەنگی صفین دا بەشدار بوم،برینداریان نەئەكوشت وكەسێكیان نەئەكوشت كە ڕابكات،وە شتومەكی كوژراویان نەئەبرد.[٤]

ڕای دوەم: هەر ماڵ وكەرەستەیەكی جەنگیان لە گەڵ خۆیان هێنابێت،لێیان ئەبرێت،وە ئەكرێت بە پێنج بەشەوە،بەڕای هادویە. بەبەڵگەی وتەی عەلی: مەیدانی شەڕەكەو هەرچی تیایە بۆ خۆتان [٥].

وەڵامدراوەتەوە كە:

١.فەرمودەكەی پێشوو بەڕاشكاوی ئەڵێت: غەنیمەتیان لێنابرێت.

٢.ئەو وتانەی كە لە پێشدا لە عەلیەوە گێڕدراونەتەوە،لە گەڵ فەرمودە باسلێكراوەكەدا ئەگونجێن وبەهێزتریشن.

**باسی نۆیەم/** دەربارەی بەرپرسیارێتیان بەرامبەر ئەو خوێنەی ڕشتویانەو ئەو ماڵەی لەناویان بردوە،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەكەم: بەرامبەر بە هیچ شتێك بەرپرسیار نین،بەڕای إمام یەحیاو حەنەفیەو شافعیە. بەبەڵگەی:

١.ڕەهاییبون لە فەرمودەی: لایجهز علی جریحها.

---

[١] لا يحل مال إمريء مسلم إلا بطيبة من نفسه.

[٢] أخرج البيهقي عن الدراوردي عن جعفب بن محمد عن أبيه :أن عليا كان لا يأخذ سلبا.

[٣] أخرج البيهقي عن أبي بكر بن أبي شيبةعن جعفر بن محمد عن أبيه :أن عليا يوم البصرة لم يأخذ من متاعهم شيئا.

[٤] أخرج البيهقي عن أبي أمامة قال:شهدت يوم صفين،وكانوا لا يجهزون على جريح ولا يقتلون موليا،ولا يسلبون قتيلا.

[٥] لكم المعسكر وما حوى.

٢.ئايەتى:﴿حتى تفيء إلى أمر الله﴾{الحجرات:٩}.واتە: شەڕيان لەگەڵ بكەن تاكو ئەگەڕێنەوە بۆ فەرمانى خوا.لێرەدا باسى بەرپرسيارێتيانى نەكردوە.

٣.إبن شهاب ئەڵێت: كە ئاژاوە بۆ يەكەم جار وروژا(بەر پا بو)، كۆمەڵێكى زۆر لەو هاوەڵانەى لە جەنگى بەدرا بەشدار بون،ئاژاوەكەيان بينى. وامان پێ گەشتوە كە ئەو هاوەڵانە رايان وابوە: كردارەكانى كاتى ئاژاوەكە بەهەند وەرناگيرێت.سزاى كوشتنەوە بەسەر كەسێكدا جێبەجێ ناكرێت كەبە ڕاى خۆى لێكدانەوەى بۆ قورئان كردوەو خەڵكى كوشتوە. سزاى كەسێك نادرێت كە ئافرەتێكى بردبێت لەو كاتەدا،وە سزاى لەسەر نيە. هەروەها لەنێوان ئەو ئافرەتەى بە تاڵان براوە لەگەڵ مێردەكەى ملاعنە ناكرێت. هەر كەسێكيش تۆمەتى بۆ دروست بكات، سزاى بوهتان دروستكردنى بەسەردا جێبەجێ ئەكرێت. لەدواى ئەوەى ئافرەتەكە ئەگەڕێتەوە عيدە ئەگرێت وئەگەڕێتەوە لاى مێردى يەكەمى. بەو شێوەيەش لە مێردەكەى ترى عيدەى تەواو ئەبێت. هەروەها مێردى يەكەمى ميراتگريەتى،ئەگەر ئافرەتەكە مرد.[1]

٤.صەنعانى ئەڵێت: ئەگەر ئەمە بە كۆدەنگى دانەنرێت،بەهێزكردنى بنەما سەرەكيەكەيە دەربارەى حەرامبونى خوێن وسامانى موسڵمان لە يەكتر.

ڕاى دوەم: كەسێك باغى بێت وكەسێك بكوژێت،ئەكوژرێتەوە،بەڕاى شافعى ولەهادەويش ئەيگێڕنەوە.بە بەڵگەى:

١.گشتگيرى ئايەتى:﴿ومن قتل مظلوما فقد جعلنا لوليه سلطانا﴾{الإسراء:٣٣}.واتە: كەسێك ستەمى لىَ بكرێت،ماف ئەدەينە كەس وكارەكەى.

---

[1] أخرج البيهقي عن إبن شهاب،قال:هاجت الفتنة الأولى فأدركت الفتنة رجالا ذوي عدد من أصحاب رسول الله،ممن شهدوا معه بدرا،وبلغنا أنهم كانوا يرون أن يهدر أمر الفتنة،ولا يقام فيها على رجل قاتل في تأويل القرآن قصاص فيمن قتل،ولا حد في سباء إمرأة سبيت،ولا يرى عليها حد،ولا بينها وبين زوجها ملاعنة،ولا يرى أن يقذفها أحد إلا جلد الحد،ويرى أن ترد إلى زوجها الأول بعد أن تعتد،فتنقضي عدتها من زوجها الآخر،ويرى أن يرثها زوجها الأول.

٢.گشتگیری فەرمودەی: کەسێك موسڵمانێك بکوژێت بەڵگەش لەسەری هەبێت،تۆڵەی لیێ ئەکرێتەوە.[1]

وەڵام دراوەتەوە کە: ئەم دەقانە گشتگیرن ،وبە بەڵگەکانی ڕای یەکەم، تایبەت ئەکرێن.

**( ١٤٨ ) عن عرفجة بن شريح رَضِيَ اللّهُ عَنهُ قال: سمعت رسول الله ( صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ ) يقول: مَنْ أَتَاكُمْ وَأَمْرُكُمْ جَمِيعٌ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ فَاقْتُلُوهُ..**

گەر هەموتان لەسەر یەك کەس ڕێکەوتبون وکەسێك هات و ویستی لێتان تێك بدات،بیکوژن.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح مسلم - كتاب الإمارة باب حكم من فرق أمر المسلمين وهو مجتمع - حديث : ٣٥٢٢

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** کەسێك لە پێشەوایەك هەڵگەڕێتەوە کە موسڵمانانی وڵاتێك لەسەری کۆکن وهەڵیان بژاردوە،ئەوە شایانی کوشتنە.چونکە زەرەر بە بەندەکانی خوا ئەگەیەنێت،بەڵگەی کوشتنیشی:

١.فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.فەرمودەی إبن عباس: کەسێك لە ئێوە شتێکی لە پێشەواکەی بینی کە بەدڵی نەبوو،با ئارام بگرێت. چونکە هەر کەسێك بستێك لە کۆمەڵی موسڵمان جیاببێتەوە،پاشان بمرێت،وەك ئەوەیە لە سەردەمی پێش ئیسلامدا مردبێت.[2]

---

[1] من إعتبط مسلما بقتل عن بينة فهو قود.أخرجه أبوداود في المراسيل والنسائي وغيرهما من حديث أبي بكر بن محمد بن عمرو بن حزم.

[2] أخرج الشيخان واللفظ للبخاري من حديث إبن عباس:من رأى من أميره شيئا يكرهه،فليصبر عليه،فإنه من فارق الجماعة شبرا فمات،مات ميتة جاهلية.وفي لفظ:من خرج عن سلطان شبرا،فمات مات ميتة جاهلية.

**باسی دووەم/** پێشەوایەك هەڵبژێردرابێت،بۆ هیچ کەس دروست نیە لێی هەڵبگەڕێتەوە،پێشەوا کە ستەمکار بێت،یا داد پەروەر بێت. بە بەڵگەی: ڕوکەشی فەرمودەکانی پێشوو.

**باسی سێیەم/** ئەم گوێڕایەڵی کردنی پێشەوایە،بە چەند فەرمودەیەك بەستراوەتەوە. لەوانە:

هەتا نوێژ ئەکەن،وە تا کوفرێکی ئاشکرایان لێ نەبینن.[1]

**باسی چوارەم/** إبن التين لە داودیەوە ئەگێڕێتەوە کە وتویەتی: زانایان دەربارەی دەسەڵاتداری ستەمکار: ئەگەر بێ ئاژاوە بتوانرێت لابرێت،باشە. ئەگەر نا پێویستی بە خۆڕاگری و ئارامیە.

**(١٤٩) عن عبدالله بن عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: قال رسول الله( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): من قتل دون ماله فهو شهيد..**

کەسێك لەپێناو بەرگری کردن لەماڵەکەیدا بکوژرێت،شەهیدە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب المظالم والغصب باب من قاتل دون ماله - حديث : ٢٣٦٨ أبوداود،نسائي،ترمذي وبة صحيحي داناوە.[2]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی حوکمی بەرگریکردن لە ماڵ وسامان،چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەکەم: دروستە،بەڕای جمهور،وەك نەوەوی وە إبن حجر لە فتح الباری دا ئەیگێڕێتەوە.بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

[1] حديث:ما أقاموا الصلاة.و مالم تروا كفرا بواحا.

[2] ألباني به صحيحي داناوة.الارواء ١٥٢٨

ب.فەرمودەی: هەر کەسێك لە پێناوی دینەکەیدا بکوژرێت،شەهیدە.وە کەسێك بۆ بەرگریکردن لە خۆی بکوژرێت،ئەوە شەهیدە. وە کەسێك بۆ بەرگریکردن لە ماڵەکەی بکوژرێت،شەهیدە. وە کەسێك لە پێناوی کەس وکارو خیزانەکەیدا بکوژرێت،شەهیدە.[1]

لە صەحیحەین دا: تەنها باسی ماڵ کراوە. دیارە کاتێك پێغەمبەری خوا ئەیکات بە شەهید،واتە بۆی هەیە شەڕ بکات وە بشکوژێت.

بەڵام ئەڵێن: بەرەنگاری کردن لە ماڵ دروست نیە،بەڵکو بۆی هەیە شکات بکات.

ڕای دوەم: واجبە،ئەمەش ڕایەکی شازە.دیارە بەڵگەشیان فەرمودەکەی أبو هورەیرەیە کە فەرمانکردن بە شەڕکردنی تیایە،وە ڕێگریکردنی تیایە بۆ دانی مال بەو کەسەی ئەیەوێت زەوتی ئەکات.

ڕای سێیەم: ئەگەر دەسەڵاتدار ویستی ماڵەکە زەوت بکات،دروست نیە دژی بوەستێتەوە،ئەمەش ڕای زانایانی فەرمودەیە.

إبن ئەڵێت: زانایان لە سەر ئەو ڕایەن کە: بۆ موسڵمان هەیە بەرەنگاری لەوانەی سەرەوە بکات. بەڵام بێ ئەوەی بەدرێژی لە سەری بدوێن.بەڵام هەر زانایەکی فەرمودە من پێی گەشتبم،کۆدەنگن لەوەدا کە دەسەڵاتدار لەم حوکمە بەدەرە،لەبەر ئەو فەرمودەو وتانەی کە فەرمان ئەکەن بە خۆڕاگری وڕێگری ئەکەن لە هەڵگەڕانەوە لێیان.

صەنعانی ئەڵێت: فەرمودەکەی أبوهورەیرە پشتگیری وتەکەی إبن المنذرە،فەرمودەکەش ئەڵێت: ئەگەر پیاوێك هات و ویستی ماڵەکەم ببات ؟پێغەمبەری خوا فەرموی: مەیدەرێ.وتی: ئەگەر شەڕی لە گەڵ کردم ؟ فەرموی: شەڕی لە گەڵ بکە،وتی: ئەگەر کوشتمی؟ فەرموی: تۆ شەهیدیت.وتی: ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرموی: لە ئاگردایە.[2]

---

[1] أخرج أبوداود وصححه الترمذي عنه ص:من قتل دون دينه فهو شهيد،ومن قتل دون دمه فهو شهيد،ومن قتل دون ماله فهو شهيد،ومن قتل دون أهله فهو شهيد.

[2] أخرجه مسلم من حديث أبوهريرة مرفوعا:أرأيت إن جاء رجل يريد أخذ مالي؟قال:فلا تعطه.قال:أرأيت إن قاتلني؟قال: قاتله. قال: أرأيت إن قتلني؟قال: فأنت شهيد.قال:أرأيت

**باسی دوەم/** ئەگەر کەسێك بەرەنگاری لە ماڵەکەی کردوو کوژرا،شەهیدە.بەرامبەرەکەشی ئەگەر کوژرا،لە ئاگردایە.بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.فەرمودە پێشوەکەی أبو هورەیرە.

**باسی سێیەم/** دەربارەی بڕی ئەو ماڵەی کە دروستە شەڕی لە سەر بکرێت،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ئەگەر ماڵەکە کەم بێت یا زۆر،دروستە بەرگری لیێ بکرێت بەرامبەر کەسێك کە بە ناهەق ئەیبات.ئەمەش ڕای جمهورە،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە،ئەویش ماڵی زۆر وکەمیش ئەگرێتەوە.

ب.ڕوکەشی فەرمودە پێشوەکەی أبوهورەیرە: ئەگەر پیاوێك هات ویستی ماڵەکەم ببات؟...

ج.شەڕکردن لێرەدا بۆ لادانی خراپەیەکە،ماڵەکە کەم بێت یا زۆر، وەك یەکە،بە وتەی قرطبی.

ڕای دوەم: ئەگەر ماڵەکە کەمبوو،دروست نیە شەڕی لەسەر بکرێت،بەڕای هەندێك لەمالکیەکان.چونکە شەڕکردن بۆ لادانی زەرەرە،بە بردنی ماڵێکی کەم،مرۆڤ زەرەر ناکات،ئەمیش هەر وتەی قرگبیە.

وەڵامدراوەتەوە کە: گشتگیری فەرمودە باسلێکراوەکان،وەڵامە بۆیان.

**باسی چوارەم/** إبن المنزر لە شافعیەوە ئەیگێڕێتەوە:

کەسێك دەستدرێژی بکرێتە سەر ماڵی یا خۆی یا خێزانی،ئەویش بە کوشتنی هێرشبەرەکە نەبێت نەتوانیت هێرشەکە لابات،بۆی هەیە.نە تۆڵە نەخوێنبایی نە کەفارەتی بەرامبەر بەو کوشتنە لە سەرنیە.بەڵام بیێ ئەوەی زۆر لەسەری بدوێین.

ئەو کەسە بۆی نیە یەکسەر هێرشبەرەکە بکوژێت.

---

إن قتلته؟قال:هو في النار. صحيح مسلم كتاب الإيمان باب الدليل على أن من قصد أخذ مال غيره بغير حق - حديث : ٢٢٧

**(١٥٠) عن إبن عباس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قال: قال رسول الله(صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ): من بدل دينه فاقتلوه...**

کەسێك دینی خۆی بگۆڕێت ، بیکوژن.

**گێرەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير باب : لا يعذب بعذاب الله - حديث : ٢٨٧٥

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** کوشتنی ئەو کەسە دروستە کە ئەیەوێت ئاینەکەی خۆی بگۆڕێت،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.کۆدەنگی زانایان.

**باسی دوەم/** دەربارەی کوشتنی ئافرەتی هەڵگەراوە لە دین،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ئەکوژرێت،بەڕای جمهور،بە بەڵگەی:

أ. وشەی **من** لە فەرمودەکەدا،هەردوو ڕەگەزەکە ئەگرێتەوە.

ب.فەرمودەکەی موعاز کاتێك پێغەمبەری خوا بۆ یەمەن دەینێرێت،پێی ئەڵێت: هەر پیاوێك لە دینی ئیسلام پاشگەز بوەوە،بانگی بکە. ئەگەر گەڕایەوە باشە. ئەگەر نا،لە ملی بدە.وە هەر ئافرەتێکیش لە دینی ئیسلام پاشگەز بوەوە،بانگی بکە. ئەگەر گەڕایەوە باشە،ئەگەر نا،لە ملی بدە.[1]

ج.إبن عباس وتویەتی: ئافرەتی هەڵگەڕاوە لە دین ئەکوژرێت.[2]

د.ئەبوبەکر لە سەردەمی خەلافەتیدا،ئافرەتێکی هەڵگەڕاوەی کوشت،وە هاوەڵانیش ئامادەبون،و هیچ کامیان ڕێگری لێ نەکرد.[1]

---

[1] حديث معاذ حين بعثه النبي صلى الله عليه وسلم إلى اليمن أنه قال له:أيما رجل إرتد عن الإسلام فادعه،فإن عاد وإلا فاضرب عنقه.وأيما إمرأة إرتدت عن الإسلام فادعها،فإن عادت وإلا فاضرب عنقها.وإسناده حسن.

[2] أخرج إبن المنذر عن إبن عباس أنه قال:تقتل المرأة المرتدة.

هەروەها إبن المنذر فەرمودەیەکی تری مرفوع ئەگێڕێتەوە دەربارەی کوشتنی ئافرەتی هەڵگەڕاوە،بەڵام فەرمودەکە لاوازە.

ڕای دوەم: ناکوژرێت،بەڕای حەنەفیەکان،بە هەڵگەی:

کاتێك پێغەمبەری خوا ئافرەتێکی بەکوژاویی بینی،پاش ئەوە ڕێگری کرد لە کوشتنی ئافرەتان. وە فەرموی: نەئەبوایە ئەم ئافرەتە شەڕی لە گەڵ بکرایە.[2]

بەڵام جمهور وەڵامی ئەدەنەوە کە: ڕێگریەکە لە کوشتنی ئافرەتێکە کە لە سەرەتاوە بێباوەڕ بوبێت،وەك لە چیرۆکی فەرمودەکەدا دەرئەکەوێت. کەواتە ڕێگریەکە تایبەتە بە کەسێك کە هەمان هۆکاری تیابێت،ئەویش شەڕ نەکردنیەتی.کەواتە هەر ئافرەتێك شەڕی لە گەڵ موسڵمانان نەکرد،نابێت بکوژرێت.کوشتنەکەش بۆ ئەو کەسەیە کە لە سەرەتاوە بێباوەڕەو خۆی بۆ شەڕ ئامادەکردوە لە گەڵ شەڕکەراندا.گشتگیری فەرمودەکە (بدل دینه) وەك خۆی ئەمێنێتەوە،بێ ئەوەی دژی هەبێت.وە بەڵگەی زۆریش پشتگیری ئەکات.

<u>باسی سێیەم/</u> دەربارەی مانای ئەو دین گۆڕینەی لە فەرمودەکەدا هاتوە،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ئەو کەسەش ئەگرێتەوە کە جولەکە بوەو،بوەتە گاور،یا هەر دینێکی تری جگە لە ئیسلام،جزیە بدات یان نا . ئەمەش ڕای شافعیەکانە.بە بەڵگەی: ڕەهایی وشەی بدل لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا.

ڕای دوەم: تەنها گۆڕینی دینی ئیسلام بە بێباوەڕی، ئەگرێتەوە.بەڕای حەنەفیەکان،بە بەڵگەی:

أ. هەرچەند فەرمودەکە بە ڕەهایی هاتوە،بەڵام کەسێکی بێباوەڕ موسڵمان بێت،ئەم ڕەهاییە نایگرێتەوە،واتە ناکوژرێت.

---

[1] أخرج إبن المنذر والدارقطني:أن أبابكر قتل إمرأة مرتدة في خلافته،والصحابة متوافرون، ولم ينكر عليه أحد.وهو حديث حسن.

[2] نهى الرسول ص عن قتل النساء لما رأى إمرأة مقتولة،وقال:ما كانت هذه لتقاتل. رواه أحمد.

ب.بێباوەڕان هەمویان یەك میللەتن. کەواتە مەبەست لە فەرمودەکە کەسێکە ئاینی ئیسلام بە ئاینێکی تر بگۆڕێتەوە.

ج.إبن عباس ئەیگێڕێتەوە بە مەرفوعی: کەسێك ئاینەکەی پێچەوانەی ئاینی ئیسلام بوو،لە گەردنی بدەن.[1] لێرەدا بەڕاشکاوی باسی دینی ئیسلام ئەکات.

**(١٥١).عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه،قال: قال رسول الله ( صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ ): خذوا عني خذوا عني،قد جعل الله لهن سبيلا،البكر بالبكر جلد مئة ونفي سنة،والثيب بالثيب جلد مئة والرجم.**

**لێم وەربگرن،لێم وەربگرن،خوای گەورە دەروی لێ کردونەتەوە: کوڕی ڕەبەن و کچ،سزاکەیان ١٠٠ دارو ساڵێك شاربەدەرکردنە.وە پیاوی هاوسەرداریش بەرامبەر ئافرەتی هاوسەردار،١٠٠ دارو بەردبارن کردنە.**

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح مسلم- كتاب الحدود باب حد الزنى – حديث : ٣٢٨٥

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** قد جعل الله لهن سبيلا، لەفەرمودەکەدا ئاماژەیەکە بۆ ئایەتی: ﴿أو يجعل الله لهن سبيلا﴾.النساء: ١٥ کە تیایدا ڕونی کردوەتەوە بەم حوکمە خوای گەورە دەروی لێکردونەتەوە.

باسی دوەم/ مەبەست لە البکر لای زانایان ئەو کەسەیە کە: ئازاد بێت و باڵغ بێت،و بەپێی گرێبەستێکی دروست جیماعی نەکەردبێت.

**باسی سێیەم/** وشەی البکر مەفهومەکەی لێرەدا مەبەست نیە.بەڵکو تەنها باسکردنی حاڵەتی زۆرینەیە.کەواتە جەڵد لە کەسی ڕەبەن ئەدرێت،ئەگەر لەگەڵ ڕەبەنێکدا زینا بکات ،یا لە گەڵ کەسێکی هاوسەرداردا بیکات. بە بەڵگەی:

---

[1] أخرج الطبراني من حديث إبن عباس مرفوعا :من خالف دينه دين الإسلام فاضربوا بعنقه.

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە (بالبكر)،ئەمەش حوکمی پیاوێکە کە زینا لە گەڵ کچێکدا بکات.

ب. بەسەرهاتی کەسە کرێگرتەکە: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا،سوێندت ئەدەم بەخوا،بە پێی قورئانی پیرۆز حوکممان بکە.ئەویش تریش کە دیاربوو لەو شارەزاتر بوو، وتی: بەڵێ،بە حوکمی قورئان بریار لەسەرمان بدە،و مۆڵەتم بدەرێ تا قسە بکەم. فەرموی: بڵێ.وتی: ئەم کورەی من لای ئەم پیاوە کرێکار بوو،لەگەڵ خێزانەکەیدا زینای کرد.پێیان وتم: ئەبێت کورەکەت بەردباران بکرێت.منیش بەرامبەر بە سەد سەر مەرو کەنیزەکێك لەگەڵی رێککەوتم. کاتێك پرسیارم لە زانایان کرد،پێیان وتم: کورەکەی من ئەبێت سەد داری لێبدرێت و ساڵێك شاربەدەر بکرێت،خێزانەکەی ئەویش بەردباران بکرێت.پێغەمبەری خوایش فەرموی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە،بە قورئانی پیرۆز حوکم ئەکەم لە نێوانتان: کەنیزەك و سەد مەرەکەت بۆ ئەگەرێتەوە،کورەکەشت سەد داری لێئەدرێت و،ساڵێك شاربەدەر ئەکرێت.ئەی ئونەیس تۆیش برۆ بۆ لای خێزانەکەی ئەو. ئەگەر دانی بە تاوانەکەدا نا،بەردبارانی بکە.[1]

ئەمەش حوکمی کەسێکە زینا لە گەڵ ئافرەتێکی هاوسەرداردا بکات.

---

[1] : إن رجلا من الأعراب أتى رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فقال : يا رسول الله ، أنشدك الله إلا قضيت لي بكتاب الله ، فقال الخصم الآخر : وهو أفقه منه نعم ، فاقض بيننا بكتاب الله وأذن لي ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " قل " ، قال : إن ابني كان عسيفا على هذا ، فزنى بامرأته ، وإني أخبرت أن على ابني الرجم ، فافتديت منه بمائة شاة ووليدة ، فسألت أهل العلم ، فأخبروني أنما على ابني جلد مائة ، وتغريب عام ، وأن على امرأة هذا الرجم ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " والذي نفسي بيده ، لأقضين بينكما بكتاب الله ، الوليدة والغنم رد ، وعلى ابنك جلد مائة ، وتغريب عام ، واغد يا أنيس إلى امرأة هذا ، فإن اعترفت فارجمها " ، قال : فغدا عليها ، فاعترفت ، فأمر بها رسول الله صلى الله عليه وسلم فرجمت. صحيح مسلم - كتاب الحدود باب من اعترف على نفسه بالزنى - حديث : ٣٢٩٦

**باسی چوارەم/** دەربارەی شار بەدەرکردنی ساڵێك بۆ کەسی رەبەن،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم:پێویستە ساڵێك شاربەدەر بکرێت. ئەمەش تەواوکاریەکە بۆ سزاکەی. ئەمەش ڕای چوار خەلیفەکەو مالك وشافعی واحمد وإسحاق وزەید بن عەلی وإبن ابی لەیلاو ثوریە. هەندێك زاناش ئەڵێن کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.بەبەڵگەی:

ا،فەرمودە باسلێکراوەکە. ونفي سنة.

ب.فەرمودە پێشوەکەی کەسە کرێگرتەکە.

ڕای دوەم: شاربەدەر کردن واجب نیە،بەڕای حەنەفیەکان وهادەوی وقاسمیەکان. بەڵگەی حەنەفیەکانیش بریتیە لە:

یەکەم: لەئایەتەکەی سورەتی نور دا باسنەکراوە،کەواتە شاربەدەرکردن زیادکردنە لە دەقەکە. وە بە فەرمودەی ئاحاد گێڕدراوەتەوە،ئەویش ئیشی پێناکرێت،ونەسخی حوکمیش ناکات.

وەڵامیان دراوەتەوە بەم شێوەیە:

أ.فەرمودەکە بەناو بانگە،لەبەر زۆری گێڕانەوەکانی و،زۆری ئەو هاوەڵانەی ئیشیان پێکردوە. حەنەفیەکانیش بە هاوشێوەی ئەو، بەڵکو کەمتریش ئیشیان کردوە،وەك شکاندنی دەستنوێژ لە پێکەنینی قاقا،وە ڕەوایەتی دەستنوێژگرتن بە نبیذ،وە زۆری تر کە حوکمێکە لە قورئاندا نیە،ئەم حوکمەش وەك ئەوانە.

ب.إبن المنذر ئەڵێت: لە بەسەرهاتی کرێگرتەکەدا پێغەمبەری خوا سوێندی خوارد کە بە پێی قورئان حوکم ئەکات.پاشان فەرموی: کوڕەکە ئەبێت سەد داری لێبدرێت،وساڵێك شاربەدەر بکرێت،پێغەمبەری خوایش ڕونکەرەوەی قورئانە.

ج.عومەری کوڕی خەتاب لە سەر مینبەر وتاری داو باسی شاربەدەرکردنی کرد.

دوەم: کاتێـك طحـاوي لاوازی بەڵگـەی حەنەفیـەکانی بینی،ئـەم وەڵامـەی دایەوە:

فـەرمودەی شـاربەدەرکردن نەسـخ بۆتـەوە بـە فـەرمودەی: ئەگـەر کـەنیزەکی هـەر کەسێك لـە ئێـوە زینـای کرد،با دارکاری بکات.پاشان لـە سـێیەم جـاردا فـەرموی: بـا بیفرۆشـیت.[1] فرۆشتنیـشی مانـای شـاربەدەرکردن ناهێڵێـت.ئەگـەر کـەنیزەك شـاربەدەر نـەکرێت،ئافرەتی ئـازادیش بـە هـەمان شێوەیە،چـونکە وەك ئـەوە. ئـەم نەسـخەش دوپـات ئەبێتـەوە بـە فـەرمودەی: ئـافرەت نابێـت سـەفەر بکـات لـە گـەڵ مـەحرەمی خۆیـدا نـەبێت.[2] ئەگـەر شاربەدەرکردن لەسەر ئافرەت لابرێت،لەسەر پیاویش لائەبرێت.

بەم شێوەیە وەڵامی دراوەتەوە:

أ.لاوازیـەك لـە ڕاکەیـدا هەیە،چـونکە لەسـەر ئـەوە بینـا کـراوە کـە: وتـەی گـشتگیر ئەگـەر تایبـەت کرا،نابێتـەوە بـە بەڵگە،ئەمـەش لـە زانـستی اصـول الفقه دا لاوازە.

ب.کـەنیزەك لـە بڕیـاری شـاربەدەرکردنەکەدا تایبـەت کراوە،لەکاتێکـدا حـوکمی فەرمودەکـە بـۆ نێـرو مێیـە،وبۆ کۆیلـەو کەنیزەکـە.بـەڵام کـەنیزەکی لێ بەدەرکراوە،وئەوانی تر لە حوکمەکەدا ماون.

سێیەم: هادەویە وتەی مهدی لە کتێبی البحردا ئەکەنە بەڵگە،کە ئەڵێت: ئـەڵێم: شـاربەدەرکردن سـزایە نـەك حەد،چـونکە عـەلی وتویـەتی: لێـدانی سـەد جەلـدەو یـەك سـاڵ دەستبەسـەرکردن.وە لەبـەر ئـەوەی عمـر لەخواردنـەوەی ئارەقـدا خـەڵکی شـاربەدەرکردوەو،ئینکاریش نەکراوە،پاشـان وتویـەتی: ئـیتر کەسـی تـر شـاربەدەر ناکەم،سـزاکانیش لاناچن لەسەر کەس.

---

[1] إن زنت أمة أحدكم فليجلدها. ثم قال في الثالثة: فليبعها.

[2] لا تسافر المرأة إلا مع ذي محرم.

وەڵامی ئەم قسەیەی مەهدیش دراوەتەوە بە:

أ.وتەکەی عەلی پشتگیری ڕای جەماوەر ئەکات،چونکە زیندانی کردنی خستۆتە بری شاربەدەرکردن،کە ئەویش جۆریکە لەشاربەدەرکردن.

ب.شاربەدەرکردنی عومەر لە خواردنەوەی ئارەقدا،ڕایەکی خۆی بوە،زیاد لە سزاکەی خۆی.پاشان بەڕای خۆی وای بینیوە کە هیچ کەس شاربەدەرنەکات بێ بونی دەق. شاربەدەرکردنیش بە هۆی زیناوە بە دەقە،ولە پێشەوا عەلیش ئەگێڕدرێتەوە.

**باسی پێنجەم/** دەربارەی شاربەدەرکردنی کچێك زینا بکات،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: شاربەدەر ئەکرێت،بەڕای شافعی. بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: شاربەدەرناکرێت،بەڕای مالك وئەوزاعی،لە عەلیش ئەگێڕدرێتەوە،بە بەڵگەی:

أ.چونکە ئافرەت عەورەتە.

ب.دەرکردنی ئافرەت،توشی خراپەی ئەکات،لەبەر ئەوەشە کە ڕێگری لێکراوە لە سەفەرکردن ئەگەر کەسێکی مەحرەمی لە گەڵ نەبێت.

**باسی شەشەم/** دەربارەی ئەندازەی شار بەدەر کردنەکە،وتراوە:

کەمترینیان: ئەو ماوەیەیە کە نوێژی تیا کورت ئەکرێتەوە،هەتا بە کەسێکی ڕێبوار دابنرێت. عمر لە مەدینەوە خەڵکی بۆ شام شار بەدەرکردوە،عوسمانیش بۆ میسر،إبن عومەریش کەنیزەکەکەی خۆی بۆ فەدەك دورخستۆتەوە. هەرکەسێکیش وڵاتی نەبوو،لەو شوێنە دور ئەخرێتەوە کە تاوانەکەی تیا ئەنجاداوە.

**باسی حەوتەم/** الثیب کەسێکە لەهاوسەرگیریەکی دروستدا جیماعی کردبێت،هەروەها کەسێکی ئازادو باڵغ وژیر بێت.ئەم حوکمە بۆ ئافرەتیشە.

**باسی هەشتەم/** دەربارەی سزای کەسی هاوسەردار ،چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەکـەم: جەڵدلێـدان وبـەرد بارانکردنیەتی،ئەمـەش ڕای عەلیـە.حـازمی ئـەڵێت: أحمـد وإسـحاق وداود وإبـن المنـذر،ئـەم ڕایـەیان هەیە،هـەروەها مەزهەبی هادەویەکانیشە.بەبەڵگەی:

ا.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: تـەنها بـەرد بـاران ئەکرێت،وهـەردوو سـزاکەی بەسـەردا نادرێت،بـەڕای مالـك وشـافعیەکان وجمهـوری زانایـان ولـە أحمـدیش ئەیگێڕنەوە.بە بەڵگەی:

ا. فـەرمودە باسـلێکراوەکە بـە فـەرمودەی مـاعزو غامدیـەو ئافرەتـە جولەکەکـە نەسـخ بۆتـەوە.چـونکە پێغەمبـەری خـوا ئەوانـەی بـەردباران کـرد.کـەس نەیگێڕاوەتـەوە کـە بـەدار لێیـان درابێـت.وە فەرمودەکـەی عبادەش لە پێشتردا وتراوە.

شـافعی ئـەڵێت: کەواتـە سـوننەت ئەوەیـە کـە لێـدانی دار لەسـەر ڕەبـەن ماوەو،لە سەر بێوەژن و بێوەپیاو نەماوە.

وەڵـام دراوەتـەوە کـە: نـە لـە بەسـەرهاتی مـاعزو ،نـە ئـەوانی تریـشدا ئەگـەر دواتـریش ڕویـان دابێت،تیـای نیـە کـە کەسـی بـەردباران کراو،بـەدار لێـی نـەدرابێت. لەوانەیـە هـۆی باسـنەکردنەکەی ئـەوە بێـت کـە حوکمەکـە زۆر ئاشکرا بوە.وئەصڵ بوە.

شـافعی ئـا بـەو شـێوەیەی کـە لێـرەدا باسـکراوە، وەڵـامی ئەوانـە ئەداتـەوە کـە عـومرە بـە واجـب دانـانێن، بـە بەڵگـەی ئـەوەی کـە: پێغەمبـەری خـوا فـەرمانی حـەج کردنـی لـەبری بـاوکی بـەو کەسـە داوە کـە پرسـیاری لێکـردوەو باسـی عـومرەی نـەکروە.وەڵـامی شـافعیش ئـەوەبوە کـە: بێـدەنگ بـون لێـی مانـای واجـب نـەبون ناگەیـەنێت. بـەڵام لەوانەیـە بوترێـت: جەڵـد کردنـی ئـەو پێـنج کەسـەی کـە پێغەمبـەری خـوا بـەردبارانی کردن،ئەگـەر ڕوبیدایە،بـەدور ئـەزانرێت کـە هـیچ کـام لـە ئامـادەبوان نەیگێڕنـەوە. لەگـەڵ

ئەوەدا کە کەسانێکی زۆر ئامادەی بەردباران کردنەکە بون. کەواتە باس نەکردنی لە هیچ ڕوایەتێکی ڕوداوەکەدا کە بەچەند شێوازیکی جیا گێڕدراونەتەوە،گومانی واجب نەبونی بەهێزتر ئەکات.

ب.کردارەکەی عەلی کە هەردوو سزای جەلد و بەردبارانەکەی کۆکردەوە،ئەوە دیارە لەوەدا کە ڕای خۆی بوە.چونکە وتویەتی: بەپێی وتەی خوا جەلدم لێدان و،بە پێی سوننەتی پێغەمبەری خواش بەرد بارانم کردن. کەواتە ناکرێت بڵێین حوکمەکەی تەوقیفیەو ڕای خۆی نیە.

وەڵامی دراوەتەوە کە: لە وتەکەیدا کە ئەڵێت: وە بە پێی سوننەتی پێغەمبەری خوا..ئەوە ئەگەیەنێت کە توقیف ەو ڕای خۆی نیە.

ڕای سێیەم: وەستان لەو حوکمەداو بڕیارنەدان لەسەری. ئەمەش ڕای صەنعانیە،کە ئەڵێت:

وتم: شاراوە نیە بەهێزی بەڵگەی فەرمودەکەی عبادە لەسەر بونی سزای جەڵدەلێدانی کەسی هاوسەردار،وپاشان بەردباران کردنی. شاراوەش نیە کە پێغەمبەری خوا کەسێکی بەردباران کردبێت،جەڵدەی لێنەداوە. کەواتە من لەم بڕیارەدا ئەوەستم هەتا خوای گەورە لەسەر ڕایەك ڕاوەستاوم ئەکات وئەویش باشترین دەروکەرەوەیە.من لە کتێبی منحە الغفاردا بەهێزی ئەو ڕایەم باسکردوە کە ئەڵێت : هەردوو سزاکە هەیە،بەڵام لێرەدا هیچ ڕایەکم دەربارەی نیە.

**(١٥٢). عـن إبـن عبـاس رَضـيَ اللّـهُ عَنهُمَـا قـال: لَعَـنَ رَسُولُ الله (صَلّى اللهُ عَلَيـه وَسَـلَم) المُخَنَّـثِينَ مِـنَ الرِّجَـالِ وَالمُتَرَجِّلَـات مِـنَ النِّـسَاءِ،وَقَالَ: أخرِجُـوهُمْ مِـنْ بُيوتِكُمْ..**

پێغەمبـەری خـوا نـەفرەتی لـەو پیاوانـە کـردوە کـە ڕەفتـاری ژنانـە ئـەنوێنن،وە ئەوئافرەتانـەش کـە ڕەفتـاری پیاوانـە ئـەنوێنن، وە فەرمویەتی: لەماڵەکانی خۆتان دەریان بکەن.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** صـحیح البخـاري ، کتـاب اللبـاس بـاب إخـراج المتشبهین بالنساء من البیوت - حدیث : ٥٥٥٤

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** نـەفرەت کـردن لـەکردارێکی خراپ،بەڵگـەی گـەورەیی ئـەو تاوانەیە.

**باسـی دوەم/** مخنـث لەپیاواندا،کەسـێکە لەهەڵـسوکەوت و قـسە وتایبەتمەندیـەکانی ئافرەتانـدا، وەك ئـەوان خـۆی ئـەنوێنێت. مەبەسـتیش کەسێکە خۆی والەخۆی بکات،نەك وا دروستکرابێت.

المترجـلات لەئافرەتاندا،ئەوانـەن خۆیـان بـەپیاوان ئەشـوبهێنن. لـە لێکدانەوەیەکدا کە ابوداود ئەیگێڕێتەوە،واهاتوە.

**باسی سێیەم/** لەبارەی مانای نەفرەت کردن لە فەرمودەکەدا،دوو ڕا هەیە:

یەکـەم: مانـای حـەرامبونی خۆشـوبهاندنی پیـاوان بـەئافرەتان و بەپێچەوانەوە ئەگەیەنێت.

دوەم: ئەو مانایە ناگەیەنێت،بە بەڵگەی:

پێغەمبـەری خـوا ڕێـی بـە نێرەمـوك ئـەدا کـە سـەردانی ئافرەتـان بکـەن. تـەنها ئەوانـەیانی شـاربەدەرئەکرد کەئەیبیـست وەسـفی جوانیـەکانی ئافرەت ئەکەن،بەشێوەیەك تەنها کەسانی باڵغ ئەتوانن واوەسفی بکەن.

صەنعانی ئەڵێت: لەوانەیە کاتێك ڕێی بەوانەداوە بێنەلای ئافرەت، چونکە وادروستکراون،نەك خۆیان والیّ ئەکەن.

**باسی چوارەم/** ئەوجۆرە کەسانە شاربەدەرئەکرێن،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی باسلێکراو.

ب.فەرمودەی ابوهریرە:پیاوێکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر کەوەك ئافرەت هەردوو دەست وقاچی لەخەنەگرتبوو.پێغەمبەری خوا فەرموی: ئەمە چیەتی؟ وتیان: خۆی بەئافرەتان ئەشوبهێنێت.پاشان فەرمانی کرد بۆ النقیع دوری بخەنەوە. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا نایکوژیت؟ فەرموی: ڕێگریم لێکراوە نویژکەران بکوژم.[1]

ج.پێغەمبەری خوا ئافرەتێکی دەرکرد (خۆی بەپیاوان ئەشوبهاند)، عومەریش پیاوێکی دەرکرد.[2]

د.فەرمودەی الواثلة بن الاسقع:پێغەمبەری خوا ئەوانەی دەرئەکرد.[3]

ه.ابوبکر مخنث یکی دەرکرد،هەروەها عومەر یش.[4]

---

[1] أتي رسول الله صلى الله عليه وسلم بمخنث قد خضب يديه ورجليه بالحناء،فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ما بال هذا؟قالوا:يتشبه بالنساء.فأمر به فنفي إلى النقيع.فقيل:يا رسول الله،ألا تقتله؟ قال:إني نهيت أن أقتل المصلين.رواه أبو داود.

[2] أخرج النبي صلى الله عليه وسلم فلانة،وأخرج عمر فلانا.رواه أحمد والبخاري.

[3] أن النبي صلى الله عليه وسلم أخرج الخنيث. أخرجه الطبراني

[4] أخرج أبوبكر مخنثا،وأخرج عمر واحدا أيضا. رواه البيهقي

**(١٥٣). عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): إِدْفَعُوا الحُدُودَ مَا وَجَدْتُمْ لَهَا مَدْفَعاً..**

چەندە ئەتوانن ڕێگری لە سزاكان بكەن.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە//** ابـن ماجةوترمـذي والحـاكم. سـنن ابـن ماجـه – كتـاب الحـدود بـاب السـتر علـى المـؤمن ودفـع الحـدود بالـشبهات – حـديث : ٢٥٤١[1]

**سەرباسەكان//**

ســـزاكان بـــەگومانێك لائـــەبرێن كـــە بگونجێـــت ڕوبـــدات: وەك بڵێـــت زۆرم لێكراوە،یـــا بەخـــــەوتوی چـــوەتە لای ئافرەتێك،لەبەرئـــــەوە قـــــسەكەی وەرئـــەگیرێت وســـزاكەی لەســـەر لائـــەبرێت. داوای بەڵگەشـــی لێناكرێـــت بـــۆ ڕاستی داواكەی،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێكراوەكە.

ب.لـــەكاتی عومـــەردا: بیـــانوی بـــۆ كەســـێك هێنایـــەوە كەلەشـــام زینـــای كـــرد بوو،نەزانینی حەرامبونی كردە بیانوو.بیهقی وعبدالرزاق ئەگێڕنەوە.

ج.هـــەروەها لـــە عمـــر وعوسمـــانیش گێڕاوەتـــەوە كـــە: كیژۆڵەیـــەكی غـــەیرە عـــەرەب زینـــای كردو،وتـــی نـــەمزانیوە حەرامە،ئـــەوانیش بیانوەكـــەیان وەرگرت.

---

[1] ضعفه الألباني في ضعيف إبن ماجه(٥٠٢).

**(١٥٤). عـن إبـن عمـر رَضِـيَ اللّـهُ عَنهُمَـا قـال: قـال رسـول الله( صَـلّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَمَ): إجتَنِبـوا هَـذه القـاذُورَات الـتي نَهَـى اللهُ عَنهَـا،فَمَنْ ألَـمَّ بِهَـا فَليَـستَتِر بِستر الله،وَليَتُبْ إلَى الله،فَإنَّهُ مَنْ يُبْدِ لَنَا صَفحَتَهُ نقم عَلَيه كِتَابُ الله عَزّوَجَلّ..**

لەوگوناهــە پیسانە دورکەونەوەکــە خــوارێگری لێکــردون. کەسـێك توشــی ئەوانــەبوو،با داپۆشـێت وتەوبــەبکات، چــونکە کەســێك خــۆی ئاشــکرا بکات لامان،سزای تۆمارکراوی لەقورئاندا بەسەر جێبەجێ ئەکرێت.

**گێــڕەرەوەی فەرمودەکــە//** حـاکم. موطـأ مالـك – کتـاب المـدبر \باب مـا جـاء فیمن اعترف علی نفسه بالزنا – حدیث : ١٥٠٦

**مانــــای وشــــەکان//** القـاذورات: مەبەسـتی کردارێکـی قێـزەون و وتەیـەکی خراپــە کــە خــوای گــەورە ڕێگــری لێکردبێــت. أبــدی صــفحته: ڕاســتی ڕوداوەکەی خۆیمان بۆ بگێڕێتەوە.

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکــــەم/** فەرمودەکــە بەڵگــەی ئەوەیــە کــە: هەرکەسـێك تــاوانێکی کرد،پێویــــستە لەســــەری بیــــشارێتەوەو،بەدانپێدانان خــــۆی ئاشــــکرا نەکات،وە پەلەبکات لە تەوبەکردن.

**باســـی دوەم/** ئەگــەر کەســەکە لای پێــشەوای موســڵمانان خــۆی ئاشــکرا کرد،لەســــەر پێــــشەوا پێویــــستە ســــزای بەســــەردا جێبــــەجێ بکرێــــت. بەبەڵگەی:

١. فەرمودە باسلێکراوەکە

فەرمودەی: لەنێوان خۆتاندا گوناهەکان بشارنەوە. چونکە هەرتاوانێك بگات بە من،سزاکەی بەسەردا جێبەجێ ئەکەم.[2]

[1] صححه الألباني في صحيح الجامع (١٤٩).

[2] أخرجه أبوداود مرفوعا: تعافوا الحدود فيما بينكم،فما بلغني من حد فقد وجب.

**(١٥٥). عن عائشة رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا قال: لما نزل عذري، قام رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ، فَذَكَرَ ذلِكَ، وَتَلاَ الْقُرْآنَ، فَلَما نزل أمر برجلين وامرأة، فضربوا الحد.** کاتێك هەواڵی پاکی من هاتەخوار، پێغەمبەری خوا لەسەر مینبەر هەستا، ئەوەی باسکردوو، قورئانی خوێندەوە. کە دابەزی لەسەر مینبەر، فەرمانی دا داری حەد لە دووپیاو، وە ئافرەتێك بدرێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** احمد، چوار کەسەکە، بوخاریش ئاماژەی پێداوە.

**مانای وشەکان//** القذف: لە زمانی عەرەبیدا واتە: تۆمەتبارکردن بە شتێك، لە شەرعیشدا واتە: تۆمەتبارکردن بە زینا کە سزا لە سەری تۆمەت بۆکراوەکە ئەسەپێنێت. نزل عذري: بێ تاوانیم لەو وتانەی أهل الإفك بۆیان هەڵبەستبوم. تلا القرآن: واتە لە ئایەتی: إن الذين جاءوا بالإفك...النور:١١ تا کۆتایی ١٨ ئایەت. رجلين: دوو پیاوەکە حسان بن ثابت ومسطح بون. إمرأة: حمنەی کچی جحش.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** سزای بوختان کردن لە قورئان و فەرمودەکانیشدا باسکراوە، لەو بەڵگانەش:

١. ئایەتی: ﴿والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعة شهداء..﴾ {النور:٤}.

٢. فەرمودە باسلێکراوەکە.

٣. کۆدەنگی زانایان.

**باسی دوەم/** کۆدەنگن لەوەدا کە سزاکەی هەشتا دارە. بە بەڵگەی: دەقی قورئانی پیرۆز.

**باسی سێیەم/** ڕوکەشی فەرمودەکە ئەوە ئەگەیەنێت کە: تەنها ئەو سێ کەسە تۆمەتیان بۆ عائشە دروست کردوە. پێغەمبەری خوایش سزاکەی بەسەریاندا جێبەجێ کرد.

**باسی چوارەم/** ئاشكرایه كه عبدالله بن أبی بن سلول بوختانەكەی دروستكردوو ،تاوانه گەورەكه له ئەستۆی ئەودایه،ئایا پێغەمبەری خوا سزاكەی بەسەردا جێبەجێ كرد؟ دوو ڕا هەیه لەو بارەیەوە:

ڕای یەكەم: سزای بەسەردا جێبەجێ نەكرد،وەك إبن القیم باسی كردوە. چەند هۆكارێكیش باس ئەكات بۆ جێبەجێ نەكردنی سزاكه لەلایەن پێغەمبەری خواوە.

ڕای دوەم: سزاكەی بەسەردا جێبەجێ كراوە،وەك حاكم له كتێبی الإكليل دا باسی كردوە.

بەڵام وتەكەی ماوردی كه ئەڵێت: پێغەمبەری خوا سزای به سەر هیچ كام لەوانەدا جێبەجێ نەكرد كه تۆمەتەكەیان بۆ عائشه دروست كردبوو. هۆكارەكەشی باس ئەكات كه سزا یا به بەڵگه یا به دانپێدانان جێبەجێ ئەكرێت.

وەڵامی وتەكەی دراوەتەوە كه: بەدەقی قورئان سزاكه له سەریان واجب بوە.سزای تۆمەت دروستكەریش بەوە بەسەریدا ئەسەپێت كه تۆمەتێكی ڕاست نەبێت. وبۆ ئیسپاتكردنیشی پێویستی به بەڵگه نیه.

صەنعانی ئەڵێت: وتم : شاراوە نیه كه قورئان هیچ كامی له تۆمەت دروستكەرەكان دەستنیشان نەكردوە.لەوانەشه مەبەستی صەنعانی ئەوەبێت كه لەكاتی لێكدانەوەی ئایەتەكاندا.چونكه ئەوە سابت بوە كه تاوانبارە گەورەكه عبدالله كوڕی أبی بوە،وە **مسطحيش** یەكێك بوە له تۆمەتباران.هەر ئەویشه كه لەم ئایەتانه دا باسكراوە: ﴿ولا يأتل أولوا الفضل منكم والسعة أن يؤتوا أولي القربى.﴾..(النور:٢٢).

( ١٥٦ ). ١.عـن عائـشةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنهَـا قالـت: قـال رسـول الله ( صَـلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ ): لا تقطع يد السارق إلا في ربع دينار فصاعدا...

دەستی دز بەرامبەر دزینی چارەکە دینارێك وزیاتر ئەبردرێت.

٢.عـن عائـشةَ رَضِـيَ اللّـهُ عَنهَـا: إقطعـوا في ربـع دينـار،ولا تقطعـوا فيمـا هـو أدنـى من ذلك.

بەدزینی چارەکە دینارێك،دەست ببڕن ولەوە کەمتر مەیبڕن.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکــە//** ١. صـحيح البخـاري - كتـاب الحـدود بـاب قـول الله تعـالى : والـسارق والـسارقة فـاقطعوا أيـديهما وفي كـم - حـديث : ٦٤١٩ صـحيح مـسلم - كتـاب الحـدود بـاب حـد الـسرقة ونـصابها - حـديث : ٣٢٧٦.دەقی فەرمودەکەش لای موسلیمە.

٢. مـسند أحمـد بـن حنبـل - مـسند الأنـصار الملحـق المـستدرك مـن مـسند الأنـصار - حـديث الـسيدة عائـشة رضـي الله عنهـا حـديث : ٢٣٩٥٨

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکــەم/** واجـب بـونی سـزای دزیکـردن لـە قورئـان وفەرمودەشـدا باسکراوە:

أ.ئایـەتی:﴿والـسارق والـسارقة فـاقطعوا أيـديهما﴾{المائـدة:٣٨} .

واتە:پیاوو ئافرەتی دز،دەستیان ببڕن.

ب.چەندەها فەرمودەش باسکراوە،لەوانەش فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باســـی دوەم/** دەربـارەی بـڕی ئـەو ماڵـەی کـە سـزاکەی بـۆ جێبـەجێ ئەکرێت،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکـەم: پێویـستە بگاتـە بـڕی دیاریکراوو،بـەڕای جمهـوری سـەلەف وخەلـەف، لەوانەش چوار خەلیفەکە.بەبەڵگەی: ئەو فەرمودانەی باسکراون.

ڕای دوەم: بڕی دیاریکراوو مەرج نیە.کەواتە ماڵە دزراوەکە کەم بێت یا زۆر،سزاکەی لەسەرە. بەڕای حەسەن وظاهريةو خەواریج. بەبەڵگەی:

أ.ڕەهایی ئایەتەکە: السارق والسارقة...

وەڵام دراوەتەوە کە: ئایەتەکە ڕەهایە لە جۆری شتە دزراوەکەو بڕەکەی،وە فەرمودەکەش ڕونکردنەوەی جۆرو بڕەکەیە.

ب.فەرمودەی: لەعنەتی خوا لە دز بێت. کڵاوی سەر ئەدزێت ودەستی ئەبڕدرێت.وە پەتێکیش ئەدزێت و دەستی ئەبڕدرێت.[1]

وەڵامی دراوەتەوە کە: مەبەست لە فەرمودەکەدا بڕینی دەستی دزەکە نیە،بەڵکو پێمان ئەڵێت کە: دز سوکەو ئەو ماڵەش کە ئەیدزێت،بێ نرخەو دۆڕاوە تیایدا.چونکە ئەگەر دزینی ئەم شتە بێ نرخانە ببێتە خوو بۆی،جورئەتی زیاتر ئەبێت و لەوە زیاتر ئەدزێت ، کە ئەبێتە هۆی بڕینی دەستی. کەواتە با لەدزینی ئەم بڕە کەمە وریا بێت،تا نەبێتە خوو بۆی و،لەوە زیاتر بدزێت.خەتابی وپێش ئەویش إبن قتيبە ئەمەیان باسکردوە.

صەنعانی ئەڵێت: هاوشێوەی ئەم فەرمودەش ئەم فەرمودانەیە:

فەرمودەی: هەرکەسێك بۆ خودا مزگەوتێك دروست بکات بەئەندازەی کولانەیەك..[2] وە فەرمودەی: خێر بکە ئەگەر بە سمی وڵاخێکیش بێت.[3]

ئاشکرایە کە نە کولانە نە سمی ولاخەکە بۆ بەخشین ناشێن.چونکە سودیان لێ وەرناگیرێت. کەواتە مەبەستی پێغەمبەری خوا تەنها زیادە ڕەوی کردن بوە لە ترساندندا.

---

[1] أخرج البخاري من حديث أبي هريرة رضي الله عنه أنه قال: لعن الله السارق يسرق البيضة فتقطع يده،ويسرق الحبل فتقطع يده.

[2] من بنى لله مسجدا ولو كمفحص قطاة.

[3] تصدقي ولو بظلف محرق.

**باسی سێیەم/** دوای ئەوەی کە جمهور لەوەدا یەکڕا بون کە ماڵە دزراوەکە پێویستە بگاتە بڕێکی دیاریکراو،تا سزاکە ئەنجام بدرێت،بەڵام لە سەر ئەو بڕە دیاریکراوە نزیکەی بیست ڕایان هەیە. تەنها دوو ڕایان بەڵگەی هەیە:

ڕای یەکەم: ئەبێت بگاتە چارەکە دینارێک ئاڵتون وسێ درهەم زیوو. ئەمەش ڕای زانایانی حجازو هەروەها شافعیە،بە بەڵگەی:

أ. فەرمودە باسلێکراوەکە،کە ڕونکرنەوەی ئایەتەکەیە. فەرمودەکەش دەقە لە باسکردنی چارەکە دیناردا.

ب.فەرمودەی إبن عمر: پێغەمبەری خوا لە بەرامبەر دزینی قەڵغانێکدا دەستی بڕی ،کە نرخەکەی سێ درهەم بوو.[1] ئەڵێن: سێ درهەمیش ئەکاتە چارەکە دینارێك.

شافعی ئەڵێت: ئەگەر سێ درهەم نرخەکەی چارەکە دینار نەبوو،نابڕدرێت. ئەم فەرمودەیەش ئەکاتە بەڵگە کە إبن المنذر ئەیگێڕێتەوە: دزێکیان هێنایە لای عوسمان کە ...دزیبوو بایی سێ درهەم بوو کە لەو کاتەدا دینارێك دوانزە درهەم بوو،ئەویش دەستی بڕی.[2]

هەروەها هەر لە إبن المنذرەوە ئەیگێڕێتەوە کە: عەلیش بەرامبەر دزینی چارەکە دینارێك کە ئەیکردە دوو درهەم ونیو،دەستی بڕی.[3]

شافعی ئەڵێت: چارەکە دینار ئەکاتە سێ درهەم.چونکە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا دینارێك دوانزە درهەم بوە. هەروەها دوای ئەویش هەر وابوە. بۆیە خوێنبایی بە دوانزە هەزار درهەم و هەزار دیناری ئاڵتون مەزەندە کراوە.

---

[1] أن النبي ص قطع في مجن قيمته ثلاثة دراهم. متفق عليه.

[2] أتي عثمان سارق سرق أترجة،قومت بثلاثة دراهم من حساب الدينار بإثني عشر فقطع.

[3] أن عليا رضي الله عنه قطع في ربع دينار كانت قيمته درهمين ونصفا.

ڕای دوەم: تــەنها لــە دە درهەمــدا ســزاکە جێبــەجێ ئــەکرێت. لــەوە کــەمتر جێبــەجێ ناکرێــت.ئەمــەش ڕای هادەویــە وزۆرینــەی زانایــانی عــیراق وسفیانی ثه وریە،بەبەڵگەی:

یەکـەم: لـە صـەحیحەین دا هـاتوە کـە:پێغەمبـەری خـوا بـەدزینی (مجـن) یـك دەستی بڕیوە.[1]

إبن عباس ئەیگێڕێتەوە کە: نرخی مجن لەو کاتەدا بە دە درهەم بوە.[2]

هـەروەها لـە ڕیوایـەتێکی تـری إبـن عمـردا هـاتوە کـە نرخـی مجـن ....... سـێ درهــەم بــوە[3]. بــەڵام ئەمــە پێــچەوانەی ڕیوایەتەکــەی تــری بوخــاری وموسلیمە.

صەنعانی لە وەڵامی ئەم ڕایەدا ئەڵێت:

١.ئــەو ڕیوایەتانــەی کــە نرخــی مجــن دیــاری ئەکــەن نــاکۆکن: هەنــدێکیان سێ درهەم وهەندێك دە وهەروەها نرخی تریش باسکراوە.

ڕیوایــەتی چــارەکە دینــاریش لــە گێڕانــەوەی عائــشە کــە متفــق علیــە یــە،وە ڕیوایــــەتی إبــــن عمــــریش بــــە هــــەمان شــــێوە،فەرمودەکانی تــــر نــــاتوانن بەرامبــەریان بوەستن،چــونکە لاوازی لــە ســەنەدیان هەیــەو مەتنەکانیــشیان دژ بە یەکە.

٢.ئــەو ڕیوایەتــەی لــە إبــن إســحاقەوە هــاتوە کــە بــە دە درهــەم مەزەنــدەی ئــەکات،وە لــە ڕێگــەی عــەمربن شــعیبە وە هــاتوە کــە قــسەی زۆری لــە ســەرە. هەرچەندە ڕەخنە لە إبن إسحاق ناگرین وبەلاوازی دانانێین.

---

[1] ثبت في الصحيحين من حديث إبن عمر: أنه ص قطع في مجن.

[2] أخرج البيهقي والطحاوي من حديث إبن عباس: أنه كان ثمن المجن على عهد رسول الله ص عشرة دراهم.

[3] ثبت في الصحيحين من حديث إبن عمر:أن قيمة المجن ثلاثة دراهم.

دوەم: پێویستە إحتیاط بکەین لە بڕینی دەستیاو بە دزینی زۆرترین بڕ، بیبڕین کە یەقینمان هەبێت پێی. چونکە بڕینی ئەندامێکی لەشە،کە حەرامە بێ هۆ ببڕدرێت.

بەڵگەی سوفیانی سەوریش کە خاوەنی ئەم رایەیە وەك إبن العربی ئەڵێت،ئەوەیە کە:

بڕینی دەست بە کۆدەنگی زانایان حەرامە ونابڕدرێت بەرامبەر بڕێك کە کۆدەنگی لە سەر نەبێت. دە درهەمیش کۆدەنگی لەسەرە،کەواتە بەو بڕەوە پابەند ئەبین،نەك کەمتر.

بەڵام صەنعانی وەڵامی ئەداتەوەو ئەڵێت: لە دوای هاتنی بەڵگەوە إحتیاط لە شوێن کەوتنی بەڵگەکەدایە نەك شتی تر.

<u>باسی چوارەم/</u> ئایا بە کامیان بڕەکە دیاری ئەکرێت،بە ئاڵتون یا زیوو؟ چەند رایەك هەیە:

رای یەکەم: بە درهەم بڕەکە دیاری ئەکرێت،نەك بە چارەکە دینار،واتە ئەگەر وەك یەك نەبون. بۆ نمونە: ئەگەر کردیە دوو درهەم.ئەمەش رای مەشهوری مالکەو،أحمدیش هەمان رای هەیە.

رای دوەم: ئاڵتون بناغەیە لە نرخاندنی شتەکاندا.ئەمەش رای شافعیە،وە رای أبو ثورو ئەوزاعی وداودە.چونکە ئاڵتون بناغەی هەمو کانزاکانە.

خەتابی ئەڵێت: چونکە لەسەر پارە کۆنەکان ئەنوسرا: دە درهەم بە حەوت مسقاڵ. بۆیە درهەم بەدینارەوە ناسرا.

هەتا شافعی ئەڵێت: ئەگەر سێ درهەم نەیکردە چارەکە دینارێك،دەست نابڕدرێت.

صەنعانی ئەڵێت: ئەم دوو رایە بەڵگەیان هەیە.رای تریش هەیە کە بێ بەڵگەن ،وپێویستە خۆمانی پێوە سەرقاڵ نەکەین.

**( ١٥٧ ). عن عائشة رَضِيَ اللهُ عَنْهَا : أن رسول الله( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) قال: أتشفع في حد من حدود الله؟ ثم قام فخطب فقال: يأيها الناس إنما أهلك من قبلكم أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه،وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد..**

ئایا تکا لەبارەی یەکێك لەسنورەکانی خوادا ئەکەیت؟پاشان هەستاو چوە سەر مینبەرو، فەرموی: ئەی خەڵکینە، ئەوانەی پێش ئێوە ئەوکاتە لە ناوچون کە دەستڕۆشتویەك دزی بکردایە،وازیا لێ ئەهێنا.لاوازێکیش دزی بکردایە،سزاکەیان بەسەردا جێبەجێ ئەکرد.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء باب حديث الغار - حديث : ٣٣٠٦.

صحيح مسلم - كتاب الحدود باب قطع السارق الشريف وغيره - حديث : ٣٢٨٢ دەقی فەرمودەکەش لای موسلیمە.

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** قسەکردنەکە لە فەرمودەی اتشفع لە گەڵ اسامەی کوری زەیدە. بەبەڵگەی ڕوایەتی بوخاری:

قورەیش لە خەمی ئافرەتە مەخزومیەکەدابون کە دزی کردبوو. وتیان: کێ قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بکات؟ کێ هەیە ئەو جورئەتەی هەبێت،جگە لە اسامەی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کردو،پێغەمبەریش فەرموی: اتشفع...

**باســـی دوەم/** پرسیارکردنە لە وشەی تشفع پرسیارێکی سەرسوڕمان وإنکاری کردنە. وادیارە أسامە پێش ئەوەی زانیبێتی کە لە سزا دیاریکراوەکاندا تکاکاری دروست نیە.

**باســـی ســـێیەم/** ڕێگریکـردن لـە تکاکـاری بـۆ سـزاکان ، بـە فـەرمودە باسـلێکراوەکەو، چـەندەها فـەرمودەی تـریش بڕیـاری لەسـەردراوە. بوخـاریش لـە کتێبەکەیـدا ناونیـشانێکی بـۆ دانـاوە: خراپـی تکـاکردن بـۆ سزاکان ئەگەر گەشتە لای سوڵتان.

**باسـی چـوارەم/** تکاکردنەکـە لـەو کاتـەدا حەرامـە کـە بـۆ پێـشەوا بـەرز ئەکرێتەوە،ئەگـەر بـۆی بـەرز کرایـەوە پێویـستە لـە سـەر ئـەویش سـزاکە جێبەجێ بکات.

إبـن عبـدالبر ئـەڵێت: کـۆدەنگی زانایـان هەیـە لـەو بارەیـەوە. هـەروەها لـە کتێبی البحر یشدا، وا هاتوە.بەڵگەشیان:

أ.پێغەمبـەری خـوا بـە أسـامە ئـەڵێت کاتێـك ویـستی تکـا بکـات: دەربـارەی سزاکان تکا مەکە.چونکە ئەگەر گەیشتە من وازی لێناهێنرێت.[1]

ب. فـەرمودەی: لـەنێوان خۆتانـدا کێـشەی سـزاکان چارەسەربکەن،چـونکە هەر تاوانێك گەیشتە من واجبە سزای بدەم.[2]

ج.إبـن عمـر ئـەڵێت: لەپێغەمبـەری خـوام بیـست کـە فـەرموی: هـەر کەسـێك تکاکـەی ببێتە هۆی جێبەجێ نەکردنی سزایەك،ئەوە دژایەتی فەرمانی خوای کردوە.[3]

د.زوبـیر ئەیگێڕێتـەوە: تکـا بکـەن تـا ئـەو کاتـەی نەگاتـە لای والی،ئەگـەر گەشتە لای والی ولێی خۆشبوو،خوا لە والی خۆش نەبێت.[1]

---

[1] قال النبي صلى الله عليه وسلم لأسامة لما تشفع: لا تشفع في حد،فإن الحدود إذا إنتهت إلي فليست بمتروكة.

[2] أخرج أبوداود من حديث عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده يرفعه:تعافوا الحدود فيما بينكم،فما بلغني من حد،فقد وجب.وصححه الحاكم.

[3] أخرج أبوداود والحاكم وصححه من حديث إبن عمر قال:سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول:من حالت شفاعته دون حد من حدود الله تعالى،فقد ضاد الله في أمره.وأخرجه إبن أبي شيبة من وجه أصح عن إبن عمر موقوفا.وفي الطبراني من حديث أبي هريرة مرفوعا بلفظ:فقد ضاد الله في ملكه.

ه.عــروەی کــوڕی زوبــیر ئــەڵێت: زوبێــر بــە دزێـك گەیــشتوو تکــای بــۆ کرد،پێیــان وت: بــا بگاتــە لای ئیمــام ئینجــا تکــای بــۆ بکــە.وتــی: ئەگــەر گەشــتە ئیمــام و تکــای بــۆ کرا،ئــەوە لەعنــەت لــە تکاکــارو تکــابۆکراو بێت.[2] وتراوە ئەم فەرمودەیە کە موقوفە پشتی پیَ ئەبەسترێت.

و. صــفوانی کــوڕی أمیــە ئــەڵێت:پێغەمبــەری خــوا فــەرموی: کاتێــك کــە فــەرمانی کــرد بــە بــڕینی دەســتی ئــەو کەســەی پۆشــاکەکەی دزیبــوو،وە تکای بۆ کرا: خۆزگە پیش ئەوەی بگەیشتە لام تکات بۆ بکردایە.[3]

ئەم ڕیواتانەش پاڵپشتی یەکتری ئەکەن.

**باسی پێنجەم/** خطابي لە مالکەوە ئەیگێڕێتەوە کە:

ئەگــەر کەســێك بــە ئــازاردانی خــەڵك نەناسرابوو،دروســتە پــێش بــەرز کردنــەوە بــۆ إمــام، تکــای بــۆ بکرێــت. بــەڵام ئەگــەر بــە ئــازاردانی خــەڵکی ناسرابوو،باش نیە تکای بۆ بکرێت.

**باســی شەشــەم/** ئـەو فەرمودانـەی موسـڵمان بـۆ شـاردنەوەو داپۆشـینی تـاوان هــان ئــەدەن،وا لێــك ئەدرێتــەوە کــە بــۆ کــاتی پــێش بەرزکردنەوەیــەتی بــۆ ئیمام،لەو کاتەدا شاردنەوەی باشترە.

**باســی حەوتــەم/** تکـاکردن لـە سـزا دیاریکراوەکانـدا دروسـت نیـە. بـەڵام لـە تەمبیَ کردنەکاندا دروستە،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی عائشە: لە سزاکاندا نەبێت،لە خاوەن کەسایەتیەکان ببورن.[4]

ب.کۆدەنگی زانایان لەسەری،وەك إبن عبدالبر ئەڵێت.

---

[1] أخرج الدارقطني من حديث الزبير موصولا بلفظ: إشفعوا ما لم يصل إلى الوالي،فإذا وصل إلى الوالي فعفا،فلا عفا الله عنه.

[2] أخرج الطبراني عن عروة بن الزبير قال: لقي الزبير سارقا فشفع فيه،فقيل:حتى يبلغ الإمام.فقال:إذا بلغ الإمام فلعن الله الشافع والمشفع.

[3] عن صفوان بن أمية :أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: لما أمر بقطع الذي سرق رداءه،فشفع فيه :هلا كان ذالك قبل أن تاتيني به.أخرجه أحمد والأربعة وصححه إبن الجارود والحاكم.

[4] حديث عائشة رضي الله عنها :أقيلوا ذوي الهيئات إلا في الحدود.رواه أحمد والنسائي والبيهقي.

**( ١٥٨ ). عن أنس بن مالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أن النَّبِيَّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) أتي برجل قد شرب الخمر، فجلده بجريدتين نحو أربعين. قال-أي أنس-: وفعله أبوبكر، فلما كان عمر إستشار الناس ، فقال عبدالرحمن بن عوف، أخف الحدود ثمانون، فامر به عمر..**

پیاوێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر کە ئارەقی خواردبۆوە، پێغەمبەری خواش نزیکەی چل داری لێدا، بەدوو چڵە دارخورما. انس ئەڵێت: أبوبەکریش هەمان کرداری پێغەمبەری کرد. بەڵام لە کاتی عومەردا، پرسی بە خەڵکەکە کرد، عبدالرحمان بن عوف فەرموی: سوکترینی سزاکان هەشتا دارە. عومەریش فەرمانی بەوە دەرکرد.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحیح مسلم - کتاب الحدود باب حد الخمر - حدیث : ٣٣٠٤.

**مانای وشەکان//** الجرید: چڵی دارخورما

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی هۆی ناوبردنی بە خمر چەند رایەك هەیە:

١. عەقل دائەپۆشێت، تخمر العقل.

٢. هەتاکو توند ئەبێتەوە، سەری دائەپۆشرێت.

٣. تێکەڵ بە عەقڵ ئەبێت.

٤. جێ ئەهێڵرێت تاکو پێ ئەگات.

٥. لە هەموو ئەم مانایانەوە وەرگیراوە، إبن عبدالبر ئەڵێت:

ئەم هەموو مانایانەی سەرەوە لە خەمردا هەیە: چونکە لێکراوەتەوە تا پێگەشتوە، وە کە خورایەوە تێکەڵ بە عەقل ئەبێت، تا بەسەر عەقڵدا زاڵ ئەبێت ودایئەپۆشێت.

**باســی دوەم/** دەربـارەی بـونی سـزایەکی دیـاریکراوو بـۆ ئـارە قخـۆر ، دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکــەم: ســزای دیــاریکراوی هەیــە. هەنــدێك کــۆدەنگی زانایــانی لێــوە بــاس ئەکــەن. بەبەڵگــەی: فــەرمودە باســلێکراوەکە: فجلــده بجریــدتین نحــو أربعین.

وەڵــام دراوەتــەوە کــە: یەکــدەنگی لێــرەدا بــەدی نــەهاتوە چــونکە ڕای پێچەوانە هەیە.

ڕای دوەم: تــــەنها ســــزای تــــەمبیْ کــــردن ئەیگرێتــــەوە. بەبەڵگــــەی: پێغەمبــەری خــوا ســزایەکی دیــاریکراوی بــۆ دانەناوە،بــەڵکو تــەنها بــیْ دیاریکردنی ژمارە لە ئارەق خۆری داوە.

**باســی سـێیەم/** ئایـا لێدانەکـە ئـەبێت تـەنها بـە چـڵی دارخورمـا بێـت؟ چـەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەکــەم: لێدانەکــە تــەنها بــە چــڵی دارخورمــا ئەبێت،بــەڕای هەنــدێك زانایانی شافعی،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: دروســته بەهــەر دارێــك لێــی بــدرێت،با دارخورمــاش نــەبێت. ئەمەش لای صەنعانی ڕای دروستە.

ڕای سـێیەم: دروســتە ئەگــەر لێدانەکــە بــە دەســت ،وبــە تاکــە پێڵــاویش بێت.

لــە شــرح صــحیح مــسلم دا ئــەڵێت: کــۆدەنگن لــەوەدا کــە ئــەکرێت بــە چــڵە دارخورمــاو و نــەعل و لایــەکی جلــیش بێــت.ڕاســتریش وەهایــە کــە بــە قامچیش ئەبێت.

ڕای چــوارەم: إبــن حجــر ئــەڵێت: هەنــدێك لــەزانایانی ســەردەمەکانی دوایــی ڕایــەکی مامناوەنــدیان گرتوە،ئــەڵێن: قامــچی بــۆ ئەوانەیــە هەڵگەڕاونەتــەوەو سەرکەشــن. وەبــۆ کەســانی لاوازیــش بــە جــل ونــەعل، لێیــان ئــەدرێت. وە کەسانی تریش،بەپێی گونجان لە گەڵ بارودۆخیان.

**باسی چوارەم/** هۆی پرسکردنی عمر به هاوەڵان، بریتی بوه له:

خالدی کوری وەلید نامه بۆ عمر ئەنوسێت که: خەڵکی سەریان کردۆته عارەق خواردنەوەو سزاکەش به سوك ئەزانن. ئەویش پرسیاری له کۆچکەران و پشتیوانان کرد که لەوێ بون،ئەوانیش کۆدەنگن بون لەوەدا که هەشتا داری لێبدرێت.[1]

وه ثور بن یزید ئەیگێڕێتەوه که: عمر پرسی کرد دەربارەی عارەق خواردنەوە،عەلی پێی وت: وائەبینین که هەشتا داری لێبدرێت. چونکه که خواردیەوه سەرخۆش ئەبێت،که سەرخۆش بوو،وڕێنه ئەکات. که وڕێنەی کرد،تۆمەت هەڵئەبەستێت. بۆیه عومەریش له عارەق خواردنەوەدا هەشتا داری له خەڵك ئەدا.[2] ئەم فەرمودەیە معضله. بەڵام وتەکەی عەلی لەچەند ڕێگەیەکی ترەوه ئەگێڕدرێتەوە.إبن حەزمیش نکوڵی لێکردوه.له ماناکەشیدا ناڕێکی هەیە، چونکه ئەڵێت: که وڕێنەی کرد،تۆمەت هەڵ ئەبەستێت. بەڵام ئەو کەسەی وڕێنه ئەکات،وتەکەی به تۆمەت دانانرێت،چونکه به ئەنقەست نەبوە. تۆمەت دروست کردنیش به بێ ئەنقەست،بەتۆمەت دانانرێت.

عبدالرزاق یش ئەیگێڕێتەوە: فەرمودەکان له عەلیەوه متواترن که پێغەمبەری خوا دەربارەی سزای عارەقخۆر هیچی دانەناوە.[3]

**باسی پێنجەم/** دەربارەی بڕی لێدانەکە،دوو ڕا هەیە:

---

[1] أخرج أبوداود والنسائي: أن خالد بن الوليد كتب إلى عمر:أن الناس قد إنهمكوا في الخمر وتحاقروا العقوبة،قال:وعنده المهاجرون والأنصار فسألهم،فأجمعوا أن يضرب ثمانين.

[2] أخرج مالك في الموطأ عن ثور بن يزيد: أن عمر إستشار في الخمر،فقال علي بن أبي طالب: نرى أن تجلده ثمانين،فإنه إذا شرب سكر،وإذا سكر هذى،وإذا هذى إفترى،فجلد عمر في الخمر ثمانين.

[3] أخرج عبدالرزاق:جاءت الأخبار متواترة عن علي أن النبي صلى الله عليه وسلم لم يسن في الخمر شيئا.

ڕای یەکــەم: ئــەبێت هەشــتا داری لێبدرێت،بــەڕای هادویــەو أبوحەنیفــە ومالك ولەیث وڕایەکی شافعی. بە بەڵگەی:

أ. فــەرمودە باسـلێکراوەکە،کە ئــەوەی تێدایــە: پێغەمبــەری خــواش نزیکــەی چــل داری لێدا،بــەدوو چــڵە دارخورمــا.وە عمــر دوای پــرس کــردن بــە هاوەڵان هەشتا داری لێداوە.

ب. فــەرمودەی عــەلی لــە بەســەرهاتی وەلیــدی کــوری عقبــە: پێغەمبــەری خــوا چــل داری لێــداوە،وە أبوبــەکریش چــل دارو،عمــریش هەشــتا،هەمویان سوننەتن،وئەوە یانم لا خۆشەویسترە.[1]

ج.لــە ســەردەمی عومــەردا کــۆدەنگی لەســەر بوە،وکەســیش نکــولی لــەوە نەکردوە.

ڕای دوەم: چــل دار واجبــە لێــی بــدرێت. ئەمــەش ڕای داود وڕای دیــاری شافعی وأحمد وأبو ثورە،بەبەڵگەی:

أ.کرداری پێغەمبەری خوابوە کە لێی نەگێڕدرێتەوە.

ب.لــە ســەردەمی ئەبوبــەکردا لــە ســەر ئــەوە ڕۆشـتون،وعەلیش لــە ســەردەمی عوسماندا لەسەری ڕۆشتوە.

صــــەنعانی ئــــەڵێت: کەســـێك بـــەدوای ڕیواتـــەکان وجیـــاوازی نێوانیـــان بگەڕێت،ئـەزانێت کــە چــل دارەکــە إحتیــاط ی زیــاتر تیایــە،وە لێــی زیــاد ناکرێت.

[1] جلد رسول الله صلى الله عليه وسلم في الخمر أربعين،وجلد أبوبكر أربعين،وجلد عمر ثمانين،وهذا أحب إلي.رواه مسلم.

**(١٥٩). عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رسول الله( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): إذا ضرب أحدكم فليتق الوجه.**

**هەر کەسێك لە ئێوە سزای تاوانبارێکی دا،با لەدەم وچاوی نەدا.**

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـە//** صحيح مسلم - كتاب البر والصلة والآداب باب النهي عن ضرب الوجه: ٤٨٣٤

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** لێدان لە دەم وچـاوو، نـە لـە کـاتی جێبەجێ کردنی سـزاکاندا،نە بـۆ هـیچ مەبەسـتێکی تر،دروسـت نیـە. بەبەڵگـەی: فـەرمودە باسلێکراوەکە.

**باسی دوەم/** لـەکاتی سـزاکاندا،نادرێت لـە عـەورەت ونـەرمایی سـك. بەبەڵگەی:

عـەلی بـە جێبـەجێ کـەری سـزاکە ئـەڵێت: لەئەندامـەکانی لەشـی بدە،وهـەموو ئەندامێکیـشی مـاف خـۆی بـدەرێ. وەخـۆت لـە دەمـو چـاوو عـەورەتی بپـارێزە.[1] هۆکارەکەشـی ئەوەیـە کـە: لـەکاتی لێدانـدا لەوانەیـە لەناوبچن.

**باسی سێیەم/** دەربارەی لێدان لە سەری سزادراوو،چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەکـەم: لەسـەری نادرێت،بـەڕای هەنـدێك لـە زانایان،چـونکە لەوانەیـە سەربکێشێت بۆ مردن.

ڕای دوەم: دروسـتە لـە سـەری بـدرێت. بـەڕای هادویـەو کەسـانی تریش،بەبەڵگەی:

---

[1] قول علي للجلاد:إضرب في أعضائه،واعط كل عضو حقه،وغتق وجهه ومذاكيره.أخرجه إبن أبي شيبة،وأخرجه عبدالرزاق وسعيد بن منصور والبيهقي من طرق عن علي.

١. عەلی بە جێبەجێکەری سزاکە ئەڵێت: لەسەری بدە.[١]

٢.ئەبوبەکریش ئەڵێت: لەسەری بدە چونکە شەیتان لەناو سەریدایە.[٢]

ڕای سێیەم: تەنها لە سەری ئەدرێت،بەڕای مالك.

**باسی چوارەم/** دەربارەی چۆنێتی ئەو دارەی لێی ئەدرێت،وتویانە:

١.لەنێوان نوێ و کۆندا بێت. بە بەڵگەی:

أ. پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا دانی نا بە زیناکرندا.پێغەمبەری خوایش داوای قامچیەکەی کرد. قامچیەکی شکاویان بۆ هێنا. فەرموی: لەم بەهێزترم بۆ بێنن،یەکێکی تریان بۆ هێنا کە هێشتا بەروبومەکەی پێوە مابوو،فەرموی: با لەنێوانی ئەم دوانەدا بێت. دارێکیان بۆ هێنا کە نەرم ببوەوە. فەرمانی کرد بەو دارە لە زیناکەرەکەیاندا.[٣]

ب. عەلی ئەڵێت: دارەکە مامناوەندی بێت،وە لێدانەکەش مامناوەندی بێت.[٤]

٢.مامناوەندی بێت لەنێوان گەورەو بچوکدا،دارێك نەبێت کە ئێسقانەکەی بشکێنێت وگۆشتەکەی بریندار بکات،وە ئەوەندە ناسکیش نەبێت،کە ئازاری نەبێت.

لە کتێبی البحردا ئەڵێت:پانیەکەی بە ئەندازەی پەنجەیەك بێت،وە درێژیەکەشی بە ئەندازەی باڵێك.

إبن الصلاح ئەڵێت: قامچی لە چەند دارێك دروست ئەکرێت،وە پێکەوە ئەئاڵێندرێت.

---

[١] قول علي للجلاد :إضرب الرأس.

[٢] قول أبي بكر :إضرب الرأس فإن الشيطان فيه .أخرجه ابن أبي شيبة وفيه ضعف وأنقطاع.

[٣] أخرج مالك في الموطأ عن زيد بن أسلم مرسلا: أن رجلا إعترف على نفسه بالزنا على عهد رسول الله،فدعا رسول الله بسوط،فاتي بسوط مكسور،فقال:فوق هذا،فاتي بسوط جديد لم تقطع ثمراته،فقال:بين هذين،فاتي بسوط قد لان وركب به،فأمر به فجلد.

[٤] ذكر الرافعي عن علي: سوط الحد بين حدين،وضربه بين ضربتين.

(١٦٠). عن إبـن عمـر رَضِيَ اللّـهُ عَنهُمَـا أن النَّبِـيَّ (صَلَى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قـال: كُلُّ مُسكِرٍ خَمرٌ وكُلُّ مُسكِرٍ حَرَامٌ..

هەموو سەرخۆشکەرێك،ئارەقەو. هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە.

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـە//** صـحیح مـسلم - کتـاب الأشـربة باب بیـان أن کـل مسکر خمر وأن کل خمر حرام - حدیث : ٣٨٢٦

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکـــەم/** هــەموو سەرخۆشـکەریك بــە خمـر ناوئەبرێت،بەبەڵگـەی: فەرموده باسلێکراوەکە.

**باســـی دوەم/** هــەموو سەرخۆشـکەرێك حەرامە،گوشـراو بێـت یـا سـرکە،بە بەڵگەی: فەرموده باسلێکراوەکە.

**باســی ســێیەم/** دەربـارەی مانـای سەرخۆشـکەر ،چـەند رایـەك هەیـە: ئایـا تـەنها ئـەو بـڕە دیـاریکراوە حەرامـە کـە؟ یـان بڕەکـەی زۆر بێـت یـا کـەم،با سەرخۆشـیش نەکات،هــەر حەرامە،ئەگــەر لــەو خواردنەوەیــە بێــت کــە سەرخۆش ئەکات؟

ڕای یەکــەم: ئەگــەر یــەك جــۆر بــون کــەم وزۆری حەرامــە. ئەمــەش ڕای جمهــوری هاوەڵــان وجگــە لــە هاوەڵانیــشە،وە احمــد وإســحاق وشــافعی ومالك وهادویە. بەبەڵگەی:

١. فەرموده باسلێکراوەکە.

٢. فەرمودەی: هەر خواردنەوەیەك زۆرەکەی سەرخۆش بکات،کەمەکەیشی حەرامە.[1]

٣. فــەرمودەی : پێغەمبــەری خــوا ڕێگــری کــردوە لــە بڕێکــی کــەم کــە زۆریەکەی سەرخۆش بکات.[1]

---

[1] حدیث جابر: أن رسول الله صلى الله علیه وسلم قال: ما أسکر کثیره فقلیله حرام.أخرجه أحمد والأربعة وصححه إبن حبان.وأخرجه الترمذي وحسنه،ورجاله ثقات.

٤.فــەرمودەی : هــەموو سەرخۆشــكەرێك حەرامــە. وە ئــەوەی زۆریەكــەی سەرخۆش بكات،بڕی مشتێكیشی حەرامە.[2]

٥.هــەروەها لــەم بابەتــەدا چــەند گێڕانەوەیــەك لــە علــی وعائــشەو ســەعید وإبـن عمـر وزەیـد بـن ثـابـت،هەرچـەندە لاوازی لـە سـەنەدەكەیاندا هەیە،بـەڵام بەو فەرمودانەی پێشوو پشتگیری ئەكرێن.

ڕای دوەم: جگــە لــە گــیراوەی تــریێ و خورمــای تەڕ،هــەر خواردنەوەیــەك ســــەرخۆش نەكات،خواردنــــەوەی حەڵاڵــــە. ئەمــــەش ڕای كوفیــــەكان وابــــو حەنیفەو هاوەڵانی وزۆربەی زانایانی بەسرەیە.

لــە كتــێبی شــرح الكنــز دا بــەم شــێوەیە ڕای حەنەفیــەكان لــەم بارەیــەوە دەرئەبڕێت:

ئـەبو حەنیفـە ئـەڵێت: عـارەق ئـاوی تـریێ یـە كـە پێكەشـتوو بێـت. ئەگـەر زۆر بكوڵێـت وكــەف بكات،كــەم وزۆرەكــەی حەرامــە.وە ئــەڵێت: كوڵــان نیــشانەیە بـۆ زۆر تونـدی ،زۆر كوڵانەكەشـی بـەوە ئـەبێت كـەف لێبێـت ،پاشـان كەفەكـە بنیــشێت.چــونكە بــەو شــێوەیە پــاكی لــە پیــسەكەی جیائەكرێتــەوە. ئەحكامــەكانی شــەرعیش براوەتــەوە،وە پــشت بــە چــارەنوس ودەرەنجــامی ئـەو شـتە ئەبەسـتێت،وەك سـزاكان،و كـافر بـونی كەسـێك حـەرام بـە حـەڵاڵ بزانێت ،و حەرامبونی فرۆشتن وپیسی.

وەلای هــەردوو هاوەڵەكەیــشی بــەو شــێوەیە: ئەگــەر خەســت بــۆوە ئەبێتــە عارەق،ومــەرج نیــە كــەف بكات،چــونكە نــاوی عــارەقی بەســەردا ئــەبڕێت. وئــەو هۆیــەش كــە پێــی حــەرامبوە تیایــدا هەیە،كــە هۆكارێكــە بــۆ ئــاژاوە نانەوەو دوژمنكاری.ئەم ناوانەش ناوی سەرخۆشكەرەكانە:

---

[1] حديث عامر بن سعد بن أبي وقاص عن أبيه بلفظ: نهى رسول الله صلى الله عليه وسلم عن قليل ما أسكر كثيره.أخرجه النسائي والدارقطني وابن حبان.

[2] حديث عائشة : كل مسكر حرام وما أسكر منه الفرق،فملأ الكف منه حرام.أخرجه أبوداود.

الطـلاء: گـيراوەی ترێيـە كـە بكوڵێنـدرێت تـا دوو لـە سـێی تـرێ یەكـە نامێنێت.
الـسكر: ئـاوی خورمایـە كـە بـۆنی كردبێـت (پاڵفتـەی خورمـا كـە ئـاگری بەرنەكەوتبێت).وە پاڵفتەی مێوژ كەگیراوەی مێوژێكە بۆنی كردبێت.
ئەمانـــە هـــەمویان حـــەرامن ئەگـــەر گەشـــتنە پلـــەی كوڵـــان وتوندبونەوە،وحەرامبونەكەی كەمترە لە حەرامبونی عارەق.
ئەو ئەندازەیەی كە لەمانە حەڵاڵە چوارن:
گـيراوەی خورمـا ومێـوژ كـە كـەم بكوڵێت،بـا خەسـتیش بێتەوە،بـەڵام ئەگـەر لێی خورایەوە سەرخۆش نەكات.
وە تێكـەڵی هەردوكیـشیان،ئەوەیە كـە ئـاوی خورمـاو ئـاوی مێـوژ تێكـەڵ بەیەك بكرێت.
وە گیراوەی هەنگوین وهەنجیرو گەنم وجۆو گەنمەشامی،لێبنرێت یان نا.
بەڵگەی كوفیەكان وئەبوحەنیفە ،ئەمانەیە:
١.ئـەو جۆرانـەی كـە بەڵگـەی حـەرامبونیان نیـە،ناوی عـارەق نایانگرێتـەوە. كەواتە بەڵگەی حەرامبونی عارەقیش نایانگرێتەوە.
٢.طحاوي بۆ لێكدانەوەی فەرموده باسلێكراوەكە، ئەڵێت:
هەنـدێك ئـەڵێن: مەبەسـت لێـی ئەوەیـە كـە پێـی سـەرخۆش بێـت. بـۆ پـشتگیری ئـەم رایـەش: بكـوژ ئـەو نـاوەی لێنانرێـت تـا یـەكێك نـەكوژێت. بـە بەڵگـــەی فـــەرمودەی: عـــارەق كـــەم وزۆرو هـــەر خواردنەوەیـــەكیش كـــە ســـەرخۆش بكـــات ،حەرامـــە.[1] بـــەڵام رای جیـــاواز هەیـــە دەربـــارەی ئـــەم فەرمودەیـــە: موصـــوله یـــا منقطـــع،مرفوعـــە یـــا موقـــوف.أحمـــد و كەســـانی تـریش ئـەڵێن: رای دروسـت لـەم فەرمودەیـەدا ئەوەیـە: وشـەی المُسْكَر نـەك

[1] حديث إبن عباس يرفعه :حرمت الخمر قليلها وكثيرها،والسكر من كل شراب.أخرجه النسائي ورجاله ثقات.

السكَر.ئەگەر ئەو وشەیەش بێت،فەرمودەی تاکە کەسەو ڕوبەڕوی فەرمودەکانی تر ناوەستێت. بۆ ڕاڤەکردنی ئەم ڕایەش چەند فەرمودەو وتەی تابعین ئەکات به بەڵگە.

له وەڵامی ئەم ڕایەشدا وتراوە:

١.ئەو بەڵگانەی کە ئەیهێننەوە،هەر یەکێکیان لە کەم وکوڕی بەدەر نیە.وناکرێته بەڵگەی خاوەن ڕایەکە.

٢.ڕای دروست دەربارەی وشەی الخمر لە زمانی عەرەبیدا ئەوەیەکە: هەموو سەرخۆشکەرێك ئەگرێتەوە،هەروەکو مجدالدین ئەڵێت. کەواتە بەڵگەی حەرامبونەکە هەمووی ئەگرێتەوە.

٣.چەند ڕیوایەتێك هەیە لە إبن عباسەوە دەربارەی حەرامبونی الباذق والطلاء.....هەروەها ڕوایەتیش لە عمرەوە بۆ حەرامبونی الطلاء(گیراوەی تری).،ئەمانەش چەند وتەیەکن پشتگیری ئەکەن لەڕای ئیشکردن بە گشتگیری دەقەکان. لەگەڵ بونی دژ بەیەکی دەقەکانیشدا،حەرامبون لەپێش حەڵاڵبونەوەیە.ڕیوایەتەکانیش ئەمانەن:

ا. کاتێك ابوجوەیریە پرسیاری لە إبن عباس کرد دەربارەی الباذق،إبن عباس وتی: محمد پێشی باذق کەوتوە،ئەوەی سەرخۆش بکات حەرامە،خواردنەوەی حەڵاڵ وپاك هەیە،لەدوای ئەوە حەرام وپیسە.[1]

ب.کۆمەڵێك هاتن بۆ لای إبن عباس وپرسیاری الطلاء یان لێکرد،وتی: ئەوە چۆنە؟ کاتێك پرسیارم لێ ئەکەن ئەوەم بۆ ڕون کەنەوە کە لەبارەیەوە پرسیار ئەکەن. وتیان: ترێیە ئەگوشرێت پاشان ئەکوڵێنرێت،دوایی ئەکرێتە الدنان ەوە.وتی: ئەوە دنانە چیە؟ وتیان:

---

[1] أخرج البخاري عن إبن عباس لما سأله أبوجويرية عن الباذق(وهو بالباء الموحدة والذال المعجمة المفتوحة،وقيل المكسورة،وهو فارسي معرب،أصله باذة وهو الطلاء) فقال إبن عباس:سبق محمد الباذق،ما أسكر فهو حرام.الشراب الحلال الطيب،ليس بعد الحلال الطيب إلا الحرام الخبيث.

دەفرێکــە بــە قــیر دەورە دراوە،وتــی؛ بــەزفت دەورەدراوە؟ وتیــان: بــەڵێ. وتــی: ســەرخۆش ئــەکات؟ وتیـان: ئەگــەر زۆربێــت.وتــی: هــەموو ســەرخۆش کەرێك حەرامە.[١]

ج.ابـن عبـاس دەربـارەی الطـلاء وتویـەتی؛ بـەئاگر لێنـان هـیچ شـتێك حـەڵاڵ وحەرام ناکات.[٢]

د.کاتێـك أبـو مـسلم الخـولانی پرسـیار لـە عائـشە ئـەکات و وئـەڵێت: ئـەی دایکــی موســڵمانان،ئەوان (خــەڵکی شــام) خواردنەوەیــەك ئەخۆنــەوە پێــی ئــەوترێت الطــلاء،ئــەویش وتــی: خــوای گــەورە ڕاســتی فــەرموە،وە خۆشەویــستەکەشم گەیاندویــەتی. لەپێغەمبــەری خۆشەویــستم بیــستوە کــە ئەیفــەرموو: کۆمــەڵێك لــە ئوممەتەکــەم ئــارەق ئەخۆنــەوەو نــاوێکی تــری لــێ ئەنێن.[٣]

ه.پێغەمبــەری خــوا ئەفــەرموێت: کۆمــەڵێك لــە ئوممەتەکــەم ئــارەق ئەخۆنــەوە ونــاوێکی تــری لــێ ئــەنێن. وە مۆســیقاش لەســەر ســەریان لــێ ئــەدرێت ، خوایش ڕۆیان ئەچێنێت بەزەویدا وئەیانکاتە مەیمون وبەراز.[٤]

---

[١] أخرج البيهقي عن إبن عباس:أنه أتاه قوم يسألون عن الطلاء،فقال إبن عباس:وما طلاؤكم هذا؟ إذا سألتموني فبينوا لي الذي تسألونني عنه.فقالوا:هو العنب يعصر،ثم يطبخ،ثم يجعل في الدنان.قال:وما الدنان؟قالوا:دنان مقيرة.قال؟مزفتة؟قالوا:نعم.قال:يسكر؟ قالوا:إذا أكثر منه.قال:فكل مسكر حرام.

[٢] أخرج عنه أيضا أنه قال في الطلاء: أن النار لا تحل شيئا ولا تحرمه.

[٣] أخرج أيضا عن عائشة في سؤال أبي مسلم الخولاني قال:يا أم المؤمنين إنهم يشربون شرابا- يعني أهل الشام- يقال له:الطلاء.قالت:صدق الله وبلغ حبي، سمعت حبي رسول الله يقول: إن أناسا من أمتي يشربون الخمر يسمونها بغير إسمها.

[٤] أخرج مثله عن أبي مالك الأشعري عن رسول الله أنه قال:ليشربن أناس من أمتي الخمر يسمونها بغير إسمها،وتضرب على رؤوسهم المعازف يخسف الله بهم الأرض،ويجعل منهم قردة وخنازير.

و. عمر ئـەڵێت: لـە فڵانـە کەسـەوە بـۆنی خواردنـەوەم کـردوە، وتویـەتی: گـلاو م خواردۆتـەوە،منیش دەربـارەی خواردنەوەکـەی پرسـیار ئەکەم،ئەگـەر سـەرخۆش بکـات،داری حـەددی لـێ ئەدەم،پاشـان بەتەواوەتی سزاکەی بەسەردا جێبەجێ کرد.[1]

ز. ابـو عبیـد ئـەڵێت: چـەند وتەیـەکی جۆراوجـۆر دەربـارەی خوارنـەوە لەپێغەمبـەر وهاوەڵانیەوە هاتوە. هەر یەکێك لەو وتانەش لێکدانەوەی خۆی هەیە:

* الخمـر: شـەربەتی تـرێ یـە کـە بکوڵێندرێت،لەمـەدا هـیچ جیـاوازی ڕا نیـە لای موسڵمانان لە حەرامبونیدا. بەڵکو جیاوازیەکە لە غەیری ئەودایە.

* السـکر: پاڵفتـەی خورمایـە کـە ئـاگری بەرنەکـەوتبێت.دەربـارەی ئـەوەش لە إبن مسعودەوە ئەگێڕدرێتەوە: السکر ئارەقە.

*البتع: گیراوەی هەنگوینە.

* الجعە: گیراوەی جۆیە.

*المذر: لە گەنمەشامی دروست ئەکرێت.

لێکدانـەوەی ئـەم چـوار جـۆرە لـە إبـن عمـرەوە ئەگێڕدرێتـەوە. إبـن المنـذریش لێـی ئەگێڕێتـەوە کـە وتویـەتی: خـەمر لـە تـرێ دروسـت ئـەکرێت،و سـکریش لە خورما.

*السکرکە: أبوموسا ئەڵێت: لە گەنمە شامی ئەکرێت.

*الفـضیخ: ئـەوخورما نەگەیوەیـە کـە ئـاگری بەرنەکـەوتبێت .إبـن عمـر بـە الفضوخ ناوی ئەبات.

ابوعبیـد ئـەڵێت: ئەگـەر لـە گـەڵ خورمـای نەگـەیودا خورمـای تـر هـەبێت،پێی ئـەوترێت: الخلـیطین (دوو تێکەڵەکـە). هـەروەها ئـەڵێت: هەندێك عەرەب بە ئارەق ئەڵێن الطلاء.

---

[1] أخرج عن عمر أنه قال:إني وجدت من فلان ريح شراب،فزعم أنه يشرب الطلاء.وإني سائل عما يشرب،فإن كان يسكر جلدته،فجلده الحد تماما.

عبيد كوری الأبرص ئەڵێت:

هي الخمر بالهزل تكنى الطلا كما الذئب يكنى أبا جعدة.

هەروەها أبوعبيد ئەڵێت: خمر باذق يشي پێ ئەوترێت.

**باسی چوارەم/** هەر شتێك سەرخۆش بكات با خواردنەوەش نەبێت،وەك تلياك،حەرامە،بە بەڵگەی:

١. فەرمودە باسلێكراوەكە.

إبن حجر ئەڵێت: هەر كەسێك بڵێت سەرخۆش ناكات بەڵكو تەنها ئەو كەسە سڕ ئەكات،ئەوە خۆی گێل كردوە،چونكە ئەویش وەك ئارەق خۆشی وبێ ئاگابونی تيايە.

ئەگەر سەرخۆشيش نەكات،خۆ سڕكەرە،أبو داوديش گێڕاويەتەوە لە پێغەمبەری خواوە: پێغەمبەری خوا ڕێگری كردوە لە هەموو سەرخۆش كەرو سڕكەرێك.[1]

خطابي ئەڵێت: سڕكەر هەموو خواردنەوەيەكە ئەندامەكانی لەش سڕ بكات وبێ هێزيان بكات.

٢.كۆدەنگی زانايان لەسەر حەرامبونی حەشيشە هەيە،وەك عراقی وإبن تيميە باسيان كردوە. هەر كەسێكيش بە حەڵاڵی بزانێت كافر ئەبێت.

**باسی پێنجەم/** إبن تيميە ئەڵێت: سەرەتای دەركەوتنی حەشيشە لە كۆتايی سەدەی شەشەمی كۆچی دابوو،كاتێك دەوڵەتی تەتار دەركەوتن. ئەمەش گەورەترينی خراپەكانە. وە لە چەند لايەكەوە لە ئارەق خواردنەوە خراپترە،چونكە وەك ئەو لەزەت وخۆشی هەيە. وە ناڕەحەتە كە مرۆڤ وازی لێبهێنێت. ئەو كەسەش بە هەڵەدا چوە كە وتويەتی:

حرموها من غير عقل ونقل وحرام تحريم غير الحرام.

---

[1] أخرج أبوداود أنه : نهى رسول الله عن كل مسكر ومفتر.

إبن تیمیه ئەڵێت: سزادان به حەد بەهۆی خواردنەوەی حەشیشەوە واجبه.
إبن البیطار ئەڵێت: حەشیشه کە بە القنب ناوئەبرێت،لەمیسردا هەیە. گەر مرۆڤ بڕی درهەمێك یا دوو درهەمی لێبخوات،زۆر سەرخۆشی ئەکات. لایەنە خراپەکانیشی زۆرە،هەندێك لە زانایان لایەنە خراپیەکان دینی بێت یا دنیایی ، ئەگەیەننه ١٢٠ خراپە.
ئەم خراپانە لە ئەفیونیشدا هەیە،بەڵکو زیاتریش. وە بنجیش حەرامە.
إبن دقیق العید دەربارەی الجوزە ئەڵێت: سەرخۆشکەرە،زانا دواییەکانی شافعی ومالکی ئەم وتەیە لە إبن دقیق العید ئەگێڕنەوە.وە پشتگیریشی ئەکەن.

**(١٦١). ١.عن أم سلمة رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا عن النَّبِيَّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) قال: إن الله لم يجعل شفاءكم فيما حرم عليكم..**
خوای گەورە چارەسەری لە حەرامکراوەکاندا بۆ دانەناون.
**٢.عن وائل بن حجر الحضرمي: أن طارق بن سويد رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ سأل النَّبِيَّ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) عن الخمر يصنعها للدواء، فقال: إنها ليست للدواء ولكنها داء..**
طارق کوڕی سوید پرسیاری لە پێغەمبەر کرد دەربارەی بەکارهێنانی ئارەق بۆ دەرمان، ئەویش فەرموی: ئارەق دەرمان نیە،وبەڵکو خۆی نەخۆشیە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**

١.بەیهەقی وأحمد،إبن حبان بە صحیحی داناوە،بوخاری بە شیوەی تعلیق لەإبن مسعودەوە ئەیگێریتەوە. صحيح ابن حبان - كتاب الطهارة باب النجاسة وتطهيرها - ذكر خبر يصرح بأن إباحة المصطفى صلى الله عليه وسلم للعرنيين حديث : ١٤٠٧[1]
٢.موسلیم وابوداود. سنن أبي داود ، كتاب الطب باب في الأدوية المكروهة - حديث : ٣٣٩٣

---

[1] قال الألباني في صحيح موارد الظمآن: حسن لغيره.( ١٣٩٧ ).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دەربارەی چارەسەرکردن بە ئارەق ، چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەکەم: چارەسەرکردن بە ئارەق حەرامە،بەڕای شافعی وجمهور. بە بەڵگەی: هەردوو فەرمودە باسلێکراوەکە.

ڕای دوەم: حەرامە،مەگەر پارویەك لە قورگی بگیرێت،تەنها عارەقیشی دەستبکەوێت تا بیخواتەوە لەوکاتەدا. ئەمەش ڕای هادەویە،لەکتێبی البحردا ئەڵێت: کۆدەنگی زانایانی لەسەرە. بەڵام ڕای جیاوازیش لەو بارەوە هەیە.

ڕای سێیەم: دروستە چارەسەری پێبکرێت،بەڕای أبو حەنیفە،بە بەڵگەی: شوبهاندنی بە خواردنەوەی میزو خوێن وپیسیەکانی تر،ئەگەر بۆ چارەسەرکردن بەکارهات، دروستە.

وەڵامدراوەتەوە کە: ئەمە شوبهاندنێکی پوچە. چونکە شوبهێنراو (میزو خوێن) بە دەق حەرامکراوە،کە هەموو حەرامکراوێك ئەگرێتەوە.

**باسی دوەم/** خاوەنی کتێبی النجم الوهاج ئەڵێت: هەموو ئەو قسانەی کە پزیشکەکان دەربارەی سودەکانی عارەق خواردنەوە وتویانە،بە پێی ئایەتی قورئان پێش دابەزینی ئایەتەکە سودی هەبوە. بەڵام دوای دابەزینی ئایەتی سورەتی مائدە خوای گەورە هەموو سودەکانی لێ دارنی. کەواتە هیچ سودێکی تێدا نەماوە..ئەم ڕایەش لە ربیع وضحاك ئەگێردرێتەوە.

لەفەرمودەیەکیشدا هاتوە کە : پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: کاتێك خوای گەورە ئارەقی حەرام کرد، سودەکانیشی لێدارنی.[1] کەواتە بابەتی چارەسەرکردن بە ئارەق ، بێسودە.

[1] حديث أسنده الثعلبي وغيره أن النبي قال: إن الله تعالى لما حرم الخمر سلبها المنافع.

**باسی سێیەم/** لەفەرمودەی دوەمدا،حەرامبونی چارەسەرکردن بە ئارەقی تیا باسکراوە. هەروەها ئەڵێت کە خۆی نەخۆشیە.

**باسی چوارەم/** لەلێکۆڵینەوەی ژیانی ئەوانەی خواردویانەتەوە دەرئەکەوێت کە چەندەها نەخۆشی دروست ئەکات. چۆن دروستی ناکات کاتێك پێغەمبەری خوا بە نەخۆشی ناوی ئەبات.خوای گەورە ڕوی ئەو شاعیرە بێ ئابڕوانە ڕەش بکات کە وەسفی ئەکەن و وەسفی خواردنەوەی ئەکەن وخەڵکی هەڵئەنێن بۆ خواردنەوەی وسەرکردنە سەری. وەك ئەوەی بیانەوێت دژایەتی خواو پێغەمبەر بکەن لەوەدا کە حەرامی کردوە. دیارە ئەوانیش کە ئەو شیعرانە ئەڵێن بە زمانی شەیتان ئەیڵێن،بۆ بانگەشەکردنە بۆ ئەوانەی خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردوە.

**(١٦٢).عن أبي بردة الأنصاري رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ،أنه سمع رسول الله (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يقول: لا يجلد فوق عشرة أسواط إلا في حد من حدود الله تعالى..**

لە دە دار زیاتر نادرێت لە کەس،جگە لەو سزا دیاریکراوانەی کە خوای گەورە دایناون

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب الحدود باب : كم التعزير والأدب - حديث : ٦٤٧١. صحيح مسلم - كتاب الحدود باب قدر أسواط التعزير - حديث : ٣٣٠٨

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** التعزير لەزمانی عەرەبیدا: بەمانای قەدەغەکردن ورەتکردنەوە دێت.

لەشەرعیشدا واتە: تەمبێ کردن لەسەر تاوانێك کە سزایەکی دیاریکراوی نیە.هۆی ناوهێنانەکەشی ئەوەیە کە: لە کردنی خراپە

دوری ئەخاتــەوە. تــەمبێکردنیش بــە قــسە وە بــەکرداریش ئەبێت،بــەپێی بارودۆخی کەسە تاوانبارەکە.

تەمبیٚ کردنیش لە چەند ڕویەکەوە لە حدود جیا ئەکرێتەوە:

١.بــەگوێرەی جیــاوازی خــەڵك ئەگۆڕێت،تــەمبیٚ کردنــی خــاوەن کەسایەتیەکان سوکترە،بەڵام لە حدود دا یەکسانن.

٢.تکاکردن تیایدا دروستە بە پێچەوانەی حدود.

٣.کەســێك زەرەری لێکــەوت بــەهۆی تــەمبیٚ کردنیەوە،قــەرەبوو ئەکرێتەوە،بەپێچەوانەی ڕای ئەبوحەنیفەو مالیك.

هەندێك جیاوازیان خستوە لەنێوان تعزیر وتأدیب،کە هیچ جیاواز نین.

**باســی دوەم/** مەبەست لــە دەستەواژەی حــدود الله : ئــەو ســزایانەیە کــە خــواو پێغەمبــەر ژمارەیــەکیان بــۆ دیــاریکردوە ، وەك دارکاریکردن،یــا سزایەکی تایبەتە وەك بڕین وبەردباران کردن.

**باســـی ســـێیەم/** زانایــان یەکــدەنگن دەربــارەی ئــەم ســزایانە: زینا،ودزی،وئــارەق خواردنەوە،وســزای ڕێگر،وســزای هەڵبەســتنی تۆمــەتی زیناکردن،وســزای کوشــتن بــۆ کەســی هەڵگەڕاوە،وســزای کوشــتنەوە بــۆ بکوژ.

**باســی چــوارەم/** ئایــا تۆڵەســەندنەوە لــە ئەندامــەکانی لەشــدا،بە حــدود دائــەنرێت،یان نــا ؟ جیــاوازی ڕا هەیــە لێــرەدا. وە ڕای جیــاوازیش هەیــە دەربــارەی ســزای: کەســێك نکــولی لــە بــونی ماڵێــك بکــات لای کــە خواســتویەتی،وە نێربــازی،وە لاقــەکردنی ئــاژەڵ،وە ئافرەتێــك ئــاژەل ســواری خــۆی بکــات،وەخراپی ئافرەتــان لــە گــەڵ یەکــدا(الــسحاق)،وە خــواردنی خــوێن و مــردارەوە بــوو و گۆشــتی بــەراز بــیٚ بــونی حاڵــەتی ناچــاری،وە جــادوو کــردن،وە دروســت کردنــی تۆمــەتی عــارەق خواردنەوە،وەنوێژنــەکردن بەتەمــەڵی،وەخواردن لــەمانگی ڕەمەزانــدا،ئایا ئەمانە حد ن یان نا؟

ئـەوەی ئـەڵێت ئـەمان حەددن،بەلایـەوە دروسـتە تـەمبێ بکـرێن بـە زیـاتر لـە ده دار.

ئـەوەش کـە ئـەڵێت حـد نیە،بەدروسـتی نازانێـت زیـاد لـە ده داری لـێ بدرێت.

**باسـی پێنجـەم/** دەربـارەی کـارکردن بـە فـەرموده باسلێکراوەکە،چـەند رایەك هەیە:

ڕای یەکـەم: ئیـشی پـێ ئـەکرێت، ولـە ده دار زیـاتر دروسـت نیـە. بـەرای لیث و احمد وإسحاق وکۆمەڵێك له شافعیەکان.

ڕای دوەم: دروسـتە لـە ده دار زیـاتر بـەڵام نەگاتـە کـەمترین حـەد. ئەمـەش ڕای ئەبوحەنیفـەو مـالکی وشـافعی و زیـد بـن علـی والمؤیـد بـالله وإمـام یەحیایە.

ڕای سـێیەم: تـەمبێ کـردن لـە هـەر حەددێکـدا کـەمترە لـە سـزای حەددەکـە خـۆی. ئەمـەش ڕای قاسـم وهـادی و ناصـرو ئەوزاعیـە ،ولـە محمـد کـوڕی حەسەنی شەیبانیش ئەگێڕدرێتەوه. چونکە:

پێـشەوا عـەلی نـەوەت وهەشـت داری لـە پیاوێـك دا کـە لەگـەڵ ئافرەتێکـدا رایبواردبوو،بەڵام زینای نەکردبوو لەگەڵیدا..

وەڵامی ئەدرێتەوە کە:

١.کـرداری هەنـدێك لـە هاوەڵـان ناکرێتـە بەڵگە،وبـەرەنگاری دەقـە ڕاسـتەکە ناوەستێت.

٢.لەوانەیـە ئـەو هاوەڵـەی سـزاکەی جێبـەجێ کـردوە فەرمودەکـەی پـێ نەگەشـتبێت. خـاوەنی کتـێبی التقریـب وا پاسـاو دێنێتـەوە: ئەگـەر شـافعی فەرمودەکـەی پـێ بگەشـتایە،فتوای لەسـەر ئەدا،چـونکە وتویـەتی: ئەگـەر فەرمودەکە ڕاست بوو،ڕای منیش وەك فەرمودەکەیە.

داودیـش وەك ئـەوە پاسـاو بـۆ مالـك ئەهێنێتەوە،کـە مالـك فەرمودەکـەی پـێ نەگەشـتوە. بۆیـە وای بینیـوە کـە سـزا بـە ئەنـدازەی تاوانـە. ئەگـەر پێـی

بگەشـــتایە،لێی لانەئـــەدا. کەواتـــە هـــەر کەســـێك فەرمودەکـــەی پـــێ بگات،ئەبێت گوێڕایەڵی بێت.

ڕای چـوارەم: دادوەر چـۆنی پـێ باشـبوو،بۆی هەیـە زیـاتریش بێت،بـەڕای ئەبو یوسف. به بەڵگەی:

لـە عمـرەوە ئەیگێڕنـەوە کـە ١٠٠ داری لـە کەسـێك داوە کـە نەخـشی لەسـەر مستیلەکەی کردبوو.[1] وە هەمان ڕایش لە إبن مسعودەوە ئەگێڕنەوە.

وەك وەڵامی ڕای پێشوو،وەڵامی ئەمانیش دراوەتەوە.

ڕای پێنجەم: زۆرترین بڕ،حەفتاو پێنج دارە،بەڕای مالك وإبن أبی لەیلا.

(١٦٣). عن أنس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ ،أن النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: **جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ**. بە ماڵ وگیـان وزمانتـان لـەدژی هاوبەش پەیداکەران جیهاد بکەن.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** أحمد،نسائی،حاکمیش بە صحیحي داناوە. مسند أحمد بن حنبل – ومن مسند بني هاشم

مسند انس بن مالك رضي الله تعالى عنه – حديث : ١٣٣٧٢[2]

**مانـــای وشـــەکان//** الجهـاد: واتـە: سـەرفکردنی هـەوڵ وتوانـا بـۆ شـەڕ لـەدژی بێباوەڕان ، یا لەسنور دەرچوان.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** جیهادکردن بە گیان،کە بریتیە لە دەرچونی خـودی کەسـەکە بـۆ ڕوبەڕوبونەوە،واجبە،بە بەڵگەی:

أ.چـــەندەها ئایـــەت لـــە قورئاندا،لەوانـــە:﴿وجاهـــدوا بـــأموالكم وأنفسكم﴾{التوبة:٤١}.واتە: بە ماڵەکانتان و بە گیانی خۆتان ،جیهاد بکەن.

---

[1] روي عن عمر أنه ضرب من نقش على خاتمه مئة سوط.

[2] صححه الألباني في المشكاة (٣٨٢١).

ب. فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باسی دوەم/** جهاد کردن بە ماڵ کە بریتیە لەبەخشینی هەرشتێك بۆ جەنگەکە پێویستە وەك نەفەقە وچەك وشتی تر،واجبە. بەبەڵگەی:

أ.چەندەها ئایەت لە قورئانەدا هەیە،لەوانە:﴿وجاهدوا بأموالكم وانفسكم﴾{التوبة:٤١}.واتە: بە ماڵەکانتان وبە گیانی خۆتان جیهاد بکەن.

ب. فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باسی سێیەم/** جهاد کردن بەزمان کە بریتیە لە: بەڵگەهێنانەوە بۆ ڕاستی ئاین و،بانگکردنی خەڵك بۆی وهاوارکردن لە کاتی شەڕکردندا بەشێوەیەك بێباوەڕانی پێ بترسێنرێت،واجبە،بە بەڵگەی:

أ.ئایەتی:﴿ولا ينالون من عدو نيلا إلا كتب لهم به عمل صالح﴾{التوبة:١٢٠}.واتە: هەر ئازارێك بە دوژمن بگەیەنن،کردارێکی چاکەیان بۆ ئەنوسرێت.

ب. فەرمودە باسلێکراوەکە.

ج.پێغەمبەری خوا بە حسان بن ثابت ئەفەرموێت: هەجو کردنی بێباوەڕان، لە لێدانی تیر قورسترە بەلایانەوە.[1]

---

[1] قوله صلى الله عليه وسلم لحسان بن ثابت :إن هجو الكفار أشد عليهم من وقع النبل.

**(١٦٤) ١.عن عبدالله بن عمررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: جاء رجل إلى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَأْذِنُ فِي الجِهَادِ،فَقَالَ: أَحَيٌّ وَالِدَاكَ؟ قَالَ: نَعَمْ.قَالَ: فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ..**

کەسێك هاتە لای پێغەمبەر تا بۆ چون بۆ جیهاد پرسی پێبکات. فەرموی: دایك وباوکت ماون؟ وتی: بەڵێ. فەرموی: لەخزمەتکردنیاندا پاداشتی جیهادت هەیە.

**٢.ومن حديث أبو سعيد رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: إِرْجِعْ فَإِنْ أَذِنَا لَكَ وَإِلَّا فَبِرَّهُمَا..**

بگەڕێرەوە،ئەگەر مۆڵەتیان داپێت،باشە،ئەگەر نا،چاکەیان لە گەڵدا بکە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**

١. صحيح البخاري – كتاب الجهاد والسير باب الجهاد بإذن الأبوين – حديث : ٢٨٦٣، صحيح مسلم – كتاب البر والصلة والآداب باب بر الوالدين وأنهما أحق به – حديث : ٤٧٢٨

٢.أحمد،أبوداود. مسند أحمد بن حنبل – ومن مسند بني هاشم مسند أبي سعيد الخدري رضي الله عنه – حديث : ١١٤٩٨..[1]

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەریزەتی جهاد لەسەر ئەو کەسە نامێنێت کە باوك ودایکی یا یەکێکیان لە ژیاندا مابێت. جهادەکە فەرزی عەین بێت یا کفایە،باوك ودایك بەچونی کوڕەکەیان زەرەریان پێ بگات یان نا. بەبەڵگەی:

١.هەردوو فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢.معاويه بن جاهمە ئەیگێڕێتەوە کە: جاهمەی باوکی دێت بۆ لای پێغەمبەر وئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا،ویستم بچم بۆ جهادو،هاتوم پرست پێ بکەم.فەرموی: دایکت هەیە؟ وتی: بەڵێ.فەرموی: لەلای ئەو بمێنەرەوە.[2]

---

[1] صححه الألباني في صحيح أبي داود (٢٥٣٠).

[2] أخرج أحمد والنسائي من طريق معاوية بن جاهمة :أن أباه جاهمة جاء إلى النبي صلى الله عليه وسلم ، فقال:يا رسول الله أردت الغزو وجئت أستشيرك.فقال:هل لك من أم؟ قال: نعم.قال:إلزمها.

**باسی دوەم/** حەرامە کوڕ بۆ جهاد کردن بچێت،ئەگەر باوك ودایکی یا یەکێکیان ڕێیان نەدا،بە مەرجێك موسڵمان بن. ئەمەش ڕای جمهوری زانایانە،بە بەڵگەی:

أ.فەرمودەی دوەمی فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.چونکە چاکەکردن لە گەڵیاندا،فەرزی عەینەو لەسەر هەموو کەسێکە. بەڵام جیهاد کردن فەرزی کیفایەیەو خەڵکی تر بری ئەو ئەکەوێت.

**باسی سێیەم/** ئەگەر جهاد لەسەر کەسێك بو بە فەرزی عەین،جهادەکە پێشی چاکەکردن لە گەڵ دایك وباوکیدا ئەخات. هەرچەندە هەردوکیان فەرزی عەینن،چونکە بەرژەوەندی جهاد کردنەکە گشتگیرترە،بۆ پاراستنی دین وپارێزگاری موسڵمانانە.بەرژەوەندی گشتیش پێش بەرژەوەندی تر ئەخرێت،کە بریتیە لە بەرژەوەندی پاراستنی لاشەی دایك وباوکەکە.

**باسی چوارەم/** لەفەرمودە باسلێکراوەکاندا بەڵگەی گەورەیی چاکەکردنی تیایە لەگەڵ دایك وباوکدا،کە لە جهادکردنیش گەورەترە.

**باسی پێنجەم/** لەفەرمودە باسلێکراوەکاندا ئەو حوکمە وەرئەگیرێت کە: ئەو کەسەی پرسی پێ ئەکرێت،ئەبێت ئەویش ئامۆژگاری بکات.وە پێویستە لە سەری پرسیار لە هەموو لای بابەتەکە بکات،تا باشترین چارەسەری پێ بڵێت.

**باسی شەشەم/** خۆماندوکردن بۆ جێبەجێ کردنی بەرژەوەندیەکانی دایك وباوك ومال خەرجکردن بۆ پێویستیەکانی دایك وباوکی ،بە جیهاد کردن ناوبردوە.کاتێك هاوەڵەکە بۆ چون بۆ جیهاد پرس ئەکات،وەك خوای گەورە ئەفەرموێت:﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾{الشُّورَى:٤٠}. واتە: سزای خراپە،خراپەیەکی وەك خۆیەتی.

لەوانەشە پەیوەندیەکی پێچەوانەشیان هەبێت: چونکە جهادکردن زەرەر گەیاندنی بە دوژمن تیایە،ئەویش ئەو هەوڵە بۆ سودگەیاندن بەدایك و باوکی سەرف ئەکات.

**(١٦٥) عن أبي موسى الأشعري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنه قال أعرابي للنبي صلى الله عليه وسلم: الرجل يقاتل للمغنم، والرجل يقاتل للذكر، والرجل يقاتل ليرى مكانه، فمن في سبيل الله؟ قال: مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ..**

پیاوێکی دەشتەکی بەپێغەمبەری خوای وت: پیاوی وا هەیە بۆ غەنیمەت شەڕ ئەکات، پیاوی واش هەیە بۆ ناوبانگ شەڕ ئەکات، وپیاوی واش هەیە بۆ ئەوە شەڕ ئەکات، تا ببینرێت. کامیان لە پێناوی خوادایە؟ ئەویش فەرموی: کەسێك شەڕی کرد تا وتەی خوای گەورە بەرز ڕابگیرێت، ئەوە لە پێناوی خوادایە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير باب من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا - حديث : ٢٦٧٥، صحيح مسلم - كتاب الإمارة باب من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل - حديث : ٣٦١٥.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** مەبەست لە كلمة الله: بانگەوازی خواییە بۆ ئاینی ئیسلام. شەڕکردنیش لەپێناویدا، بۆ کەسێك بیەوێت بانگەوازەکە لەبەرزیدا بێت، خێری بۆ ئەنوسرێت، بە بەڵگەی فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باسی دوەم/** مەفهومی بە مەرجگرتنەکە لە فەرمودەکەدا ئەوە ئەگەیەنێت کە: شەڕکردنێك ئەو سیفەتەی تیا نەبوو (بۆ بەرزکرنەوەی بانگەوان)، لەپێناوی خوادا نیە.

**باسی سێیەم/** ئەگەر لە گەڵ ئەم مەبەستەدا، مەبەستی تری تێکەڵ بوو، وەك هاتن بۆ غەنیمەت، ئایا بە هاتن لەپێناوی خوادا ئەژمار ئەکرێت یان نا؟

طبري ئەڵێت: ئەگەر لەسەرەتاوە مەبەستی بۆ بەرزکردنەوەی دینی خوابوو، دوای ئەوە هەر مەبەستێکی تری شاراوەی هەبێت زەرەری نیە، ئەمەش ڕای جمهورە.

فەرموده باسلێکراوەکەش ئەوه ئەگەیەنێت کە،ئەگەر مەبەستێکی تریشی هەبوو،لەمەبەستە سەرەکیەکە دەرناکات،چونکە بۆ ئەوە شەڕی کردوه کە دینی خوا بەرز ڕابگیرێت.

پشتگیری ئەم لێکدانەوەیەش ئایەتی:﴿ليس عليكم جناح أن تبتغوا فضلا من ربكم﴾{البقرة:١٩٨}. واتە:

گوناهتان ناگات ئەگەر داوای ڕۆزی لە خوا بکەن. ئەم داواکردنە دژ بە فەریزەی حەج نیە.کەواتەهەموو پەرستشەکانی تریش وەك حەج وان لەو لایەنەدا.

کەواتە: پاڵنەری کردارەکە،پشتی پێ ئەبەسترێت لێرەدا: ئەگەر پاڵنەرەکە بەرزڕاگرتنی دینی خوا بوو،زەرەری نیە، ئەگەر هەر مەبەستێکی تری شاراوەی لە پاڵدا بێت.

**باسی چوارەم/** ئەگەر هەردوو مەبەستەکە یەکسان بون: بەرزکردنەوەی بانگەوازو بۆ غەنیمەت،زەرەری نیە. بەبەڵگەی:

أ.ڕوکەشی فەرموده باسلێکراوەکەو ئایەتەکەی پێشوو.

ب.ئایەتی :(ولا ينالون من عدو نيلا إلا كتب لهم به عمل صالح﴾{التوبة: ١٢٠}.واتە: هەر ئازارێك بە دوژمن بگەیەنن،کردارێکی چاکەیان بۆ ئەنوسرێت.مەبەست لە ئازارگەیاندن پێیان ئەوەی کە شەرع ڕێی پێداوە: ئەگەر مەبەستی لە بردنی غەنیمەت،تورەکردنی بێباوەڕان و یارمەتیدەری بێت بۆ ئەنجامدانی چاکە، ئەوە پاداشتی هەیە،وپێچەوانەی جیهاد کردن نیە.

ج.فەرمودەی: کەسێك بێباوەڕێك بکوژێت،شتومەکە تایبەتیەکانی بۆ خۆیەتی.[1] پێش شەڕکردن،بەڵگەی ئەوەیە کە: بۆ غەنیمەت شەڕکردن پێچەوانەی جهاد کردن نیە،بەڵکو پێغەمبەری خوا ئەو فەرمودەیەی تەنها بۆ ئەوە وتوە کە ئەو کەسەی ئەیبیستێت ئەو پەڕی هەوڵ بدات لەشەڕکردن دژی بێباوەڕان.

---

[1] من قتل قتيلا فله سلبه.

د.فەرمودەی: خوای گەورە چاودێری ئەو کەسەیە کە تەنها باوەڕ بە خواو بەڕاست زانینی پێغەمبەرەکەی لەماڵەوە دەری کردوە بۆ جهاد کردن،ئەو کەسە بیگێڕێتەوە بۆ شوینی خۆی،بە دەستکەوتنی پاداشت،یا غەنیمەت،یا ئەیخاتە بەهەشتەوە.[1] ئاشکرایە ئەم هەواڵانە بەڵگەیەلەسەرئەوەی :

دروستە جگە لە مەبەستە سەرەکیەکە،مەبەستێکی تریش هەبێت. چونکە هەواڵدانەکە بەو شێوەیە ماناکەی بەو شێوەیە پێویست ئەکات.

ه.دەرچونی پێغەمبەری خوا لە گەڵ هاوەڵانیدا بۆ جەنگی بەدر،بەمەبەستی دەستکەوتنی کاروانەکە بوو.تەنها بە مەبەستی غەنیمەت وەرگرتن دژ ناوەستێت لە گەڵ مەبەستی بەرز ڕاگرتنی دیندا،بەڵکو ئەمەش جۆریکە لە بەرز ڕاگرتنی دین (لاوازکردنی توانای ماددیان).

و.ئایەتی﴿وتودون أن غير ذات الشوكة تكون لكم﴾{الأنفال:٧}.واتە: ئێوە حەزتان بە شتێکی تر ئەکرد جگە لە سەرکەوتن لەشەڕەکەدا. ئەمەش دانپیانانی خوای گەورەیە بەمەبەستەکانیان. هیچ لۆمەشیان ناکات لەسەری. لەگەڵ ئەوەدا کە لێرەدا پێیان ڕائەگەیەنێت کە ئەوان ماڵیان خۆشتر ئەوێت لە شەڕکردن. کەواتە: بەرز ڕاگرتنی دینی خوا،بریتیە لە ترساندنی بێباوەڕان وبردنی ماڵیان وبڕینی دارو درەختیان و...شتی تریش.

ز.بەشداریکردن لە جیهاددا بۆ دەستکەوتنی غەنیمەت،لەناو هاوەڵاندا باو بوە،وئەوانیش لەخوا ئەپاڕانەوە کە غەنیمەتیان دەستبکەوێت.عبدالله بن جحش لە ڕۆژی احددا ئەڵێت: خوای گەورە داوات لێ ئەکەم پیاوێکی ئازام توشبێت،شەڕی لەگەڵ بکەم وشەڕم لە گەڵ بکات،پاشان ئارامیم پێ ببەخشە،هەتا ئەیکوژم وشتومەکە تایبەتەکەی ئەبەم.[2]

---

[1] حديث أبي هريرة قال:قال رسول الله :إنتدب الله لمن خرج في سبيله لا يخرجه إلا إيمان بي وتصديق برسولي أن أرجعه بما نال من أجر،أو غنيمة،أو أدخله الجنة.رواه البخاري.

[2] أخرج الحاكم والبيهقي بإسناد صحيح أن عبدالله بن جحش يوم أحد قال:اللهم أرزقني رجلا شديدا أقاتله ويقاتلني،ثم أرزقني عليه الصبر حتى أقتله وآخذ سلبه.

**باسی پێنجەم/** لەوانەشە بوترێت: ئەگەر هەردوو پاڵنەرەکە (بۆ پاداشت وبۆ ناو دەرکردن) وەك یەکبن. بۆ نمونە،پاداشتەکە پوچەڵ ئەبێتەوە،بەبەڵگەی:

أ.پیاوێك هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا،ئەگەر پیاوێك بۆ پاداشت وبۆ ناودەرکردن هات،هیچی بەر ئەکەوێت؟ فەرموی: هیچی بەرناکەوێت.سێ جار لێی دوبارە کردوە،هەر دەیفەرموو: هیچی بەرناکەوێت.

پاشان پێغەمبەری خوا فەرموی: خوای گەورە تەنها ئەو کردارە وەرئەگرێت کە تەنها بۆ ئەو ئەنجام ئەدرێت،وبۆ دەستخستنی ڕەزامەندی ئەوە.[1]

صەنعانی وەڵامی ئەم ڕایە ئەداتەوە و ئەڵێت: لەوانەیە هۆی پوچبونی کردارەکەی مەبەستی ناوبانگ پەیداکردنەکە بێت،کە کردارەکەی کردوە بە ریاء،ئەویش کردار پوچەڵ ئەکاتەوە،بەپێچەوانەی داواکردنی غەنیمەتەوە،چونکە پێچەوانەی جیهاد کردن نیە.

ب.پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا،پیاوێك بیەوێت لەپێناوی خوادا بجەنگێت،وە مەبەستی دەستکەوتنی کەل وپەلی دنیایی بێت؟ فەرموی: هیچ پاداشتێکی نیە.سێ جار وەڵامەکەی بۆ دوبارە کردوە،هەموو جارێکیش ئەیفەرموو: هیچ پاداشتێکی نیە.[2]

صەنعانی لەلێکدانەوەی ئەم فەرمودەیەدا ئەڵێت: دیارە پێغەمبەری خوا لە پیاوەکە تێگەشتوە کە پاڵنەرەکەی بۆ جهاد کردن،ماڵی دنیایە،بۆیە ئەو وەڵامەی داوەتەوە. ئەگینا بەشداری پێکردنی داواکردنی دنیا لەپاڵ جیهادەکەدا،لەلایەن هاوەڵانەوە ئاسایی بوە.وەك لەپێشەوە باسکرا.

---

[1] أخرج أبو داود والنسائي من حديث أبي أمامة بإسناد جيد قال: جاء رجل فقال:يارسول الله أرأيت رجلا غزا يلتمس الأجر والذكر،ماله؟قال:لا شيء له.فأعادها ثلاثا،كل ذلك يقول:لا شيء له.ثم قال رسول الله :إن الله تعالى لا يقبل من العمل إلا ما كان خالصا وأبتغي به وجهه.

[2] أخرج أبو داود من حديث أبي هريرة:أن رجلا قال:يا رسول الله،رجل يريد الجهاد في سبيل الله،وهو يبتغي عرضا من الدنيا،فقال:لا أجر له.فأعادها عليه ثلاثا،كل ذلك يقول:لا أجر له.

**( ١٦٦ ) عن سليمان بن بردة عن أبيه عن عائشة رَضِيَ اللّهُ عَنهَا قالت: كَانَ رَسُولُ الله إذا أمر أميراً عَلَى جَيْشٍ أوْ سرِيَةٍ أَوْصَاهُ في خَاصَّته بِتَقْوَى الله وَبِمَنْ مَعَهُ مِنَ المُسْلمِينَ خَيْراً، ثمّ قَالَ: إغْزُوا على إسم الله تعالى، في سبيل الله تعالى، قاتلوا من كفربالله، أغزوا، ولاتغدروا، ولا تمثلوا، ولاتقتلوا وليدا. وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال، فايتهم أجابوك إليها فاقبل منهم وكف عنهم: أدعهم إلى الإسلام، فإن أجابوك فاقبل منهم، ثم ادعهم إلى التحول من دارهم إلى دار المهاجرين، فإن أبوا فاخبرهم بانهم يكونون كاعراب المسلمين، ولايكون لهم في الغنيمة والفيء شيء، إلا أن يجاهدوا مع المسلمين. فإن هم أبوا فاسئلهم الجزية، فإن هم أجابوك فاقبل منهم، فإن هم أبوا فاستعن عليهم الله تعالى وقاتلهم. وإذا حاصرت أهل حصن، فارادوك أن تجعل لهم ذمة الله وذمة نبيه فلاتفعل، ولكن إجعل لهم ذمتك، فإنكم إن تخفروا ذممكم أهون من أن تخفروا ذمة الله. وإذا أرادوك أن تنزلهم على حكم الله فلا تفعل به، بل على حكمك، فإنك لاتدري أتصيب فيهم حكم الله تعالى أم لا..**

هەر کاتێك پێغەمبەری خوا کەسێکی بکردایە بە فەرماندەی لەشکرێك یا سریەیەك، ئامۆژگاری ئەکرد کە تەقواداربێت. هەروەها لە گەڵ ئەو موسڵمانانەی لە گەڵیدایە چاك بێت، پاشان ئەیفەرموو: بەناوی خواو لە پێناوی خوادا شەڕبکەن. شەڕبکەن لە گەڵ هەر کەسێك کە باوەڕی بەخوا نەبێت. غەزا بکەن، وپەیمان مەشکێنن، وکوژراوەکان ئەتك مەکەن، ومناڵ مەکوژن. ئەگەر بە دوژمنە بێباوەڕەکەت گەشتی، بۆ سێ ئاکار بانگیان بکە، جا هەر کامیان هەڵبژارد، لێیان وەربگرەو وازیان لێبهێنە: بانگیان بکە بۆ موسڵمان بون، گەر وەڵامیان دایتەوە، لێیان وەربگرە. پاشان بانگیان بکە تا لە شوێنی خۆیانەوە بگوازنەوە بۆ لای کۆچکەران، ئەگەر رازی نەبون، پێیان بڵێ کە وەك موسڵمانە دەشتەکیەکان ئەژمێردرێن، ولە غەنیمەو فەیء دا بەشیان نابێت، مەگەر لەشەڕدا بەشدار بن. ئەگەر رازی نەبون، داوای سەرانەیان لێبکە. ئەگەر بەگوێیان کردی، لێیان وەربگرە، ئەگەرنا، پشت بە خوا ببەستەو شەڕیان لەگەڵدا بکە. ئەگەر

گەمارۆی قەڵایەکت دا،ویستیان لە سەر پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەی دابیەزنن،ڕازی مەبەو،پەیمانی خۆتیان بەریێ. چونکە ئەگەر قسەی خۆتان بشکێنن ئاسانترە تاکو پەیمانی خوای گەورە بشکێنن. ئەگەر ویستیان لەسەر حوکمی خوای گەورە دایانبەزێنیت،ڕازی مەبە. بەڵکو لە سەر حوکمی خۆت دایان بەزێنە. چونکە نازانیت حوکمی خوای گەورەت دەربارەیان پێکاوە یان نا.

<u>**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**</u> صحیح مسلم - کتاب الجهاد والسیر باب تأمیر الإمام الأمراء علی البعوث - حدیث : ٣٣٤٨

<u>**مانای وشەکان//**</u> جیش: ئەو سەربازانەیە کە بۆ جەنگ ئەچن. سریة: بەشێکی لەشکرە،کە لە ناو لەشکرەکەوە دەرئەچن بۆ لێدانی دوژمن وپاشان ئەگەڕێنەوە ناو لەشکرەکە. یان نزیکەی ٤٠٠ کەسی سوارەیە.

هۆکاری ناونانەکەشی ئەوەیە کە بەشەودا هێرش ئەکەن. و تغلوا: خیانەت کردنە لە مالّی غەنیمەت. تغدروا: بێ وەفایی. تمثلوا: ئەتککردنی کوژراو،بە برینی لوتی یا گوێی یا عەورەتی،یا هەر ئەندامێکی تری لەشی.

الولید: منداڵێکە نەگەشتبێتە تەمەنی باڵق بون. إلی ثلاث خصال: بۆ یەکێك لەم سێ سیفەتانە. الغنیمة: ئەو ماڵەیە کە موسڵمانان بەشەڕ دەستیان ئەکەوێت. الفيء: ئەو ماڵەیە کە بێ شەڕکردن دەستی موسڵمانان ئەکەوێت. تخفروا: پەیمان بشکێنن. ذمة الله: گرێبەستی سوڵح وئاشتەوایی وشەڕ ڕاگرتن.

<u>**سەرباسەکان//**</u>

<u>**باسی یەکەم/**</u> فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی: هەر کاتێك سەرکردە کەسێکی بۆ شەڕ نارد،ئامۆژگاری ئەکات بە لە خواترسان،وە هەڵسوکەوتی چاك لەگەڵ هاوەڵانیدا. پاشان ئەمانەی پێ ڕائەگەیەنێت: حەرامبونی خیانەت لە ماڵی غەنیمەت،وە حەرامبونی پەیمان شکاندن وئەتککردن،وە حەرامبونی کوشتنی منداڵی بێباوەڕان. ئەمانە هەموو بە کۆدەنگی زانایان ، حەرامن.

**باسی دوەم/** لەبارەی بانگکردنی بێباوەران بۆ موسڵمان بون پێش شەڕکردن لە گەڵیاندا، چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: پێویستە پێش شەڕەکە بانگ بکرێن،جا ئەگەر پێشتر بانگ کرابێتن یان نا،وەك یەکە. ئەمەش ڕای مالك و هادویە،بەبەڵگەی: ڕوکەشی فەرمودە باسلێکراوەکە.

وەڵامیاندراوەتەوە بە فەرمودەی:پێغەمبەری خوا شەو دای بەسەر بەنو مصتەڵەقدا لە کاتێکدا بێ ئاگابون. شەڕ کەرەکانیانی کوشت و،نەوەکانیانی هێشتەوە.[1]

دوەم:پێویست نیە بانگ بکرێن.بەڵام بە فەرمودە باسلێکراوەکە وەڵامی ئەمان ئەدرێتەوە.

سێیەم: ئەگەر کەسێکیان پێیان نەگەشتبێت،واجبە بانگ بکرێن،ئەوانەیش کە بانگ کراون لە پێشتردا،چاك وایە بانگ بکرێنەوە. ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە وەك إبن المنذر ئەڵێت.بەبەڵگەی:

أ.فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب.فەرمودەکەی پێشووی ڕای دوەم.

ج.فەرمودەی کعب کوری ئەشرەف وکوشتنی إبن أبی الحقیق.

لەکتێبی البحردا کۆدەنگی زانایان باس ئەکات بۆ واجب بونی بانگکردنی ئەوانەی کە بانگ نەکراون.

**باسی سێیەم/** لەدوای ئەوەی کە بێباوەڕان موسڵمان بون،چاك وایە کە بۆ کۆچکردن بۆ لای موسڵمانان بانگ بکرێن. بەبەڵگەی:

أ.لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا مۆڵەتی تێدایە بۆ مانەوەیان.

ب.مانەوە لە بیاباندا لەوانەیە بێتە هۆکاری نەشارەزایی لە ئەحکامەکانی شەرع،لەبەر کەمی زانایان لەوێ.

---

[1] حديث نافع عن عبدالله بن عمر قال: أغار رسول الله صلى الله عليه وسلم على بني المصطلق وهم غارون،أي غافلون،فقتل مقاتلتهم وسبى ذراريهم.متفق عليه

**باسی چوارەم/** دەربارەی ئەو کەسانەی غەنیمەت و فيء یان پێدەدرێت،دوو ڕا هەیە:

یەکەم: تەنها بۆ ئەوانەیە کە کۆچیان کردوە،نادرێتە ئەوانەی کە لەدەشتا ئەژین،مەگەر بەشداری شەڕەکە بوبن. ئەمەش ڕای شافعیە،بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: جیاوازی ناکرێت لەنێوان ئەوانەدا کە کۆچیان کردوە لە گەڵ ئەوانەی کە لە شوێنی خۆیان ماونەتەوە. هەردولایان پێیان ئەدرێت. ئەمەش ڕای مالك وئەبوحەنیفەو هادویە. وە ئەڵێن فەرمودەکە نەسخ بۆتەوە،بەڵام لەسەر ئەم قسەیە هیچ بەڵگەیەکیان نیە.

**باسی پێنجەم/** جزیە (سەرانە) لەکێ وەر ئەگیرێت؟ دوو ڕا هەیە:

یەکەم: سەرانە لەهەموو بێباوەڕێك وەرئەگیرێت،خاوەن نامە ئاسمانیەکان بێت،یان نا،عەرەب بێت یا غەیری عەرەب. ئەمەش ڕای مالك وئەوزاعیە،و صەنعانیش پشتگیری کردوە. بە بەڵگەی: گشتگیری وتەی (عدوك) دوژمنەکەت ، کە لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا هەیە.

دوەم: تەنها لە خاوەن نامەکان ومەجوس وەرئەگیرێت،عەرەب بن یان نا.ئەمەش ڕای شافعیە،بە بەڵگەی:

أ.ئایەتی ﴿حتى يعطوا الجزية﴾ (التوبە: ٢٩ )،دوای ئەوەی کە باسی ئەهلی کتاب ئەکات.

ب.فەرمودەی: وەك خاوەن نامەکان ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن (مەجوس).[1]

وە ئەڵێن: جگە لەم دوو جۆرە،ئەوانی تر ئەکەونە ژێر حوکمی گشتگیری ئایەتی:﴿ وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة﴾ (البقرة:١٩٣). وە ئایەتی:﴿ فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم﴾.(التوبة:٥).

بۆ فەرمودە باسلێکراوەکەش ئەم وەڵامانە ئەدەنەوە:

---

[1] سنوا بهم سنة أهل الكتاب.

أ. نەسخ کراوەتەوە،چونکە پێش ڕزگارکردنی شاری مەککە وتراوە. بە بەڵگەی ئەوەی کە باسی کۆچکردنی تێدایە،وئایەتەکان دوای کۆچکردن هاتون.

بەڵام صەنعانی ئەڵێت: ئایەتەکان تەنها باسی وەرگرتنی سەرانە ئەکات لە خاوەن نامەکان. بەهیچ شێوەیەك باسی وەرگرتن یا وەرنەگرتن لە غەیری ئەوان ناکات. فەرمودەکەش باسی وەرگرتنی لەغەیری ئەوان ئەکات.

ب.یا لێك ئەدریتەوە بەوەی کە مەبەست لە دوژمن لە فەرمودەکەدا خاوەن نامەکانە.

صەنعانی وەڵامی ئەمەش ئەداتەوە کە: ئەو لێکدانەوەیە زۆر دورە لە ڕاستیەوە.

سێیەم: سەرانە لە عەرەبێك وەرناگیرێت کە ئەهلی کیتاب نەبێت. تەنها لەخاوەن نامەکان وەرئەگیرێت. وە لە غەیری عەرەبیش وەر ئەگیرێت.ئەمەش ڕای عیترەو حەنەفیەکانە.

**باسی شەشەم/** فەرمودەکە ئەوەی تێدایە کە: ڕێگری کراوە لە سەرکردە کە لەسەر پەیمانی خواو پێغەمبەر، ڕێك بکەوێت لەگەڵیان. بەڵکو ئەبێت لەسەر پەیمانی خۆی بێت.پێغەمبەری خوایش هۆکاری ئەوە لێك ئەداتەوە، کە: سەرکردە پەیمانی خۆی و هاوەڵانی بشکێنێت لای خوای گەورە باشترە لەوەی کە پەیمانی خوا بشکێنن. هەرچەندە پەیمان شکاندن لەهەموو کاتێکدا حەرامە.

دەربارەی جۆری ئەم ڕێگرتنەش ، دوو ڕا هەیە:

یەکەم: بۆ خۆ بە دور گرتنە لێی. بەڵام کۆدەنگی زانایان نیە لەسەر ئەم ڕایە.

دوەم: بۆ حەرامبونە،وەك ئەسڵی هەموو ڕێگرتنێك لەشەرعدا.

**باسی حەوتەم /** فەرمودەکە ئەوەی تێدایە کە: ڕێگری کراوە کەلەسەر حوکمی خوا ڕێك بکەوێت لەگەڵیاندا. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە: نازانرێت حوکمەکە ئەپێکێت یان نا. بۆیە لەسەر حوکمێك ڕێناکەوێت کە نازانێت ڕوئەدات یان نا. بەڵکو سەرکردە لەسەر حوکم و بڕیاری خۆی ڕێك ئەکەوێت لەگەڵیان.

**باسی هەشتەم/** فەرمانکردن بەڕێکەوتن لە گەڵیاندا بەپێی بڕیاری خۆی ،بەڵگەی ئەوەیە کە:

لە بوارەکانی ئیجتیهادا ڕاستی لەگەڵ یەك کەسدایە،وە هەموو موجتەهیدێك نەیپێکاوە.

**(١٦٧).عن الصعب بن جثامة قال: سئل رسول الله عن الدار من المشركين يبيتون، فيصيبون من نسائهم وذراريهم، فقال: هم منهم.**

**پرسيارکرا له پێغەمبەری خوا دەربارەی بێباوەڕان که به شەو بەسەریاندا بدرێت،وژن ومنداڵەکانیان پێوەبێت؟ فەرموی: ژن ومنداڵەکانیش هەر لەوانن(له حوکمی کوشتنیان).**

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير باب أهل الدار يبيتون - حديث : ٢٨٧١، صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير باب جواز قتل النساء والصبيان في البيات من غير تعمد - حديث : ٣٣٦٨.

**ماناى وشەکان//** التبييت: لەشەودا بدەن بەسەریاندا لەکاتێکدا که بێ ئاگان،وه تێکەڵن به ژن ومنداڵەکانیان. لەو کاتەدا ژن ومنداڵەکان بەرئەکەون بێ ئەوەی موسڵمانان مەبەستی کوشتنیان بێت.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** زانایان یەکڕان لەوەدا که: دروست نیه نیەتی کوشتنی ژن ومنداڵەکان هەبێت. ابن بطال وچەند زانایەکی تریش ئەم کۆدەنگیه ئەگێڕنەوە.

به بەڵگەی:

١.ڕێگری لێکراوە،وەك له فەرمودە باسلێکراوەکاندا هەیە.

٢.پێغەمبەری خوا به هاوەڵێك ئەڵێت: بەخالید بگەرەوەو پێی بڵێ: منداڵ نەکوژێت ،وکرێگرتەش نەکوژێت.[1]جەنگی حونەینیش یەکەم شەڕ بوو که خالد بەشداریکرد تیایدا له گەڵ پێغەمبەردا،پێش ئەوەش له ڕزگارکردنی مەککەدا بەشداری کردوە.

---

[1] قول النبي صلى الله عليهم لأحدهم: إلحق خالدا فقل له: لا تقتل ذرية ولا عسيفا. أخرجه البخاري.

٣. إبن عمر ئەڵێت: پێغەمبەری خوا لە شەڕێکیدا ئافرەتێکی بە کوژراوی بینی. دوای ئەوە ئینکاری لە کوشتنی منداڵ وئافرەتان کرد.[١]

٤. إبن عمر ئەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا هاتە شاری مەککەوە. ئافرەتێکی کوژراویان بۆ هێنا،فەرموی: ئەمە نەئەبوایە بکوژرایە.پاشان ڕێگری کرد لە کوشتنی ئافرەتان.[٢]

**باسی دوەم/** ئەگەر ئافرەتێك شەڕی کرد،ئەکوژرێت. ئەمەش ڕای شافعی و کوفیەکانە.بە بەڵگەی:

١.تێگەشتنمان بۆ فەرمودەی (لتقاتل) ،لە فەرمودە پێشوەکەی إبن عمردا.

لە فەرمودەی رباح کوڕی ڕەبیعی تەمیمیدا هاتوە: لە جەنگێکدا لە گەڵ پێغەمبەری خوادا بوین. بینی خەڵکەکە کۆمەڵیان کردوە، ئافرەتێکی بە کوژراوی بینی. فەرموی: نەئەبوایە ئەم ئافرەتە شەڕی بکردایە.[٣]

٢. پێغەمبەری خوا ڕەزامەندی دەربڕی کوشتنی ئەو ئافرەتەی کە ویستی یەکێك لە هاوەڵان بکوژێت.

عکریمە ئەیگێڕێتەوە: لە تائف پێغەمبەری خودا ئافرەتێکی بە کوژراوی بینی، فەرموی: ئایا ڕێگریمان نەکردن لە ژن کوشتن؟ کێ کوشتویەتی؟ پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، لە تەنیشتمەوە بوو،ویستی بمدات بە زەویدا و بمکوژێت. منیش کوشتم. پێغەمبەری خودا فەرمانی دا کە لاشەکەی بشارنەوە (بینێژن).[٤]

---

[١] عن إبن عمر: أن النبي صلى الله عليه وسلم رأى إمرأة مقتولة في بعض مغازيه،فأنكر قتل النساء والصبيان. متفق عليه.

[٢] أخرج الطبراني في الأوسط من حديث إبن عمر قال: لما دخل النبي صلى الله عليه وسلم مكة،أتي بإمرأة مقتولة. فقال: ما كانت هذه لتقاتل. ونهى عن قتل النساء.

[٣] في حديث رباح بن ربيع التميمي قال: كنا مع رسول الله في غزوة فرأى الناس مجتمعين ورأى إمرأة مقتولة،فقال: ما كانت هذه لتقاتل. أخرجه أبوداود والنسائي وإبن حبان.

[٤] عن عكرمة: أنه صلى الله عليه وسلم رأى إمرأة مقتولة بالطائف، فقال: ألم أنه عن قتل النساء؟ من صاحبها؟ فقال رجل: يا رسول الله، أردفتها فأرادت أن تصرعني فتقتلني فقتلتها. فأمر بها أن توارى. أخرجه أبوداود في المراسيل.

**باسی سێیەم/** دەربارەی کوشتنی ژن و منداڵ چەند ڕایەکیان هەیە،هەرچەندە لەوەدا یەکڕان کە دروست نیە لە سەرەتادا بکوژرێن:

ڕای یەکەم: دروستە بکوژرێن،ئەگەر لە کاتی شەڕدا بدرێت بە سەریاندا.ئەمەش ڕای شافعی و ئەبوحەنیفەو جمهورە. بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

فەرمودەی (هم منهم) بەڵگەیە لە سەر ڕەوایی کوشتنیان،ئەگەر تێکەڵ بە خەڵکێك بون کە شایانی کوشتنن،و جیانە ئەکرانەوە لێیان،نەك لەو کاتەدا کە کەسیان لە گەڵ نیە.

ڕای دوەم: دروست نیە بە هیچ شێوەیەك بکوژرێن،هەتا ئەگەر شەڕکەرەکان، لەناو ژن ومنداڵەکانیشدا بون. یان لە ناو کەشتی یا قەلأیەکدا بون کە ئەوانی تێدا بون. لەو کاتەدا نە کوشتنیان دروستە،وە نەسوتاندنیان. ئەمەش ڕای مالك و ئەوزاعیە. بە بەڵگەی:

ڕوکەشی فەرمودە باسلێکراوەکان.

ڕای سێیەم: تەنها لەو کاتەدا دروستە بکوژرێن، کە شەڕکەران لە ناویاندا بن. ئەمەش ڕای هادەویە.

وە ئەڵێن: ئەگەر لە ناو موسڵماندا خۆیان حەشاردابوو، دروست نیە بکوژرێن. مەگەر ترسی لە ناو چونی موسڵمانان هەبێت.

**باسی چوارەم/** دەربارەی چارەنوسی ژن و منداڵە کوژراوەکان،چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: لە ئاگری دۆزەخدان. بە بەڵگەی: فەرمودەی (هم منهم) کە بە ڕەهایی باسیکردوە.

دوەم: ئەوان لە بەهەشتدان. ئەمەش ڕای دروستە دەربارەی چارەنوسی منداڵان.

سێیەم: لە بڕیاردان لەو بارەیەوە ئەوەستین. ئەم ڕایەش بە لای صەنعانی دروسترین ڕایە.

(١٦٨) ١.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ..

هەر دڕندەیەك كەڵبەی هەبێت،خواردنی حەرامە.

٢.وعن إبن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بلفظ: نَهَى عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَكُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ.

ڕێگری كردوه لە خواردنی هەموو دڕندەیەك كەڵبەی هەبێت،وە هەموو باڵندەیەك كە دەنوكی هەبێت.

گێـڕەرەوەی فەرمودەكـە// ١. صحيح مسلم - كتاب الصيد والذبائح وما يؤكل من الحيوان باب تحريم أكل كل ذي ناب من السباع - حديث : ٣٦٦٧ ٢. صحيح مسلم - كتاب الصيد والذبائح وما يؤكل من الحيوان باب تحريم أكل كل ذي ناب من السباع - حديث : ٣٦٦٨

مانـای وشـەكان// الناب: كەڵبە،السبع: ئاژەڵی دڕندە. المخلب: نینۆكی هەر دڕندەیەك بە سەر زەویدا بڕوات، یا بە ئاسماندا بفڕێت.

سەرباسەكان//

باسـی یەكـەم/ زانایان دەربارەی خواردنی گۆشتی ئاژەڵێك كەڵبەی هەبێت،وە باڵندەیەك كە نینۆكی هەبێت،چەند ڕایەكیان هەیە:

ڕای یەكەم: حەرامن،بەڕای جمهورو هادویە وشافعی وأبوحەنیفە و أحمدو داود. بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكان.

ڕای دوەم: حەڵاڵن. ئەمەش ڕای إبن عباسە وەك إبن عبدالبر لێی ئەگێڕێتەوە. هەروەها ڕای عائشەو إبن عمرە لە ڕیوایەتێكی لاوازیدا.وە ڕای شەعبی و سەعیدی كوڕی جوبەیر. بە بەڵگەی:

ئایەتی: ﴿ قل لا أجد في ما أوحي إلي محرما ....﴾ ( الانعام: ١٤٥).

کەواتــە: حــەرام کراوەکــان ئەوانــەن لــەو ئایەتــەدا بــاس کــراون،وە جگــە لەوانە ی باسکراون ئەوانی تر حەڵاڵن.

وەڵام دراوەتەوە کە:

أ. ئــەم ئایەتــە مەککیــەو فەرمودەکــەی ئــەبو هــورەیرە،دوای کۆچــکردن بــوە بــۆ مەدینــە. کەواتــە فەرمودەکــە نەســخی حــوکمی ئایەتەکــەی کــردوە بــە لای ئەوانــەی کــە: پێیــان وایــە قورئــان بــە فــەرمودە نەســخ ئەکرێت.

ب. ئایەتەکە گشتگیرەو فەرمودەکانیش تایبەتن.

ڕای ســێیەم: کەراهــەتی هەیــە و حــەرام نیــە. ئــەم ڕایــەش لــە مالــك ئەگێڕنەوە.

<u>**باســـی دوەم/**</u> دەربــارەی ئــەو ئاژەڵانــەی کەڵبــەیان هەیــەو حــەرامن،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکــەم: دڕنــدە ئــەو ئاژەڵەیــە کــە گۆشــت ئــەخوات،وەك فیــل و کــەمتیارو گۆڕهەڵکەنە و پشیلە. ئەمەش ڕای ئەبو حەنیفەیە.

ڕای دوەم: ئــەو ئاژەڵەیــە کــە پــەلاماری مــرۆڤ ئــەدات،وەك:شــێرو گــورگ وپڵــنگ.بــەڵام کــەمتیارو ڕێــوی ناگرێتــەوە، چــونکە پــەلاماری مــرۆڤ نادەن.ئەمەش ڕای شافعیە.

(١٦٩). ١.عن عدي رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قال:سألت رسول الله عن صيد المعراض فقال: إذا أصبتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ،وإذا أصبتَ بِعرضه فقتل فإنه وقيذ، فلا تأكل..

پرسیارم کرد له پێغەمبەر دەربارەی ڕاوکردن به ئامێری المعراض ،ئەویش فەرموی: ئەگەر بە لا تیژەکەی کوشتت، ئەوە بیخۆ. بەڵام ئەگەر به لا پانەکەی بەری کەوتوو کوشتی، ئەوە مەیخۆ.

٢.عن عبدالله بن مغفل رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ أن رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نهى عن الخذف،وقال: إنها لاتصيد صيدا،ولا تنكأ عدوا. ولكنها تكسر السن،وتفقا العين..

پێغەمبەری خوا ڕێگری کردوە لە بەرد هەڵدان،وە فەرمویەتی: ڕاوی پێ ناکرێت ودوژمن ئەزیەت نادات. بەڵام دان ئەشکێنێت و،چاو کوێر ئەکات (دەرئەهێنێت).

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//**

١. صحيح البخاري - كتاب الذبائح والصيد باب التسمية على الصيد حديث : ٥١٦٢

. ٢. صحيح البخاري - كتاب الذبائح والصيد باب الخذف والبندقة - حديث : ٥١٦٧. صحيح مسلم - كتاب الصيد والذبائح وما يؤكل من الحيوان باب إباحة ما يستعان به على الاصطياد والعدو - حديث : ٣٧٠٨

**مانای وشەکان//** المعراض: إبن التين ئەڵێت: دارێکە لە لایەوە ئاسنی پێوەیە،کاتێك ڕاوچی هەڵی ئەدات ، ئەگەر بە لایە تیژەکەی بەر نێچیرەکە بکەوێت، گۆشتەکەی ئەخورێت.ئەگەر بە لا پانەکەی بەری بکەوێت، ناخورێت.الوقیذ: ئاژەڵێك یا باڵندەیەکە بە دار یان بە بەردێك ئەکوژرێت کە تیژ نەبێت. الموقوذة: نێچیرێکە تا مردن بە دار لێی دراوە.الخذف: هەڵدانی بەرد بە دوو پەنجە.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** دەربارەی كوشتن (ڕاو كردن) بە ئامێری قورس،یا بەرد،زانایان دوو ڕایان هەیە:

ڕای یەكەم: حەڵاڵ نیە.ئەمەش ڕای مالك و شافعی وئەبی حەنیفەو ئەحمەد و **ثەوریە**. بە بەڵگەی:

أ. هەردوو فەرمودە باسلێكراوەكە. فەرمودەی یەكەم ڕێگریە لە خواردنی نێچیرێك بە المعراض كوژرابێت. فەرمودەی دوەمیش : ڕێگریە لە خواردنی هەر گیان لەبەرێك بە بەرد كوژرابێت. چونكە بەرد بە قورساییەكەی پێی ئەكوژرێت، نەك بە تیژیەكەی.

ب. چونكە بە قورساییەكەی كوژراوە نەك تیژیەكەی.كە ئەوەش بە قورئان وە بە كۆدەنگی زانایان حەرامە.

ڕای دوەم: حەڵاڵە بە ڕەهایی. ئەمەش ڕای ئەوزاعی و مەكحول و زۆری تر لە زانایانی وڵاتی شامە.بە بەڵگەی:

**باسی دوەم/** فەرمودەی كالوقیذ ،واتە وەك ئەوەیە كە بە دارێك لێی دراوە تا گیانی دەرچوە. چونكە هەردوو بەشدارن لەوەدا كە بە تیژیەكەی ناكوژرێن.

**باسی سێیەم/** لەفەرمودەكەدا پێغەمبەری خوا ڕێگری كردوە لە بەرد هەڵدان كە بێسودە،وئەو زەرەرەش ئەگەیەنێت كە لە فەرمودەكەدا باسكراوە. هەروەها هەر كردارێكی هاوشێوەی ئەو، هەمان حوكمی هەیە.

**باسی چوارەم/** دەربارەی كوشتن بە قوڕێك كە وشك بوبێتەوە، بۆ نێچیرەكە هەڵبدرێت، وتویانە:

خواردنی نێچیرەكە دروست نیە، چونكە بە قورساییەكەی ئەكوژرێت. ئەمەش ڕای زۆربەی سەلەفە:

إبن عمر ئەڵێت: ئەوەی بە بندقە ئەکوژرێت،حوکمی ئەوەی هەیە کە بە بەردی ورد بکوژرێت.[1]

هەروەها سالم و قاسم و مجاهدو إبراهیم و عەتاو حەسەن،هەروەها بوخاریش، بە کەراهەتیان زانیوە.

لە فتح الباری دا ئەڵێت: زانایان یەکدەنگن لەوەدا (کەمێکیان نەبێت)،کە حەرامە خواردنی گۆشتی ئەو نێچیرەی بەو قوڕە وشکەو بە بەرد ئەکوژرێت. هۆی حەرامیەکەشی ئەوەیە کە: کوشتنەکە بە هێزو توانای ڕاوکەرەکەیە نەك بە تیژی ئامێرەکە.

بەڵام ئەگەر ڕاوچیەکە پێی گەشت و سەری بڕی، ئەوە خواردنی دروستە. وەك هەڵدانی قوڕو بەرد بۆ باڵندەی گەورە.

**باسی پێنجەم/** صەنعانی ئەڵێت: ئەو ئامێرانەی ئێستە مادەی ڕەصاص هەڵ ئەدەن، ئەوە ئاگری ئەو مادەیە ئەوەندە تیژە،کە نێچیرەکە بەو تیژیە ئەکوژرێت،نەك بە قورساییەکەی. کەواتە وا دیارە کە نێچیرەکە ،حەڵاڵە.

**(١٧٠). عن شداد بن أوس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إن الله تعالى كتب الإحسان في كل شيء،فإذا قتلتم فاحسنوا القتلة وإذا ذبحتم فاحسنوا الذبحة،وليحد أحدكم شفرته،وليرح ذبيحته.. ..**

خوای گەورە چاکەکردنی لە هەموو شتێکدا فەرز کردوە،ئەگەر کوشتتان،بەجوانی بکوژن،وئەگەر سەرتان بڕی، بەجوانی سەربڕن.با چەقۆکانتان بۆ سەربڕین تیژ بێت، ئیسراحەت بەسەربڕاوەکەتان بکەن.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح مسلم - كتاب الصيد والذبائح وما يؤكل من الحيوان باب الأمر بإحسان الذبح والقتل - حديث : ٣٧٠٩.

---

[1] أخرج البيهقي عن إبن عمر رضي الله عنهما أنه كان يقول: المقتولة بالبندقية تلك الموقوذة.

**مانــای وشــەکان//** الإحسان: لـە حەسـەنەوە هـاتوە واتـە: جـوان لەشـەرعدا یـا لای خــەڵکی. لیحــد: شــەقۆکەی تیــژ بکــات. الــشفرة: چــەقۆی گــەورە.وە هەر ئاسنێك کە گەورە بێت وە تیژ بێت. لیرح: با پشوی پێ بدات.

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** مەبەســت لــە فــەرمودەی: کتــب الإحــسان واتــە: واجبــی کــردوە،وەك خـــوای گـــەورە ئەفـــەرموێت:﴿إن الله یـــأمر بالعـــدل والإحـــسان﴾{النحـــل:٩٠}.واتـــە: خـــوای گـــەورە فـــەرمان ئـــەکات بـــە رەچـــاوکردنی دادپـــەروەری و چـــاکەکردن. لـــەوە زیـــاتریش باســـی لێـــوەکراوە: ئـــەویش چـــاکەکردنە لـــە کوشـــتندا،ئاژەڵ بێـــت یـــا مرۆڤ،لەسزاداندا بێت (کوشتنەکە) یا لە شتی تردا بێت.

**باســـی دوەم/** فەرمودەکـە بەڵگـەی نارەوایـەتی کوشـتنەوەیەکە وەك ئـەو شـێوەیەی کـەپێی کـوژراوە. بـەڵام لەوانەیـە بـە ئایـەتی:﴿فمـن إعتـدى علـيكم فاعتـدوا عليـه بمثـل مـا اعتـدى علـيكم﴾{البقـرة:١٩٤}.واتـە: کەسـێك دەسـتدرێژی کـردە سـەرتان،وەك هاوشـێوەی خـۆی ئێـوەش دەسـتدرێژی بکەنەوە سەر.ئەم فەرمودەیە تایبەت بکرێت.

**باســی ســێیەم/** بـە هـەردوو فـەرمودەی ولیحـد وە ولـیرح،فەرمودەکـە هەنـدێك شـێوەی چـاکە کردنمـان بـۆ ڕون ئەکاتەوە،ئـەوەش بەتیـژکردنی چـەقۆو خێراو جوان سەربڕینی.

**(١٧١). عن إبن عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عن النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: عذبت إمرأة في هرة سجنتها حتى ماتت، فدخلت النار فيها، لاهي أطعمتها وسقتها، ولا هي تركتها تاكل من خشاش الأرض.**

ئافرەتێك سزادرا بەهۆی پشیلەیەکەوە،کە بەستبویەوە تامرد: نەخواردن وخواردنەوەی ئەداپێی،نە ئەیهێشت لەمێروەکانی سەرزەویش بخوات.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء باب حديث الغار - حديث : ٣٣١٢. صحيح مسلم - كتاب البر والصلة والآداب باب تحريم تعذيب الهرة ونحوها من الحيوان الذي لا يؤذي - حديث : ٤٨٥٥

**ماناى وشەكان//** هرة: مێینەی پشیلە. خشاش: مێروی سەر زەوی.

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** دەربارەی دینی ئافرەتەکە،دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: ئافرەتەکە موسڵمان بوە،بەڵام بەهۆی ئەو تاوانەوە خراوەتە ئاگرەوە. ئەمەش ڕای نەوەویە.

ڕای دوەم: بێباوەرش بوە. ابونعیم لە کتێبی مێژوی ئەصفەهاندا ئەڵێت: بەهۆی بێباوەڕیەکەیەوە سزادراوە،وبەهۆی ئازاردانی پشیلەکەشەوە،سزاکەی زیاتربوە.عائشە ئەڵێت: بەهۆی بێباوەڕی و ستەمکردنیەوە شایانی سزادان بوە.[1]

**باسی دوەم/** ڕوایەتێك هەیە ئەڵێت: ئافرەتەکە حمیری بوە. ڕیوایەتێکی موسلیمیش ئەڵێت : لە بنو إسرائیل بوە. ئەم دوو ڕیوایەتە بەو شێوەیە

[1] روى البيهقي في البعث والنشور عن عائشة : فاستحقت العذاب بكفرها وظلمها.

ڕێك ئەخرێن كە: كۆمەڵێك لە تیرەی حومەیر هاتنە ناو ئاینی جولەكەوە. كەواتە كە ئەوتریت لە بنو إسرائيل بوە،واتە دینی ئەوانی هەبوە.كە ئەشوترێت حومەیریە،واتە لەو تیرەیەیە.

**باسی سێیەم/** دەربارەی كوشتنی پشیلە ،چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەكەم: كوشتنی حەرامە،بەبەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكە. سزادانیش لەسەر كردنی ئیشێكی حەرامە.

ڕای دوەم: ئەگەر پشیلەكە هێرشی كردە سەر مرۆڤ وە زەرەری پێگەیاند،دروستە بكوژرێت. ئەمەش دروسترین ڕایە لای الدمیری لە ڕاڤەكردنی كتێبی المنهاج دا.

ڕای سێیەم: لە كاتی ئاساییشدا دروستە بكوژرێت،وەكو ئەو پێنج گیانەوەرەی كوشتنیان دروستە. ئەمەش ڕای قازیە.

**باسی چوارەم/** دروستە پشیلە لە ماڵدا بهێڵرێتەوە و ببەسترێتەوە،بەمەرجێك: خواردنی بدرێتێ. بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێكراوەكە.

**باسی پێنجەم/** واجب نیە خواردنی بدرێتێ،بەڵكو تەنها واجبەكە ئەوەیە بۆ خواردن ڕێی لێ نەگیرێت. ئەمەش ڕای صەنعانیە.

**باسی شەشەم/** حەرامە پشیلەو ئاژەڵی تریش ببەسترێتەوە بێ خواردن وخواردنەوە. چونكە:

أ. فەرمودە باسلێكراوەكە.

ب. ئەمە سزادانی دروستكراوەكانی خوایە،كە ڕێگری لێكراوە.

(١٧٢). ١.عن إبن عمر رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا عن رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أنه أدرك عمر بن الخطاب في ركب، وعمر يحلف بأبيه، فناداهم رسول الله: ألا إن الله ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم، فمن كان حالفا فليحلف بالله، أو ليصمت..

پێغەمبەری خوا لەکاروانێکدا بەعومەر گەشت، لەکاتێکدا عومەر سوێندی بە باوکی ئەخوارد. پێغەمبەری خوا بانگی کردن: خوای گەورە رێگریتان ئەکات لەسوێند خواردن بەباوکتان. ئەوکەسەی سوێند ئەخوات، با بەخوا سوێند بخوات، یان بێدەنگ بێت.

٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ مرفوعا: لا تحلفوا بآبائكم، ولا بأمهاتكم، ولا بالأنداد، ولا تحلفوا إلا وأنتم صادقون.

سوێند بەباوکانتان مەخۆن، و بەدایکانتان مەخۆن، و بەبتەکان مەخۆن. بە ڕاستگۆیی نەبێت سوێند مەخۆن.

گێڕەرەوەی فەرموودەکە// ١. صحيح البخاري - كتاب الأدب باب من لم ير إكفار من قال ذلك متأولا أو جاهلا - حديث : ٥٧٦٢. صحيح مسلم - كتاب الأيمان باب النهي عن الحلف بغير الله تعالى - حديث : ٣١٩٠

٢.أبوداود ونسائي. سنن أبي داود - كتاب الأيمان والنذور باب في كراهية الحلف بالآباء - حديث : ٢٨٤٣[1]

ماناي وشەكان// الأيمان: كۆی وشەی یمینە، مانای دەست ئەگەیەنێت. بە پەیمان بەستن وتراوە یمین، چونکە بەشداربوەکان دەستی ڕاستی یەکتریان ئەگرت. الركب: بریتیە لە کاروانێکی دە وشترو زیاتر، هەروەها بۆ ئەسپیش بەکار دێت. الند: بریتیە لەو بتانەی کە ئەیان پەرست جگە لە خودا، کاتێکیش سوێندیان ئەخوارد، ئەیانوت : سوێند بە لات و عوززا.

[1] صححه الألباني في صحيح أبي داود ( ٣٢٤٨ ).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەی فلیحلف بالله: مەبەست لێی ئەوە نیە کە تەنها بەم وشەیە سوێند بخورێت. چونکە پێغەمبەری خوا وشەی تریشی بۆ بەکار هێناوە،وەکو : یا مقلب القلوب.

**باسی دوەم/** دەربارەی ڕێگری کردن لە سوێند خواردن بە جگە لە خودا، دوو ڕا هەیە:

ڕای یەکەم: بۆ حەرام بونە، بە ڕای حەنابلەو زاهریە. صەنعانی بە ڕایەکی بەهێزی داناوە.

إبن عبدالبر ئەڵێت: بە کۆدەنگی زانایان، سوێند خواردن بە جگە لە خودا دروست نیە.

لە گێڕانەوەیەکیدا ئەڵێت: سوێند خواردن بە جگە لە خودا،باش نیەو ڕێی لێگیراوە.وە بۆ هیچ کەس نیە سوێندی پێ بخوات.کە ئەڵێت دروست نیە،واتە حەرامە وەك چۆن لە سەرەتادا بە ڕاشکاوی وتویەتی.

ماوردی ئەڵێت: بۆ هیچ کەس نیە کە سوێندی هیچ کەس بدات بە جگە لە خودا،وەك تەڵاق و بەندە ئازادکردن و نەزر کردن. ئەگەر دادوەریش سوێندی کەسێك بدات بەو شێوەیە، ئەبێت لابرێت.

بەڵگەی حەرامبونەکەش:

١. ڕێگری کردن لە هەردوو فەرمودە باسلێکراوەکەدا. ڕێگری کردنیش بۆ حەرامبونە.
٢. فەرمودەی إبن عمر: **هەرکەسێك** سوێند بە جگە لە خودا بخوات،بێباوەڕ ئەبێت. لەڕیوایەتی حاکم دا: هەر سوێندێك بە جگە لە خودا بخورێت، هاوەڵ پەیدا کردنە بۆ خودا. لە ڕیوایەتی

احمـدا: کەسـێك سـوێند بـە جگـە لـە خـودا بخـوات، هاوبـەش پەیـدا کەرە بۆ خودا.[1]

٣. هـەر کەسـێك لـە ئێـوە سـوێندی خـواردوو ، لـە سـوێندەکەیدا وتـی: سوێند بە لات و عوزا، با بڵێت: لا إله إلا الله.[2] موسلیم .

٤. کاتێـك سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەقـاص سـوێند بـە لات و عـوزا ئـەخوات،و بـۆ پێغەمبـەری خـودای ئەگێڕێتـەوە، ئەفـەرموێت: بڵـێ: لا إلـه إلا الله وحـده لا شـريك له،لـه الملـك ولـه الحمـد،وهو علـى كـل شـيء قـدير. پاشان سێ جار بـە لای چەپدا تـف بکەو، پەنا بگرە بە خودا لە شەیتان و،جارێکیتر دوبارەی مەکەرەوە.نسائی[3]

ئـەم فەرمودانـەی دوایـی، ئـەو ڕایـە بـە هێـز ئەکـەن کـە سوێند خواردنەکـە حـەرام ئەکـەن.چـونکە بەڕاشـکاوی ئـەڵێت هاوبـەش پەیداکرنـە، بـێ لێکدانـەوە. لەبـەر ئـەوە فـەرمانی کـردوە بـە تازەکردنـەوەی بـاوەڕو وتـنی وشەی یەکتاپەرستی.

دوەم: مەکروهـە: بـەڕای جمهـوری شـافعیەکان و ڕای دیـاری مالکیـەکان. ئەمـەش ڕای هادەویەکانـە، بـە مـەرجێك مەبەسـتی بـە گـەورەدانان نـەبێت. بەڵگەشیان:

١. فـەرمودە باسـلێکراوەکە.سـەرفرازبوو سـوێند بـە بـاوکی، ئەگـەر ڕاست بکات.

---

[1] حديث إبن عمر رضي الله عنهما : من حلف بغير الله فقد كفر. رواه أبوداود والحاكم واللفظ له.وفي رواية الحاكم: كل يمين يحلف بها دون الله تعالى شرك. ورواه أحمد بلفظ: من حلف بغير الله فقد أشرك.

[2] من حلف منكم فقال في حلفه : واللات والعزى، فليقل: لا إله إلا الله.أخرجه مسلم

[3] حديث سعد بن أبي وقاص أنه حلف باللات والعزى. قال: فذكرت ذلك للنبي صلى الله عليه وسلم، فقال: قل: لا إله إلا الله وحده لا شريك له،له الملك وله الحمد،وهو على كل شيء قدير وانفث عن يسارك ثلاثا،وتعوذ بالله من الشيطان الرجيم ولا تعد. النسائي

وەڵام دراوەتەوە کە:

أ. إبن عبدالبرئەڵێت: ئەم وشەیە لە فەرمودەکەدا نەبیستراوە، بەڵکو ڕاویەکەی ئەیگێڕێتەوە: سوێند بە خودا سەرفراز بوە، ئەگەر ڕاست بکات.بەڵکو هەندێك کەس ئەڵێن : ڕاویەکە وشەی والله هەڵگێڕاوەتەوە بۆ وأبیە.

ب. . ئەم وشەیە وەك سوێند خواردن نیە، بەڵکو تەنها وەك وشەیەکە کە ڕۆژانە بەکاردێت بێ سوێند خواردن.وەك ئەڵێن تربت یداك.

ج. لە پێشدا سوێند خواردن بەو شێوەیە دروست بوو، پاشان نەسخ بۆتەوە.ماوردی وا ئەڵێت. سوهەیلی ئەڵێت: زۆربەی لێکۆڵەران لە سەر ئەو ڕایەن.بەڵام منزری ئەڵێت: بانگەشەی نەسخ بونەوە لاوازە، چونکە ئەتوانرێت کۆبکرێنەوە، مێژوەکەشی نازانرێت تا نەسخ بێت.

د. وشەی لابراوە کە وایە: سوێند بە خودای باوکی سەرفرازبوو..بەیهەقی وا ئەڵێت.

٢. فەرمودەی: ئەوە هاوبەش پەیدا کەرە، زانایان ئەڵێن: بۆ قورس کردنە وەك فەرمودەی: ڕیابازی هاوبەش پەیدا کردنە.

وەڵام دراوەتەوە کە: ئەم ڕایە بێباوەڕی لە سوێند خۆرەکە لا ئەبات.بەڵام حەرامبونەکە هەر ئەمێنێتەوە. هەروەك چۆن ڕیابازی حەرامە،هەرچەندە خاوەنەکەی بێباوەڕ نابێت.

٣. خوای گەورە لە قورئاندا سوێندی بە دروستکراوەکانی خواردوە،وەك خۆرو مانگ و ..

وەڵام دراوەتەوە کە: بۆ بەندە نیە چاو لە خودای گەورە بکات،چونکە بە ویستی خۆیەتی چی کرد، وە چ بڕیارێکی دەرکرد. بەڵام ئەم سوێندان

وا لێکدراونەتەوە کە سوێند خواردنە بە: خوای خۆرو ،خوای مانگ و هەروەها..

<u>باسی سێیەم/</u> نهێنی ڕێگری کردن لە سوێندخواردن بە جگە لە خودا ئەوەیە کە:

سوێند خواردن بە شتێك بە گەورە ڕاگرتنی ئەو کەسە ئەگەیەنێت.لە ڕاستیدا گەورەیی تەواویش تەنها بۆ خودای گەورەیە.کەواتە تەنها سوێند بە خوداو سیفاتەکانی ئەخورێت. ئەمەش یەکدەنگی زانایانی لە سەرە.

<u>باسی چوارەم/</u> حەرامە سوێند خواردن بە دەرچون لە ئیسلام وە لەدین، وە سوێند کە ببێت بە جولەکەو لەو بابەتانە. بە بەڵگەی:

فەرمودەی بورەیدە لە پێغەمبەری خوداوە: هەر کەسێك سوێندی خوارد و وتی: من بێبەریم لە دینی ئیسلام، ئەگەر لە سوێنەکەیدا ڕاستگۆ بوو،ئەوە بەو شێوەیەیە کە وتویەتی، ئەگەر بە درۆ ئەیوت،ئەگەر بۆ دینیش بگەڕێتەوە،بە ساغی ناگەڕێتەوە.[1]

ڕای دیاریش ئەوەیە:

لە سوێند خواردن بەم حەرامکراوانە، کەفارەت واجب نابێت، چونکە:

أ. کەفارەت بۆ کارێکە خوا ڕێی پێدابێت، نەك قەدەغەی کردبێت.

ب.لە شەرعدا کەفارەتی ئەم سوێندانە باس نەکراوە، بەڵکو تەنها باسی وتنی وشەی یەکتاپەرستی کراوە.

---

[1] حديث بريدة أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: من حلف فقال: إني بريء من الإسلام،فإن كان كاذبا فهو كما قال. وإن كان صادقا فلن يرجع إلى الإسلام سالما. أخرجه أبوداود وابن ماجه والنسائي بإسناد على شرط مسلم.

**(١٧٣). عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رسول الله( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): من ولي القضاء فقد ذبح بغير سكين..**

کەسێك بوە دادوەر،ئەوە بەبێ چەقۆ سەربڕاوە.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە**// ئەحمەد وە چوار کەسەکە. سنن أبي داود – كتاب الأقضية باب في طلب القضاء – حديث : ٣١١٧ ..[1]

**سەرباسەکان**//

**باسی یەکەم**/ فەرمودەکە بەڵگەیە لە سەر: ئاگادارکردنەوە لە دادوە ری کردن و ،چونە ناو کاری دادوەری. زانایانی پێشین ودوای ئەوانیش بەو شێوە لێی تێگەشتون.وەك بڵێت: هەر کەسێك ببێتە دادوەر،خۆی توشی سەربڕینی خۆی کردوە. با ئاگادار بێت و وریا بێت: چونکە ئەگەر بڕیاری ناڕەوا دەر بکات،بیزانێت یان نەیزانێت، لە ئاگردایە.

**باسی دوەم**/ دەربارەی مانای خۆی سەربڕیوە، چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: لە ناوبردنی، واتە: بە دادوەری کردن خۆی لەناو بردوە.وتویەتی بە بێ چەقۆ،تا ڕای بگەیەنێت کە مەبەستی مل لێکردنەوە بە چەقۆ نیە، بەڵکو مەبەستی لەناوبردنی نەفسە بە سزای ڕۆژی دوایی.

دوەم: بە مەعنەوی نەك مادی خۆی لە ناو بردوە:

چونکە ئەگەر ڕاستی بپێکێت،نەفسی ماندوو ئەکات لە دنیادا، چونکە بە دوای ڕاستیدا ئەگەڕێت و ئەو خاڵانەی کە پێویستە بایەخی پێبدات لە سەیر کردنی داواو هەڵوێست دەربڕین بەرامبەر هەردوو لایەن و، یەکسانی و دادپەروەری بەرامبەریان. ئەگەر بە هەڵەشدا چوو، سزای قیامەت لێی نابێتەوە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا ماندوو بون چاوەڕێیەتی.

إبن الصلاح ئەڵێت: خۆی سەر ئەبڕێت ، واتە: دادوەر لە نێوان سزای دنیاییدایە ئەگەر پێکای.وە سزای قیامەت ئەگەر هەڵەی کرد.

---

[1] صححه الألباني في صحيح الترمذي( ١٣٢٥ ).

**(١٧٤). عـن علـي رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قـال: قـال رسـول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ): إذا تقاضى إليـك رجـلان فـلا تقـض لـلأول حتـى تـسمع كـلام الآخر، فـسوف تـدري كيـف تقضي. قال علي: فما زلت قاضيا بعد.**

ئەگــەر دوکــەس بــۆ دادوەری هــاتن بۆلات،بریــاربۆ یەکــەم مــەدە تــا قــسەی دوەمــیش نەبیــستی،چونکە وا ئــەزانیت چــۆن بریارئــەدەی.عــەلی ئــەڵێت: تــا ئێستاش بەوشێوەیە قەزاوەت ئەکەم.

**گێــــڕەرەوەی فەرمودەکــــە//** ئەحمــەد وە ئــەبوداود، ترمــذیش بــە حەســەنی داناوە،وە ئیبن حبانیش بە صەحیح.[1]

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** پێویــستە دادوەر یەکــەم جــار داوای داواکــار ببیــستێت، پاشان وەڵامی داوالێکراو.بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

**باســــی دوەم /** بــۆ دادوەر نیــە لــە پــێش ئــەوەی وتــەی داوالێکــراو ببیستێت،بڕیار بدات.

لە کاتی وەڵامدانەوەی بەرامبەردا:

ئەگــەر بــە ئەنقەســت پــێش ئــەوەی وەڵــامی داوا لێکــراو ببیــستێت، بڕیاریــدا، بڕیارەکــەی پوچــەو نەنگیــە لــە کەســایەتیدا.ئەگــەر بــە هەڵــەش بــوو، بــە نــەنگی دانانرێــت. بــەڵام بڕیارەکــە بــە شــێوەیەکی ڕاســت دوبــارە ئەکاتەوە.

بــەڵام لــە کــاتی بێــدەنگ بــونی داوا لێکــراو لــە وەڵامدانــەوە. یــا وتــی: دانــی پێــدا نــانێم و نکــولیش ناکــەم، دەربــارەی بڕیــاری دادوەر لــەو کاتــەدا، چــەند ڕایەك هەیە:

---

[1] حسنه الألباني في صحيح الترمذي (١٣٣١).

یەکــەم: بڕیــار لــە دژی دەرئەکرێت،چــونکە بەڕاشــکاوی سەرپێــچی کــردوە. ئەگــەر دادوەر ئــارەزوی لێبێت،دەســت بەسەریــشی ئــەکات،تاکو یــان دانــی پێــدا ئــەنێت، یــان نکــولی لــێ ئــەکات.ئەمــەش ڕای مالیــك و یەحیایــە لــە کتێبی البحردا.

دوەم: بڕیــــار لـــە دژی دەرئەکرێت،چـــونکە پێویـــستە ڕاســـتەوخۆ وەڵـــام بداتەوە. لە بەر ئەوەی بێدەنگ بونی وەك نکولی کردنە.

وەڵــام دراوەتــەوە کــە: نکــولی کردن،ســوێند نەخواردنــە.ئەمــەش پەیوەنــدی بەوەوە نیە.

سێیەم: دەســت بــە ســەر ئــەکرێت،تا یــان دانــی پێــدا ئــەنێت، یــا نکــولی لــێ ئەکات.

وەڵــام دراوەتــەوە کــە: وەڵــام نەدانــەوە بەســە بــۆ ئــەوەی بڕیــار لــە دژی دەربکرێت،چــونکە بڕیارەکــە بــۆ نەهێــشتنی نــاکۆکی ولابردنــی زیانەکانــە (پێویست بە دەست بە سەر کردن ناکات).

چــوارەم: وەك بڕیــــار بەســــەر کەســــی ئامــــادە نەبودا،ئــــەو کەســــەی ڕێــــی داوەبڕیــار بــە ســەر ئامــادە نــەبودا دەربکرێــت، ڕێگەشــی داوە بڕیــار بــە ســەر ئــەو کەســەدا دەربکرێــت کــە وەڵــام ناداتــەوە.لەبــەر ئــەوەی هــەردولا، لــە وەڵــام نەدانەوەدا بەشدارن. ئەمەش ڕای دروستە.

<u>باســی ســێیەم/</u> دەربــارەی حــوکمی بڕیــاردان لــە دژی ئامــادە نــەبودا،دوو ڕا هەیە:

یەکــەم: بڕیــار لــە دژی دەرناکرێــت. ئەمــەش ڕای زەیــدی کــوڕی عــەلی و ئــەبو حەنیفەیە. بە بەڵگەی:

أ. فــەرمودە باســلێکراوەکە، چــونکە بەڵگەیــە لــە ســەر ئــەوەی کــە: بڕیــار نادرێت تا گوێ لە داوالێکراو نەگیرێت. ئامادە نەبویش وەڵامی نیە.

ب.ئەگـــەر بڕیـــاردان لـــە دژی دروســـت بوایە،پێویـــستی بـــە ئامـــادە بـــون نەئەکرد.

دوەم: بڕیـــاری بـــە ســـەردا دەر ئـــەکرێت. ئەمـــەش ڕای هادەویـــەو مالـــك وشافعیە. بە بەڵگەی:

١. فەرمودەکەی هیند.
٢. ئامـــادە نـــەبوو، مافەکـــەی نافـــەوتێت، هـــەر کاتێـــك ئامـــادەبوو وە بەڵگـەی هـەبوو، گـوێی لـێ ئـەگیرێت،و بڕیـاری لـە سـەر دەر ئـەکرێت، ئەگـــەر بڕیـــارە پێـــشوەکەش هـــەڵ بوەشـــێنێتەوە. چـــونکە وەك بـــە مەرج دانراو وەهایە.
٣. فەرمودە باسلێکراوەکە بۆ کاتێکە کەسەکە ئامادە بێت.

**(١٧٥). عن أبي بكرة رَضِيَ اللّهُ عَنهُ، عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قـال: لـن يفلح قوم ولوا أمرهم إمرأة..**

هـــیچ کۆمـــەڵێك ســـەرکەوتوو نابن،کاروبـــاری خۆیـــان بخەنـــە دەســـت ئافرەتەوە.

<u>گێــــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//</u> صحيح البخاري - كتاب المغازي باب كتاب النبي صلى الله عليه وسلم إلى كسرى وقيصر - حديث : ٤١٧٢

<u>سەرباسەکان//</u>

<u>باســـی یەکـــەم/</u> دەربـارەی دانـی لێپرسـراوێتی بـە ئـافرەت، چـەند ڕایـەك هەیە:

یەکـەم: هەرچـەندە شـەرع وای دانـاوە کـە ئـافرەت سەرپەرشـتیارە لـە مـاڵی خۆیـدا، بـەڵام دروسـت نیـە هـیچ کاروبـارێکی گـشتی موسـڵمانانی پـێ بدرێت. ئەمەش ڕای جمهورە، بە بەڵگەی:

أ. فـەرمودە باسـلێکراوەکە. دور کەوتنـەوە لـە کارێـك کـە سـەر فـرازی تێدا نەبێت، واجبە.
ب. دادوەری پێویـــستی بـــە عـــەقڵی تـــەواوە،و ڕای ئـــافرەتیش کـــەم و کوڕی تێدایە، بە تایبەتی لە کۆبونەوەی پیاواندا.

دوەم: تەنها لە سزاکاندا نەبێت،دروستە بڕیار بدات. ئەمەش ڕای حەنەفیە.

سێیەم: بۆ هەموو کاروبارێك دروستە. ئەمەش ڕای إبن جەریرە.

باسی دوەم/ فەرمودەکە هەواڵمان ئەداتێ بە سەرفرازنەبونی کۆمەڵێك کە ئافرەت سەرپەرشتیاریان بێت. موسڵمانانیش فەرمانیان پێکراوە کە هۆکاری سەرفرازی بە دەست بهێنن و دورکەونەوە لە سەرشۆڕی.

**( ١٧٦ ). عن أبي مريم الأزدي عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: من ولاه الله شيئا من أمور المسلمين فاحتجب عن حاجتهم وفقيرهم،إحتجب الله دون حاجته.**

هەر کەسێك شتێك لە کاروباری موسڵمانانی کەوتە دەست،ئەویش خۆی لە پێویستی و لەهەژارانیان بشارێتەوە،خوای گەورە پێویستیەکانی بۆ جێبە جێ ناکات.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە// ئەبوداود و ترمذي. سنن أبي داود- كتاب الخراج والإمارة والفيء باب فيما يلزم الإمام من أمر الرعية والحجبة عنه – حديث : ٢٥٧٤.[1]

**سەرباسەکان//**

باسی یەکەم/ فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: هەر کەسێك کارو بارێکی موسڵمانان بگرێتە دەست،پێویستە خۆیان لێ بەدور نەگرێت، بینینی ئاسان بکات بۆیان، تا هەر کەسێك هەژار بێت یان نا، بە ئاسانی بگاتە لای.

باسی دوەم/ فەرمودەی إحتجب الله عنه ، کنایە یە لەوەدا کە خوای گەورە بەزەیی و بەخششی خۆی ئەگرێتەوە لێیان.

[1] صححه الألباني في صحيح أبي داود ( ٢٩٤٨ ).

<u>باســی ســێیەم/</u> ئایـا لێپرسـراوو بـۆی هەیـە دەرگـاوانی هـەبێت؟ دوو ڕا هەیە:

یەکـەم: نابێـت لێپرسـراو دەرگـەوانی هـەبێت. ئەمـەش ڕای شـافعی و کۆمەڵێکە.چونکە پێشینەکان نەیانبوە.

وەڵام دراوەتەوە کە:

١. ڕاسـتە لـە سـەردەمی پێـشیندا نـەبوە. بـەڵام کـوا پیـاوانی وەك ئەوانمان دەست ئەکەوێت.

٢. ئـەو ڕایـە بـۆ کاتێکـە خـەڵکی لـە سـەر خێـر کۆببنـەوەو گوێڕایـەڵی لێپرسراو بن.

دوەم: بونی دەرگەوان دروستە.

سێیەم: بونی کارێکی باشە.لە بەر ئەم بەڵگانە:

١. بـۆ ڕێکخـستنی لایەنـە ناکۆکـەکان، ڕێگـری کـردن لـە دەسـت درێـژی کاران و، دژایەتی خراپە.

٢. سـەرقاڵبونی خـەڵك بـە دەمـە قـاڵێوە: ئەگـەر دادوەر دەرگـاوانی نـەبێت، لـە هـەموو کـاتێکی شـەوو ڕۆژیـدا لـە کـاتی خـواردن وخواردنەوەیدا،وە لـە کاتێکـدا لـە گـەڵ خێزانەکەیدایـە: یـا لـە کـاتی نوێژ کردنیدا، لایەنە ناکۆکەکان دێن بۆ لای.

٣. پێغەمبەری خودا لە هەندێك کاتدا دەرگاوانی هەبوە .

<u>باسـی چـوارەم/</u> ئـەرکی دەرگـاوان ئەوەیـە کـە: بـاردۆخی ئامـادەبوان بگەیـەنێت بـە لێپرسـراو، بـە تایبـەتی خـاوەن کەسـایەتیەکان. لەوانەیـە بـۆ داوەری کـردن بێـت لێپرسـراوەکەش وا ئـەزانێت بـۆ سـەردان هـاتوە،ڕێزێکی زیـاتری لـێ ئـەگرێت، کـە دروسـت نیـە ئـەو ڕێـزە لـە کەسـی سکاڵاکار بگیرێت.

**(١٧٧). عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: لعن رسول الله الراشي والمرتشي في الحكم.**

**پێغەمبەری خوا لەعنەتی لەبەرتیل دەر و بەرتیل خۆر لەحوکمدا کردوە.**

**گێـــرەرەوەی فەرمودەکــــە//** مسند احمد (٦٤٩٦)، الترمذي، الأحكام باب ما جاء في الراشي والمرتشي في الحكم.وصححه الألباني في صحيح الترمذي(١٣٣٦).

**سەرباسەکان//**

**ماناى وشەکان//**

اللعن: دور کەوتنەوە لەو شوێنانەی کە بەزەیی خودای تیایە. الراشي: ئەو کەسەیە ماڵێك ئەبەخشێت تا بە هۆیەوە بگاتە ناهەقیەك. ئەو پەتەیە کە ئاوی پێ دەرئەهێنرێت لە ناو بیردا. المرتشي: بەرتیل وەرگر، لێپرسراو. الرائش: ئەو کەسەیە لە نێوانی پارە دەرو وەرگرەکەدایە یا بۆ خۆی پارەش وەرنەگرێت. ئەگەر وەری گرت تاوانەکەی گەورەترە.

**باســی یەکــەم/** لەعنەت کردنی کەسانی تاوانبار لە ئەهلی قیبلە، دروستە.

بە بەڵگەی: فەرمودە باسلێکراوەکە.

بەڵام فەرمودەی: موسڵمان لەعنەت ناکات. مانکەی ئەوەیە:

أ. لەعنەت لە کەسێك ناکات کە شایانی نیە،و خواو پێغەمبەرەکی لەعنەتیان لێ نەکردوە.

ب. یاخود: زۆر لەعنەت بەکار ناهێنێت.وشەی لعان وا ئەگەیەنێت.

**باســـی دومم/** بەرتیل وەرگرو بەرتیل دەر هەردوکیان شایانی لەعنەتن، چونکە:

بەرتیل دەر بە ماڵەکەی ئەیەوێت بگاتە ناهەق. وە بەرتیل خۆریش لە بەر ئەوەی بڕیاری ناهەقی دەرکردوە.

باسی سێیەم/ بەرتیل حەرامە، بۆ قازی یا دادوەر بێت، یا بۆ ئەو کەسەی زەکات و خێر کۆ ئەکاتەوە، یا بۆ هەر کەسێکی تر. بە بەڵگەی:
أ. ئایەتی: ﴿ ولا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل وتدلوا بها إلى الحكام لتأكلوا فريق من أموال الناس بالإثم وانتم تعلمون ﴾ (البقرة: ١٨٨)
ب. فەرمودە باسلێکراوەکان.
ج. کۆدەنگی زانایان.

(١٧٨). عن إبن عباس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا أن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: لو يعطى الناس بدعواهم لأدعى ناس دماء رجال وأموالهم، ولكن اليمين على المدعى عليه.

ئەگەر هەر کەسێك بەپێی داوای خۆی شتی بدرێتێ، خەڵکانێك داوای ماف خۆیان لەخوێن ومالّی خەڵکی ئەکەن. بەلّام کەسی داوالێکراو سوێند خواردنی لەسەرە.

گێڕەرەوەی فەرمودەکە// صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن سورة البقرة - باب إن الذين يشترون بعهد الله وايمانهم ثمنا قليلا حديث : ٤٢٨٦ صحيح مسلم - كتاب الأقضية باب اليمين على المدعى عليه - حديث : ٣٣١٤

مانای وشەکان// الدعاوی کۆی وشەی دعوی : کەسێکە بانگەشەی مافێك ئەکات بۆ خۆی بە رشستی بێت یا بە درۆ. البينات: کۆی بينة، بەڵگەی ئاشکرا،بۆیە واناونراوە چونکە: حەق وراستی بە ئاشکرا دیارە تیایدا.

سەرباسەکان//

باسی یەکەم/ فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە کە: قسەی هیچ کەس وەرناگیرێت لە داوا کردنی ماف خەڵکیدا. بەڵکو پێویستی بە بەڵگەیە، یا دانپیانانی داوالێکراوو.

**باسی دوەم/** دەربارەی ئەو کەسەی کە سوێند ئەدرێت،دوو ڕا هەیە:

یەکـەم: سـوێند خـواردن لـە سـەر داوا لێکراوە،ئەگـەر داواکـار و داوالێکـراو تێکـەڵیان هـەبێت یـان نـا. ئەمـەش ڕای جمهـورە. بـە بەڵگـەی: گـشتگیری فەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: تـەنها ئـەو کەسـە سـوێند ئـەخوات کـە لـە گـەڵ داواکـاردا تێکـەڵی هەیـە. ئەمـەش ڕای مالیکـە.هـەتاکو کەسـانی نـەفس نـزم کەسـانی خـاوەن کەسایەتی سوك نەکەن بە سوێند دانیان بۆ چەند جارێك.

**باسی سێیەم/** زانایـان ئـەڵێن: حیکمـەت لـەوەدا کـە بەڵگـە هێنانـەوە لـە سـەر داواکـارە ئەوەیـە کـە: لایـەنی داواکـار لاوازە: چـونکە پێـچەوانەی داوایـەك ئـەکات کـە پێـچەوانەی واقعە،لـە بـەر ئـەوە داوای بەڵگـەی بـەهێزی لێئەکرێت، هەتاکو لایەنەکەی بەهێز بێت.

بـەڵام لایـەنی داوالێکـراو بـەهێزە: چـونکە لـە بناغـەدا وایـە کـە ئەسـتۆی پاکـە،و تـەنها داوای سـوێندی لـێ ئـەکرێت. چـونکە سـوێند خـۆر سـود بـۆ خۆی ئەهێنێت و زیان لە سەر خۆی لا ئەبات.

**(١٧٩). عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): حق المسلم على المسلم ست: إذا لقيته فسلم عليه، وإذا دعاك فاجبه، وإذا إستنصحك فانصحه، وإذا عطس فحمد الله فشمته، وإذا مرض فعده، وإذا مات فاتبعه..**

**ماف موسڵمان بەسەر موسڵمانەوە، شەشە: کەپێی گەشتی سەلامی لێبکە. و کەداوەتی کردیت بچۆ. و کەداوای ئامۆژگاری لێت کرد ئامۆژگاری بکە.وە کەپژمی وسوپاسی خوای کرد، وەڵامی بەرەوە. وە کە نەخۆش کەوت سەردانی بکە،و کە مرد شوێنی بکەوە.**

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** صحيح مسلم، كتاب السلام،باب من حق المسلم على المسلم(٤١٣٩).

**سەرباسەکان//**

**مانای وشەکان//**

**إستنصحك:** داوای ئامۆژگاریت لێ بکات. **التشميت:** نزا کردنە بۆ کەسێك کە ڕێنمونی کراو بێت ڕێی ڕاست بگرێت. ئەمەش ڕای ثعلبە..

**باسی یەکـەم/** مانای ماف ئەوەیە کە: ناکرێت وازی لێبهێنرێت، کردنیشی: یا واجبە یا سوننەتێکی دوپاتکراوەیە کە وەك واجبە کە نابێت تەرك بکرێت.

بەکار هێنانیشی بۆ هەردوو ماناکە لە بواری بەکارهێنانی وشەیەکە کە دوو مانا هەڵبگرێت. إبن الاعرابی ئەڵێت: وشەی حق بۆ واجب بەکار ئەهێنرێت.

**باسی دووەم/** یەکەمین ماف موسڵمان لەو شەش مافەی لە فەرمودەکەدایە: سەلام کردنە کاتێك پێی ئەگات، بە بەڵگەی:

أ. کەپێی گەشتی سەلامی لێبکە. لە فەرمودە باسلێکراوەکەدا.

ب. لە صەحيحى موسليمدا هاتوە: فەرمانكردن بە بڵاوكردنەوەى سەلام،كە هۆكارێكە بۆ بەدەستهێنانى خۆشەويستى.[١]

ج. لە صەحيحەيندا هاتوە: باشترين كردار دان دان وبڵاوكردنەوەى سەلام لە هەر كەسێك بيناسيت ونە يناسيت.[٢]

د. عەمار ئەڵێت: سىٚ سيفات هەيە، هەر كەسێك كۆيان بكاتەوە، باوەڕى كۆكردۆتەوە:

ستەم لە خۆت نەكەيت ،وە بەخشينى سەلام وسەلامكردن لە خەڵكى،وە بەخشين لە كاتى ناڕەحەتيدا.[٣]

**باسى سێيەم/** دەربارەى سەلامكردن لە سەرەتاوە وەك لە فەرمودەكەدا هاتوە، دوو ڕا هەيە:

يەكەم: سەلامكردن واجبە. ڕوكەشى فەرمانەكەش وا ئەخوازێت.

دوەم: سەلامكردن سوننەتەو وەڵامدانەوەى فەرزە. إبن عبدالبر و چەندين زاناى تريش وايان بۆ گواستوينەتەوە.

**باسى چوارەم/** دەربارەى ماناى سەلامكردنەكە وتراوە:

أ. سەلام ناوێكە لە ناوەكانى خودا. كاتێك ئەوترێت: السلام عليكم،واتە : لە پارێزگارى خوادا بن،خواتان لە گەڵ.

ب. سەلام واتە بێوەيى و دور لە ناخۆشى.

**باسى پێنجەم/** كەمترين سەلام كردن ئەوەيە بڵێت: السلام عليكم. لەو تەواوتر بڵێت: السلام عليكم ورحمە الله وبركاتە. ئەگەر بڵێت : السلام عليك يا سلام عليك، برى ئەكەوێت.

---

[١] الأمر بافشاء السلام .

[٢] إن أفضل الأعمال: إطعام الطعام وتقرأ السلام على من عرفت وعلى من لم تعرف.

[٣] ثلاث من جمعهن فقد جمع الايمان: إنصاف من نفسك، وبذل السلام للعالم، والانفاق من الاقتار.

**باســـی شەشـــەم/** ئەگـەر ئـەو موسـڵمانەی سـەلامی لێکـرا تەنهابوو،ئـەویش و فریشتەکانیش ئەگرێتەوە.

**باســـی حەوتـــەم/** ئـەو کەسـەی سـەلامی لێکـرا، تـەنها بوو،وەڵامدانـەوە کـە فـەرزە لـە سـەری. ئەگـەر کۆمـەڵێکیش بـون: وەڵامدانـەوە فـەرزی کیفایـە یـە لە سەریان. بە بەڵگەی:

فـــەرمودەی پێـــشەوا عـــەلی لـــە پێغەمبـــەری خـــوداوە: ئەگـــەر کۆمـــەڵێك تێپـــەڕین بـــە شـــوێنێکدا ســـەلام کردنـــی یـــەکێکیان بـــری ئـــەوان ئەکـــەوێت. ئەگـــەر ئـــەوانیش کۆمـــەڵ بـــون، وەڵامدانـــەوەی یـــەکێکیان بـــری ئـــەوانی تـــر ئەکەوێت.[1]

**باســـــی هەشـــــتەم/** مەرجـــە یەکـــسەر وەڵـــامی ســـەلامەکە بداتـــەوە.ئەگـــەر ســـڵاوکەریش لـــەوێ نەبوو،بـــە نامەیەکـــدا بـــۆی بنوســـێت یـــا بـــە کەســـێکدا سڵاوی بۆ بنێرێت.

**باســـی نۆیـــــەم/** پیـادە سـەلام لـە ڕۆشـتوو ئـەکات،وە ڕۆشـتوو سـەلام لـە دانیـشتو ئەکات،وکـەم سـەلام لـە زۆر ئەکـەن،و بـچوکیش سـەلام لـە گـەورە ئەکات. بە بەڵگەی:

لە بوخاری موسلیمدا چەندین فەرمودە لەو بارەیەوە هەیە.

**باســـی دەیـــەم/** فـەرمودەی : (کاتێـك پێـی گەشـتی) ئـەوە ئەگەیـەنێت کـە: هـەر کاتێك لێك جیابونەوە سەلام ناکەن.

بەڵام ئەم لێکدانەوەیە ئیشی پێ ناکرێت،لە بەر فەرمودەی:

هـەر کەسـێکتان دانیـشت، بـا سـەلام بکـات. ئەگـەر هەسـتایە سـەر پـێ بـا سەلام بکات.یەکەمیشیان لە دوەمیان لە پێشتر نیە بە سەلامکردن.

---

[1] يجزيء عن الجماعة إذا مروا أن يسلم أحدهم، ويجزيء عن الجماعة أن يرد أحدهم. رواه أحمد والبيهقي.وصححه الالباني في صحيح أبي داود(٥٢١٠).

كەواتـە مەبەسـت لـە فەرمودەكـە : كاتێـك پێـى ئـەگات. ئەوەيـە بـا زۆر لـە يەكيش دور نەكەونەوە ، لە بەر ئەم فەرمودانە:

أ. هـەر كەسـێك لـە ئێـوە بـە هاوەڵەكـەى گەيـشت، بـا سـەلامى لێبكـات. ئەگـەر درەختێـك يـا ديوارێـك كەوتـە نێوانيانـەوە پاشـان پێـى گەشـتەوە، بـا سەلامى لىٚ بكاتەوە.[١]

ب.ئەنـەس ئـەڵێت: هاوەڵـانى پێغەمبـەرى خـودا بـە ڕێگـادا ئەڕۆشـتن، كاتێـك درەختێـك يـا گردێكيـان پـىٚ بگەشـتايە، بـە لاى ڕشاسـت و چـەپدا جيـا ئەبونـەوە. لـە دواى ئـەوە كـە بـە يـەكترى ئەگەشـتن سـەلاميان لـە يـەكتر ئەكرد.[٢]

<u>باسـى يازدەهـەم/</u> دەربـارەى فـەرمودەى (كـەداوەتى كرديـت بـچۆ) ، چـەند ڕايەك هەيە:

يەكـەم: هـەموو دەعوەتێـك ئەگرێتـەوە، ئـەبێت وەڵـام بدرێتـەوە.زاهـيرى فەرمودەكەش وا ئەخوازێت.

دوەم: زانايان تايبەتيان كردوە بە دەعوەتى وەليمەو ژنهێنان..

صـەنعانى ئـەڵێت: باشـتر وايـە بوترێـت: لـە دەعـوەتى وەليمـەدا واجبـەو ، جگـە لـەوە سـوننەتە. چـونكە تـەنها لـە يەكـەميان هەڕەشـى تێدايـە لـەو كەسەى وەڵامى ناداتەوە.

<u>**باسـى دوازدەهـەم/**</u> هـەر كەسـێك داواى ئامۆژگـارى لـە كەسـێكى تـر بكـات، واجبـە ئامۆژگـارى بكـات و فێڵـى لـىٚ نـەكات. بـە بەڵگـەى فـەرمودەى: فانصحه.

<u>**باسـى سـيازدەهەم/**</u> ئامۆژگـارى كـردن كاتێـك واجـب ئـەبێت كـە داواى لـىٚ بكرێت. بە بەڵگەى ڕوكەشى فەرمودەكە.

---

[١] إذا لقي أحدكم صاحبه فليسلم عليه، فإن حال بينهما شجرة أو جدار فليسلم عليه.أبو داود

[٢] قال أنس: كان أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم يتماشون،فإذا لقيتهم شجرة أو أكمة، تفرقوا يمينا ويسارا. فإذا إلتقوا من ورائها يسلم بعضهم على بعض.

**باســـی چــــواردەهەم/** ئامۆژگــاری کــردن بــه بێئــەوەی داوای لێبکرێــت، سوننەتە. چونکە پیشاندانی ڕێگای چاکەیە.

**باســی پازدەهــەم/** هـەر کەسێك گوێی لـەو کەسە بو کە پـژمیوەو وتـی الحمد لله، ئــەبێت وەڵــامی بداتــەوە. ئەمـــەش ڕای ظاهریـــة و إبـــن العربـــی و صەنعانیە. بە بەڵگەی:

أ. فەرمانکردن لە فەرمودەی فشمتە.

ب. فــەرمودەی: هــەر کەســێك لــە ئێــوە پــژمی و سوپاســی خــودای کــرد، پێویستە لە سەر هەر کەسێك کە گوێی لێیە ،پێی بڵێت: یرحمك الله.[1]

**باســی شــازدەهەم/** یەکدەنگن لـەوەدا کـە: وتـنی الحمدلله لـە سـەر ئـەو کەسـەی ئەپژمێت: شتێکی باشە. وەك نەوەوی ئەڵێت.

**باســی حەڤدەهــــەم/** نـەوەوی ئـەڵێت: بـاش وایـە کەسێك پـژمی،بیری چـوو الحمـد لله بکـات، بـیری بخرێتــەوە تــا الحمــدلله بکــات و ئــەویش وەڵــامی بداتەوە. ئەمەش ئامۆژگاری کردنە لە سەر چاکە کردن.

**باســـی هەژدەهــــەم/** دەربـارەی چـۆنێتی سوپاسـگوزاری کـردن و چـۆنێتی وەڵامدانەوەی، چەند فەرمودەیەك هەیە:

أ. ئـەبو هـورەیرە لـە پێغەمبـەری خـوداوە ئەگێڕێتـەوە: هـەر کەسـێك لـە ئێـوە پـژمی، بڵێـت: الحمـد لله.براکـەی یـا هاوەڵەکەشـی پێـی بڵێـت: یرحمك الله.ئەویش بڵێت: یهدیکم الله ویصلح بالکم.[2]

ب. ئـەبو هـورەیرە لــە پێغەمبــەری خـوداوە ئەگێڕێتـەوە: هــەر کەسـێك لــە ئێـوە پــژمی، بڵێــت: الحمــد لله علــی کــل حــال. براکــەی یــا هاوەڵەکەشــی پێــی بڵێت: یرحمك الله. ئەویش بڵێت: یهدیکم الله ویصلح بالکم.[1]

---

[1] إذا عطس أحدكم وحمد الله ، كان حقا على كل مسلم يسمعه أن يقول: رحمك الله. أخرجه البخاري.

[2] إذا عطس أحدكم فليقل: الحمد لله،وليقل له أخوه أو صاحبه: يرحمك الله. وليقل هو: يهديكم الله ويصلح بالكم. أخرجه البخاري.

**باسی نۆزدەهەم/** دەربارەی چۆنێتی وەڵامدانەوەی ئەو کەسەی ئەپژمێت، چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم: پێی ئەوترێت: یهدیکم الله ویصلح بالکم. ئەمەش ڕای جمهورە. بە بەڵگەی دوو فەرمودەکەی پێشوو.

دوەم: ئەڵێت: یغفر الله لنا ولکم. ئەمەش ڕای کوفیەکانە، بە بەڵگەی : فەرمودەی طبرانـي کە لە إبن مەسعود ئەیگێڕێتەوە، وە بوخاریش لە أدب المفرد دا هێناویەتی.

سێیەم: خۆی سەرپشکە لەو دوو وشەیەی ڕابردودا.

چوارەم: لەنێو هەردوو وشەکەدا کۆی ئەکاتەوە.

**باسی بیستەم/** لە ئادابەکانی پژمین:

أ. فەرمودەی ئەبو هورەیرە: هەر کەس لە ئێوە پژمی، با هەردوو لەپی دەستی بگرێت بە دەم و چاویەوە،وە با دەنگی نزم بکات.[٢]

ب. لە دوای وشەی: الحمد لله، بڵێت رب العالمین.

لە فەرمودەی إبن عباسدا هاتوە: هەر کەسێکتان پژمی و وتی: الحمد لله،فریشتەکان ئەڵێن: رب العالمین. کاتێك وتی: رب العالمین، ئەوانیش ئەڵێن: یرحمك الله.[٣]

ج. تا سێ جار ئەگەر پژمی، پێی ئەڵێت: یرحمك الله. بەڵام لە سێ جار زیاتر پژمی، پێی ناڵێت. ئەبو هورەیرە ئەیگێڕێتەوە: هەر کەسێك لە ئێوە پژمی، بەرامبەرەکەی وەڵامی بداتەوە. ئەگەر لە سێ

---

[١] إذا عطس أحدكم فليقل: الحمد لله على كل حال،وليقل له أخوه أو صاحبه: يرحمك الله. ويقول هو: يهديكم الله ويصلح بالكم أخرجه أبو داود وغيره بإسناد صحيح.

[٢] وإذا عطس أحدكم فليضع كفيه على وجهه،وليخفض بها صوته. الحاكم والبيهقي.

[٣] حديث إبن عباس: إذا عطس أحدكم فقال: الحمد لله، قالت الملائكة: رب العالمين. فإذا قال أحدكم: رب العالمين، قالت الملائكة: رحمك الله .الطبراني وفيه ضعف.

جـار زیـاتر پـژمی ئـەوە توشـی هەڵامـەت بـوە،و دوای سـێیەم جـار وەڵامی نادرێتەوە.[1]

**باسی بیست ویەکەم/** إبن ابی جمره ئەڵێت:

فەرمودەکـە بەڵگـەی گـەورەیی نیعمـەتی خودایـە بـە سـەر ئـەو کەسـەی ئەپـژمێت. ئـەویش لـەو هـەموو خێـرەوە دەرئەکـەوێت کـە دوای پژمینەکـە دێت. ئامارژەشـی تێدایـە بـۆ گـەورەیی بەخشـشی خـودا بـە سـەر بەنـدەوە: بـە هـۆی پژمینەکـەوە زیـانی لەسـەر لائەچـێت،وە سوپاسـی خـودای لەسـەر ئەکات کـە پاداشـتی لـە سـەر وەرئەگرێت. پاشـان نـزای خێـر بـۆ ئـەو کەسـە ئەکات کە پێی ئەڵێت: خوا ڕەحمت پیّ بکات.

لـە بـەر ئـەوەی ئـەو کەسـەی ئەپـژمێت، پژمینەکـەی سـودی تێدایـە و نیعمـەتی خودایە،کـە کۆمـەڵێك بوخـار بـەهۆی پژمینەکـەوە لـە مێـشکیدا دەرئەچێت کـە لەوانـە یـە توشـی نەخۆشـی بکـات، ئەگـەر بمایەتـەوە: لـە بـەر ئەمانـە، ئـەبێت سوپاسـی خـودا بکـات لـە سـەو ئـەو نیعمەتـەی کـە ئەندامـەکانی لەشـی وەك خـۆی ماوەتـەوە، لـە دوای ئـەو پژمینـە، کـە وەك بومەلەرزە وایە بۆ لەش.

**باسـی بیـست ودوەم/** فەرمودەکـە ئـەوە ئەگەیـەنێت کـە: غـەیری موسـڵمان کـە پـژمی،وەڵامی نادرێتـەوە. لـە فـەرمودەی ئـەبو موسـادا هـاتوە؛ جولەکـە لای پێغەمبـەری خـودا ئەپـژمین،بۆ ئـەوەی پێیـان بڵێـت: خـوا ڕەحمتـان پـیّ بکات. ئەویش ئەیفەرمو: خوا ڕێنمویتان بکات و حاڵتان باش بکات.[2]

---

[1] عن أبي هريرة مرفوعا: إذا عطس أحدكم فليشمته جليسه.فإن زاد على ثلاث فهو مزكوم فلا يمت بعد ثلاث. سنن أبي داود.

[2] كان اليهود يتعاطسون عند رسول الله يرجون أن يقول لهم: يرحمكم الله.فيقول: يهديكم الله ويصلح بالكم. أبي داود والترمذي بأسانيد صحيحة.سنن الترمذي،الذبائح،أبواب الأدب عن رسول الله،باب ما جاء كيف يشمت العاطس( ٢٧٩٢ ).

**باســـی بیـــست و ســـێیەم/** دەربـارەی جـۆری فـەرمان کردنەکـە لـە فـەرمودەی ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکە، دوو ڕا هەیە:

یەکەم: واجبە، بوخاریش ئەم ڕایەی هەیە.

وتراوە: ئەگەری ئەوە هەیە کە فەرزی کیفایە بێت.

دوەم : سوننەتە بەڕای جمهور.

نەوەوی ئەڵێت: کۆدەنگی لە سەر ئەوەیە کە واجب نیە.

إبن حجر ئەڵێت: واتە واجب نیە لە سەر هەموو کەس(فرض عين).

**باســـی بیـــست وچـــوارەم/** لـە سـەردانی کردنـی نەخۆشدا،ناسـراوو بێـت یـا نەناسراوو، نزیك بێت یان دور، وەك یەکە.

**باســـی بیـــست وپێنجـــەم/** فـەرمودەی: هـەر کاتێـك نـەخۆش کـەوت. هـەموو جۆرە نەخۆشیەك ئەگرێتەوە. بەڵام نەخۆشی چاو ئێشەی لێ دەرکراوە.

وەڵـام دراوەتـەوە بـە فـەرمودەی زەیـدی کـوڕی ئەرقـەم: پێغەمبـەری خـودا سەردانی کردم کاتێك چاوم ئێشا.[1]

**باســـی بیـــست وشەشـــەم/** ڕوکەشـی فـەرمودەی: کاتێـك نـەخۆش کـەوت ســـەردانی بکـــە، ئـــەوە ئەگەیـــەنێت کـــە ســـەردانەکە لـــە ســـەرەتای نەخۆشیەکەوەیە.

بـەڵام إبـن ماجـە ئەیگێڕێتـەوە لـە ئەنەسـەوە: پێغەمبـەری خـودا دوای سـێ ڕۆژ سەردانی نەخۆشی ئەکرد.[2]

وەڵـام دراوەتـەوە کـە: لـەم فەرمودەیـەدا ڕاویـەکی تێدایـە، زانایـان وازیـان لە ڕیوایەتەکەی هێناوە.

---

[1] عن زيد بن أرقم قال: عادني رسول الله من وجع بعيني. سنن أبي داود ،كتاب الجنائز،باب في العيادة في الرمد( ٢٧٤٥ ). وصححه الحاكم. واخرجه البخاري في الأدب المفرد.

[2] عن أنس: كان النبي لا يعود إلا بعد ثلاث.سنن إبن ماجه.

**باسی بیست وحەوتەم/** فەرمودەکە: ماف موسڵمان لە سەر موسڵمان...ئەوە ئەگەیەنێت کە: سەردانی نەخۆشی ئەهلی کتابی ناکرێت.

بەڵام لە فەرمودەدا هەیە کە: پێغەمبەری خودا سەردانی خزمەتکارە کتابیەکەی کرد.ئەویش بە بەرەکەتی سەردانەکەی پێغەمبەری خوداوە موسڵمان بوو.[1]

هەروەها سەردانی ئەبو گالبی مامی کرد کە لە سەرە مەرگدا بوو، بانگی کرد بۆ دینی ئیسلام.[2]

**باسی بیست وهەشتەم/** دواکەوتنی جەنازەی موسڵمان، ناسراو بێت یان نەناسراو، واجبە.بە بەڵگەی:

فەرمان کردن لە فەرمودەکەدا: ئەگەر مرد شوێنی بکەوە.

**(١٨٠). عن إبن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إذا كنتم ثلاثة فلا يتناجى إثنان دون الآخر،حتى تختلطوا بالناس من أجل أن ذلك يحزنه.**

ئەگەر سێ کەس بون،دوانتان بێ ئەوەیترچپە نەکەن،تاتێکەڵ بەخەڵکیتر ئەبن،چونکە(چرپەکە) کەسی سێیەم دڵتەنگ ئەکات.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري، كتاب الإستئذان، باب إذا كانوا اكثر من ثلاثة فلا بأس بالمسارة والمناجاة،(٥٩٥٧). صحيح مسلم، كتاب السلام ،باب تحريم مناجاة الاثنين دون الثالث بغير رضاه (٤١٧٠)..

**ماناى وشەکان//** المناجاة: پرس پێکردن و چپە کردن.

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** پێغەمبەری خودا ڕێگری کردوە لە چپەکردنی دوو کەس پێکەوە ئەگەر سێهەمیان لە گەڵ بوو، لە بەر ئەوەی:

---

[1] أن النبي عاد خادمه الذمي وعرض عليه كلمة الإسلام.

[2] زار عمه أبا طالب في مرض موته.

أ. ئەوەی بە تەنهایە دڵتەنگ ئەبێت و وا ئەزانێت کە شایانی ئەوە نیە نهێنی خەڵکی لابێت.

ب. وا ئەزانێت لە دژی ئەو قسە ئەکەن.

**باسی دوەم/** ئەگەر زیاد لە سێ کەس بون، ڕێگریەکە نامێنێت، چونکە ئەو دوو هۆکارەی سەرەوە لەم حاڵەتەدا نیە.

**باسی سێیەم/** دەربارەی حوکمی ئەو ڕێگریە لە فەرمودەکەدا، دوو ڕا هەیە:

یەکەم: ڕێگریەکە بۆ هەموو بارودۆخێکە، لە سەفەردا بن یا نیشتەجێبن. ئەمەش ڕای إبن عمرو مالك و جمهوری زانایانە. بە بەڵگەی:

ڕوکەشی فەرمودە باسلێکراوەکە.

دوەم: ئەو ڕێگریە نەسخ بۆتەوە، بەڕای هەندێك زانا.

صەنعانی ئەڵێت: هیچ بەڵگەیەك نیە.وە ئایەتەکانی سورەتی مجادلە ش دەربارەی ڕێگری کردنی جولەکەیە لە چپەکردن،لە بەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ. مجاهد دەربارەی ئایەتی ﴿ ألم تر الی الذین نهوا عن النجوی﴾ (المجادلة:٨) ئەڵێت: ئەم ئایەتە دەربارەی جولەکەیە.

ب. مقاتل کوڕی حەیان ئەڵێت:

پەیمان نامەیەك لە نێوان پێغەمبەر و جولەکەکاندا هەبوو،ئەوانیش هەر کاتێك یەکێك لە هاوەڵان بە لایاندا تێپەڕیایە،چپەیان ئەکرد، هەتاکو موسڵمانەکە وای ئەزانی بۆ کوشتنی ئەو چرپە ئەکەن،یا تا دڵی ناخۆش بکەن. کاتێکیش موسڵمان ئەوەی بدیایە،لە ترسا لەو ڕێگەیەوە نەئەڕۆشت.پێغەمبەری خوایش ڕێگری کردن لەو چرپە کردنە،بەڵام ئەوان هەر بەردەوام بون لە سەری، لە بەر ئەم ئایەتانە دابەزی ﴿ ألم تر الی الذین نهوا عن النجوی﴾ (المجادلة:٨)

**(١٨١). عن عبدالله بن عمرو بن العاص رَضيَ اللّهُ عَنْهُمَا عن النَّبيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قال: رضا الله في رضا الوالدين، وسخط الله في سخط الوالدين..**

ڕەزامەنـدى خـوا(لەكەسـێك) لەڕەزامەنـدى بـاوك ودايكـى كەسـەكەيە، وە ڕقلێبونيشى لەڕقلێبونى دايك وباوكيەتى.

**گێـڕەرەوەى فەرمودەكـە//** سـنن الترمـذي، الـذبائح أبـواب الـبر والـصلة عـن رسـول الله ،بـاب مـا جـاء مـن الفـضل في رضـا الوالـدين. وصـححه ابـن حبـان والحاكم.وقال الألباني في صحيح الترغيب(٢٥٠١): حسن لغيره.

**سەرباسەكان//**

**ماناى وشەكان//**

البِـر: بريتيـە لـە كردنـى چـاكە بە شـێوەيەكى بـەرفراوان. البَـر: ئـەو كەسـەيە زۆر بە فراوانى چاكە ئەكات.ئەوەش سيفاتى خواى گەورەيە.

الـصلة: سيلەى ڕەحـم، واتـە چـاكە كردنـە لـە گـەڵ خزمـان لە پـشت بـن يـا بە هـەر شـێوەيەكى تـرى خزمايـەتى. وەبـەزەيى هاتنـەوە پێيانـدا،وە نـەرمى لـە گەڵيانـدا،وە چـاودێرى كردنـى بارودۆخيـان. هـەروەها هـەتا ئـەو كاتـەش كـە ئـەوان دەسـت درێـژى ئەكـەن و لـە گەڵتـدا خـراپ ئـەبن. پێـچەوانەكەشى: پچڕاندنى ئەو پەيوەنديەيە.

**باسـى يەكـەم/** فەرمودەكەيە بەڵگەيـە لـە سـەر ئـەوەى: واجبـە منـداڵ دايك و بـاوكى ڕازى بكـات ،چـونكە ڕەزامەنـدى خـوداى تێدايـە.وە حەرامـە بێزاركردنيان،چونكە بێزاركردنى خواى تێدايە.

**باسـى دوەم/** دەربـارەى پـێش خـستنى بـە دەسـتهێنانى ڕەزامەنـدى دايـك و باوك بە سەر فەرزەكانى تردا، چەند ڕايەك هەيە:

ڕاى يەكـەم: ئەگـەر ڕازى نـەبون، ئـەبێت كـوڕ واز لـە جيهـاد كـردن بهێنێـت. جگـە لـە فـەرزى عـەين وەك نوێـژەكان، يەكـدەنگى زانايـان لـە سـەر ئەوەيـە

کـە ئەگـەر ڕازیـش نـەبون لـە سـەر نوێـژ کـردن، بـە گوێیـان ناکرێـت.ئەمـەش ڕای امیر حەسەنە لە کتێبی الشفاء وڕای شافعیشە.بە بەڵگەی:

أ.فـەرمودەی إبـن عمـر: پیاوێـك دێـت بـۆ لای پێغەمبـەری خـوداو داوای مۆڵـەتی لـێ ئـەکات بـۆ جیهـاد کـردن، ئـەویش ئەفـەرموێت: بـاوك و دایکـت مـاون؟ وتـی: بـەڵێ. فـەرموی: پاداشـتی جیهـاد کـردن لـە خزمـەتی ئەوانـدا بەدەست بهێنە.[1]

ب. فـەرمودەی ئـەبو سـەعید: پیاوێـك لـە یەمەنـەوە بـۆ لای پێغەمبـەری خـودا کۆچـی کـرد، وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خودا،ئـەوە بـۆ لای تـۆ کۆچـم کـردوە. فـەرموی: هـیچ کەسـت لـە یەمـەن هەیـە؟ ئـەویش وتـی: دایکـم وبـاوکم. فـەرموی: مۆڵـەتیان داوی بێیـت بـۆ ئێـرە؟ وتـی: نـەخێر. فـەرموی: بگـەڕێرەوەو داوای مۆڵـەتیان لێبکـە. ئەگـەر مۆڵـەتیان دای جیهـاد بکـە. ئەگەر نا چاکە لە گەڵ ئەواندا بکە.[2]

ڕای دوەم: کردنـی فـەرزەکان و سـوننەتەکانیش دروسـتە، ئەگـەر ئـەوان ڕازیـش نـەبون، بـە مـەرجێك بـە هـۆی دوری کوڕەکەیانـەوە زیانیـان پـێ نەگات.ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە.

فـەرمودەکانیش والێـك ئەدەنـەوە کـە بـۆ دوپاتکردنـەوەی زیـاتری مـاف دایـك وباوکـە،و ئـەبێت مـرۆڤ شـوێن ڕەزامەنـدی ئـەوان بکـەوێت مەگـەر بێزاربـونی خـودای تێـدا بێـت. وە دەفـەرموێت: ﴿ وإن جاهـداك علـى أن تـشرك بـي مـا ليس لك به علم فلا تطعهما وصاحبهما في الدنيا معروفا﴾.(لقمان:١٥)

---

[1] حديث إبن عمر: أنه جاء رجل يستأذنه صلى الله عليه وسلم في الجهاد. فقال: أحي والداك؟ قال: نعم. قال: ففيهما فجاهد.صحيح البخاري، كتاب الجهاد والسير، باب الجهاد بإذن الأبوين(٢٨٦١).

[2] أن رجلا هاجر إلى رسول الله من اليمن،فقال: يا رسول الله إني قد هاجرت. قال: هل لك أهل باليمن؟ فقال: أبواي. قال: أذنا لك؟ قال: لا. قال: إرجع فاستئذنهما، فإن أذنا لك فجاهد،وإلا فبرهما. سنن أبي داود،كتاب الجهاد، باب في الرجل يغزو وأبواه كارهان (٢٢١١) وفي إسناده مختلف فيه.

صەنعانی ئەڵێت: ئایەتە دەربارەی ئەوانەیە کە منداڵەکانیان ناچار ئەکەن هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەن، یا تاوانی گەورە بکەن.

**باسی سێیەم/** فەرمودەی بەڵگەی ئەوەیە کە: گوێڕایەڵیان نابێت بۆ واز هێنان لە فەرزی کفایەو عەین. بەڵام کۆدەنگی زانایان فەرزی عەینی تایبەت کردوە.

**باسی چوارەم/** ئەگەر ماف باوك و ماف دایك دژبە یەك بون: ماف دایك پێش ئەخرێت. بە بەڵگەی:

فەرمودەی بوخاری،پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کێ لە پێشترە بە من تا خزمەتی بکەم؟ تا سێ جار فەرموی: دایکت، پاشان فەرموی: باوکت. [1]

إبن بطال ئەڵێت: وا ئەگەیەنێت کە دایك سێ ئەوەندەی باوك ماف بە سەر منداڵەوە هەیە. لەبەر دوگیان بونی، وپاشان دانانی منداڵەکە،وەشیردانی.

صەنعانی ئەڵێت: ئەم ئایەتانە ئاماژەن بۆ ئەو ڕاستیە:

أ. ﴿ ووصينا الإنسان بوالديه إحسانا حملته أمه كرها ووضعته كرها﴾ (الاحقاف: ١٥)

ب. ﴿ حملته امه وهنا على وهن﴾ (لقمان: ١٤)

قازي عیاض ئەڵێت: جمهوری زانایان ڕایان وایە کە لە چاکەکردندا دایك پێش باوك ئەخرێت. محاسبی کۆدەنگی زانایان لەو بارەیەوە باس ئەکات.

**باسی پێنجەم/** دەربارەی باپیرو برا، کامیان بۆ چاکە کردن لە گەلیان لە پێشترن، چەند ڕایەك هەیە:

---

[1] قال رجل: من أحق الناس بحسن صحبتي؟ قال: أمك ثلاث مرات. ثم قال: أبوك. صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب من أحق الناس بحسن الصحبة ،(٥٦٥٠).

قـازي عيـاض ئـەڵێت: بـاپیر لـه پێـشتره، کـه ڕای زۆرینەشـی لـه سـەره،و زانایانی شافعیش هەمان ڕایان هەیە.

ئـەو کەسـەی بـه دوو هۆکـار پێـت ئـەگات لـه پـێش ئەوەیـه کـه بـه یـەك هۆکـار پێـت ئەگات،پاشـان خزمەکان،لـه خزمەکانیـشدا مەحرەمـەکان وەك (مـام و خـاڵ..)پـێش نامەحرەمـەکان ئـەخرێت (ئـامۆزان و خـاڵۆزا..)،پاشـان خزمـانی عـصبه، پاشـان خزمـان بـه هـۆی ژنخوازیەوه،پاشـان نزیکـی بـه هۆی وەلاو و پەیمان بەستنەوه، پاشان دراوسێ.

إبـن بطـال ئامـاژه بـەوه ئـەکات کـه ئەمـه لـه کاتێکدایـه کـه نـەتوانرێت بـه یەکجار مافی هەمویان بدرێت.

<u>**باسـی شەشـەم/**</u> دەربـارەی پـێش خـستنی مـافی مێـرد، فـەرمودەی عائـشه هاتوه:

پرسـیارم لـه پێغەمبـەری خـودا کـرد: کـێ لـه هـەموو کـەس زیـاتر مـافی بـه سـەر ئافرەتـەوه هەیـە؟ فـەرموی: مێردەکـەی. وتم: ئـەی بـۆ پیـاو؟ فـەرموی: دایکی.[1]

صـەنعانی ئـەڵێت: لەوانەیـه ئەمـه تایبـەت بێـت بـه کاتێـك کـه زیـان بـه دایك وباوکـه کـه بگـات، لـەو کاتـەدا مـافی ئـەوان پـێش مـافی هاوسـەرو مێـرد ئەخرێت.ئەمەش تا فەرمودەکان هەمویان یەك بکەون له مانادا.

---

[1] عن عائشة رضي الله عنها: سألت النبي ص: أي الناس أعظم حقا على المرأة؟ قال: زوجها. قلت: فعلى الرجل: قال: أمه. أحمد والنسائي وصححه الحاكم.السنن الكبرى النسائي،كتاب عشرة النساء،حق الرجل على المرأة( ٧٩٠٦ ).وقال الألباني في ضعيف الترغيب( ١٢١٢ ): ضعيف.

**(١٨٢). عن أنس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ عن النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) أنه قال: والذي نفسي بيده لا يؤمن عبد حتى يحب لاخيه ما يحب لنفسه.**

سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە،هیچ بەندەیەك باوەڕی تەواونابێت،هەتا ئەوەی بۆخۆی خۆشی ئەوێت،بۆبراکەشی خۆش بوێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحیح البخاري، كتاب الإيمان، باب من الإيمان أن يحب لأخيه ما يحب لنفسه،(١٣). صحيح مسلم،كتاب الايمان،باب الدليل على أن من خصال الإيمان أن يحب لأخيه ما يحب لنفسه (٩٣).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە بەڵگەیە لە سەر گەورەیی مافی دراوسێ و برا.

**باسی دوەم/** فەرمودەکە باوەڕ لەو کەسە دائەڕنێت کە: ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆی خەڵکی تر پێی خۆش نیە.

بەڵام زانایان وا لێکی ئەدەنەوە کە باوەڕی تەواو نابێت. چونکە لە بنەماکانی شەریعەتدا یە کە: کە کەسێك ئەو سیفەتەشی تێدا نەبێت، لە ئیمان و باوەڕ دەر ناچێت.

**باسی سێیەم/** فەرمودەکە وشەی خۆشەویستی بەکار هێناوە و دیاری نەکردوە چ شتێکی بۆی خۆش بوێت. بەڵام لە ڕیواتی نسائیدا دیاری کردوە: هەتاکو چ خێرێکی بۆ خۆی ئەوێت، بۆ براکەشی بوێت.[1]

زانایانیش ئەڵێن: مەبەست لەخێر: خواپەرستیەکان و کردارە ڕێپێدراوەکانە.

---

[1] حتى يحب لأخيه من الخير ما يحب لنفسه.السنن الصغرى النسائي،كتاب الإيمان وشرائعه،علامة الإيمان(٤٩٧٧).

إبن الصلاح ئەڵێت: ئەمەش لەو کردانەیە کە ئاسان نیەو قورسە.
بەڵام صەنعانی وەڵامی ئەداتەوە کە: بەو شێوەیە قورس نیە، چونکە ماناکەی وایە: باوەڕی هیچ کامتان تەواو نابێت تا ئەو خێرەی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ برا دینیەکەشی پێی خۆش بێت. بەدەستهێنانشی بەوە ئەبێت کە: ئەو نیعمەتەی خۆی هەیەتی براکەشی هەیبێت ،بە بێ ئەوەی لە نیعمەتەکەی خۆی کەم ببێتەوە. ئەمەش بۆ دڵێکی ساغ ئاسانە. بەڵام لە سەر کەسێك قورسە کە دڵێکی نەخۆشی هەبێت.
**باسی چوارەم/** وشەی دراوسێ موسڵمان و بێباوەڕو فاسق و هاوەڵ و دوژمن و خزم و بێگانەو نزیك و دوریش ئەگرێتەوە. هەر کەسێك هەموو ئەو سیفاتانەی تێدا بێت، ئەوە لە بەرزترین پلەدایە. کەسێکیش زۆرترین سیفاتی تێدا بێت، وەك ئەوە. هەتا ئەو کەسەی کە یەك سیفاتی تێدایە. هەر یەکێك لەوانەش بە پێی بارو دۆخی، ماف ئەدرێتێ.
لە فەرمودەی جابردا هاتوە: دراوسێ سێ جۆرە: یەکەمیان تەنها ماف دراوسێتی هەیە، کە دراوسێیەك هاوەڵ بۆ خودا پەیدا بکات. وە دراوسێیەك کە دوو ماف هەبێت، ئەویش دراوسێی موسڵمانە. وەدراوسێیەك کە سێ ماف هەیە، ئەوەش دراوسێیەکە کە خزم بێت و موسڵمان بێت: ماف موسڵمانی و دراوسێتی و خزمایەتی هەیە.[1]
بوخاری لە کتێبی الادب المفردا ئەیگێڕێتەوە: عبدالله کوڕی عمر مەڕێکی سەربڕی و بەشی بۆ دراوسێ جولەکەکەی نارد.[2]

---

[1] عن جابر: الجيران ثلاثة: جار له حق وهو المشرك له حق الجار. وجار له حقان،وهو المسلم. وجار له ثلاثة حقوق،جار مسلم له رحم.له حق الإسلام والرحم والجوار. الطبراني.ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة(٣٤٩٣).

[2] أن عبدالله بن عمر ذبح شاة فاهدى منها لجاره اليهودي. الأدب المفرد، البخاري،

ئەگەر دراوسێ برای موسڵمان بوو، بۆ خۆی چ خێرێکی پێ خۆشە بۆ ئەویش پێی خۆش ئەبێت.ئەگەر بێ باوەڕیش بوو، پێی خۆشە دراوسێکەی موسڵمان بێت تا ئەو خێرەی لە موسڵمانێتیدایە لێی بێبەش نەبێت.

**باسی پێنجەم/** شێخ محمد ی کوڕی ئەبی جەمرە ئەڵێت:

پاراستنی ماف دراوسێ نیشانەی تەواوی باوەڕە، و زیان گەیاندن پێی لە تاوانە گەورەکانە. لە فەرمودەدا هاتوە: کەسێك باوەڕی بە خوداو ڕۆژی دوایی بێت، زیان بە دراسێکەی نەگەیەنێت.

شێخ ئەڵێت: ئەم مافە لە دراوسێیەکەوە بۆ یەکێکی تر ئەگۆڕێت، بە گوێرەی چاك وخراپی دراوسێکە.

**باسی شەشەم/** مرۆڤی بێباوەڕ بە نەرمی ئیسلامی بۆ ڕون ئەکرێتەوە و هان ئەدرێت. فاسقیش بە نەرمی و بە شێوازی گونجاو، ئامۆژگاری ئەکرێت،وە کەم وکوڕیەکانی دائەپۆشرێت و بە نەرمی ڕێگری لێ ئەکات.ئەگەر ئەو شێوازە سوی هەبوو باشە. ئەگەر نا بۆ تەمبێ کردنی پشتی لێ ئەکرێت،و پێی ئەوترێت ئەوە هۆکاری پشت تێ کردنیەتی، تا وازی لێ بهێنێت.

**باسی حەوتەم/** لە کاتێکدا ماف دراسێکان دژ بە یەك بون: ماف نزیکترین دراوسێ پێش ئەخرێت.هەروەك لە فەرمودەی عائشەدا هاتوە: وتم ئەی پێغەمبەری خودا، دوو دراوسێم هەیە، دیاری بۆ کامیان ببەم؟ فەرموی: کامیان لەماڵەکەتەوە نزیکترە.[1]

حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە: دراوسێی نزیك ئەزانێت چ کاڵایەك ئەچێتە ئەو ماڵەوە، بەڵام دراوسێ دورەکە وانیە.

---

[1] حديث عائشة رضي الله عنها: قلت : يا رسول الله إن لي جارين فإلى أيهما أهدي؟ قال: إلى أقربهما بابا. صحيح البخاري، كتاب الشفعة ، باب أي الجوار أقرب ( ٢١٦٧ ).

**باسی هەشتەم/** دەربارەی سنوری دراسێ، چەند رایەك هەیە:

١. لە هەموو لایەكەوە تا ٤٠ ماڵ.

٢. هەر كەسێك گوێی لە بانگ بوو ئەوە دراوسێیە.ئەمەش رای پێشەوا عەلیە.

٣. هەر كەسێك لە گەڵتدا نوێژی بەیانی لە مزگەوت كرد،ئەوە دراوسێیە.

**(١٨٣). عن أبي أيوب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ،أن رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: لا يحل لمسلم أن يهجرأخاه فوق ثلاث ليال،يلتقيان،فيعرض هذا ويعرض هذا،وخيرهما الذي يبدأ بالسلام.**

حەڵاڵ نیە بۆ هیچ موسڵمانێك سێ شەو زیاتر پشت بكاتەبراكەی: بەشێوەیەك كەبەیەك گەشتن،ئەم پشت بكاتە ئەوو ، ئەویش پشت بكاتە ئەم، چاكترینیشیان ئەوەیە لەسەلامكردندا دەست پێشخەرە.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە//** صحيح البخاري، كتاب الأدب،باب الهجرة (٥٧٤٩). صحيح مسلم،كتاب البر والصلة والآداب،باب تحريم الهجر فوق ثلاث(٤٧٧١).

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكەم/** وشەی حەڵاڵ نیە، واتە حەرامە. كەواتە: حەرامە لە سێ رۆژ زیاتر پشت لە موسڵمان بكەیت.

**باسی دوەم/** فەرمودەكە ئەوە ئەگەیەنێت كە: تا سێ رۆژ دروستە قسەی لێ دابڕێت. حیكمەتەكەشی ئەوەیە: توڕە بون و ئەخلاقی ناشرین، لە ناخی مرۆڤدا هەیە،بۆ ئاسانكاری بۆ مرۆڤ و هەتا ئەو توڕەییەی بە سەر ئەچێت و دائەمركێتەوە، رێی پێدراوە تا سێ رۆژ پشت لە براكەی بكات:

لــه ڕۆژى يەكەمــدا: توڕەييەكــەى نامێنێــت،وه لــه دوەمــدا: بــه خۆيــدا ئەچـێتەوه، وەلــه سـێيەمدا: داواى لێبـوردن ئـەكات. لـەوە تێپـەڕى و زيـاتر بوو، دەست درێژى كردنه سەر مافى برايەتيه.

باسـى سـێيەم/ پـشت هـەڵكردن بـەوە لێكداوەتـەوە كـە هـەردوكيان بـە يـەك ئەگـەن و ئـەو ڕو ئـەكات بـەو لاوە، ئـەميش ڕو ئـەكات بـەو لاوە. ديـارە لـە زۆربەى كاتدا لە كاتى بە يەك گەشتندا بەو شێوە يەيە.

باســـى چـــوارەم/ دەربـارەى نـەمانى سـاردى نێوانيـان و تازەكردنـەوەى پەيوەندى، چەند ڕايەك هەيە:

ڕاى يەكـەم: نـەمانى پـشت هەڵكردنەكـە بـە سـەلام كـردن ئـەبێت. ئەمـەش ڕاى جمهورو ماليك وشافعيە. بە بەڵگەى:

أ. فەرمودە باسلێكراوەكە.

ب. فــەرمودەى: ئاشــت بونــەوەى بــەوە ئــەبێت كــە بێــت و ســەلامى لێبكات.[1]

ڕاى دوەم: ئەگــەر پــچڕاندنى قــسە ئــازارى بــە بەرامبەرەكــەى ئەگەيانــد، ئـەوە سـەلام كـردن بـە تـەنها بـەس نيـە، بـەڵكو ئـەبێت قـسەشى لـە گـەڵ بكات، بگەڕێتەوە بارودۆخى پێشوو. ئەمەش ڕاى أحمد و إبن القاسمە.

ڕاى سـێيەم: سـەيرى بـارودۆخى كەسـى بەرامبـەر ئـەكرێت: ئەگـەر بـە قـسە كـردن لـە گەڵيـدا زيـاد لـە سـەلام كـردن ، دڵـى چـاك بـوەوە وهۆكـارى پـشت هەڵكردنەكـە نـەما، ئەوە زۆر باشە. ئەگەر پێويستى بەوە نەبوو ، تەنها سەلام كردنەكە بەسە.

باسى پێنجەم/ حوكمى سێ ڕۆژ زياتر:

إبــن عبــدالبر ئــەڵێت: كــۆدەنگن لــەوەدا كــە: ئەگــەر قــسە كــردن لــە گــەڵ كەسـێكدا زيـان بـە ديـن ئەگەيـەنێت، يـان زيـانى بـۆ خـودى كەسـەكە يـا

---

[1] ما رواه الطبراني من طريق زيد بن وهب عم إبن مسعود في أثناء حديث موقوف: ورجوعه أن ياتي فيسلم عليه. قال الألباني في صحيح الترغيب( ٢٧٦٤ ): حسن الاسناد مقطوع.

ماڵەکەی ئەگەیەنێت، لەو کاتەدا دروستە لە سێ ڕۆژ زیاتر قسەی لێ دابڕێت، چونکە جیابونەیەك بە شێوەیەکی جوان، باشترە لە تێکەڵبونێك زەرەری بەدوادا بێت.

لە ناو زانا پێشوەکانیشدا هاوەڵان و دوای ئەوانیش، ڕویداوە کە پشتیان لە یەکتری کردوە.ئەوانیش بیانوی خۆیان هەیە،و ئێمەش گومانی باشیان پێ ئەبەین.لە ناو مرۆڤەکانیشدا جیاوازی ڕا هەر ئەبێت.

**(١٨٤). عن إبن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): من دل على خير فله مثل أجر فاعله..**

کەسێك ڕێنموییی بکات بۆ چاکە،وەك ئەنجامدەری کارەکە، چاکەی بۆ ئەنوسرێت.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح مسلم، كتاب الإمارة،باب فضل إعانة الغازي في سبيل الله بمركوب (٣٦٢٠).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** نیشاندەری کرداری چاکە وەك چاکەکەرەکە، پاداشتی بۆ ئەنوسرێت، بە بەڵگەی:

١. فەرمودە باسلێکراوەکە.

٢. فەرمودەی: (کەسێك لە دینی ئیسلامدا کردارێکی چاکەیەك دابهێنێت،پاداشتی خۆی و هەر کەسێك ئیش بەو کردارەی ئەو بکات ، وەرئەگرێت)[1]

[1] من سن سنة حسنة في الإسلام، كان له أجرها وأجر من عمل بها.صحيح مسلم،كتاب العلم، باب من سن سنة حسنة أوسيئة ومن دعا إلى هدى أو ضلالة.

**باســی دوەم/** ڕێنیشاندان بەوە هەبێت کە : بە کەسێك بڵێت کرداری چاکە بکات، هەروەها ڕێنمویی کەسێك بکات کە بەد وای چاکە کردندا ئەگەڕێت، هەروەها ئامۆژگاری کردن و بیرخستنەوەو دانانی زانستی بەسود.

**باســی سێیەم/** وشەی (خیر) چاکە کردن،نیشاندانی چاکە ئەگرێتەوە، بۆ دنیا بێت یا بۆ قیامەت.

وتەی ئەوەوی چەند جوانە و ماناکانی ئاشکراوو ڕێنیشان دەری چاکەی دنیاو قیامەتە...

**( ١٨٥ ). عن إبن عمر رَضِيَ اللّهُ عَنهُمَا قال: قال رسول الله ( صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ ): من تشبه بقوم فهو منهم..**

کەسێك خۆی بەکۆمەڵێك بشوبهێنێت،لەوان ئەژمێردرێت.

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـه//** سنن أبي داود، كتاب اللباس، باب في لباس الشهرة(٣٥٦٧). وصححه إبن حبان .وفيه ضعف وله شواهد.وقال الالباني في الإرواء: حسن صحيح(١٢٦٩).

**سەرباسەکان//**

**باســی یەکــەم/** فەرمودەکە بەڵگەی ئەوەیە: هەر کەسێك خۆی بە بێدین و فاسقەکان بشوبهێنێت،لەوان ئەژمار ئەکرێت. یان بە بێباوەڕن و بیدعەچیەکان لە هەر کردارێکدا کە تایبەت بێت بەوان : جل پۆشین بێت یا سواری بێت یا هەڵسوکەوت بێت.

**باســی دوەم/** ئەڵێن: ئەگەر بە بێباوەڕان شوبهاند لە پۆشاك لە بەر کردنداو، باوەڕیشی وابوو کە وەك ئەوانە،ئەو کەسە بێباوەڕ ئەبێت.

ئەگەر باوەڕی وا نەبوو، جیاوازی ڕا هەیە لای زانایان:

هەندێك پێیان وایە بێباوەڕ ئەبێت و ڕوکەشی فەرمودەکەش ئەوە ئەخوازێت.

هەندێکیش ئەڵێن: بێباوەڕ نابێت، بەڵام تەمبێ ئەکرێت.

**(١٨٦). عن سهل بن سعد قال: جاء رجل إلى النبي فقال: يارسول الله دلني على عمل إذا عملته أحبني الله واحبني الناس، فقال: إزهد في الدنيا يحبك الله ،وازهد فيما عند الناس يحبك الناس.**

**پیاوێك هاتەلای پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا،كارێكم پێ نیشانده ئەگەر كردم ،خواو خەڵكی خوا خۆشی بوێم. فەرموی: لەدنیا بێ ئومێد بە، خواخۆشتی ئەوێت. وە لە سامانی خەڵكیش بێ ئومێد بە (چاو مەبڕە ماڵی خەڵكی) ،خەڵكی خۆشتی ئەوێت.**

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەكـــە//** سنن إبن ماجه،كتاب الزهد، باب الزهد في الدنيا(٤١٣٥)،وقد حسنه النووي لشواهده.وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة(٩٤٤).

**سەرباسەكان//**

**باسی یەكـــەم/** فەرمودەكە بەڵگەیە لە سەر گەورەیی و بەڕێزی زوهد و دنیا نەویستن.ئەمەش هۆكارێكە بۆ بە دەستهێنانی خۆشەویستی خودا و خەڵكی. چونكە:

كەسێك بێ ئومێد بێت لە ماڵ و سامانی خەڵك، ئەوانیش خۆشیان ئەوێت،لە بەر ئەوەی خەڵكی وا ڕاهاتون كە بە لایان قورسە داوایان لێبكرێت، كەسێك چاوی لە سەروەتیان بێت.

**باســـی دوەم/** ئاسایيە ئەگەر بە دوای ئەو هۆكارانەدا بگەڕێت كە خۆشەویستی خەڵكی بە دواوەیە،بەڵكو یان سوننەتە یا واجبە. بە بەڵگەی:

١. فەرمودە باسلێكراوەكە.

٢.فەرمودەی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، باوەڕتان تەواو نابێت تا یەکتریتان خۆش نەوێت).[1]

٣. پێغەمبەری خودا هانی داوین بۆ بڵاو کردنەوەی سەلامکردن کە هۆکاری خۆشەویستیە. وە دیاری بەخشینیش. هەروەها هەر هۆکارێك کە خۆشەویستی مسۆگەر بکات.

**(١٨٧). عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رسول الله( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا اؤتمن خان..**

نیشانەی دوڕوو سیانە: کاتێك قسەی کرد درۆئەکات،وە کەپەیمانی دا نایباتەسەر،وە کەبە دەستپاك دانرا ناپاکی ئەکات.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** صحيح البخاري، كتاب الأيمان، باب علامة المنافق(٣٣).صحيح مسلم، كتاب الايمان،باب بيان خصال المنافق(١١٨).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** دوڕوو کەسێکە باوەڕ دەرئەخات و،بێباوەڕی ئەشارێتەوە.

**باسی دووەم/** فەرمودەکە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی: هەر کەسێك سیفاتێك لەوانەی تێدا بێت ،ئەوە سیفاتێکی دوڕوەکانی تێدایە. ئەگەر هەموو سیفاتەکانی تێدا بوو، ئەوە کەسێکی دوڕوە. با باوەڕیشی بە هەموو ئەحکامەکانی ئیسلام هەبێت.

**باسی سێیەم/** لە فەرمودەکەدا ناڕونیەك هەیە لەوەدا کە: ئەم سیفاتانە لەوانەیە لە مرۆڤی باوەڕداریشدا هەبن. لە بەر ئەوە زانایان لە ماناکەیدا چەند ڕایەکیان هەیە:

---

[1] والذي نفسي بيده لا تؤمنوا حتى تحابوا.مسند أحمد، مسند العشرة المبشرين، مسند الزبير بن العوام( ١٣٧٩ ).

ڕای یەکەم: ئەم سیفاتان سیفاتی دوڕون، هەر کەسێکی باوەڕدار ئەو سیفاتانەی تێدا بێت، وەك دوڕووو وایە بە مەجازی. چونکە دوڕو کەسێکە پێچەوانەی ناخی خۆیی ئاشکرا ئەکات.ئەوەش لە هەڵگری ئەم سیفەتانەدا هەیە. دوڕوەکەیشی بەرامبەر ئەو کەسەیە کە قسەی لە گەڵ کردوە و پەیمانی پێداوە،شەڕی لە گەڵدا کردوە، نەك دوڕو بێت بەو مانیەی کوفر بشارێتەوەو باوەڕ دەربخات.

نەوەوی ئەڵێت: ئەمە ڕای زۆربەی لێکۆڵەرەوانە. صەنعانیش ئەڵێت: ئەمە ڕای دروستە.

ڕای دوەم: ئەم فەرمودەیە دەربارەی دوڕوەکانی سەردەمی پێغەمبەری خودا وتراوە، ئەیانوت باوەڕمان هەیە و درۆیان ئەکرد، وە پێغەمبەریان بۆ نێردرا بەڵام خیانەتیان لێکرد.وە پەیمانیان دا کە دین سەربخەن، بەڵام غەدریان کردو پەیمانیان شکاند. وە لە شەڕەکانیاندا ڕوی ڕەشی خۆیان نیشان ئەدا. ئەمەش ڕای سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتای کوڕی ڕەباحە. هەروەها حەسەنیش بۆ ئەم ڕایە گەڕایەوە کاتێك پێچەوانەی ئەم ڕایەی هەبوو.هەروەها ئەم ڕایە لە إبن عباس و إبن عمر ئەگێڕنەوە کە لە پێغەمبەری خودایان گێڕاوەتەوە. قازی عیاض ئەڵێت: زۆربەی زانایانی فیقه لە سەر ئەم ڕایەن.

خەتابی لە هەندێکیان ئەگێڕێتەوە کە: فەرمودەکە لە پیاوێکی دیاریکراودا وتراوە: پێغەمبەری خودا بەڕاشکاوی ڕوبەڕویان نەئەبوەوە و پێیان بڵێت تۆ دوو ڕووی. بەڵکو تەنها ئاماژەی بۆ ئەکرد.

ڕای سێیەم: خەتابی ئەڵێت: فەرمودەکە بۆ ئاگادارکردنەوەی موسڵمانە کە وریابێت ئەم سیفاتانەی تێدا نەبێت کە بەرەو وی ئەیبات. بۆ پشتگیری ئەم ڕایەش چیرۆکی ثعلبة ئەهێنێتەوە کە خوای گەورە دەربارەی ئەفەرموێت: ﴿ فأعقبهم نفاقا في قلوبهم إلى يوم يلقونه بما أخلفوا الله ما وعدوه وبما كانوا يكذبون﴾ (التوبة: 77).

ئەم پیاوە پەیمان شکاندن و درۆکردن بەرەو بێباوەڕی برد.

**( ١٨٨ ). عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رسول الله ( صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): إياكم والظن ، فإن الظن أكذب الحديث..**

وریابن لەگومان بردن،چونکەگومان درۆترین قسەیە.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صحیح البخاري، کتاب الوصایا، باب قول الله تعالى : من بعد وصية.صحيح مسلم، کتاب البر والصلة والاداب،باب تحريم الظلم(٤٧٧٤).

**مانـای وشـەکان//** الظن: ئەو خەیاڵە یە کە بە سەر دەرونی مرۆڤدا دێت،کە ئەگەری ڕاست و پوچیشی تێدایەو،بڕیاری لە سەر دەکرێت و پشتی پێ ئەبەسترێت.

**سەرباسەکان//**

**باســـی یەکـــەم/** دەربارەی مەبەست لە وشەی ئاگادارکردنەوە لە فەرمودەکەدا،چەند ڕایەك هەیە:

ڕای یەکەم: ئاگادارکردنەوەیە لە گومانی خراپ بردن بە موسڵمان،وەك خوای گەورە دەفەرموێت: :﴿إجتنبوا كثيرا من الظن ﴾ الحجرات:( ١٢) .

ڕای دوەم: ئاگادار کردنەوەو ڕێگری کردن لە دروست کردنی تۆمەت،بە بێ پاساو. وەك ئەوەی کەسێك تۆمەتی خراپ بدرێتە پاڵی، لە کاتێکدا هیچ خراپەیەکی لێ دەرنەکەوتوە. ئەمەش ڕای خەتابیە.

ڕای سێیەم: ئاگادارکردنەوە لە بە دوادا چونی تۆمەت و سور بون لە سەری.بەڵام ئەگەر تۆمەتەکە بە خەیاڵیدا هات و جێگیر نەبوو لای، ئەوە چاوپۆشی لێکراوە، وەك لە فەرمودەکەدا هاتوە: خوای گەورە چاوپۆشی کردوە لەو خەیاڵەی بە دەرونی ئومەتەکەیدا دێت،ئەگەر دەری نەبڕن و ئیشی پێ نەکەن.[1]

---

[1] تجاوز الله عما تحدثت به الأمة أنفسها ما لم تتكلم أو تعمل. مسند أحمد،مسند بني هاشم، مسند أبي هريرة ( ٩٣٤١ ).

**باســـی دوەم/** فەرمودەکــە دەربــارەی کەســێکە کــە: جنێــوو خراپــەی لــێ دەرنەکەوتبێت. بەڵام ئەم ڕەهاییەش بەم فەرمودانە ئەبەسترێتەوە:

أ. (بە گومانی خراپ خۆتان لە خەڵکی بپارێزن).[1]

ب. (گومانی خراپ حەرامە).[2]

ج.فەرمودەی: (لە براکەت ئەمین مەبە با لە تیرەی بەکریش بێت.[3]

**باسی سێیەم/** زومەخشەری، گومان خراپ ئەکات بەم بەشانەی خوارەوە:

١. واجب: بریتیە لە گومانی باش بردن بە خوای گەورە.

٢. حـەرام: گومـانی خـراپ بـردن بـە خـودا، وە بـە هـەر موسـڵمانێك کـە لـە ئەصڵدا دادپەروەرە. ئەوەش مانای فەرموەکەیە: إياكم والظن..

٣. سـوننەتە: گومـانی چـاك بـردن بـەو موسـڵمانانەی کـە لـە ئەصـڵدا دادپەروەرن.

٤. دروســتە: وەك وتــەی ئەبوبــەکر بــە عائـشەی کــچی، کاتێـك گومــان کەوتـە دڵیـەوە کـە لـە سکی خێزانەکـە یـا دوو منـداڵ هـەبێت. بۆیـە فـــەرموی: ئـــەوەی لـــە ســـکیدایە،یا دوو براکـــەتن، یـــا دوو خوشکەکەتن.[4]

نمونــەی تــریش: گومــانی خــراپ بــە کەســێك کــە بــە تێکــەڵی شــوێنی خــراپ و ئاشــکراکردنی تــاوان بــە ناوبانگــە.ئــەوە حــەرام نیــە گومــانی خراپــی پــێ ببرێــت، چـونکە خـۆی پێناسـەی خـۆی ئـەکات. هـەر کەسـێك

---

[1] إحترسوا من الناس بسوء الظن. قال الشوكاني في الفوائد المجموعة: روي مرسلا مرفوعا، وكلها ضعيفة ( ٢٥٨ ).

[2] يحرم سوء الظن. قال الصنعاني: كل طرقه ضعيفة وبعضها يقوي بعضا. سبل السلام ٤/ ٢٨٦

[3] أخوك البكري فلا تأمنه. سنن أبي داود ،كتاب الأدب، باب في الحذر من الناس،( ٤٢٨٢ ). وضعفه الألباني في ضعيف سنن أبي داود( ٤٨٦١ ).

[4] إنما هما أخواك وأختاك .صححه الألباني في إرواء الغليل( ٦١/٦ ). البدر المنير لابن الملقن ( ١٤٤/٧ ).

خــۆى پــەردەپۆش بكــات، تــەنها گومــانى چــاكەى پــىٚ ئــەبرێت.
كەســێكيش بــچێتە شــوێنى خراپ،تۆمــەتى بــۆ دروســت ئــەكرێت.
كەسێكيش تاوانى خۆى ئاشكرا بكات،گومانى خراپى پىٚ ئەبەين.
ئەو خاڵەى كە ئەم جۆرە گومانانە لە يەكترى جيا ئەكاتەوە ئەوەيە:
هــەر گومانێـك نيـشانەى ڕاسـت و هــۆى ئاشـكراى نەبوو،ئـەو گومانـە حەرامــە و پێويــستە لێــى دوربكەوينــەوە. ئــەوەش لــە كاتێكدايــە گومانلێكراو چاكى و باشى لىٚ بينرابێت.
وە هــەر كەســێك لــە ڕوكەشــدا ئەمانــەت و دەســت پــاكى لــىٚ بينرابێت،حەرامـە گومـانى خيانـەتى پـىٚ ببرێـت. بـە پێـچەوانەى ئـەو كەسەى كە بە گومان لە ناو خەڵكدا ناوى دەركردوە.
<u>باســى چــوارەم/</u> فـەرمودەى (فإن الظـن أكـذب الحـديث) ، گومـانى ناونـاوە بـە قسە، چونكە قسەى ناو دڵ و دەرونە.
هــەر بۆيــە گومـانيش درۆتـرين قـسەيە، چـونكە درۆ پێـچەوانەى واقعـە بـىٚ پـشت بەسـتن بـە نيـشانە. ناشـرينى درۆيـش ئەوەنـدە ئاشـكرايە پێويـست بە دەرخستن ناكات.
گومــانيش خاوەنەكــەى وا ئــەزانێت، پــشتى بــە شــتێك بەســتوە. كەســى گــوێگريش زۆر كــات نازانێــت بەرامبەرەكــەى درۆزنــە. بۆيــە نــاونراوە بــە درۆترين قسە.

**(١٨٩). عـن عائـشة رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهَـا قالـت: قـال رسـول الله (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ): اللهم من ولي من أمر أمتي شيئا فشق عليهم،فاشقق عليه..**

خوایە،هەرکەسـێك کاروبـارێکی ئوممەتەکـەی مـنی گرتەدەسـت وقورسـی کردلە سەریان، تۆش توند بە لەگەڵیا.

**گێـڕەرەوەی فەرمودەکـە//** . صـحيح مـسلم، كتـاب الإمارة،بـاب فـضيلة الإمـام العادل وعقوبة الجائر(٣٥١٥).

**مانای وشەکان/** شق عليهم توشی نارەحەتیان ئەکات.

**سەرباسەکان//**

**باسـی یەکـەم/** نـزا کردنـی پێغەمبـەر لێیـان بـە توشـبونی نارەحەتی،بەرامبـەرە بـە کردارەکـەیان.نارەحـەتی دنیـاوو قیامـەتیش ئەگرێتەوە.

**باسـی دوەم/** فەرمودەکـە بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: لەسـەر کاربەدەسـت پێویـستە ئاسـانکاری بکـات لـە کاروبـاری ژێردەسـتەکانی،ونەرم ونیـان بێـت لـە گـەڵیان ، وچاوپۆشـی بکـات لەگەڵیانـدا ، ڕوخـصەت نـەك عەزیمـەت بەکاربهێنێت، تـاکو نارەحـەت نـەبن. ئـەوەیان لـە گـەڵ بکـات کـە حـەز ئەکات خوای گەورە لە گەڵ ئەودا بیکات.

**(١٩٠). عـن أبـي ذر رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ، عن النّبِـيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ) فيمـا يرويـه عـن ربه، قال: يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي، وجعلته بينكم محرما، فلا تظالموا..**

خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ئـەی بەنـدەکانم،من سـتەمم لەسـەر خـۆم حـەرام کردوەو،لەنێوانی ئێوەشدا بەحەرامم داناوە، کەواتە ستەم لەیەکتری مەکەن.

**گێـــڕەرەوەی فەرمودەکـــە//** صـحیح مـسلم، کتـاب الـبر والـصلة والأدب،بـاب تحریم الظلم (٤٨٠٢)

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** ئەم فەرمودەیە لە فەرمودە قودسیەکانەو،فەرمودەی خوای گەورەیە.

**باســـــی دوەم/** التحـــریم لـــەزمانی عەرەبیـــدا واتـــە قەدەغـــەکردنی شـتێك.لەشەرعیـشدا،ئەوکردارەیە کـە بکەرەکـەی شـایانی سـزایە. بـەڵام ئـەم مانایـە بـۆ خـوای گـەورە دورە،مەبەسـتی فەرمودەکـەش ئەوەیـە کـە خـوای گەورە دورە لە ستەمکردن.

**باســـی ســـێیەم/** سـتەمکردنی خـوای گـەورە مەحاڵە،چـونکە سـتەم واتـە: هەڵـسوکەوتکردن لـە مـوڵکی خەڵکیدا،تێپەڕانـدنی سـنور. هەردوکیـشیان بـــۆ خـــوای گـــەورە مەحاڵە،چـــونکە خـــۆی خـــاوەنی هـــەموو جیهانـــەو هەڵـــسوڕێنەری وردو درشـــتی کاروبـــارە کانیـــەتی. خـــوای گـــەورە ئەفـەرموێت:﴿ومـا ربـك بظـلام للعبیـد﴾ {فـصلت:٤٦}.وە لـە فـەرمودە کەیشدا هاتوە: إني حرمت الظلم على نفسي.

**باســـی چـــوارەم/** فـەرمودەی فـلا تظـالموا دوپاتکردنـەوە یـە بۆفـەرمودەی **وجعلته بینکم محرما**.

**باســـی پێنجـــەم/** سـتەمکردن لـە پێوانـەی ژێریـدا بێزراوە،شـەریعەتیش بێزراوتـری کردوەو،هەڕەشـەی سـزادانی بـۆ کـردوە،وەك ئەفـەرموێت:﴿وقـد خاب من حمل ظلما﴾ {طه:١١١}.

**(١٩١). عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أن رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: أتدرون ما الغيبة؟ قالوا: الله ورسوله أعلم،قال: ذكرك أخاك بما يكره. قال: أفرأيت إن كان في أخي ما أقول؟ قال: إن كان فيه ما تقول فقد إغتبته، وإن لم تكن فيه فقد بهته..**

فەرموی: ئەزانن غەیبەت چیە؟ وتیان: خواوپێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرموی: باسکردنی براکەتە بەوەی پێی ناخۆشە. ئامادەبویەك وتی: ئەگەر لەبراکەمدا ئەوە هەبوو کەمن باسم کردوە؟ فەرموی: ئەگەر تیایدا بێت،ئەوە غەیبەتت کردوە. ئەگەر تیای نەبێت،ئەوە بوختانە (قسە هەڵبەستنە بۆی).

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـە//** صحيح مسلم، كتاب البر والصلة والأدب،باب تحريم الغيبة(٤٨١٨).

**سەرباسەکان//**

**باسی یەکەم/** فەرمودەکە لێکدانەوەی دەستەواژەی (الغيبة) یە لەئایەتی﴿ولا يغتب بعضكم بعضا﴾ {الحجرات:١٢}.

**باسی دوەم/** الغيبة لەوشەی الغيب (نادیار) وەرگیراوە،چونکە لەپاشەملەو بەنادیاری ئەکرێت.

لەشەرعیشدا،دووڕا لەبارەی ماناکەیەوە هەیە:

یەکەم: باسکردنی براکەی بەئامادەبونی خۆی یا ئامادەنەبونی،بەشێوەیەك کە پێی ناخۆش بێت،بەبەڵگەی: (ذكرك أخاك بما يكره) لەفەرمودەکەدا.غەزالیش هەمان لێکدانەوەی هەیە،وەك ئەوەی ئەڵێت: باسکرنی مرۆڤە بەشێوەیەك پێی ناخۆش بێت،لەبارەی جەستەی ،یا دینی،یا دەرونی،یا ئەخلاقی،یا سامانی،یا باوکی یا کوڕی

یـــا هاوســـەری یـــا خزمـــەتکاری یاجوڵانـــەوەی یـــا دلخۆشـــبونی یـــا دڵناخۆشی،یاشتێتر کە باسکردنی پێناخۆش بێت،بەدەربڕین یا ئاماژە.

دوەم: غەیبـــەت کـــردن تـــەنها لەپاشملـــە ئـــەبێت،تا لەگـــەڵ مانـــا زمانەوانیەکەیدا یەکبگرێتەوە،بە بەڵگەی:

ئـــەو فەرمودەیـــەی دراوەتـــە پـــاڵ پێغەمبـــەر (صَـــلَّی اللهُ عَلَیْـــهِ وَسَلَّمَ)،کەفەرمویەتی: ماکرهت أن تواجه به أخاك فهو غيبة.[1] شتێك حەز نەکـەیت ڕوبـەڕو بەبراکـەتی بڵێیـت ، ئـەوە غەیبەتـە. ئـەم فـەرمودە ئەگـەر ڕاست بێت فەرمودەکەی ابوهريره تايبەت ئەکات.

لێکدانـەوەی زانایـانیش بەڵگـەی ئـەم بۆچـونەیە،لێکدانەوەی هەنـدێکیش بۆی ئەوەیە کە:

أ.باسکردنی عەیبەکەیە لە پاشملە.

ب.بەخراپی باسی براکەت بکەیت لەپاش ملە ،ئەگەر تیاشی بێت.

**<u>باسی سێیەم/</u>** ئەوەوی ئەڵێت:

نمونـــەی تـــری غەیبـــەت،وەك ڕوشـــاندن و لەکـــەدارکردن لەوتـــەی نوسـەراندا،کاتێك ئـەڵێن: کەسـێك کـە خـۆی بـەزانا دائـەنێت وتی،هەنـدێك کـەس کـە لەسـەر پیاوچـاکان ئـەژمێردرێن....وە هەنـدێك دەسـتەواژەی تـر کـە ئـەزانرێت مەبەسـت چـیە لێـی. هـەروەها لـەکاتی باسـکردنی کەسـێك بوترێـــت: خوالێمـــان خۆشـــبێت،یا خواتەوبـــەمان لـــیٚ وەرگرێت،یـــا خواسەلامەتمان بکات....

**<u>باســـی چـــوارەم/</u>** باسـکردنی عـەیب بـەرەو ڕوو حەرامە،چـونکە ئەبێتـە هـۆی ئازاردانی،ئەگەر غەیبەتیش نەبێت.

**<u>باسی پێنجەم/</u>** مەبەست لە(أخاك) لەفەرمودەکەدا: برای دینیە.

---

[1] الجامع في الحديث لابن وهب، هذا كتاب الصمت، في الكلام لما لا ينبغي ولا يحسن عن ابن شهاب عن رسول الله ( ٣٣٠ )..وضعفه الالباني في ضعيف الجامع ( ٥١٢٩ ).

هەڵبــژاردنی وشــەی بــرا بۆی،ڕاکێــشانی غەیبەتکــەرە بــۆ لای غەیبەتکراو،چــونکەئەگەربرای بێت،باشــتروایە بەســۆزبێت بۆی،ونهێنیـەکانی داپۆشـی و،پاسـاو بـۆ عەیبـەکانی بێنێتەوە،نـەك بڵـاوی بکاتەوە.

**باســی شەشــەم/** وشـەی (أخـاك) لەفەرمودەکـەدا بەڵگـەی ئەوەیـە کـە: غەیبـەتکردنی ناموســڵمان دروســتە. إبــن المنــذر ئــەڵێت: فەرمودەکــە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی:کەسێك بـرات نـەبێت جولەکـە یاگـاور یـا بدعەچـیەك کەلەئیسلام دەریکردبێت،غەیبەتکردنی دروستە.

**باســی حەوتــەم/** فـەرمودەی (بمـایکرە) ئـەوە ئەگەیـەنێت کـە: کاتێـك باســکردنەکەی پــێ نــاخۆش نــەبێت وەك ئەوانــەی خراپــەکارن وداوێــن پیسن،غەیبەت نیە.

**باســی هەشــتەم/** حــەرامبونی غەیبــەتکردن لەشــەرعدا جێــی گومــان نیە،ویەکڕان لەسەری.

بـەڵام زانایـان دەربـارەی ئـەوەی کـەگوناهی گەورەیـە یـا بـچوك،دووڕایان هەیە:

یەکــەم:لەگوناهــە گەورەکانــە،قــرطبي ئــەڵێت: یەکــدەنگی هەیــە لەوبارەیەوە،بە بەڵگەی:

فــەرمودەی (إن دمــاءکم وأمــوالکم علــیکم حــرام)[1] خــوێن ومالْتــان لەســەر یەکتر حەرامە.

زرکــشی ئــەڵێت: ســەیرە کەســێك خــواردنی مــردارەوە بــو ،بەگــەورە دائـەنێت.وغەیبــەت بــەگوناهی گــەورە دانانێــت. هەرچــەندە خــوای گــەورە غەیبەتی وەك خواردنی گۆشتی مرۆڤی مردوو داناوە.

[1] ذكره الشوكاني في كتاب الفتح الرباني وصححه( ٨/ ٣٩٩٩ ).

فـــەرمودەكانیش كەباســـی غەیبـــەت ئەكـــەن زۆرن وبەڵگـــەن لەســـەر حەرامبونی.

دووەم: گونـاهی بـچوكە،بەڕای غـەزالی وخـاوەنی كتـێبی العمـدة.ئـەوزاعی ئەڵێت: جگە لەم دوزانایە كەسی تر لەسەر ئەم ڕایە نیە.

**باسی نۆیەم/** زانایان شەش خاڵیان لەغەیبەت جیاكردۆتەوە:

یەكـــەم: شـــكاتكردن/ دروســـتە ســـتەملێكراو بڵێـــت: فڵـــان كـــەس ســـتەمی لێكردوم،مـــاڵی بردوم،یـــا ســـتەمكارە،بەڵام لای كەســـێك باســـی بكـــات كەتوانای لابردنی یا سوككردنی ستەمەكەی هەبێت،بەبەڵگەی:

هینـــد لای پێغەمبـــەر (صَـــلَّى اللهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ) شـــكات لـــە أبوســـفیانی هاوسەری ئەكات وئەڵێت: پیاوێكی چروكە.[1]

دووەم: باســـكردنەكە، یارمەتیـــدەری گـــۆڕینی خراپەیـــەك بێـــت،ولای كەســـێك باســـی بكـــات كـــەتوانای گـــۆڕینی هـــەبێت،بڵێت: فڵـــان كـــەس ئـــەوەی كـــردوە بەرامبەر كەسێك، وە بەئاشكرا خراپە ڕائەگەیەنێت.

سـێیەم:پـرس كـردن (وەرگـرتنی ڕای شـەرع)،بەزانایـەك بڵێـت: فڵـان كـەس سـتەمی لێكردوم،چـۆن ئـەتوانم خـۆمی لـێ ڕزگاربكـەم؟ بەڵگـەش بـۆ ئـەوە: ناتوانێت بێ باسكردنی كەسەكە خۆی بپارێزێت لەچونە ناو حەرامەوە.

چـــوارەم: ئاگاداركردنـــەوەی موســـڵمانان تـــا نەخەڵـــەتێن پێـــی،وەك باســـی لایـــەنی خراپـــەی ڕاوی فـــەرمودەكان وشـــایەت وكەســـێك وانـــە ئەڵێتـــەوە، وەكەســـێك فـــەتوا ئەدات،بەنـــەزانی. بـــە بەڵگـــەی ،فـــەرمودەی : بـــئس أخـــو العـــشيرة.[2] وە فـــەرمودەی (أمـــا معاويـــة فـــصعلوك لا مـــال لـــه،واما ابـــوجهم فـــلا يـــضع عـــصاه عـــن عاتقـــه) [3] كاتێـك بەفاتمـەی كـچی قەیـسی وت،كاتێـك ویـستی ڕای پێغەمبەر وەربگرێت،باسی خوازبێنی معاویەو أبوجهم ی كرد.

---

[1] صحيح البخاري، كتاب البيوع، باب من اجرى أمر الأمصار على ما يتعارفون بينهم( ٢١٢٥ ).

[2] صحيح البخاري، كتاب الأدب، باب لم يكن النبي صلى الله عليه وسلم ، فاحشا( ٥٧٠٨ ).

[3] سنن أبي داود رقم ( ٢٢٨٤ ). وسكت عنه.

پێنجەم: باسکردنی ئەوانەی بەئاشکرا خراپە ئەکەن،دروستە تەنها بەو سیفەتە باسبکرێن کەبەئاشکرا ئەیکەن .بەبەڵگەی: فەرمودەی ( اُذْكُرُوا الفَاجِرَ)[1] باسی خراپەکار بکەن.

شەشەم: ناساندنی کەسێك کە بە عەیبەکانیەوە ئەناسرێت،وەك یەك کەڵەچارو ،شەل ،چاو پەڕوپوشاوی .ناوهێنانەکەش بۆباسی کەموکوڕی غەیبەتکردن نەبێت.

**(١٩٢).مِنْ حَدِيثِ إِبْنِ مَسْعُود رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ رَفَعَهُ: لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلَا اللَّعَّانِ وَلَا الفَاحِشِ وَلَا البَذِيءِ..**

ئیماندار تانەدەرو لەعنەتکەرو داوێن پیس ودەم پیس نیە.

**٢.عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ): إِنَّ اللهَ يُبْغِضُ الفَاحِشَ البَذِيءَ.**

خوای گەورە ڕقی لە داوێن پیسی دەم پیسە.

**گێـرەرەوەی فەرمودەکـە//**١.سنن الترمذي،الذبائح، أبواب البر والصلة عن رسول الله، باب ما جاء في النميمة(١٩٨٣) ،وە بەحەسەنی داناوە،حاکم یش بەصحیحی داناوە.

٢.ترمـذي گێڕاویەتەوەو بەصحیحی داناوە. ئەلبانیش بە صەحیحی داناوە.صحيح الجامع(١٣٥).

**مانـای وشـەکان//** البُغْضُ: ڕقلێبون،پێچەوانەی خۆشویستن. الطَّعْنُ: جنێودان. البَذِيءُ: قسەی ناشرین. اللَّعَّانُ: صیغەی مبالغەیە،واتە: زۆر لەعنەت بەکارئەهێنێت.

---

[1] ضعفه الألباني في ضعيف الجامع (١٠٤).

**سەرباسەكان//**

**باســــى يەكــــــەم/** ڕق لێبــونى خــوا بۆبەندەكانى،واتــە خــۆش نەويستنە.مەبەستيش لێى،سزادان وڕێزلێ نەگرتنيانە.

**باســى دوەم/** مبالغـة و زيـادەڕۆيى لەلـەعن دا مەبەسـت نيە،چـونكە لەعنـەت بەكارهێنان كەم و زۆرى حەرامە.

**باسـى سـێيەم/** فـەرمودە باسلێكراوەكە،پێمان ئـەڵێت كـە جنێـودان وتانـەدان لەســـيفاتى موســـڵمانى تـــەواو نيە،جگـــە لەلەعنـــەت كردنـــى بێباوەر،ئارەقخۆرو،كەسـێك لەعنـەت لـەخواو پێغەمبەرەكـەى بكـات(ئەمانـە بەدەرن لە نەهيەكە) .

**(١٩٣). عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتَّاتٌ..**

دوزبان ناچێتە بەهەشتەوە.

**گێـــڕەرەوەى فەرمودەكـــە//** صـحيح البخاري،كتـاب الأدب،بـاب مـا يكـره مـن النميمـة(لا يـدخل الجنـة قتـات)(٥٧٣٢). صـحيح مـسلم، كتـاب الإيمـان، بـاب بيان غلظ تحريم النميمة(١٨١).

**مانـــاى وشـــەكان//** القَتَّـاتُ: النَّمَّـامُ قـسەهێنەرو بـەر، دوزبـان،وتراوە: لەنێوان ئەم دو وشەيە جياوازى هەيە:

النَّمَّـــامُ: ئـــەو كەســـەيە لەســـەرەتاى بەســـەرهاتەكەوە ئامادەيە،پاشـــان ئەيگەيـەنێت. القتـات:بەدزيـەوە گـوێ ئـەگرێت وكـەس پێـى نازانێت،پاشـان قسەكە ئەگوێزێتەوە.

**سەرباسەكان//**

**باســـى يەكـــەم/** النَّمِيمَـة واتـە: گواسـتنەوەى قـسەى خـەڵك بـۆ يـەكترى ، بەمەبەستى ئاژاوەنانەوە.

**باسی دوەم/** غەزالی دەربارەی النَّمِيمَة ئەڵێت:

سنوری النَّمِيمَة ئەوەیە: ئاشکراکردنی ئەوەی کە قسەکەی بۆئەبرێت یا خاوەن قسەکە یا کەسێکی تر،پێیان خۆش نیە ئاشکرابێت، بەئاماژەکردن،یانوسین یا سەر ڕاوەشاندن.

هەروەها ئەڵێت: نَميمَة ، ئاشکراکرنی نهێنی وپەردەلادان لەوەی ئاشکراکردنی باش نیە. خۆ ئەگەر ببینێت ماڵێك بۆ خۆی ئەشارێتەوە،کە ئەوەی باسکرد بۆ خەڵکی ئەوە نەمیمەیە.

صەنعانی ئەڵێت: لەوانەیە ئەمەیان نەچێتە بواری نەمیمەوە،بەڵکو نهێنی ئاشکراکردنە کە ئەویش حەرامە.

**باسی سێیەم/** تاوانی دوزبان گەورەیە،بەبەڵگەی:

أ. فەرمودە باسلێکراوەکە.

ب. طبرانـي بە مرفوعی ئەیگێڕێتەوە: حەسودو دوزبان وکاهین،لەسەر ڕێبازی من نین،وە منیش لەسەر ڕێبازی ئەوان نیم. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدْ احْتَمَلُوا بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً﴾{الأَحْزَاب:٥٨}.[1] واتە: ئەو کەسانەی ئازاری باوەڕدارانی هەردوو ڕەگەز ئەدەن،بێ ئەوەی هیچ گوناهێکیان کردبێت،ئەوانە بوختان وتاوانێکی گەورەیان ئەنجام داوە.

ج.أحمد ئەیگێڕێتەوە: باشترینی بەندەکانی خوا ئەوانەن کە بە بینینیان ،خوات بیر ئەکەوێتەوە. خراپترینیشیان ئەوانەن کە زۆر دوزبانی ئەکەن،و زۆر بەدوای عەیبی خەڵکدا ئەگەڕێن. خوای گەورەش لە گەڵ سەگدا حەشریان ئەکات.[2]

---

[1] لَيْسَ مِنَّا ذُو حَسَد،وَلَا نَمِيمَة وَلَا كَهَانَة،وَلَا أَنَا مِنْهُ،ثُمَّ تَلَا قَوْلَهُ تَعَالَى:....الآية. قال عنه الالباني في السلسلة الضعيفة: موضوع (٥٨٦).

[2] خِيارُ عِبَادِ اللهِ الذينَ إذَا رُؤوا ذُكِرَ اللهُ،وَشَرُّ عِبَادِ اللهِ المَشَّاؤنَ بِالنَّمِيمَةِ البَاغُونَ لِلْبَراءِ العَيْبَ،يَحْشُرُهُمُ اللهُ مَعَ الكِلَابِ.مسند أحمد، مسند الشاميين،حديث عبدالرحمن بن غنم الأنصاري (١٧٧٣٦).

**باسی چوارەم/** الحافظ المنذري ئەڵێت: موسڵمانان یەکدەنگن لەوەی کە دوو زمانی حەرامەو،لەگەورەترینی تاوانە لای خوای گەورە.
لەقسەکانی غەزالی دا بۆمان دەرئەکەوێت،ئەگەر بەنیازی ئاژاوەنانەوە بوو،ئەوکاتە دوو زمانی ئەبێتە تاوانی گەورە.
**باسی پێنجەم/** لەوانەیە قسە هێنان فەرزبێت، کاتێك گوێت لەکەسێکە نیەتی خۆی لە ئازاردانی کەسێك بە ناهەق ئاشکرا ئەکات. ئەویش کەسەکە ئاگادار ئەکاتەوە. ئەگەر توانرا بێ ناوهێنانی خاوەنەکەی قسەکە بگەیەنرێت، باشە. ئەگەر نا ناوی کەسەکەش ئەهێنرێت.

**(١٩٤). عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): طُوبَى لِمَنْ شَغَلَهُ عَيْبُهُ عَنْ عُيُوبِ النَّاسِ..**
**طوبا** بۆ ئەو کەسەی بەهۆی سەرقاڵبون بەعەیبی خۆیەوە،ناپەرژێتە سەر عەیبی خەڵکی.

**گێڕەرەوەی فەرمودەکە//** البزار بەإسنادیکی باش( حسن ).[1]
**مانای وشەکان//** طُوبَى:چاوگی الطِّيبُ،یان ناوی درەختێکە لە بەهەشتدا،بەسەد ساڵ ئەتوانرێت بگەیتە کۆتاییەکەی.
**سەرباسەکان//**
مەبەست لەفەرمودەکە: طوبا بۆ ئەو کەسەی سەرقاڵە بەسەیرکردن ولابردن وپۆشینی نەنگیەکانی خۆی و ناپەرژێتە باسکردن وناسینی عەیبی خەڵك و،کاتێك ویستی عەیب لەخەڵك بدۆزێتەوە،ئەوەندە عەیبی خۆی لەبیرە،کەباسی ئەوانی بیربەرێتەوە.

---

[1] ئەلبانی ئەڵێت: قد يكون صحيح المعنى والمبنى لشواهده المقوية له..تحريم آلات الطرب(٧٤).

## پێرستی بابەتەكان